

# گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

ژمارە (٢٧) ساڵی ٢٠١٣

## لەم ژمارەیەدا

### بەشی کوردی



### بەشی عەرەبی - القسم العربي



### English part– بەشی ئینگلیزی

# ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
# لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

١- گۆڤـاری ئەکادیمیـای کـوردی، کە گۆڤارێکـی زانسـتیی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی کورد و کوردستان، دوای ئەوەی هەڵسەنگاندنی زانسـتییان بـۆ دەکرێت، بـڵاو دەکاتەوە، بۆیـە دەبێ هەمـوو مەرجەکانی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانسـتییان تێدا ڕەچاو کرابێـت. لێکۆڵینەوەکەش، کە مەرجە لە بارەی کێشەیەکی زانستییەوە بێت و بیرۆکە و لێکدانەوەی نوێی تێـدا بـێ، دەبێ لە هیچ شـوێنێکی تر بڵاو نەکرابێتەوە، یـا بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.

٢- زمانـی کوردی زمانـی سـەرەکی بڵاوکردنەوەیە لە گۆڤـاری ئەکادیمیای کـوردی ، بەڵام ڕێگـەش دەدرێ لێکۆڵینـەوەی بە نرخ بە هـەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی بڵاوبکرێنەوە..

٣. هـەر بابەتێـک کـە بۆ گۆڤـاری ئەکادیمیای کـوردی دەنێردرێ ، پێویسـتە ناوونیشانی باس، ناوی نووسەر، شوێنی کارەکەی، پلە و پایەی زانستی لە سەر لاپەڕەی یەکەمی لێکۆڵینەوەکە نووسرابێت.

٤. دەبـێ پوختەیەکـی باس، بە هـەردوو زمانەکەی دی، لە کۆتایی باسـەکەدا بنووسـرێت. ناشبێ پوختەکە لە ١٥٠ وشە زیاتر بێت و پێویستیشە توێژەر لەو پوختەیەدا گرنگی و ئەنجامەکانی باسەکە بخاتە ڕوو.

٥- هەر کاتێ باس، لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستییەوە، بە ئەرێنی گەڕایەوە، ئەوا دەسـتەی نووسـەران ڕەزامەندینامەی بڵاوکردنەوە بـە توێژەرەکەی دەدات.

٦- هەموو باسـەکان بیر و بۆچوونی نووسـەرەکانیانن و مەرج نییە بیروڕای دەستەی نووسەران بن.

٧- بـۆ ئـەوەی بابەت لەگەڵ ڕێنمایی و شـێوازی بڵاوکردنـەوەی گۆڤارەکەدا کۆکبێ، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەربڕین و دەستەواژەی هەیە، ئەوەش بە مەرجێ واتاو بیرۆکەی سەرەکیی توێژینەوەکە نەگۆڕێت.

٨ـ ئەگەر باسەکە لە بارەی پەیدۆزیی (تحقیق)ی هەر دەستنووسێکەوە بێت، ئەوا بنەماو ڕێبازە زانستییەکانی ئەم بوارە پەیڕەو دەکرێن و شەش لاپەڕەی کۆپیکراو لە دەستنووسەکە لەگەڵ باسەکەدا هاوپێچ دەکرێن.

٩ـ پەیڕەوکردنی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناوونیشانی باس، توێژینەوەی بابەت، شێوازی بەکارهێنانی سەرچاوە و ڕێکخستنی پەراوێزەکان مەرجی بڵاوکردنەوەیە. هەر باسێک ئەم بنەما زانستییانەی تێدا فەرامۆش کرابێت، لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردیدا بڵاوناکرێتەوە.

١٠ـ باسەکە، لە پاڵ دانەیەکی سەر CD، بە سێ دانە لە سەر کاغەزی (A٤) چاپ دەکرێت بە مەرجێ ژمارەی لاپەڕەکانی، بە وێنە و نەخشە و لیستی سەرچاوەکانییەوە، لە (٢٥ ) لاپەڕە زیاتر نەبن و بە فۆنتی (١٥)بن و بە Ali-K- Sahifa نووسرابن.

١١ـ ئەگەر بابەتەکە وەرگێڕدرا بوو، دەبێ پەیوەندی بە لایەنێکی کولتووری کوردییەوە هەبێت (زمان، ئەدەب، مێژوو، ... هتد). مەرجیشە کە وەرگێڕانەکە لەو زمانەوە بێت کە لە بنەڕەتدا بابەتەکەی پێ نووسراوە. پێویستە دەقە ئەسڵەکەش هاوپێچ بکرێت.

١٢ـ لەکاتی پێویستدا گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بەشێکی تەرخان دەکات بۆ خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی ئەو کتێبانەی لەبارەی کورد و کولتووری کوردییەوە نووسراون چ بە کوردی یان بە هەر زمانێکی دیکە، بە مەرجێک نووسەر ڕەچاوی پێوەرو ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی تیایدا بکات.

## به بۆنەی کۆچی دوایی کوردناسی ڕووسەوە

# پرۆفیسۆر ژیگالینا

**پرۆفیسۆر جەبار قادر**



بە کۆچی دوایی پرۆفیسۆری مێژوو و سەرۆکی بەشی کوردناسی لە ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسیی سەر بە ئەکادیمیای زانستی ڕووسیا، ئۆلگا ئیڤانەڤنا ژیگالینا، دوا کۆڵەگەی قوتابخانەی کوردۆلۆجیای کلاسیکی لە پایتەختی ڕووسیا ماڵئاوایی لێکردین. قوتابخانەی ڕۆژهەڵاتناسی و کوردناسی کلاسیکی لە مۆسکۆ لە سەردەمی یەکێتی سۆڤیەتدا لە ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسیدا بەرجەستە دەبوو. ئەم قوتابخانەیە بایەخی تایبەتی بە لێکۆڵینەوەی مێژوویی دەدا، لە بەرامبەردا قوتابخانەی پیتەربورگ (سان پیتەربورگ)، کە لە سەردەمی تزاریدا دامەزرابوو، لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکانیان زیاتر ڕوویان لەلایەنی فیلۆلۆژی بوو.

کوردناسی ڕووسی و سۆڤیەتی لە دونیای کوردۆلۆژیدا پێگەیەکی درەوشاوەی هەیە، تۆماری بەرهەمەکانی خامەی کوردناسان، کە بیبلیۆگرافیای کوردناسی لە دووتۆی خۆیدا کۆی کردوونەتەوە و هەموو لایەنەکانی ئەم بوارە دەگرنەوە، زیاتر لە هەشت هەزار ناونیشانی بۆمان تۆمار کردووە، بۆیە لەم بوارەدا هیچ ناوەندێکی دی دونیا نەیتوانیوە جێگەی بگرێتەوە. لەم ساڵانەی دواییدا ئەستێرە گەشەکانی کوردناسی لە ڕووسیا و کۆمارەکانی پێشووی یەکێتی سۆڤیەت یەك بە دووی یەکدا سەریان نایەوە. میخائیل سیمیۆنەڤیچ لازەرێف، مانڤێل ئەرسینۆڤیچ هەسراتیان،

ئۆردیخانێ جەلیل، شاکرۆی محۆیی، شەرەڤ ئەشیری و پێش ئەوانیش قەناتێ کوردۆ، چەرکەزێ بەکۆ، نەفتولا ئەرۆنەڤیچ خالفین و یولیا ئەڤالیانی، ڕۆدینکۆ و ئەریستۆڤا و گەلێکی دی ماڵئاواییان لێکردین بێ ئەوەی نەوەیەکی نوێی کوردناس جێگەیان بگرێتەوە و شوێنەکانیان پڕ بکاتەوە.

دوا کۆستی دونیای کوردناسی لە ڕووسیا، کۆچی دوایی سەرۆکی بەشی کوردی لە ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسی سەر بە ئەکادیمیای زانستی ڕووسیا بوو لە مۆسکۆ، پرۆفیسۆر ئۆلگا ئیڤانەڤنا ژیگالینا، کە لە تەمەنی ٦٧ ساڵیدا، لە ڕۆژی چوارشەممە ٢٣ ئوکتۆبەری ٢٠١٣ لە شوێنی کارەکەی دڵی لە لێدان کەوت. ئەو بەشەی خاتوو ژیگالینا زیاتر لە سی ساڵ بوو کاری تێدا کرد، لقێکە بە نێوی لقی کوردناسی و کێشە هەرێمایەتییەکان لە سەنتەری لێکۆڵینەوەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاست لە ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسی لە ئەکادیمیای زانستی ڕووسیا. ئۆلگا ژیگالینا لە ساڵی ١٩٤٦ لە شاری کراسنەڤۆدسک لە تورکمانستان (لە ساڵی ١٩٩٣ نێوی ئەو شارە کرا بە تورکمانباشی) هاتۆتە دونیاوە، هەر لەوێ خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی تەواو کرد.

ژیگالینا لە ساڵی ١٩٦٩ بەشی زمانە ڕۆمان و جەرمەنییەکانی لە فەکولتێتی (فاکەڵتی) فیلۆلۆژی لە زانکۆی مۆسکۆ تەواوکرد. خوێندنی زمانە لاتینی و جەرمانییەکان و دواتریش فێربوونی زمانی فارسی، یارمەتییان دا لە بواری توێژینەوەدا لە مێژوونووسیی ئینگلیزی و سیاسەتەکانی بریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئێرانناسیدا.

هەر لە ساڵی ١٩٦٩ لە ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسی دەستی بەکار کرد. لە دەسپێکدا خەریکی کاری تەکنیکی — زانستی بوو، واتا بۆ وەرگێڕان و کارکردن لە سەر دەکومێنت و بەڵگەنامەکان، بەڵام دوای ساڵێك بووە کارمەندی زانستی لە بەشی ئاسیای ناوەڕاست، کە کوردناسی بەنێوبانگ خالفین، خاوەنی کتێبی "ململانێ لە پێناو کوردستاندا"، سەرۆکایەتی دەکرد. خالفین شارەزا بوو لە بواری سەرچاوەناسی و هیستۆریۆگرافیادا "مێژوونووسیدا" و لەو بارەیەوە لێکۆڵینەوەی گرنگی بڵاو کردۆتەوە و کاریگەری لەسەر ژیگالینا هەبوو.

هەر بە هاندانی خالفین و لە ژێر سەرپەرشتیی ئەودا ژیگالینا دەستی کرد بە وەرگێڕانی بیرەوەرییەکانی جەنەراڵی سوپای رووسیای تزاری بلارامبێرگ لە ئەڵمانییەوە بۆ رووسی و ئامادەکردنی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە. بیرەوەرییەکانی بلارامبێرگ سەرچاوەیەکی گرنگ بوو لە بارەی ئاسیای ناوەڕاست و کاوکازەوە (کەفکاز یا قەوقاز). ژیگالینا ئەو کارەی بە باشی ئەنجام دا و گەلێ تێبینی و بەدواداچوونی لە بارەی رووداوەکانەوە خستە سەر و خالفینیش پێشەکی بۆ نووسی. خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی بەناوبانگی ئەدەبیاتی رۆژهەڵات لە مۆسکۆ ئەم کتێبەی لە زنجیرەی ((ناوەڕاستی ئاسیا لە سەرچاوە و مەتریاڵەکاندا)) بڵاوکردەوە.

دوای ئەو کارەی و دوای ئەوەی خالفین ئەوەی تێدا بەدی کرد کە توانای باشی بۆ کاری زانستی هەیە، پێشنیازی بابەتێکی بۆ کرد بۆ ئەوەی تێزی دکتۆرای لە سەر بنووسی، ئەویش پرسی ئاسیای ناوەڕاست بوو لە مێژوونووسیی ئینگلیزی سەدەی نۆزدەدا. ئا لێرەدا خوێندنی زمانە جەرمانییەکان بەدادی هات. ئەم کارەی لە ساڵی ١٩٧٣ بە سەرکەوتوویی تەواوکرد و بڕوانامەی دکتۆرای پێی وەرگرت. تێزی دکتۆراکەی بەم ناونیشانە بوو " پرسی ئاسیای ناوەڕاست لە مێژوونووسی ئینگلیزیدا لە شەستەکان– نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا".

ژیگالینا وەکو ئێرانیست و کوردناس نێوی رۆیشتووە و هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرای ناووکە لە ساڵی ١٩٩٦، ئەمەش رێگەی داوەتێ کە لە ساڵی ٢٠٠٥ نازناوی پرۆفیسۆری وەربگرێت.

ئۆلگا ژیگالینا ساڵانی ١٩٧٤ – ١٩٧٩ی لە تەك هاوسەرەکەیدا لە ئێران بەسەر برد. هاوسەرەکەی لە ئاژانسی هەواڵە سیاسییەکانی سەر بە باڵیۆزخانەی

سۆڤیەت لە ئێران کاری دەکرد. ئەم چەند ساڵەی ئێران بوون بە وەرچەرخانێك لە ژیانی زانستی ژیگالینادا و دوای گەڕانەوەی بۆ مۆسکۆ بۆ هەمیشە بە ئێران و کوردەوەیان گرێدا و تا دواڕۆژی ژیانی هەر بە دۆزی کورد و بارودۆخی ئێرانەوە خەریك بوو. لە ئێران فێری فارسی بوو و دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسا لەگەڵ هاوسەرەکەیدا سەردانی گەلێ شوێن بکات. لە نزیکەوە شارەزایی لە کۆمەڵگەی ئێران و پێکهاتەی دانیشتوان و باری کولتووری، مێژوویی و سیاسی ئەو وڵاتە پەیدا کرد. بەشێکی کەم لە ڕۆژهەڵاتناسانی سۆڤیەت بەخت یاوەریان بوو و دەرفەتی لەو جۆرەیان بۆ دەرەخسا.

دوای گەڕانەوەی بۆ مۆسکۆ لە ساڵی ١٩٧٩ و بەهۆی ڕووداوەکانی شۆڕشی گەلانی ئێران و ئاڵوگۆڕە گەرمەکانی ڕۆژهەڵاتەوە گرووپێك پێکهێنرا بۆ لێکۆڵینەوە لە بارودۆخی کورد. لە دەسپێکدا تەنها هەسراتیان و ژیگالینا خۆیان بۆ کارکردن لەو گرووپە بەتەواوی تەرخان کردبوو. بەڕێوەبەری ئەو کاتەی ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسی، یڤگێنی پریماکۆف، کە لە دوای کۆچی دوایی غەفورۆف، لە ساڵانی ١٩٧٧ — ١٩٨٥ ئەو ئەرکەی دەبینی، پێش ئەوەی بە پەیژەی دەسەڵاتدا سەرکەوێ تا بوو بە وەزیری دەرەوە و سەرۆك وەزیرانی ڕووسیا. پریماکۆف پشتگیری لە هەبوونی ئەم گرووپە دەکرد. هەسراتیان هەوڵی زۆری دا تا ژمارەیەك لە کوردناسانی بەش و دەزگاکانی دی یەکێتی سۆڤیەت بۆ هاوکاری و بەشداریکردن لە چالاکییەکانی ئەم بەشە ڕاکێشا، وەکو لازەرێف و ڕوسلان تسەبولۆف و گەلێکی دی. مانڤێل هەسراتیان هەوڵی زۆریشی دەدا بۆ پێگەیاندنی نەوەیەکی نوێ لە کوردناسان بۆ ئەوەی لە دواییدا شوێنی ئەمان بگرنەوە. لەم بوارەدا کوردانی یەکێتی سۆڤیەت و کوردانی دەرەوەی ئەو وڵاتەش بۆ خوێندنی دکتۆرا وەردەگیران. لە هەشتاکاندا و پێش ئەوەی کوردناسی بە هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت تووشی قەیرانێکی کوشندە بێت، بەرهەمی زانستیی بەرچاو لە لایەن کارمەندانی ئەم بەشەوە بڵاوکرانەوە.

لە ساڵی ١٩٨٤ گرووپی کوردناسان گۆڕدرا بۆ سێکتەری کوردناسی و تا ساڵی ١٩٩٠ پرۆفیسۆر هەسراتیان سەرپەرشتی دەکرد، لە ساڵانی (١٩٩٠—

٢٠٠٤) پرۆفیسۆر لازەرێف بەرپرسیارێتی بەشەکەی گرتە ئەستۆ، لەدوای ئـەویش و لە ساڵی ٢٠٠٤ تا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کرد پرۆفیسۆر ژیگالینا سەرۆکی ئـەم بەشە بوو. واتا زیاتر لە سـی سـاڵی تەمـەنی خـۆی بـۆ ئـەم بەشـە تـەرخان کـرد. ژیگالینا نوێنەرایەتی نەریتەکانی قوتابخانەی مۆسکۆی ڕۆژهەڵاتناسی دەکـرد، کـە بە لێکدانەوە و وردبوونەوەی مێژوویی و پشتبەسـتن بـە بەڵگەنامـەکانی ئەرشـیفی ڕووسی دەناسرا و لەو بابەتانەی دەکۆڵییەوە کـە بـاس نـەکرابوون یـا کـەم لێیـان کۆڵرابووەوە.

بواری کاری سەرەکیی ژیگالینا ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو. لـە تـەك ئەوەشـدا بە هۆی پاشخانە زانسـتییەکەیەوە گرنگـی بـە مێژوونووسـی ئینگلیـزی لـە بـارەی ئاسیای ناوەڕاست و ئێران و ئەفغانستانەوە دەدا.

وەکـو لـە سـەرەوە ئاماژەمـان پێکـرد یەکـەمین بەرهـەمی وەرگێـڕان بـوو لـە ئەڵمانییـەوە بـۆ ڕووسـی لـە سـاڵی ١٩٧٨. ئـەوەی گرنگـە لێـرەدا لـە بـارەی بیرەوەرییەکانی بلارامبێرگەوە ئاماژەی پێبکەین ئەوەیە کە ئەو ئەفسـەرە باڵایـە، بەتایبـەت لـەو بەشـانەی لـە بـارەی گەشـتەکەیەوە بـوون بـە کـەناری ڕۆژهـەڵاتی دەریای خەزەردا و لە ئابلۆقەی هیراتدا، باس لە "کوردستانی خوراسان" دەکـات. ((لەو کورتە بیبلیۆگرافیایەدا، کە لەگەڵ ئەم چەند دێڕەدا هـاوپێچ کـراوە، ئامـاژە بە گرنگترین بەرهەمەکانی پرۆفیسۆر ژیگالینا دەکەین)).

لە ساڵی ١٩٨٠ ژیگالینا دەست دەکات بە بڵاوکردنەوەی باس و لێکۆڵینـەوە لـە بـارەی کـوردانی ئێـران، پرسـەکانی کوردناسـی، بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی نیشـتمانی لـە ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان و حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتان. هـەر لـەو کاتەوە لە مۆسکۆ دەبێت بە پسپۆر و شارەزای ڕۆژهەڵاتی کوردستان، کە لە چـاو بەشەکانی دی کوردستان لە مۆسکۆ لێکۆڵینەوەی کەمی لە بارەوە کرابوو.

ژیگالینـا بـە درێـژایی هەشـتاکان لـە بڵـاوکراوە تایبەتـەکان بـە زانسـتی ڕۆژهەڵاتناسـی لـە مۆسـکۆ و ناوەنـدەکانی تـری زانسـتی لێکۆڵینـەوە و باسـی لـە بـارەی کـوردی ئێـران و ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتانەوە بڵـاودەکردەوە. زۆربـەی ئـەم لێکۆڵینـەوە وتارانـە لـە بڵـاوکراوە و بلـوتنی تایبەتـدا بڵاودەکرانـەوە، کـە تـەنها

بژاردەیەك لە کەسانی حیزبی و کاربەدەستی سیاسی بۆیان هەبوو بیانبینن و کەڵك لە ناوەڕۆکەکەیان وەربگرن، بێ ئەوەی تەنانەت لە نووسینەکانیشیاندا ئاماژەیان پێبکەن. واتا دەچوونە چوارچێوەی نهێنیی دەوڵەت و حیزبەوە. ئەم بارە بە زیانی نووسەران و ئامادەکارانی ئەو بابەتانە دەشکایەوە، چونکە هەموو ئەو هەوڵ و کارە زانستییانە لە لایەن خوێنەرانی ئاسایی و تەنانەت پسپۆرانی بیانیشەوە نەدەبینران و نووسەرەکانیان بە نەناسراوی دەمانەوە ئەمە بەشێك بوو لە دیاردەی بەحیزبیکردنی زانست کە یەکێتی سۆڤیەت گیرۆدەی ببوو، لە سەردەمی بەعسیشدا شتێکی لەو جۆرە بە ناوی ((تداول محدود)) هەبوو. من بۆ خۆم بۆ یەکەمین جار دوای بڵاوکردنەوەی هەندێ لە کتێبەکانی لە هەشتاکان ناویم بینی و لە نەوەدەکان ناسیم و چەند جارێك لە مۆسکۆ، برۆکسل و بەرلین بینیم و بەشێك لە بەرهەمەکانی پێشکەش کردم و وتارێکم لە بارەیەوە لە گۆڤاری "دڵانپاڕ" لە ئازاری ١٩٩٥ بڵاوکردەوە، کە جوانەمەرگ ڕەهبەر جەلال لە فینلەندا بڵاوی دەکردەوە. لەم نووسینەدا کەڵك لەو وتارە وەرگیراوە. لەم وتارەدا بۆ کارئاسانی و دووبارە نەکردنەوەی ئەو ناوە درێژە، ئاماژە بە ئەو بلوتنە تایبەتەی ئینستیتوتی ڕۆژهەلاتناسی ئەکادیمیای زانستی یەکێتی سۆڤیەت بەم پیتانە دەکەین (ب . ت. ئی. ڕ. ئە. ز. ی. س)، کە کورتکراوەی ناوی بڵاوکراوەکەیە دوای ئەوەی کردوومانە بە کوردی.

لە ساڵی ١٩٨١ ژیگالینا وتارێکی لە ژێر ناونیشانی " هەندێ ناوەندی کوردناسی بیانی" بڵاوکردەوە. لەم وتارەدا ئاماژەی بەوە کردووە کە لە ڕۆژئاوا بایەخ بە کوردۆلۆژیا دەدەن و لە پێگەی گرنگی کوردستان و فاکتەری کوردی تێگەیشتوون و هەوڵدەدەن زیاتر لە بارەی کوردەوە بزانن. ژیگالینا لەو وتارەیدا باس لەوەش دەکات کە کوردناسانی ڕۆژئاوا دەرفەتی ئەوەیان هەیە گەشتی زانستی بۆ ئەو وڵاتانە بکەن کە کوردستانیان دابەش کردووە و لە نزیکەوە بە کورد و کۆمەڵگەی کوردی ئاشنا بن، دەتوانن زمانی کوردی فێربن و لە خوونەریتی کورد بکۆڵنەوە. لە کاتێکدا کوردناسانی سۆڤیەت لەمە بێبەش بوون و تەنها لە ڕێگەی کتێب، بەڵگەنامەکانی ئەرشیف و ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانی و سیخوڕییەکانەوە

زانیارییان لە بارەی کوردەوە وەردەگرت. ئەوانەی ڕۆژئاوا پەیوەندییان لەگەڵ کورداندا هەبوو، لەگەڵ خوێنەوار و پسپۆرەکانیان کاریان دەکرد و بانگهێشتیان دەکردن بۆ ناوەندەکانی خۆیان بۆ ئەوەی کاریان لەگەڵدا بکەن و ئەمەی بە سەرچاوەیەکی گرنگ دەزانی بۆ زانیارییەکانیان. وەکو بڵێی ئەمیش دەیویست کە کوردناسانی سۆڤیەت دەبێ هەمان شتیان بۆ بکرێت. ئەو ئەوەی دەبینی چۆن ڕۆژئاوا هەوڵدەدات باڵادەستیی خۆی لە ناوچەکەدا بەردەوام بێت و لەمەشدا فاکتەری کوردی لە بیر نەدەکرد، لە کاتێکدا یەکێتی سۆڤیەت زۆر گوێی بەم لایەنە نەدەدا.

لێکۆڵینەوەی ژیگالینا لەسەر کوردی ڕۆژهەڵات لە دوای شۆڕشی گەلانی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ ئەوە دەردەخات کە ئەم چەند باش لە سروشتەکانی ڕژێمی نوێی ئێران تێگەیشتبوو و خەسڵەتەکانی کاربەدەستانی نوێی بە باشی دەستنیشان کردبوو. لە توێژینەوەکانیدا لێکدانەوەی دروستی بۆ ڕژێمی نوێ و سیاسەتەکان لەمەڕ کورد و هێزە کوردییەکان دەکرد، کە زۆریان تەنانەت لای کوردناسانیش نەناسراو بوون. گەشەکردنی بزووتنەوەی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە کۆتایی حەفتاکان و دەستپێکی هەشتاکان، بە لای ژیگالیناوە ئەوە ڕوون دەکاتەوە، بۆچی ڕژێم وا بە توندی کەوتە گیانی کورد و لە هەوڵی دامەزراندنی سیستەمێکدا بوو کە هەردوو لایەنی سیاسی و ئاینی لە خۆیدا کۆبکاتەوە.

ناکۆکی نێوان داخوازییەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بۆ ئۆتۆنۆمی نەتەوەیی لە چوارچێوەی ئێرانێکی دیموکراتدا لەگەڵ بۆچوونی دەسەڵاتی مەزەبی کۆنسێرفاتیزمی شیعیدا ئەوەی دەردەخست کە دۆزی کورد لەو بەشەی کوردستان چارەسەری بەخۆیەوە نابینێت، تا ئەو بیر و بۆچوونە باڵادەست بێت. بزووتنەوەی کورد لە لایەن ئەو دەسەڵاتەوە بە بزووتنەوەیەکی دژە ئیسلام نێودەبرا.

لە کتێبی (بزووتنەوەی کوردی لە سەردەمی نوێ و هاوچەرخدا، مۆسکۆ ١٩٨٧)، ژیگالینا ئەو بەشانەی نووسی کە پەیوەندییان بە دۆزی کوردەوە هەبوو لە ئێران لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە تا هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو. لە



ساڵی ١٩٨٨ کتێبی (بزووتنەوەی نیشتمانی کورد لە ئێران ١٩١٨–١٩٤٧)ی بڵاو کردەوە. ئەمە یەکەمین لێکۆڵینەوەی زانستیی هەمە لایەنە بوو لە کوردناسی سۆڤیەتیدا، کە باسی لە سەرهەڵدان، پەرەسەندنی بزووتنەوەی نیشتمانی کورد لە ئێران دەکرد لە بیستەکان و چلەکانی سەدەی ڕابردوودا.

لەم کتێبەدا لە تەك لێکدانەوە مێژووییە سیاسییەکەدا لایەنە دیموگرافی، کلتووری و ئابوورییەکانیش تیشکیان خراوەتە سەر. ئەم توێژینەوەیە لەسەر بنەما و لەبەر ڕۆشنایی ئەرشیفەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئیمپراتۆری ڕووسیا نووسراوە، بە تایبەتی فۆندەکانی نیشتمانی هیندی و فۆندی کوردناسی ڕووس ڤیلچێڤسکی و مەتریاڵەکانی ئەرشیفی ڕۆژهەڵاتناسی ئینستیتوتی دەستنووسە دێرینەکان لە سان پیتەربۆرگ.

لە ساڵی ١٩٩٠ کتێبی (بەریتانیای مەزن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەنالیزی کۆنسیپتەکانی سیاسەتی دەرەوە). ئەم کتێبە لە بنەمادا تێزی دکتۆراکەی بوو، بەڵام کارێکی زۆری لەسەر کردو، ئەوجا بڵاوی کردەوە. لەم کتێبەدا ئەنالیزی مێژوونووسی ئینگلیزی لە بارەی ڕۆژهەڵاتەوە (بە تایبەتی ئێران و ئەفغانستانەوە) کردووە و بەرهەمە سەرەکییەکانی پسپۆرانی بەریتانی خستۆتە بەرتیشکی لێکۆڵینەوە.

لە ساڵی ١٩٩٦ بەرگری لە تێزی دکتۆرای ناووکەکەی کرد کە بە ناونیشانی ((پرۆسە ئیتنۆ– کۆمەڵایەتییەکان لە ئێران لە سەدەکانی ١٩ و ٢٠)) بوو. بنەمای سەرەکی ئەم تێزە کتێبی ((پێشڤەچوونی ئیتنۆسۆسیالی کۆمەڵگەی ئێرانی)) بوو کە لە ساڵی ١٩٩٦ دا بڵاوی کردەوە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا ژیگالینا سیستەمی فیدیرالی بە باشترین چارەسەری دادەنێت بۆ دامەزراندنەوەی دەوڵەتی ئێران،

بەڵام سیستەمی دینی– مەزهەبی بە کۆسپی گەورە دەبینێ لەبەردەم ئەم چارەسەرییەدا و ئێران بە کۆمەڵگەیەکی پڕ لە ناکۆکی و ئاڵۆزی ئەتنیکی، نەتەوەیی و مەزهەبیی پێناسە دەکات.

لە ساڵی ٢٠٠٢ کتێبی (خاننشینە کوردییەکانی خوراسان لەسەردەمی دوا قاجارەکاندا)) بڵاودەکاتەوە. ڕەنگبێ ئەمە تەنها لێکۆڵینەوە بێت لە دونیای کوردناسی لە بارەی خاننشینەکانی کوردەوە لە خوراسان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و دەسپێکی سەدەی بیستەم. لەم لێکۆڵینەوەدا ژێگالینا پێگەی خانەکانی کوردی لە خوراسان لە ململانێی نێوان ئینگلیز و ڕووسەکان خستۆتەڕوو لە بەر ڕۆشنایی بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیای تزاری، هەروەها بەشداری کوردی خوراسان لە سەرهەڵدان و ڕاپەڕینەکاندا لە دژی دەسەڵاتی ناوەندی و لەنێوچوونی خاننشینەکانی کورد لەو دەڤەرە لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوو.

لە ساڵی ٢٠٠٨ و لەبەر ڕۆشنایی مەتریاڵەکانی ئەرشیفی ڕووسی، کتێبێکی لە بارەی کرماشانەوە نووسی، کە یەکێ لە گرنگترین دەڤەرەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە. لەم کتێبەدا پێگەی کرماشانی لە ململانێی زلهێز و دەوڵەتە هەرێمایەتییەکاندا پیشانداوە.

لە ساڵی ٢٠١١ دەزگای چاپی ئەڵمانی Lambert Academic Publishing کتێبی ((دۆزی کورد لە سیاسەتی ئێرانی هاوچەرخدا، کێشەی چارەسەرکردنی بەریەککەوتنی ئیتنۆ–سیاسی کوردی لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا) بۆ ژێگالینا بە زمانی ڕووسی بڵاوکردەوە. ئەم بەرهەمە تایبەتە بە سیاسەتی ئێران بەرامبەر کوردی ئەو وڵاتە دوای ڕژێمی شاهنشایەتی ١٩٧٩ تاوەکو ساڵی ٢٠١٠، لە هەردوو ئاستی سیاسەتی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی. لەم کتێبەدا تایبەتمەندییەکانی بزووتنەوەی کوردی لە سەردەمی شۆڕشی ئێراندا ١٩٧٨–١٩٧٩ خراونەتەڕوو، ئەنالیزی سیاسەتەکانی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی کۆماری ئیسلامی ئێرانی لە کوردستان و لەبەرامبەر کورد کردووە. ئەوەش خراوەتە ڕوو کە چارەسەری دۆزی کورد لەو وڵاتە لە ڕێگەی هێزەوە هیچ ئاسۆیەکی نییە و تەنها ڕێگەی

وتووێژە لەگەڵ نوێنەرانی کورد و ڕێگەدان بە بەشداری چالاکانەی کورد لە ژیانی سیاسی و بەڕێوەبەرایەتی ئێراندا دەتوانی ئەم پرسە چارەسەر بکات. ژیگالینا پێ لەسەر یەکڕیزی هێزە کوردستانییەکان دادەگرێ، کە بەزامنی وەدەستهێنانی مافەکانی کوردی دادەنێ. ئەمەش بە یەکێك لە بەرهەمە زانستییە کەمەکان لە بارەی کوردی ئێران لە دوای شۆڕشی گەلانی ئێرانەوە دەژمێردرێ و ڕەنگبێ بۆ ڕووسیا کارێکی تاقانە بێت لەم بوارەدا. دوا بەرهەمی ژیگالینا کتێبی: (مەلا مستەفای بارزانی: پۆرترێتی مێژوویی لە ساڵی ٢٠١٣ لە ٢٣٨ لاپەڕەدا بڵاوکراوەتەوە. بە پێی سەرچاوەکان زیاتر لە ٢٠٠ لێکۆڵینەوەی پێشکەش کردووە بە وتار و باسەکانەوە ژمارەیان دەگاتە ٥٠٠. دوا وتاری لە سەر سایتی " New Eastern Outlook " لە ڕێککەوتی ٢٠١٣/١٠/٢١ بڵاوکراوەتەوە، واتە دوو ڕۆژ پێش مردنی.

لە تەك ئەمانەدا لە بواری سەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی کارە زانستییەکاندا چالاکانە بەشداری دەکرد. بە دەستپێشخەری ئەو ساڵانە کۆنفرانسی تایبەت لە ژێر ناوی ((خوێندنەوە لازارێفییەکان))، مێزگردی گفتوگۆ و کۆبوونەوەی زانستی لە بەشەکەدا ڕێکدەخران، کە پرسە گرنگەکانی کوردناسی تیایاندا تاوتوێ دەکران.

هەروەها کاری ڕیداکتەری (کۆمەڵە وتار، کتێبە هاوبەشەکان)ی دەگرتە ئەستۆی خۆی، بە تایبەتی ئەوانەی کە لە لایەن بەشی کوردناسییەوە ئامادە دەکران.

ئەندامی ئەنجوومەنی زانستی ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیای زانستی ڕووسیا بوو، هەروەها ئەندامی ئەنجوومەنی تێزەکانی دکتۆرا بوو لە بواری مێژووی نوێ و هاوچەرخدا لە زانکۆی دەوڵەتی مۆسکۆ بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان. سێ قوتابی دکتۆرا بە سەرپەرشتی ئەو تێزی دکتۆرایان ئامادە کرد. ژیگالینا تا دوا ڕۆژی لە ژیانی داهێنانی زانستی و مامۆستایی بەردەوام بوو و لە شوێنی کارەکەی گیانی سپارد.

بەشداری کۆنفرانس و سیمپۆزیۆمە ناوخۆیی و نێودەڵەتییەکانی کرد. لە ساڵی ١٩٩٦ وتاری پێشکەشی کۆنفرانسی (کورد و شار) لە پاریس کرد، لە ساڵی

٢٠٠٨ لـە کۆنفرانسـی (شـاری ڕۆژهـەڵاتی) لـە کراکـۆف بەشـداری کـرد. ئەنـدامی کۆمەڵـەی ئێرانیسـتانی ئـەورووپا بـوو و بەشـداری لـە کۆنفرانسـەکانیدا دەکـرد. وتارەکەی لە بارەی کوردەکانی خوراسانەوە لە گۆڤـاری ئـەو کۆمەڵەیـە لـە سـاڵی ٢٠٠٣ بڵاوکرایەوە.

لە کۆبوونـەوەکانی دەسـتەی دامەزرێنـەری ئینسـایکلۆپیدیای کوردسـتان لـە برۆکسل لە سـاڵانی ١٩٩٥ و ١٩٩٦ بەشـداری کـرد و ئامـادەیی خـۆی دەربـڕی بـۆ نووسین و هاوکاریکردنی ئەم پڕۆژە زانستییە.

## بیبلیۆگرافیای هەندێ لە بەرهەمەکانی پرۆفیسۆر ئۆلگا ئیڤانەڤنا ژیگالینا:

١. بلارامبێـرگ، یادداشـتەکان، ئـۆ. ئـی. ژیگالینـا و یێ. ف. شمیـدت لـە ئەڵمانییـەوە کردوویانە بە ڕووسی، خالفین پێشەکی بۆ نووسیوە، مۆسکۆ ١٩٧٨.

١. لـە بـارەی پرسـی خـەباتی کـوردەوە لـە پێنـاو ئۆتۆنـۆمی نەتـەوەیی لـە سـەردەمی شۆڕشـی ئێرانـدا ١٩٧٨ – ١٩٧٩. لـە " ب. ت. ئـی. ڕ. ئـە. ز. یـە. س" ژمـارە ٥ (٢١٢)، مۆسکۆ ١٩٨٠.

٢. لەگەڵ نووسەرانی دیدا، باری ئێستای دۆزی کورد، ئەو بەشەی تایبەت بـوو بـە دۆزی کورد لە ئێران ژیگالینا نووسیویەتی، لە " ب. ت. ئی. ڕ. ئە. ز. یـە. س"، ژمـارە ٢ (٢١٥)، مۆسکۆ ١٩٨١.

٣. هەندێ سەنتەری کوردۆلۆژی بیانی، لە " ب. ت. ئی. ڕ. ئـە. ز.یـە. س "، ژمـارە ٢ (٢١٥)، مۆسکۆ ١٩٨١.

٤. ڕۆڵی ئیسلام لە پەرەسەندنی ئیدیۆلۆژی بزووتنەوەی نەتەوەیی کـورد لـە ئێـران، لـە کتێبی " ئیسلام لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست"، مۆسکۆ ١٩٨٢.

٥. هەڵوێستی کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە مەڕ دۆزی کورد، لە " ئیسـلامی هاوچـەرخ: کێشـەکانی سیاسـەت و ئیـدیۆلۆژیا" کۆمەڵـە بەرهـەمێکی هاوبەشـی پرۆگرامـەکانی ناوەنـدە زانسـتییەکانە لـە بـارەی کێشـە گەرمـەکانی ئیسلامناسـی

هاوچەرخەوە لە ساڵانی ١٩٨٠ – ١٩٨٢، لە بڵاوکراوەکانی ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسی بە سەرپەرشتی یڤگێنی پریماکۆف، مۆسکۆ ١٩٨٢.

٦. ئۆلێگ لودڤیگۆڤیچ ڤیلچێڤسکی و کوردناسی، لە کتێبی " ئێران"، مۆسکۆ ١٩٨٣.

٧. بارودۆخی کوردستانی ئێران، " ب. ت. ئی. ڕ. ئە. ز. یە. س"، ژمارە ١ (٢٢٣)، مۆسکۆ ١٩٨٣.

٨. بارودۆخی سیاسی لە کوردستانی ئێران، " ب. ت. ئی. ڕ. ئە. ز. یە. س"، ژمارە ١ (٢٢٩)، مۆسکۆ ١٩٨٤.

٩. لە بارەی دۆزی کوردەوە لە ئێران، " ب. ت. ئی. ڕ. ئە. ز. یە. س "، ژمارە ١(٢١٩)، مۆسکۆ ١٩٨٥.

١٠. تایبەتمەندی و خەسڵەتەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی کورد لە ئێران لە شەستەکان و حەفتاکان، لە کۆبەرهەمی " کوردناسی"، یەریڤان ١٩٨٥.

١١. پەرەسەندنی باری ئاڵۆز و بەریەککەوتن لە کوردستانی ئێران، لە " ب. ت. ئی. ڕ. ئە. ز. یە. س" ژمارە ٢ (٢٣٥) مۆسکۆ ١٩٨٥.

١٢. بارودۆخی کوردستانی ئێران، " ب. ت. ئی. ڕ. ئە. ز. یە. س"، ژمارە ٢٤٢، مۆسکۆ ١٩٨٦.

١٣. سیاسەتی نەتەوەیی و ئایینی کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە کوردستانی ئێران، لە کۆبەرهەمی " ئیسلام و کێشەکانی ناسیۆنالیزم لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست"، مۆسکۆ ١٩٨٦.

١٤. کورد و کوردستان، " ب. ت. ئی. ڕ. ئە. ز. یە. س"، ژمارە ٦، مۆسکۆ ١٩٨٦.

١٥. لەگەڵ کوردناسانی دیدا، بزووتنەوەی کورد لە سەردەمی نوێ و هاوچەرخدا، مۆسکۆ ١٩٨٧. (هەموو ئەو بەشانەی لە بارەی کوردی ئێرانەوەن ژیگالینا نووسیونی).

١٦. لە بارەی پرسی هاوپەیمانانی کوردەوە لە خەبات لە پێناو ئۆتۆنۆمیدا، " ب. ت. ئی. ڕ. ئە. ز. یە. س"، ژمارە ١، مۆسکۆ ١٩٨٨.

١٧. هەندێ لایەنی بزووتنەوەی کوردی لە کۆماری ئیسلامی ئێران، " ب. ت. ئی. ڕ. ئە. ز. یە. س"، ژمارە ٢٥٤، مۆسکۆ ١٩٨٨.

١٨. بزووتنـــەوەی نەتـــەوەیی کـــورد لـــە ئێـــران ١٩١٨ – ١٩٤٧، مۆســـکۆ ١٩٨٨. (١٦٧ لاپەڕە)

١٩. ڕەزامەندی ئێران بە بڕیـاری ٥٩٨ ئەنجومـەنی ئاسایشـی نەتـەوە یـەکگرتووەکان – هەڵوێستی کوردان لە مەڕ شەڕ و ئاشتی، " ب. ت. ئـی. ڕ. ئـە. ز. یـە. س"، ژمـارە ٦، مۆسکۆ ١٩٨٩.

٢٠. بارودۆخی ئێستای کـوردی ئێـران لـە دیـدی مێژوونووسـیی ڕۆژئاواییـیـەوە، کۆمەڵـە بەرهەمی مێژوونووسیی ئێران، مۆسکۆ ١٩٨٩ .

٢١. بریتانیای مەزن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە سەدەکانی نۆزدە و دەسـپێکی بیسـتدا، لێکدانەوەی کۆنسێپتەکانی سیاسەتی دەرەوە، مۆسکۆ ١٩٩٠.

٢٢. لە بارەی ڕەوشی کوردستانی ئێرانەوە، کۆمەڵە بەرهەمی " ڕۆژهەڵات و سەردەم"، مۆسکۆ ١٩٩٠.

٢٣. هەندێ لە خەسـڵەت و تایبەتمەندییـەکانی پرۆسـەی ئیتنـۆ– ئـایینی لـە ئێـران، لـە کۆمەڵە بەرهەمی " ئیسلام و بونیاد و پەیکەرە کۆمەڵایەتییەکان"، مۆسکۆ ١٩٩٠.

٢٤. پارتە سیاسی و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی کورد لە ئێران، " ب. ت. ئـی. ڕ. ئـە. ز. یە. س"، ژمارە ٦، مۆسکۆ ١٩٩٠.

٢٥. پێشڤەچـوونە ئیتنـۆ – کۆمەڵایەتییـەکان لـە کۆمەڵگـەی ئێرانیـدا، مۆسـکۆ ١٩٩٦. (٢٦١ لاپەڕە).

٢٦. خاننشینەکانی کوردی خوراسان لـە سـەردەمی دوا قاجارەکانـدا، کۆتـایی سـەدەی نۆزدەهەم و دەسپێکی سەدەی بیستەم، مۆسکۆ ٢٠٠٢. (٢٤٥ لاپەڕە)

٢٧. کوردانی ئۆستانی کرماشان لـە سـەرلەئێوارە و سـاڵانی شـەڕی یەکـەمی جیهانیـدا، مۆسکۆ ٢٠٠٨.

٢٨. دۆزی کـــورد لـــە سیاســـەتی ئێرانـــی هاوچـــەرخدا، کێشـــەی چارەســـەرکردنی بەریەککەوتنی ئیتنۆ – سیاسی کورد لە کۆماری ئیسلامی ئێران، ٢٠١١ بە ڕووسی لە ٤٠٠ لاپەڕەدا، Lambert Academic Publishing.

٢٩. کوردەکانی ڕۆژئاوای ئاسیا، سەدەی بیسـت– دەسـتپێکی سـەدەی بیسـت و یـەك، کێشەی بڕیاری چارەنووسی کورد، کۆمەڵە وتار، مۆسکۆ ٢٠١٢، (٣٧٦) لاپەڕە.

30. Constitutional Revolution in Kurdish Northern Khorasan, in European Iranists Congress vol.3 , Paris 2003.

٣١. مەلا مستەفای بارزانی: پۆرترێتی مێژوویی، مۆسکۆ ٢٠١٣.

## سەرچاوەکان

١. د. جەبار قادر، کوردناسی ڕووس خاتوو ژیگالینا، گۆڤاری دلانپاڕ، ژمارە (١) خولی پێنجەم، هێلسنکی ١٩٩٥/٣/٢٥.

٢. کۆمەڵێ وتاری ژیگالینا: لە سایتی New Eastern Outlook (شەش وتار بە ئینگلیزی).

٣. نۆدار مۆساکی، کوردۆلۆگ ئۆلگا ژیگالینا، سایتی www.Kurdishcenter.ru. کە بۆ خۆی لە ئینستیتوتی ڕۆژهەلاتناسی و بەشی کوردی توێژەری زانستی پێشکەوتووە.

٤. نووسینەکانی ژیگالینا لە سەر تۆڕی ئینتەرنێت و کتێبە سەرەکییەکانی کە دەستمان پێیان گەیشتووە.

# سیستەمی ڕاناو
# لە بکەرنادیاری کرمانجیی ژووروودا

**پرۆفیسۆر د. وریا عومەر ئەمین**
**ئەکادیمیای کوردی**

لە کرمانجیی ژووروودا دوو دەستە ڕاناوی جودا و یەك دەستە ڕاناوی لکاو (ڕ.ل) هەیە کە لەم نەخشەیەدا خراوەتە ڕوو:

| ژمارە | کەس | ڕاناوی جودا A | ڕاناوی جودا B | ڕاناوی لکاو |
|---|---|---|---|---|
| تاك | ١ | من | ئەز | م |
| | ٢ | تە | تو | ی |
| | ٣ | وی/ویێ | ئەو | ×/ ت: ـەت[1] |
| کۆ | ١ | مە | ئەم | ین |
| | ٢ | وە | هوون | ن |
| | ٣ | وان | ئەوان | ن |

ڕاناوە جوداکان ئەرکی بکەری و بەرکاری دەبینن بە پێی ئەم خشتەیە:

| ئەرك | کاتی کار ڕابردوو | کاتی کار داهاتوو |
|---|---|---|
| بکەر | **A** | **B** |
| بەرکار | **B** | **A** |

ا – کار هەمیشە لەگەڵ دەستەی B دا لەکەس و ژمارەدا ڕێك دەکەوێ. واتا لە داهاتوودا لەگەڵ بکەر و لە ڕابردوودا لەگەڵ بکەردا. ئەمە بە سیستەمی ئێرگەتیڤی ناو دەبرێ.(٢)

ب – ڕاناوی کەسی ٣ت بۆ ڕابردوو هیچ فۆڕمێکی نییە (مۆڕفیمی سیفرە)و لە داهاتوودا بە (ت و ـەت ) دەردەکەوێ.

**ئەز وە دبین ـ م** (داهاتوو ـ کار لەگەڵ بکەردا ڕێککەوتووە)
بکەر بەرکار کار ڕ.ل
B A

**من هوون دیت ـ ن** (ڕابردوو ـ کار لەگەڵ بەرکاردا ڕێککەوتووە)
بکەر بەرکار کار – ڕ.ل
A B

**بۆ گوێزانەوەی ڕستە لە بکەردیارەوە بۆ نادیار:**

١ – بکەر و ڕاناوی لکاوی بکەری لادەبرێ.

٢ – بەرکار جێی بکەر دەگرێ. لەبەر ئەوەی زمانی کوردی سەر بە تایپی SOV یە لەشوێنی خۆی دەمینێتەوە.

٣ – ئەگەر کاتی کارەکە داهاتوو بێت ، ڕاناوی بەرکاری لە دەستەی A یەوە دەبێ، بکرێ بە بکەر نادیار ، بە ڕاناوی بەرانبەری لە دەستەی B جێگیر دەکرێ و بەم جۆرە:(٣)

| A | | B |
|---|---|---|
| من | دەبێتە | ئەز |
| تە | | تو |
| وی/ وێ | | ئەو |
| مە | | ئەم |

| هوون | | وە |
|---|---|---|
| ئەوان | | وان |

٤ – چاوگی کاری ڕستەکە وەردەگیرێ.

٥ – ( هات – ـە) دەخرێتە پێش کارە بە چاوگکراوەکە.

٦ – کاتی کاری ڕستەکە دەکرێتە بەرکاری ( هات).

٧ – بە پێی کەس و ژمارەی بکەرە تازەکە (بەرکارە بە بکەربووەکە) ڕاناوێکی لکاو دەخرێتە سەر کاری (هات).

لە ڕستەی :

**هوون مە دناسن.**

**هوون:** بکەرە سەر بە کۆمەڵی B یە.

**مە :** بەرکارە سەر بە کۆمەڵی A یە.

**د :** نیشانەی ئەسپێکتە.

**ناس :** کارە کاتەکەی داهاتووە.

**ن :** ڕاناوی لکاوی ڕێکەوتنە لەگەڵ بکەردا.

**کە دەگوێزرێتە نادیاری:**

١ – بکەر (هوون) کە سەر بە دەستەی B یە و ڕاناوی ڕێکەوتنی بکەری (ن) لادەبرێن .

**(X) مە دناس ـ X**

٢ – بەرکار جێی بکەر دەگرێ.

٣ – بەرکار لە دەستەی A یە ، بە ڕاناوی بەرانبەری لە دەستەی B جێگیر دەکرێ.(مە) دەبێتە (ئەم):

**ئەم دناسـ ـ**

٣ – چاوگی کاری ڕستەکە وەردەگیرێ . لێرە ( ناسین) ـە.

**ئەم (ناسین)**

٤ – (هات ـ ـە) دەخرێتە پێش کارە بە چاوگبووەکە.

**ئەم (هات ـ ـە) (ناسین)**

٥ – کاتی کاری ڕستەکە دەکرێتە بەرکاری ( هات). لێرە کاتەکە داهاتووە (هات) دەبێتە (دهێـ )

**ئەم ( دهێـ ـ ـە ) (ناسین)**

٦ – بە پێی کەس و ژمارەی بکەرە تازەکە (بەرکارە بە بکەربووەکە) ڕاناوێکی لکاو دەخرێتە سەر کاری (دهێـ ). لەم ڕستەیەدا ، بەرکارە بە بکەربووەکە (ئەم) لە کەسی یەکەمی کۆدایە. ڕاناوی لکاوی کەسی یەکەمی کۆ (ین) ـە. دەچێتە سەر (دهێـ ):

**ئەم (دهێـ (ین) ـ ـە) (ناسین)**

ڕستەکە لە ئەنجاما دەبێتە:

**ئەم دهێینە ناسین.**

لە ڕستەی :

**وێ ئەز دیتم.**

**وێ** : بکەرە سەر بە کۆمەڵی A یە.

**ئەز** : بەرکارە سەر بە کۆمەڵی B یە.

**دیت** – کارە کاتەکەی ڕابردووە.

**م** : ڕاناوی لکاوی ڕێکەوتنە لەگەڵ بەرکاردا.

**کە دەگوێزرێتە نادیاری:**

١ – بکەر (وێ) لادەبرێ . راناوی لکاوی بکەریی ڕێکەوتنی نییە تا لابرێ.

**(X) ئەز دیتـ ـ م**

٢ – بەرکار جێی بکەر دەگرێ.

**ئەز دیتـ ـ م**

٣ – بەرکار لە دەستەی B یەوەیە ، وەك خۆی دەمینێ.

٣ – چاوگی کاری ڕستەکە وەردەگیرێ . لێرە ( دیتن) ـە.

**ئەز (دیتن) ـ م**

٤ – (هات ـ ـە) دەخرێتە پێش کارە بە چاوگبووەکە.

**ئەز (هات ـ ـە) (دیتن) ـ م**

٥ – کاتی کاری ڕستەکە دەکرێتە بەر کاری ( هات).لێرە کاتەکە ڕابردووە (هات) وەك خۆی دەمینێتەوە.

٦ – بە پێی کەس و ژمارەی بکەرە تازەکە (بەرکارە بە بکەربووەکە) ڕاناوێکی لکاو دەخرێتە سەر کاری (هات). لەم ڕستەیەدا ڕێکەوتن لەنێوان بەرکار و کاردا بوو بۆیە هەر ڕاناوە لکاوەکە خۆی دەچێتە سەر ڕەگی (هات).

**ئەز (هات ـ (م) ـ ـە) (دیتن) ـ**

ڕستەکە لە ئەنجاما دەبێتە:

**ئەز هاتمە دیتن.**

## پەراوێزەکان

١ – لەگەڵ کاتی ڕابردوودا کەسی سێیەمی تاك قاڵبی بینراوی نییە.(X) نیشانەیە بۆ نەبوونی شێوە (مۆڕفیمی سیفر).

٢ – یەکەم جار ئەم دیاردەیەی ڕێزمانی کوردی و دەرخستنی ئەوە کە کرمانجیی ژووروو سەر بە سیستەمی ئێرگەتیڤیە لە ساڵی ١٩٧٩ بوو . سەیری ئەم سەرچاوەیە بکەن (ل ١٣٥ – ١٣٩)

**Amin, W.O**.(1979) Aspects of the verbal construction in Kurdish. London University. 2nd .Reprinted by Kurdish Academy 2011.

٣ – سەیری ئەم سەرچاوەیە بکەن:

**وریا عومەر ئەمین** (١٩٨٨) گۆڕانی ڕاناو لە بکەرنادیاری کرمانجیی ژووروو. ڕۆژنامەی هاوکاری ژ ١٠٣٢ ی ١٩٨٨/١/٥.

## سەرچاوەکان

**Amin, W.O**.(1979) Aspects of the verbal construction in Kurdish. London University. 2nd publication by Kurdish Academy 2011.Publishing series No.114.

**Bakaev, Ch**.(1973) yazik Kurdov. SSR. Moscow.

**Kurdoev, K**.(1978) Gramatika Kurdiskava yazika. Moscow.

**Mackenzie, D.**(1961) Kurdish Dialect Studies – I. London

**وریا عومەر ئەمین** (١٩٨٨) گۆڕانی ڕاناو لە بکەرنادیاری کرمانجیی ژووروو. ڕۆژنامەی **هاوکاری** ژ ١٠٣٢ ی ١٩٨٨/١/٥.

__________( ١٩٨٩) ڕاناو لە بکەر نادیاری کرمانجیی ژووروو. ڕۆژنامەی **هاوکاری** ژ ١٠٤٦ی ١٩٨٩/١/٣٠.

__________(١٩٩٠) ڕێزمانی ڕاناو لە کرمانجیی ژووروودا. گ. کۆڕی زانیاریی عیراق – دەستەی کورد. ژ٢١ ل ٢٥٢ – ٢٦٢.

__________(١٩٩١) ڕاناوی بەرکاری لە بکەر نادیاردا. ڕۆژنامەی العراق ژ ٤٦٤٧ ی ١٩٩١/٤/٣٠.

## ملخص البحث

### نظام الضمير في جملة المبني للمجهول في الكردية الشمالية

**الأستاذ الدكتور وريا عمر أمين**

**الأكاديمية الكردية**

اللغة الكردية الشمالية تابعة للنظام الاركتيفيتي . حيث يتوافق فيها الفعل مع المفعول به في الزمن الماضي. فيها مجموعتان من الضمائر المنفصلة . وهما مجموعة A (**من – ته – وى / وێ – مه – وه – وان**) ومجموعة B (**ئەز – تو – ئەو – ئەم – هوون – ئەوان**) ومجموعة واحدة من الضمائر المتصلة وهي ( **م – ى – ت / ەت – ين – ن – ن**). يتفق الفعل مع مجموعة **B** سواء ظهرت كفاعل أو مفعول. وظائف الضمائر المنفصلة موضحة في هذا الجدول:

| الدور | زمن الفعل | |
|---|---|---|
| | ماضي | مضارع |
| فاعل | A | B |
| مفعول | B | A |

عند تحويل جملة المبني للمعلوم إلى مبني للمجهول يحدث تبادل بين الضمائر المنفصلة بقواعد معقدة ومنظمة. هذا البحث محاولة لتحديد تلك النظم.

## Abstract

## The System of the pronouns in the passive of Northern Kurdish



***Professor Dr. Waria Omar Amin***
***Kurdish Academy***



Northern Kurdish belongs to the Ergative system of languages, In which the verb agrees with the object NP in number and person in the past tense. Two sets of the independent personal pronouns are recognized Set (A) **(min – te – wi:/ we – me – we - wan)** and set (B) **(ez – tu – ew – em – hu:n – ewa:n)** and one set of personal suffixes **(m – i: - t/et - i:n – n – n )**.The task of the personal suffixes is to express the agreement between the subject and object NPs with the verb. The verb always agrees with the set **(B)** whether it occures as a subject or as an object.

The functions of the independent pronouns are shown in the following table:

| Function | Tense | |
|---|---|---|
| | Past | Present |
| Subject | A | B |
| Object | B | A |

In transferring an active sentence, in which the subject and the object are expressed in independent pronouns, to passive, the pronouns exchange their sets by complex grammatical rules.

This paper is an attempt to show this linguistic phenomena that occurs in northern Kurdish and specify the rules that perform this aspect.

# ئەدەب و پڕاگماتیکی فراوان[1]
# (ماکرۆ پڕاگماتیک)

**پ .ی.د سەباح ڕەشید قادر**
**زانکۆی ڕاپەڕین**

**م.ی.بێری یاسین حسێن**
**کۆلیژی پ .بنەڕەت – ز.سەلاحەددین**

**١- پێشەکی:**

ناونیشانی ئـەم لێکۆڵینەوەیـە (ئـەدەب و پڕاگمـاتیکی فـراوان)ە، کـە بەرانبـەر زاراوەی ماکرۆ پڕاگماتیك دەوەستێ، بواری لێکۆڵینەوەکە سـەرووی پڕاگماتیکـە و هەوڵی ئـەوە دەدات سـنووری پڕاگماتیـك فـراوان بکـات بـۆ هـەموو ئـەو ئاسـت و بوارانەی کە پڕاگماتیك دەتوانێت چالاکییەکانی خۆی تێدا کارا بکات، وەکو بـواری ئەدەب و کەلتوور و هەموو بوارەکانی تری زمان. لە مـاکرۆ پڕاگماتیکدا چـاوەڕێی ئەوە ناکرێت بنەماکانی پڕاگماتیك ڕاستەوخۆ جێبەجێ بکرێـت، بـەڵکو پـەنجـە بـۆ ئـەو وردەکارییانـە رادەکێشـێ، کـە لـە بـواری دەرەوەی زمـان، سـەرووی زمـان و سەرووی پڕاگماتیك شیکردنەوە و لێکدانەوەی بۆ دەکرێت، دەکرێ بـوترێ هـەموو داڕشتنێکی تیۆری لەبارەی پڕاگماتیکەوە بـە مێتاپڕاگماتیـك دادەنـرێ، پەڕینـەوە بـۆ بـواری دەسـتەبەرکردنی ئـەدەب و کـەلتوور لـە بـواری پڕاگماتیـك بـە ماکرۆپڕاگماتیك ناودەبرێت، بەڵام شیکردنەوەی ئێمە دەچێتە ئاستی مێتـا ماکرۆـ پڕاگماتیکەوە. واتە هەردوو لایەنەکە بە خۆوە دەگرێت.

لێکۆڵینەوەکە دەکەوێتـە سـنووری شـیکردنەوەیەکی تیـۆری بـۆ ئاسـتی دەق و جۆرەکـانی چوارچێوە(سـیاق) و ئـەدەب و لـە چوارچـێوەی بەرهەمـە ئـەدەبی و کەلتوورییەکانی کرمانجیی ناوەڕاست. سنووری لێکۆڵینەوەکەش بە شـیکردنەوەی تیۆریی ئەو بوارانـە سـنووردار دەکـرێ. ئـەم لێکۆڵینەوەیـە دوای ئـەم پێشـەکییە بەسەر دوو بەشی سەرەکی دابەش دەبێ، بەشی یەکەم بریتییـە لـە شـیکردنەوەی پەیوەندی و کەرەسەکانی نێوان زمان و پەیوەندیکردن، بەشی دووەم پەیوەندی

ئـەدەب و پراگماتیـك شـی دەكاتـەوە. كورتـەی زمـانی عـەرەبی و ئینگلیـزی و ڕیزكردنی سەرچاوەكان كۆتایی لێكۆڵینەوەكەیە.

**١-١. بەشی یەكەم – زمان و پەیوەندیكردن:**

زمان گوزارشتێكە دەربارەی توانا هۆشـەكییەكانی تـاك بـۆ پەیوەنـدیكردن و هەڵسوكەوتكردن لەگەڵ دەوروبەر و كۆمەڵگادا، هۆكارێكـە تـاك بـەكاری دێنـێ بـۆ دابینكردنی پێداویستییەكانی و جێبەجێكردنی داواكارییەكانی لە كۆمـەڵگادا، هـەر بـەهۆی زمانیشــەوە گفتوگـۆ لـەبارەی كارەكـانی دەكـات و بـەكاری دێنــێ بــۆ شـیكردنەوە و ڕوونكردنـەوەی بیرەكـانی و گەشـەپێدانی ڕۆشـنبیری و زیـادبوونی شـارەزایی لـە ڕێگـەی كـارلێككردنی لەگـەڵ ئـەو دەوروبـەرەی تیایـدا دەژی، بەواتایەكی سادەتر، (زمان بۆ پەیوەندیكردنە لەگەڵ دەوروبەردا). بێگومان جگـە لە زمان مرۆڤ ڕێگەی تریشی دۆزیوەتەوە بۆ دابینكردنی ئەم پەیوەندییـە هەنـدێك لەم ڕێگایانە لەگەڵ زمانەكەی خۆیدا بەكاری دێنێ "وەك بزاوتنی دەست و دەم و برۆ..." هەندێكی تریان بەتەنیا خۆیان بـەبێ زمـان بـەكاردێن بـۆ پەیوەنـدیكردن، وەك گڵۆپی هاتوچۆی ناو شارەكان (محمد معروف ٢٣:٢٠١١).

"ساپیر" زمان بەوە پێناسە دەكات كە، (هۆكارێكی خۆویستە تاك لـە ڕێگـەی سیسـتەمێكی هێماییـیـەوە بـەكاری دێنـێ، بـۆ گەیانـدنی بیرەكـان و هەڵچـوون و ئارەزووەكـانی (سـلیم حمـدان ١٣:٢٠٠٩)، زمـان لـەپاڵ بـەجێهێنانی ناسـنامەی كۆمەڵایەتی ئـەركی پەیوەنـدیكردن و گەیانـدنیش بـەجێ دێنـێ، زمـان هۆكـارێكی بیری و ئامرازێكی تێگەیشتنی جیهانی و بنچینەی هەموو چالاكییەكی ڕۆشنبیرییە.

ئەدەب نموونـەی ئـەم جـۆرەی بـەكارهێنانی زمانـە كـە لـە ڕێگەیـەوە نووسـەر پەیامێك دەگەیەنێت بە كەسانی تر و كار لە بیركردنەوە و هەستەكانیان دەكـات، ساپیر دەڵێ (زمـان هۆكـار و مـاددەی ئەدەبـە وەك چـۆن برۆنـز و مەڕمـەڕ و قـوڕ ماددەی پەیكەرتاشن. (ادوارد ساپیر٣٠:١٩٩٣)، هـەروەها فـالیری دەڵـێ (ئـەدەب تەنها فراوانكردنـی هەنـدێ تایبەتمەنـدیی زمـان و بەكارهێنانییـەتی (ادوارد سـاپیر ٤١:١٩٩٣ ).

هەر پێناسەیەك بۆ زمان بكرێ، دەبێ ئەركی پەیوەندیكردن لە سەرووی ئەركەكانی ترەوەی بێت، بوونی ئەم ئەركەش لە هەموو بەكارهێنانەكانی زماندا هەستی پێدەكرێ، تەنانەت كە تاكە كەسێكیش لەگەڵ خودی خۆی دەدوێ.

بەكارهێنانی پێكهاتە زمانییە جیاجیاكان بەستراوەتەوە بە ئەركی زمان و پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانەوە كە ئەمەش لە توانستی كۆمەڵایەتیدا هەستی پێ دەكرێ، كە لەم گوتنانەدا دەردەكەوێ، كێ قسە دەكات؟ لەگەڵ كێ قسە دەكات؟ كەی؟ لە كوێ؟ ڕۆڵی قسەپێكەرانی زمانەكە چییە؟ بۆ چ مەبەستێك قسە دەكەن؟ پلە و پایەی كۆمەڵایەتی، زانیاریی هاوبەش ....، ئەو چەمكانە ئەوە دەردەخەن كە چەند یاسای كۆمەڵایەتی هەیە لەپاڵ یاسا زمانییەكان كە بڕیار لەسەر بەكارهێنانی زمان دەدەن لە هەڵوێستە جیاجیاكاندا.

"سۆسێر" لەو زمانەوانانەیە كە پێی وایە ئەركی زمان پەیوەندیكردنە، بەو شێوەیە پێناسەی زمان دەكات ( زمان بریتییە لە سیستەمێكی دیاریكراو لە ئاماژەكان كە سروشتێكی كۆمەڵایەتی هەیە و بەكاردێت بۆ گواستنەوەی پەیامە مرۆڤایەتییەكان (منذر عیاشي ٢٠٠٢:٥٥).

ئەگەر سەیری كردەی پەیوەندیكردن بكەین لەنێوان زمان لەلایەك، وەك سیستەمێكی گەیاندن و گەیاندنیش وەك ئامانج لەم پەیڕەوەدا، بەشداربووانی ئەم كردەیە لە چوارچێوەی پەیوەندییەك دەبن، كە زمان تیایدا ئامرازێكە بۆ گەیاندن و گەیاندنیش ئەركێكی زمانی دەبینێ.

**كۆدی زمانی**

| نێرەر | ئامرازی گەیاندن | پەیام | یان كەناڵی پەیوەندیكردن | (وەرگر) |
|---|---|---|---|---|
| (قسەكەر، نووسەر) | (كتێب ، ڕۆژنامە...) | بابەت و بیرۆكەكان | (رادیۆ ، گۆڤار...) | (گوێگر، خوێنەر) |

(هەمان سەرچاوە:٥٦)

### ١-٢. پەیڕەوی گەیاندن :

توانای مرۆڤ بۆ سەركەوتن لە ژیاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو توانایەی كە مرۆڤ بۆ پەیوەندیكرن هەیەتی، بەشێوەیەك كە دەتوانێ بیرۆكە و شارەزاییەكانی خۆی بۆ كەسانی تری دەوروبەری بگوازێتەوە، بەگۆڕینەوەی زانیارییەكان و نامە زمانی و

نازمانییەکان لە رێگەی کەناڵێکی پەیوەندیکردن کە ئەرکی گواستنەوەی واتای مەبەستدار دەبینێ.

وشەی پەیوەندیکردن (Communication) بە واتای: گەیاندن، راگەیاندن، گفتوگۆکردن و پەیوەندیکردن دێت. رەچەڵەکی ئەم وشەیەش دەگەڕێتەوە بۆ زمانە ئەوروپییەکان و بنچینەکەی بۆ وشەی لاتینی (Communians)، کە بەواتای شتی هاوبەش دێت، لەم وشەیەوە وشەی (Commune) داڕێژراوە، کە واتای (کۆمەڵی شارستانی ) دەگەیەنێ.

پەیوەندیکردن هونەری گوزارشتکردنە لە بیرۆکەکان و سیستەمێکە بۆ ناردن و وەرگرتنی واتا و چەمکەکان لە نێرەرەوە بۆ وەرگر، لە رێگەی گۆڕینەوەی واتای نێو نامەکان کە هەڵگری مەبەستی دیاریکراون، پەیوەندیکردن تەنیا شتە هۆشەکی و ناسراوەکان ناگرێتەوە، بەڵکو لایەنی ویژدانی و هەست و جووڵەش دەگرێتەوە.

ئەو پێناسانەی بۆ پەیوەندیکردن کراون زۆرن، بەڵام هەموویان لە چوارچێوەی چۆنیەتی ئەنجامدانی کردەی پەیوەندیکردن و رەگەزەکانی ئەو کردەیە دەخولێنەوە، هەریەك لە گۆشە نیگایەکەوە بە پێی دید و بۆچوون و زانیارییە خودییەکان باس لەم کردەیە دەکات، (سیستەمی گەیاندن لە ژیانی مرۆڤدا کردەیەکی ئاڵۆزە و پێویستی بە چەند پاژەیەك دەبێت بۆ ئەوەی تێگەیشتن بێتە ئەنجام، سەرەتا (نێرەر) بیرێکی لا دروست دەبێت، دوایی وروژێنەرێك، ئینجا وەری دەگێڕێتە سەر هێمایەك، کە لەلای وەرگر بخوێنرێتەوە، دواتر پەیامەکە لە کەناڵێکی پەیوەندیدا دادەنرێت بۆ ( وەرگر )، ئەویش بە گوێرەی پێویست لێکی دەداتەوە و تێگەیشتن روودەدات (عەبدولواحێد مشیر ٢٠٠٩:٣٨).

"سۆسێر" لە بارەی پەیوەندیکردنەوە دەڵێ: هەر پەیڕەوێکی گەیاندن بەلایەنی کەمەوە پێویستی بە دوو کەس هەیە، سەرەتای پەیڕەوەکە لە لایەن (A)ەوە دەست پێدەکات لە چوارچێوەی بازنەیەکی پەیوەندیکردندا کە تیایدا (AوB) بەیەکەوە گفتوگۆ دەکەن، پەیامەکە بریتییە لەو بیرۆکانەی کە لە مێشکی (A)ەوە بوونیان هەیە، لە رێگەی دەنگەکانی زمانەوە گوزارشتی لێ دەکرێ کە لە دەمی(A) ەوە دەردەچێ و دەگوازرێتەوە بۆ گوێی (B)، دواتر بازنەکە بەردەوام

دەبێ لەلایەن (B)، بەڵام بە ئاراستەیەکی پێچەوانە، ئەگەر وێناکردنەکان لە مێشکی (B) یەکسان بن بە وێناکردن لە مێشکی (A)دا ئەوا پەیوەندیکردنەکە بە سەرکەوتوویی ئەنجام دەدرێ، وەك لەم هێڵکارییەدا دەردەکەوێ:




(بڕوانە: سحر کاظم ٢٠١١:٢٣ـ٢٤)

چەمکی پەیوەندیکردن لای "یاکوبسن" بریتییە لەوەی کە (نێرەر پەیامێك بۆ وەرگر دەنێرێ بۆ ئەوەی پەیامەکە کاریگەر بێ، پێویستی بە دەوروبەرێك هەیە بۆی بگەڕێتەوە، دەوروبەرێك کە لە لای وەرگر درکپێکراوبێ، پەیامەکە پێویستی بە کۆدێکی هاوبەش هەیە بە شێوەیەکی تەواو یان بەشێکی، لە نێوان نێرەر و وەرگرەوە دواتر پەیوەندیکردنەکە پێویستی بە کەناڵێکی فیزیکی و پەیوەندییەکی دەروونی هەیە لە نێوان هەریەك لە نێرەر و وەرگر، پەیوەندییەك ڕێ بە پەیوەندیکردن و پاراستنی بدات (رومان یاکوبسن ١٩٨٨:٢٧).

"یاکوبسن" لەم دیاریکردنەدا سوودی لە بیرۆکەی تیۆرەکەی "شانۆن و وەیڤەر" وەرگرتووە لە شیکردنەوەی پەیوەندیکردن لە ئامێری بێتەل کە بەم شێوەیە گوزارشتیان لێ کردووە: سەرچاوەیەك پەیامێك هەڵدەبژێرێ و لە کۆدێك دایدەنێ، دواتر بە هۆی ئامێرێکی ناردن دەیگۆڕێ بۆ هێما و، ئامێری وەرگرتنیش ئەو کۆدە شی دەکاتەوەو دەیگۆڕێ بۆ نامەیەك کە وەرگر بتوانێ وەری بگرێ، ئەو گۆڕانکارییانەی لە پەیامەکە ڕوودەدات لە هەردوو ئامێری ناردن و وەرگرتن بەهۆی (تشویش)ەوەیە، وەك لەم هێڵکارییەدا دەردەکەوێ:




(بڕوانە: سحر كاظم ٢٠١١:٣٦-٣٧)

ئــەو هێڵكارییانــەی بــۆ روونكردنــەوەی پــەیڕەوی گەیانــدن كــراون زۆرن، بــەڵام بەناوبانگترینیان ئەو هێڵكارییەیە كە "یاكوبسن" پێشكەشی كردووە :




(رومان یاكوبسن ١٩٨٨:٢٧)

ئەم هێڵكارییەی "یاكوبسن" لە ئەدەبدا بەم شێوەیە دەبێ:

دەوروبەر

نووسەر (داهێنەر)---------- دەق ---------- خوێنەر

كۆد

(عبدالناصر حسن ١٩٩١:٣)

لــە کــردەی پەیوەندیکردنــدا هێماکــان و ڕۆڵ و چــەمکەکان لــە نێــوان بەشداربووانی پرۆسەکەدا ئاڵوگۆڕ دەکرێن لەگەڵ ئـەو بـیر و واتایانـەی لـە مـاوەی پەیوەندیکردندا دروست دەبن، ئەم پەیوەندیکردنەش لـە پەیوەنـدیکردنی تـاك بـە خـودی خۆیــەوە دەســت پــێ دەکــات بــۆ پەیوەنــدیکردنی لەگــەڵ دەوروبــەر و پەیوەنــدی جــەماوەری، جــۆری پەیوەندیکردنەکــەش بــەپێی جیــاوازیی کــات و پێکهاتە و هەڵوێستی پەیوەندیکردنەکە جیاواز دەبێ.

**١ـ٣. هۆکارەکانی پەیوەندیکردن و جۆرەکانی :**

**١ـ٣ـ١. پەیوەندیی زمانی:**

**١) هۆکارە زارەکییەکان :**

ئەو هۆکارانەن کە بە هۆیەوە زانیاری لە نێوان نێرەر و وەرگر ئاڵوگۆڕ دەکـرێ بـە شـێوەیەکی زارەکـی و لەڕێگـەی گوتنەکانـەوە، وەکـو (گفتوگـۆی نێـوان دوو هاوڕێ، چاوپێکەوتن، پەیوەندی تەلەفۆنی، کۆڕ و دانیشـتنەکان، کۆبوونـەوەکان) ئەمەش بە کورتترین ڕێگا دادەنرێ بۆ ئاڵوگۆڕکردنی زانیارییەکان.

**٢) هۆکاری نووسین:**

ئـەو هۆکارانـە دەگرێتــەوە کـە بەهۆیانـەوە زانیـاری لـەنێوان نێـرەر و وەرگـر ئاڵوگۆڕ دەکرێ لە ڕێگەی نووسراوەکانەوە، وەکـو ( بەرهـەمی ئـەدەبی، ڕاپـۆرت، بلاوکراوەکـان،....) لــە گــرنگترین خاســییەتەکانی ئــەم پەیوەندیکردنــە توانــای پارێزگاریکردن و گەڕاندنەوەی زانیارییەکانە لەکاتی پێویسـت، بۆنموونـە ڕۆمـان و چـیرۆك نامەیـەکی ئاڕاسـتەکراوە لـە نێـرەرەوە کـە ( نووسـەر)ە بـۆ وەرگـر کـە (خوێنــەر)ە، کۆدەکــانیش زمانــە و نووســینەکانیش کەناڵــە فیزیکییەکەیــە، دەوروبەرە دەرەکییەکـەش ئـەو بارودۆخـە ڕۆشـنبیری و سیاسـی و کۆمەڵایەتییـە هاوبەشــــەیە، کــــە دەوری کــــردەی پەیوەندیکردنەکــــەی دەدات، دەوروبــــەرە ناوەکییەکــەش بریتییــە لــەو بارودۆخــە گشــتییەی دەقەکــە بــۆ کەســەکان و ڕووداوەکان وێنەی دەکێشێ .

**١-٣-٢. پەیوەندیی نازمانی:**

ئەمەش لە ڕێگەی هۆکارە نازمانییەکانەوە ئەنجام دەدرێ، کە بە هۆیانەوە زانیاری لە نێوان نێرەر و وەرگرەوە لەپەیڕەوی گەیاندندا ئاڵوگۆڕ دەکرێ، کە بریتین لە ( ئاماژەکان، هێما نازمانییەکان، جووڵەی دەست، ڕێگاکانی دانیشتن و دەربڕینەکانی دەم و چاو ...) کە بە زمانی جەستەش ناسراوە (ئەم هۆیانە لەزۆر ڕووەوە لەزمان دەچن، وەك زمان کار دەکەن و لەسەر یەك بنەما دەڕۆن (محمد معروف ٢٠١١:٢٣)، ئەم جۆرە پەیوەندیکردنە دەکرێ بەمەبەست بێ، یان بێ مەبەست، بە پێی جیاوازیی ڕۆشنبیری و کەلتوور و کۆمەڵگا واتا و چەمکی جیاوازیی دەبێت، (ئەم هۆیانەی تری پەیوەندیکردن نموونەیەکی سادە و ساکاری زمانی مرۆڤن و لەوانەشە زمان لە قۆناغێکی مێژووییدا هەر لەشێوەی ئەمانەدا بووبێ، یان هەروەك هەندێ زمانەوان باوەڕیان وایە زمان بریتی بێت لە گەشەی یەکێك لەمانە (هەمان سەرچاوە:٢٤).

**١-٤. هاوبەشەکانی پەیڕەوی گەیاندن :**

**١-٤-١. نێرەر:**

لایەنی یەکەمە لە پەیڕەوی گەیاندن و گۆشەیەکی زیندووە لەبازنەی پەیوەندیکردندا، (نێرەر بەسەرچاوەی ئاخاوتن دادەنرێ بەبێ نێرەر گوتار بوونی نابێ، لایەنی یەکەمی گوتارە و گوتنەکان ئاڕاستەی لایەنی بەرامبەر دەکات، بۆ ئەوەی بازنەی کردەی پەیوەندیکردنەکە تەواوبێ (عبدالهادي بن ظافر ٢٠٠٤:٧).

نێرەر لەوانەیە کەسێك بێت یان دەزگایەك بێ یان کۆمەڵە کەس و ڕێکخراوێك بن، کە بە کردەی پەیوەندیکردن هەڵدەستن، وەك سەرچاوەیەکن بۆ سەرهەڵدانی ئەو پەیامەی کە هەڵگری واتای مەبەستدارە.

نێرەر ئەو کۆدانە هەڵدەبژێرێ، کە لەگەڵ پلە و پایەو ئاستی وەرگر بگونجێ، بۆ نموونە گوتاری سیاسی جیاواز دەبێ لەگەڵ گوتاری ئەدەبی و بەهەمان شێوە گوتاری ئەدەبیش لە ڕووی کۆدە بەکارهاتووەکان و شێوازی دەربڕینەکانی جیاوازە لەو گوتارەی کە بۆ کاروباری ڕۆژانە بەکاردێ، وەك لە بەشی یەکەم لە بەکارهێنانی زمان ئاماژەی پێدرا.

**١-٤-٢. پەیام:**

ئەمەش لایەنی هەستپێکراو و بەرجەستەیە لە پەیڕەوی گەیاندندا، کە بریتییە لەو نیشانە و هێما کۆدکراوانەی کە بەشێوەیەك دادەڕێژرێن شیاوبێ بۆ گواستنەوە، پەیام ئەو نامەیەیە کە نێرەر بۆ وەرگری دەنێرێ لە ڕێگەی کەناڵی گەیاندنەوە و بیرۆکەی نێرەر دەنوێنێ لە وێنەی دەنگیدا کاتێك ئاخاوتنەکە زارەکی دەبێت، لەشێوەی نووسین لە گوتاری نووسراودا و ئاماژە و جووڵەکان لە پەیڕەوی نازمانیدا، کۆدەکان لە پەیڕەوی گەیاندندا روخساری دەرەوەی پەیام دەنوێنن و بابەتیش[٢] ناوەڕۆکی پەیامەکەیە، دەکرێ زاراوەی پەیام لە چیرۆك و ڕۆماندا بەم شێوەیە روون بکرێتەوە :

نامەکە: ڕۆمانەکەیە.

شێوەی نامەکە: پیت و وشە و یاساکانی ریزکردنیانە.

ناوەڕۆکی نامەکە: ئەوەی خوێنەر لێی تێدەگات واتە زانیارییەکان.

کۆدی نامەکە: ئەو زمانەیە کە پێی نووسراوە.

**١-٤-٣. کۆد:**

ئەو زاراوانەی بۆ گوزارشتکردن لەو هاوبەشە بەکارهاتوون زۆرن، (هەندێك زاراوەی زمان(Language) ی"سۆسێری" بۆ بەکاردێنن، هەندێك "System"ی "هیلمسلیف" و هەندێکیش توانست (Competence)ی چۆمسکی بۆ بەکاردێنن، بەڵام هەموو ئەمانە ئاماژە بە سیستەمێکی هێمایی دەکەن، کە هاوبەشە لە نێوان نێرەر و وەرگر، سەرکەوتنی پرۆسەی ئاخاوتن بە شێوەیەکی سەرەکی پشت بەو سیستەمە هاوبەشە دەبەستێ (الطاهر بومزبر ٢٠٠٧:٢٧).

بەبێ بوونی کۆد پەیام ناسراو نابێ و لێك نادرێتەوە، بە بوونی کۆدی هاوبەشی نێوان نێرەر و وەرگر مەبەستی قسەکەر ئاشکرا دەبێ و یارمەتیدەر دەبێت بۆ تێگەیشتنی وەرگر و پرۆسەی پەیوەندیکردن بەردەوام دەبێ، (کۆد و نامە) لە پەیوەندی زمانیدا بەرانبەر (زمان و گوتن ) دەوەستن یان ( زمان و

ئاخاوتن)، (کۆد هۆکارێکی گشتییە دەکرێ بۆ ژمارەیەکی بێ کۆتا لە نامە بەکاربێت وەك چۆن زمان بۆ ژمارەیەکی بێ کۆتا لە گوتن بەکاردێ .

کۆد چەندەها شێوەی جیا جیا لە ( دەنگ، رووناکی، نووسین، جووڵە...) دەگرێتەوە، بەڵام زمان دوو شێوە دەگرێتەوە، دەنگی (زارەکی) کە ئاڕاستەی ئەندامی بیستن دەکرێ، نووسراو کە ئاڕاستەی ئەندامی بینین و دەست لێدان دەکرێ، بەمەش دەکرێ زمان بە شێوەیەك لە کۆد دابنرێ و ئاخاوتنی زمانیش بە جۆرێك لە نامە دابنرێ. (لطيف زيتوني ٩٨:٢٠٠٢).

**١-٤-٤. دەوروبەر:**

دوو جۆر لە دەوروبەر (سیاق) دەوری پەیڕەوی گەیاندن دەدەن (دەوروبەری دەق) و (دەوروبەری دەرەوەی دەق)، دەوروبەری دەق دەوروبەری زمانیشی پێدەگوترێت، ئەم جۆرەی دەوروبەر تەنها گرنگی بە پەیوەندیی نێوان یەکەکانی پێکهاتەی دەق دەدات دوور لە پەیوەندیی یەکەکان بە جیهانی دەرەوەی دەق، هەرچی دەوروبەری دەرەوەی دەقە ئەمانە دەگرێتەوە (دەوروبەری کۆمەڵایەتی، سیاقی دۆخ، دەوروبەری ئەدەبی، دەوروبەری رۆشنبیری و دەروونی). (بڕوانە: سحر كاظم ٢٣٢:٢٠١١).

**١-٤-٥. کەناڵ:**

بازنەی بەیەکگەیاندنی نێوان نێرەر و وەرگرە وەکو پردێکە هەردوو لایەنی پەیڕەوی گەیاندن بەیەکەوە دەبەستێتەوە، پەیام کاتێك لە لایەن نێرەرەوە ئامادە دەکرێ، کە لە رێگەی کەناڵەوە دەنێردرێ بۆ وەرگر، کەناڵ بەپێی شێوە و جۆری پەیوەندی و کۆدی پەیوەندیکردنەکە دەگۆڕێ، وەك (رادیۆ، تەلەفزیۆن، گۆڤار، رۆژنامە، مایکرۆفۆن، نەخشە، وێنە، لیست، کۆمپیوتەر، تەلەفزیۆن، ...)، بۆنموونە لە پەیوەندی جەماوەریدا رۆژنامە، یان گۆڤار یان کەناڵی تەلەفزیۆنی و رادیۆیی دەبێ، کەچی لەپەیوەندی بە کۆمەڵ مایکرۆفۆن دەبێ وەکو گوتاری هەینی و وانەی زانستی و کۆڕ و کۆبوونەوەکان.

### ١ـ٤ـ٦. وەرگر:

مەبەست لێی ئەو لایەنەیە کە پەیامەکەی ئاڕاستە دەکرێ و بەرانبەر نێرەر دەوەستێ لە پەیڕەوی گەیاندندا، وەرگر بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕۆڵ دەبینێ لە ئاڕاستەکردنی نێرەر لەکاتی هەڵبژاردنی هێما و داڕشتنەکانی گوتنەکەی، وەرگر دوای وەرگرتنی پەیامەکە ئەرکی شیکردنەوەی کۆدەکان دەگرێتە ئەستۆ بۆ گەیشتن بە واتای مەبەستدار لە پەیڕەوی گەیاندندا، ئەمەش کاتێك دەبێ کە ئەو کۆدانەی نێرەر بەکاری دێنێ بۆ گەیاندنی مەبەستەکەی ناسراوبێ لەلایەن وەرگرەوە، باشترین نموونەش بۆ ئەمە قسەپێکەرانی زمانێکی دیاریکراون، (وەرگر لە کردەی شیکردنەوەی کۆدەکان و لێکدانەوەیاندا پەنا دەباتە بەر سێ قۆناغ:

١ـ لێکدانەوەی واتای فەرهەنگی، لە ڕێگەی واتای وشە و لێکدانیانەوە.

٢ـ بەراوردکرنی لەگەڵ ئەو دەوروبەرەی کە تێیدا گوتراوە، تا بزانێت دەگونجێت یان نا.

٣ـ ئەگەر مەبەستەکەی نەگەیاند، ئەوا دەبێ بگەڕێتەوە بۆ هەندێ زانیاریی کەسی و کولتووری (عەبدولواحێد مشیر ٢٠٠٩:٤٠).

### ١ـ٥. ئەرکەکانی زمان لە پەیڕەوی گەیاندندا:

"یاکوبسن" دوای دیاریکردنی هاوبەشەکانی پەیوەندیکردن و ئاماژەدان بەوەی هەریەك لەو رەگەزانە ئەرکێکی جیا بەجێ دێنێ، شەش ئەرك بۆ زمان لە پەیڕەوی گەیاندندا دیاری دەکات:



**١-٥-١. ئەرکی هەڵچوونی** Emotive function:

ئەم ئەرکە کاتێك دەبێ کە هێماکە وەڵامدانەوەیەکی هەڵچوونی دروست بکات، ئەمەش تایبەتە بەنێرەر و مەبەستی نێرەر لە پەیوەندکردندا، کاتێك هەوڵ دەدات ئەزموونی ژیانی خۆیی و بیرۆکەکانی و هەست و هەڵچوونەکانی لە رێگەی پەیامەکەوە دەربڕێ، ئەم ئەرکە بە ئەرکی دەربڕیش (Expressive Function) ناسراوە.

**١-٥-٢. ئەرکی ئاماژەکردن** Referential function:

ئەمەش تەرکیز دەکاتە سەر سەرچاوە (المصدر) کە هێماکە بۆ شتێك دەگەڕێتەوە لە دەوروبەردا، بۆ نموونە لە چیرۆکدا کاتێك برگەکانی گێڕانەوە تەرکیز دەکاتە سەر هەڵوێست و رووداوە گێڕدراوەکان ئەرکێکی گەڕانەوەیی دەبینێ، (ئەم ئەرکەی زمان لە هەموو نامەیەکدا بەدی دەکرێ، کە بنچینەی هەموو پەیوەندییەکەیە و پەیوەندی نێوان پەیام و ئەو بابەتەی لێی دەدوێ دیاری دەکات (بییر جیرو ١٩٩٢:٣٠).

**١-٥-٣. ئەرکی تێگەیشتن لە دەق** Conative function:

ئەم ئەرکە پەیوەندی بە وەرگرەوە هەیە، کە هەڵدەستێ بە شیکردنەوەی کۆدەکان و گەیشتن بە واتا و ناوەرۆکی نامەکە، لەرێگەی هەڵوەشاندنەوە و رۆناندنەوەی دەقەکەدا.

**١-٥-٤. ئەرکی ئەدەبی** Poetic function:

ئەم ئەرکە تایبەتە بە لایەنی ئەدەبی، ئەرکی ئەدەبیشی پێ دەگوترێ، یاکۆبسن، لە بارەی ئەم ئەرکەوە دەڵێ: (بەر لە هەموو شتێك وەڵامی ئەو پرسیارەیە چی وادەکات نامەیەك وەك بەرهەمێکی هونەری سەیر بکرێ؟)، یاکۆبسن خۆی وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە و دەڵێ: (تەرکیزکردنە سەر پەیام ئەرکی ئەدەبیی زمانە)، واتە بوونی ئەرکی ئەدەبی لەناو پەیامێك، ئەوە وادەکات

پەیامەکە وەك بەرهەمێکی هونەری سەیر بکرێ، ئەمەش لە کاتێکدا دەبێ کە ئەرکێکی ئەدەبی بەجێ هێنابێ. (سحر کاظم ١٨٨:٢٠١١).

**١-٥-٥. ئەرکی ئاگادارکردنەوە** Phatic function:

یەکێکە لە ئەرکە سەرەکییەکانی پەیوەندیکردن کە دەکرێ بە هۆیەوە هەر کردارێکی پەیوەندیی زمانی بنیاد بنرێ و ئاراستە بکرێ، لەم ئەرکەدا، تەرکیز لەسەر کەناڵەکە دەکرێ بەتایبەتی ئەو بڕگانەی گێڕانەوە، کە تەرکیز دەکاتە سەر پەیوەندی گێڕەرەوە (Narrator) و ئەوەی بۆی دەگێڕێتەوە (Narrate) بۆنموونە لە گوتنەکانی وەك: ( ئەی خوێنەر، لەگەڵمی، ...).

**١-٥-٦. ئەرکی مێتازمانی** Metalingual function:

یەکێکە لە ئەرکەکانی پەیوەندیکردنی زمانی کە تەرکیز دەکاتە سەر کۆد، لە رووی تایبەتمەندیی زیاتر دەکرێ بڵێین بڕگەگانی گێڕانەوە کە تەرکیز دەکاتە سەر ئەو زمانەی لە گێڕانەوەکەدا بەکارهاتووە ئەرکێکی مێتازمانی بەجێ دێنێ، ئەمەش پەیوەندیی بە زمانێکەوە هەیە، کە بەکاردێ بۆ وەسفکردنی خودی زمان خۆی، بۆنموونە ئەو زمانەی لەم لێکۆڵینەوەیە بەکارهاتووە ئەرکێکی مێتازمانی بینیوە (بڕوانە: Danial 2002:181-185).

**١-٦- زمانی نووسین و زمانی قسەکردن:**

مێژووی لێکۆڵینەوە لە زمان پەیوەندییەکی فراوانی لەنێوان زمانی نووسین و قسەکردن دەرخستووە، مرۆڤ دوای ئەوەی لەدایك دەبێت سەرەتا فێری زمانی قسەکردن دەبێت، نەك نووسین، بۆیە زۆر لە زمانەوانەکان بڕوایان وایە زمانی نووسین فۆڕمی نووسینە بۆ زمانی قسەکردن، کە بریتییە لە تۆمارکردنی دەنگەکانی مرۆڤ لە شێوەی فۆڕمی نووسراودا، (نووسین بریتییە لەو هەوڵەی کە مرۆڤ داویەتی بۆ تۆمارکردنی قسە، تاوەکو مێژوو و میراتی خۆی لە فەوتان بپارێزێ. نووسین زمان نییە، بەڵکو لەگەڵ قسەکردندا دوو شێوەی زمانن و

نووسین دووجار دوورکەوتنەوەیە لە راستییە رووداوەکان (واقیع) چونکە رەمزە بۆ رەمزی تر واتە"گوتن" (محمد معروف ۲۲۱:۲۰۱۱ ).

زمانەوانەکان باوەڕیان وابوو زمانی نووسین وەسفی زمانی قسەکردن دەکات و یارمەتیمان دەدات بۆ فێربوونی زانیاری و فێربوونی زمان، زمانی نووسین نواندن و بەستنەوەی زمانی قسەکردنە بە جیهانی واقعی، کە زمانی قسەکردن لە شێوەی نووسین تۆمار دەکرێ زۆر جێگیرتر دەبێ، ئەمەش وای کردبوو (کە بۆ چەند سەدەیەك، زمانی نووسین شوێنێکی دەرکەوتووتر داگیر بکات، کە بریتی بوو لە رێگەی گواستنەوەی ئەدەب، بەمەش بۆتە سەرچاوەی زمانێکی یەکگرتووی بەرز کە هەست بەوە دەکرا زمانێکی بەردەوام و بە دەسەلات دەدات بەدەستەوە. بەم پێیە یاساکانی رێزمان تایبەت بوون بە دەقە نووسراوەکان (Crystal2006:147).

پەیوەندیی سەرەکی نێوان زمانی قسەکردن و زمانی نووسین پەیوەندییەکی سادە و ساکارە مرۆڤ نووسین بۆ نواندنی جیهانی واقعی خۆی بەکاردێنێ کاتێك لە دەرەوەی نووسین قسە دەکەن ئەمە دەبێتە زمانێکی قسەکردن.

کاری ئەدەبی وەك نموونەیەك بۆ زمانی نووسراو گرینگییەکەی لە پەیوەندییە دواخراوەکەیەتی، کە دەقی نووسراو پێی جیا دەکرێتەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی وەرگرتنی کاری ئەدەبی لە دەرەوەی سیاقە بنجییەکەی خۆی روودەدات، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کراوەبێت لە رووی شیکردنەوە و زیاتر لە لێکدانەوەیەك لەخۆ بگرێ، واتا لە چوارچێوە تەسکەکەی ئاخاوتنی زارەکی دەربکات و هەر خوێنەرێك لە رێگەی رۆشنبیریی کەسی و بەپێی ئەزموونی تایبەتیی خۆی لە ژیاندا لە دەق بڕوانێ.

زمانی قسەکردن ئاسانترە بۆ فێرکردن لە زمانی نووسین، بەلام کاریگەریی زمانی نووسین زیاترە و زیاتر دەمێنێتەوە، زۆربەی زانیارییەکانی مێشکی مرۆڤ لە رێگەی هەستی بینینەوە وەردەگیرێ و لە مێشکدا هەڵدەگیرێ، لەکاتێکدا ئاخاوتنی زارەکی لەگەڵ لەناوچوونی دەنگ نامێنێ و بزر دەبێ، بە شێوەیەکی وردتر هەموو کەسێك هەوڵدەدات زانیارییەکان لە وێنەی ناو مێشکەوە بەدەست بێنێتەوە، کاتێك دایکێك بیەوێ منداڵەکانی فێری شتێك بکات ئەوا زمانی

قسەکردنەکە ڕێگەیەکی ئاسانترە بەڵام مرۆڤ لە قۆناغێکدا، وای لێدێت زیاتر پشت بە چاوەکانی دەبەستێ وەك لە گوێیەکانی، لە کاتێکدا کە فۆڕمە نووسراوەکەی زمانی قسەکردن هەمان واتا بەدەستەوە دەدات، ئەوە لە کاتێکدا کە بمانەوێ فێری زانیاری بین نەك زمان.

ئەوەی کە روون و ئاشکرایە هەموو کەس وەسفی واتاکان لە ڕێگەی شتە مادییەکانەوە دەکات، هەروەها پەیوەندیکردنی مرۆڤ لەگەڵ یەکتر لە ڕێگەی قسەکردنەوە، ئەوانەن کە پەیوەندی بە توانای نەستەکانەوە هەیە ئەم جۆرەیان زۆر سنووردارترە لە بیرکردنەوە لە ڕێگەی شتە مادییەکانەوە، کاتێك مرۆڤ هەست بە گرانی لە دەربڕین دەکات پەنا دەباتە بەر ئەو رستانەی لە ڕێگەی نووسینەوە لە مێشکیدا هەڵگیراون.

زمانی نووسین جێگیرترە و کەمتر گۆڕانی بەسەردا دێت، (زمانی قسەکردن رۆژانە بە بەراورد بەوەی کە پشتگوێ دەخرا و دەستبەرداری بوون وەکو بابەتێکی لێکۆڵینەوەی نا دەوڵەمەند بۆتە مایەی کەمبوونەوە و گرنگی پێنەدان و ڕێکنەخستنی، دەتوانین بڵێین زمانی قسەکردن زمانێکی بێ یاسایە قسەکەر هەست بە سەرلێشێوانێك دەکات، لەوەی بۆ ئەوەی ئاخاوتنێکی گونجاو ئەنجام بدات پێویستە بە قاڵبە دروستەکانی زماندا بچێتەوە، وەکو ئەوەی لە کتێبە ڕێزمانییەکاندا تۆمار کراوە یان وەك شێوازی نووسین پێناسە کراوە، هەروەها درکاندنەکانیش دەبێ پەیڕەوی نووسینی ستاندارد بکات (Crystal 2006:147).

کاتێك مرۆڤ زمانی نووسین نازانێ ئەو تەنیا دەتوانێت زمانی قسەکردن بە بیر خۆی بێنێتەوە و دەنگەکانی زمان بەرهەم بهێنێ. ئەو ناتوانێ لەو واتایانە بگات کە بە ڕێگەی نووسینەوە نوێنراون کاتێك کە مرۆڤ بە شێوەیەکی سەرەکی لێکدانەوەی واتاکان بە ڕێگەی بیرکردنەوەی ماددی دەکات، زۆربەی زۆری واتاکانیش لە ڕێگەی گەشەکردنی کۆمەڵەوە بەرهەم دێت .

ئەو جیاوازییانەی لە نێوان زمانی قسەکردن و نووسیندا هەیە زۆر زیاترە لەوەی بتوانرێ سنووری بۆ بکێشرێ (جیاوازییەکان زۆر زیاترە لەوەی خەڵکی بیری لێ دەکەنەوە، بەراوردکردنەکەش گەورەتر دەبێ کاتێك کە تێکستێکی

نووسراو بەراورد دەکەین لەگەڵ گفتوگۆیەکی ئاساییدا، تەنانەت لە گوتنێکی فەرمیی ئامادەکراویشدا، وەکو ئەوەی مامۆستایەك لە وانەوتنەوەدا پەیڕەوی دەکات، بۆنموونە (ئاخاوتنی پۆل) تا ڕادەیەك لە زمانی نووسین دەچێ لە رووی رۆنان و فۆڕمەکەیەوە، ئەمە کاتێك زمانی قسەکردنەکە تۆمار بکرێت، بەلاّم زۆرجار هەموو وردەکارییەکانی قسەکردن ناتوانرێ تۆمار بکرێ (هەمان سەرچاوە:١٤٩).

"کریستەل" لەبارەی جیاوازیی رۆنانی (پێکهاتە) و بەکارهێنان لە نێوان زمانی قسە و نووسیندا، دەڵێ: (بە هیچ شێوەیەك ناکرێ جیاوازیی لە نێوان ئەم دوو شێوەی بەکارهێنانی زمان بکەین، چونکە ئەم جیاوازییانە لە بنەڕەتدا لە جیاوازیی بنچینەییی تر بەرهەم دێن، کە لە جۆرەکانی هەڵوێستی پەیوەندیکردنەوە دێنە کایە، قسە بەشێکە لە کارلێککردن، بە زەمەن (کات) کە بە میکانیزمی پەیام ناردن بەستراوەتەوە، لەوەی تاڕادەیەك هاوبەشەکانی قسەکردن (قسەکەر و گوێگر) لەکاتی ئێستادان، قسەکەر پەیامنێرێکی دیارە (بۆ گوێگر یان وەرگر)، کەچی نووسین بەستراوەی شوێنە[٣] و جێگیر و دەرکەوتووە ئەنجامەکەشی ئەوە دەبێت کە هاوبەشی نووسین (وەك لە هەموو دەقە ئەدەبییەکاندا )، نازانرێ قسەکەر نووسەر کێیە؟ (Crystal 2006:149).

"یولْ" لە بارەی رۆنان (پێکهاتە) و بەکارهێنانەوە ئەم جیاوازییانە لە نێوان هەردوو شێوەی بەکارهێنانی زمانی نووسین و قسەکردن دیاری دەکات:

١. ڕستەکانی زمانی ئاخاوتن پەسندێتی ڕێزمانییان کەمترە لە ڕستەکانی زمانی نووسین.
٢. ڕستەکانی زمانی ئاخاوتن بەزۆری ڕستەی ناتەواون و لە زنجیرەیەك فرەیز پێکدێن.
٣. لاڕستە (کلۆز) لە زمانی ئاخاوتندا زۆر کەم بەدی دەکرێ.
٤. لە زمانی ئاخاوتندا ڕستەکان زیاتر بکەر دیارن، واتە ڕستەی بکەر نادیار زیاتر لە زمانی نووسیندا بەرچاو دەکەوێ.
٥. لە زمانی نووسیندا نیشانە بەرجەستەکانی لاڕستە (کلۆز) وەکو (کە، کاتێك،....) لە دیارخستنی پەیوەندی نێوان لاڕستەکان بەدی دەکرێن، لە

زمانی ئاخاوتندا فرەیزەکان بەهۆی ئامرازی دانەپاڵی (بـەڵام، و، ..) بەیەکـەوە دەبەسترێنەوە.

٦. لە زمـانی نووسـیندا هەنـدێك ڕێکخـەری ڕەوانبێـژی (بـەلاغی) هـەن وەکـو (لـە سەرەتادا، لەمەش گرنگتر، لە دەرئەنجامـدا..) بـەڵام لـە زمـانی ئاخاوتنـدا زۆر کەم بەدی دەکرێن.

٧. لە زمانی نووسیندا کەس یا شتی ئاماژە بـۆکراو دەکرێت زۆر جـەختی لەسـەر بکرێتەوە، وەکو:

دووبارە دەیڵێمەوە، دەچمەوەسەر، ئەوەی سەبارەت بەـــ وتم،....

٨. ڕستەکانی زمانی نووسین زیاتر لەشێوەی نیهاد و گوزارەدان، بەڵام ڕسـتەکانی زمانی ئاخاوتن زیاتر ڕستەی بە باسکراو و ناوەسفین، بۆنموونە:

پشیلەکان + بەڕەڵات کردن؟ (بڕوانە: Yule and..1983: 15)

"کریســتەل" لــەبارەی پەیوەنــدیی زمــانی نووســین بــە قســەکردنەوە و پەسندکردنی یەکێکیان بەسەر ئەوی ترەوە دەڵێ: (ناکرێ زمانی نووسین و زمـانی قسەکردن هیچ کاتێك رووبەڕووی یەك بکرێنەوە یان لە یەك ئاست سـەنگ دابنـرێ، هیچ بیرۆکەیەکی واش لە ئارادا نییە کـەوا زمـانێکی پەیوەنـدیکردن لـەویتر چـاکتر بێت، هەروەها بە پێی پەیوەندی مێژووییانەوە ئەو راستییەی کە ماوە بیڵێین لـە کۆمــەڵگای نوێــدا دوو رێگــەی زۆر جیــاواز لــە سیســتەمی پەیوەنــدیکردن بــۆ ئەندامەکانی خۆیان دابین دەکەن، هەر یەکێکیان گەشە دەکات بۆ بەدەستهێنانی رێگەی تایبەت بۆ پەیوەندیکردن ناکرێ نە نووسین بە زمانی قسـەکردن بگـۆڕدرێ نە زمانی قسەش بە نووسین بگۆڕدرێتەوە. (Crystal2006: 148).

"هالیدەی" لە رووی تایبەتمەندیی لکاندن جیاوازیی لـە نێـوان هـەردوو جـۆری زمانی نووسین و قسەکردن بـەوە دەکـات، کـە (زمـانی نووسـین بـە دەق و زمـانی قسەکردن بە نادەق دادەنێت، لە دەقدا پارچەکان "رسـتە بەدوایەکـداهاتووەکان" بەیەکترەوە لکاون و پەیوەندییەکی ئەوتۆ لە نێوانیاندا هەیە کە هـەموو رسـتەکان وەك یەکەیەکی یەکگرتوو لێدەکات. بەڵام لە (نادەق)دا ئەو پەیوەندییـە لـە نێـوان پارچەکانیدا نییە و رستەکانی بەیەکترەوە نە لکـاون. ئـەو کۆمەڵـە رسـتە بـەدوای

یەکداهاتووانەش کە لکاندن لە نێوانیاندا نییە یەکەیەکی یەکگرتوو پێك ناهێنن (قەیس کاکل ٢٠٠٢:٢٤).

**١ـ٧. پەیڕەوی گەیاندن لە ئەدەبدا:**

بەر لە روونکردنەوەی پەیڕەوی گەیاندن لە دەقی ئەدەبیدا "دەقی گێڕانەوە" پێناسەی چەند فەیلەسووف و زمانەوانێك بۆ گێڕانەوە دەخەینە روو، گێڕانەوە نموونەی پەیوەندییەکی ناڕاستەوخۆ دەنوێنێ، کە (یەکێکە لەو پرەنسیپانەی لە رێگەیەوە جیهان ئاشنای کێشە و کردەوە و ئەزموونەکانمان دەکەین (Herman2007:23)، بە گواستنەوەیان لە جیهانێکی راستەقینەوە بۆ جیهانێکی خەیاڵی کە جیهانی گێڕانەوەیە، لە رێگەی رەگەزە ئەدەبییە جۆراوجۆرەکان لە شێوەی پەیامی نووسراودا.

"گینیت" لەبارەی پێناسەی گێڕانەوەوە دەڵێ: (هیچ پێناسەیەك بۆگێڕانەوە بێ کەم و کوڕی و کێشە نییە، گێڕانەوە نواندن و پێشکەشکردنی رووداوێك، یان زنجیرە رووداوێکە (Herman2007:23) .

بەهۆی بڵاوبوونەوە و فراوانی بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە (گێڕانەوە) لە بوارەکانی زمانەوانی و ئەدەب بە گشتی، لێکۆڵەران بەپێی تێڕوانینی کەسی و پەیوەندی ئەم زاراوەیە بە بواری لێکۆڵینەوەکەیان، پێناسەی جیاجیایان بۆ گێڕانەوە کردووە:

تراسك: (گێڕانەوە بریتییە لەو دەقەی کە چیرۆکێك دەگێڕێتەوە، ئەو دەقەی گێڕانەوەی تێدایە جیاوازە لە دەقەکانی تر، بەوەی کۆمەڵێك رووداوی خەیاڵی یان راستەقینە دەگێڕێتەوە، نموونەی گێڕانەوەی نووسراو بریتین لە کتێبە مێژووییەکان و رۆمان و چیرۆك، کەچی نموونەی گێڕانەوەی زارەکی ئەو چیرۆکانەن کە لەکاتی گفتوگۆدا دەگێڕدرێنەوە (Trask2007:181) .

گێراڵد پرنس: (گێڕانەوە نواندنێکە بۆ یەك یان زیاتر لە رووداوێکی راستەقینە یان خەیاڵی، کە لە لایەن یەك، دوو یان زیاتر لە کەسێك"گێڕەرەوەیەك" دەگێڕدرێتەوە بۆ یەك یان زیاتر لە "بۆگێڕدراوەیەك" (جیراڵد پرنس ٢٠٠٣:٥٨).

ئابۆت "Abbott": (گێڕانەوە پێشکەشکردنی ئەو ڕووداوانەیە، کە لە چیڕۆك و گێڕانەوە پێکدێن، چیڕۆك بریتییە لە ڕووداوێك یان زنجیرەیەك لە ڕووداو، گوتاری گێڕانەوەش بریتییە لە نواندن و پێشکەشکردنی ئەو ڕووداوانە (Herman2007:23).

جان لۆفیف: (گێڕانەوە بریتییە لە هەر گوتنێك، کە جیهانێکی وەرگیراو لە ڕاستی دەگەڕێنێتەوە بۆ زەین، کە لە هەردوو ڕەهەندی ماددی و مەعنەوییەوە و لە کات و شوێنێکی دیاریکراوەوە و زۆربەی کاتیش بەهەڵگەڕاوەیی لە ڕێگەی گۆشەنیگای کەسایەتییەك، یان زیاتر پێشکەش دەکرێت، وێڕای گۆشەنیگای گێڕەرەوە (شجاع مسلم ١٩٩٤:٥٩).

لە دەقی گێڕانەوەدا دانەر سەرچاوەی دروستکردنی پەیڕەوی گەیاندنە، لە ڕێگەی پەیامێك لە شێوەی دەقی نووسراودا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پەیوەندی بە خوێنەر دەکات کە هەردووکیان وێنەی دوو کەسایەتین لە جیهانی ڕاستەقینەدا، دانەری دەقی گێڕانەوە (هەمیشە شت پێشکەش دەکات تەنانەت ئەگەر ڕووداوە گێڕدراوەکە بەشێکیش نەبێ لە ئەزموونی کەسیی خۆی، لەوانەیە ڕووداوی ژیانی خەڵکانی تر یان ئەفسانە یان شیعری داستان بێ، یاخود باس لە پاڵەوانێتی کەسێکی قارەمان بکات (Floderink1993:434).

دانەر کە نێرەری ڕاستەقینەی پەیامەکەیە ڕووداوەکان لە ڕێگەی گێڕەرەوەیەك یان چەند گێڕەرەوەیەکی ناو دەقەکە پێشکەش بە خوێنەر دەکات، کە هەندێ جار دانەر خۆی ئەو ڕۆڵە دەبینێ یان ئەو ڕۆڵە دەدات بە یەکێك لە کەسایەتییەکانی چیڕۆکەکە، یان هەندێ جار گێڕەرەوە بە شێوەیەکی کۆنکریتی دەرناکەوێ، لەو حاڵەتەدا بە دانەری ناوەکی ناودەبرێ .

وەرگری پەیام لەم پەیڕەوەدا خوێنەرە کە لە ڕێگەی خوێندنەوەی دەقی گێڕانەوەکەوە پەیامی دانەری پێدەگات. (گەیاندن لە ئاستی گێڕانەوە پێویستە، لەسەر ئاماژەپێکردنەکانی ئەو پەیامە بێت، کە لە لایەن دانەرەوە ئاڕاستەی خوێنەری دەق "وەرگر" کراوە. (Floderink1993:434). ئەمە سەرەڕای ئەو گفتوگۆ و ئاخاوتنانەی لە ناو جیهانی خەیاڵی گێڕانەوەدا لە نێوان

کەسایەتییەکانی چیرۆك و رۆمانەکاندا ئاڵوگۆڕ دەکرێن، کە جۆرێك لە کاریگەری و کارتێکردنی نێوان ئەو کەسانە پیشان دەدات و ئەم کاریگەرییە بۆ خوێنەری دەق و جەماوەریش دەگوازرێتەوە، ئەمەش شێوەیەکی تری پەیوەندیکردن دەنوێنێ، تاڕادەیەك لەو گفتوگۆیانە دەچێ کە لە ژیانی رۆژانەدا ئەنجام دەدرێ.

**١-٧-١. دانەر و خوێنەر** Author and Reader:

دوای مێژوویەك لە هەوڵدان و وتووێژی بەردەوام لێکۆڵینەوەکان بە ئاڕاستەی دۆزینەوەی وەڵامێك رۆیشتن بۆ ئەو پرسیارانەی لە لێکۆڵینەوە رەخنەییەکاندا هاتنە ئاراوە دەربارەی کارە ئەدەبییەکان، کە پشت بەلایەنی سێیەم دەبەستن لە سێگۆشەی بەکارهێنەری زماندا، لە پەیوەندی ئەدەب بە پڕاگماتیکەوە، کە ئەویش خوێنەر یاخود بەکارهێنەری دەقی ئەدەبییە.

دەقی ئەدەبی پێکهاتەیەکی دابڕاوی نییە و بەتەنیا بەویستی دانەرەکەی گەشە ناکات، بەڵکو مەسەلەی گەشەی جۆرە ئەدەبییەکان دەکەوێتە ژێر کاریگەریی کارتێکەرێکی گەورە کە خوێنەرە، (خوێنەر وەك هاوبەشێکی چالاك رۆڵێکی گەورە لە گەمەی ئەدەبی دەگێڕێ، کاریگەریی خوێنەر لە رێگەی وەرگرتنی دەقەکەوە و توانەوە لەناو لایەنە فیزیکی و سایکۆلۆژییەکانی پرۆسەکەدا درێژ دەبێتەوە (فراوان دەبێ)، ئەم پرۆسەیە لەگەڵ خوێندنەوەدا یەك دەگرێتەوە (Mey2001:237) .

بەڕای "ئایسر" (Wolfgang Iser) واتای دەق بریتییە، لە ئەنجامی کارلێککردنی نێوان دەق و خوێنەر، ئەرکی رەخنەگری دەقی ئەدەبیش شیکردنەوەی دەق نییە، وەك بابەتێك، بەڵکو شیکردنەوەی کارتێکردنی دەقە لەسەر خوێنەر، (دانەر لە داهێناندا پێویستییەکی راستەوخۆی بە هاوکاریی خوێنەرێکی شارەزا هەیە، دەقە ئەدەبییەکان هەموو کات چەند بۆشاییەکیان تێدایە کە تەنیا خوێنەر توانای پڕکردنەوەیانی هەیە (عبدالناصر حسن ٩٣:١٩٩١)، ئەم هاوکارییەی خوێنەریش (بە بەتەواوکردنی لایەنی گشتی ئەو پرۆسەیەی دانەر دروستی کردووە دەردەکەوێ، بەئەنجامدانی ئەوەی خوێنەر دەبێتە کارایەك لەپاڵ ئەوەی دەبێتە بەشێك لە سەیرکەر لە کردەکەدا، هەروەها خوێنەر رۆڵەکە دەگۆڕێ: ئەمەش لەکاتی خوێندنەوەی دەق لەلایەن خوێنەر و

دووبارە شیکردنەوە و بەرهەمهێنانەوەی دەبێ، ئەو کارلێککردنە بە پرۆسەی دیالێکتیکی[٤] دادەنرێ (Mey2001:237).

ئەوەی جێی سەرنجە یەکەم خوێنەری دەق دانەرەکەیەتی کە بەرهەمهێنەری دەقەکەیە و دوای چەند کردەیەکی بەردەوام لە داڕشتن و خوێندنەوە ئەو دەقە بەرهەم دێنێ، کە ئەویش وەك خوێنەرێکی ئاسایی دەق نییە، بەڵکو شارەزایی تەواوی لە ئامرازە هونەرییەکان و ئەو ئەرکە جوانیناسییانە (جمالیة) هەیە، کە تایبەتمەندیی ئەدەبییانە بە دەق دەبەخشن.

بەڕای "ئیکۆ" دەق ستراتیژییەتێکە هەریەك لە نووسەر و خوێنەر بەشدارن تیایدا، دانەر بۆ ئەوەی ستراتیژییەتی دەقەکە ڕێکبخات دەبێ پشت بە زنجیرەیەك توانا ببەستێ، کە هەمان ئەو توانایانەن کە خوێنەری نموونەیی[٥] بۆ تێگەیشتن بە دەق بەکاری دێنێ، بەو ڕێگایەی کە دانەر بیری لێدەکاتەوە و بە پشتبەستن بە یاساکانی پراگماتیك کە هەموو کات سەپاندنی بوونی لایەنی بەرامبەرە، کە دانەر دەیدوێنێ.

واتای دەق سەبارەت بەهەموو خوێنەرەکان بەیەك ڕێگا بونیاد دەنرێ بەلاَم جیاوازیی لە تێگەیشتنی ئەو واتایە لە خوێنەرێکەوە بۆ خوێنەرێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی ئەو پەیوەندییەی خوێنەر لەگەڵ دەق دروستی دەکات، جیا لەوەی خوێنەرێکی تر دروستی دەکات لەگەڵ هەمان دەقدا، ئەگەرچی (دانەری راستەقینە کەسایەتییەکی جێگیر و دیاریکراو دەنوێنێ لە ماوەیەکی مێژوویی بۆ داهێنانە ئەدەبییەکەی، بەلاَم خوێنەرانی دەقەکەی بەپێی سەردەم دەگۆڕێن و خاوەنی کەسایەتیی جیاوازن، ئەمەش هۆی بوونی وەرگرتن و کاردانەوەی جیاوازە بۆ هەمان بەرهەمی ئەدەبی (رولان بارت ١٩٩٢: ٨٨).

هەر خوێنەرێك شێوەیەکی تایبەت لە کارلێککردنی هەیە لەگەڵ ئەو دەقەی دەیخوێنێتەوە هەرچەندە هەمان ئەو ڕێبازە دەگرێتە بەر، کە دەق بەسەر هەموو خوێنەرەکانەوە دەیسەپێنێ، ئەم جیاوازیی کالێککردن و لێکدانەوەی خوێنەر لە هاودەقی (Co-text)[٦] ئاشکراتر دەردەکەوێ.

ئـەوەی راسـتی بـێ ( دانـەر تاڕادەیـەك پشـت بـە خوێنـەر دەبەسـتێ وەكـو پێشگریمانەكارێك بۆ چـالاكییە ئەدەبییەكـەی خـۆی، هـەروەها خوێنـەریش پشـت بەدانـەر دەبەسـتێ بـە درككـردن بـە پێشـهاتەكانی دونیـای دەوروبـەر لـە دەقـە نووسراوەكەدا، بۆ ئەوەی (بەخودی بكات) و بە سەركەوتوویی ببێت بە بەشێك لە شانۆكە.

لێكۆڵینەوەی پڕاگماتیك بۆ ئەدەب یان چـالاكی ئـەدەبی تـەركیز دەكاتـە سـەر سیماكانی جیاكردنەوەی ئەو دیالێكتانەی وەسفی بەرهەمـە ئەدەبییـەكان دەكـەن "بەدیالێكتیككردنی لایەنـەكانی بەرهەمـە ئەدەبییـەكان"، وەك ئـەوەی كـە دانـەر رێكـی دەخـات و رابەرایـەتی دەكـات، بـەلاّم لـە هـەمان كاتـدا دەق ئاڕاسـتەكراوی خوێنەر و كردەیەكی چالاكی وشەكانە، خوێنەرەكان بە سنووری دەقەكە كۆتبەنـد دەكرێن، بـەلاّم لەگـەڵ ئەوەشـدا دەق رادەیـەكی ئـازاد دەسـتەبەر دەكـات وەكـو پێویست لـەوەی كـە چـۆن خوێنـەر بتـوانێ بەشـداری تێدا بكـات لەگـەڵ دانـەر و دەقێكی گشتی دابڕێژێتەوە (Mey2001:237).

دانەر كە داهێنەری راستەقینەی دەقە نێرەری نامەیەكی ئەدەبییە بـۆ خوێنـەر كـە رۆڵـی وەرگـر دەبینـێ لـە پـەیڕەوی گەیانـدنی ئـەدەبی و هەریـەك لـە دانـەر و خوێنەر دوو كەسی راستەقینەن لە جیهانی واقعی و ژیانێكی سەربەخۆ و دابڕاویان هەیـە لـە دەقـی ئـەدەبی، كـە پەیوەندییـەكی وتووێـژخوازی ناڕاسـتەوخۆ كۆیـان دەكاتەوە، خوێنەر هەر لە سەرەتای خوێندنەوەی دەقدا لەگەڵ دانـەر دەڕوات بـۆ ئـەوەی بگـات بـەوەلاّمی ئـەو پرسـیارەی: بۆچـی دانـەر ئـەو دەقـەی نووسـیوە و دەیەوێ لە رێگەی دەقەكەیەوە چیمان پێ بڵێ؟

لێرەدا كە باس لە پەیوەنـدی دانـەر و خوێنـەر دەكـەین مەبەسـت لـە دانـەر و خوێنەری راستەقینەیە، كە لە جیهانی واقعی دەژیـن و كەسـایەتییەكی ئاسـاییان هەیە و سەرقاڵی نەهامەتییەكانی ژیانی رۆژانەن، بە پێچەوانەی دانـەر و خوێنـەری نـاوەكی كـە تـەنها لـە جیهـانی خەیاڵیـدا بوونیـان هەیـە، كـە جیهـانی نووسـینە و كەسایەتییەكی راسـتەوخۆیان نییـە لـەو جیهانـەدا و گوزارشـت لـە خـودی خۆیـان ناكەن تیایدا، ئەمەش دەبێتە هۆی لـە كارخسـتنی هـەموو پەیوەندییـەكی زمـانیی راستەقینە لە نێوانیاندا.

جیهـانی واقعـی جیهـانێکی راسـتەقینەیە و تـەواوە لـە رووی کـەس و کـات و دەوروبەر و شوێن و رووداوەکانـەوە و تایبەتـە بـە دانـەر و خوێنـەری راسـتەقینە، جیهانێکی کراوەیە و سنوورێك نییە بۆ وردەکارییەکانی و ناکرێ تێکەڵ بە جیهانی نووسین بکرێ کە جیهـانێکی خەیاڵییـە و کۆتبەنـدە لـە رووی پێکهاتـەی زمـانی و ئەوەی وشەکانی دەق و پێکهاتەی زمانی گوزارشتی لێ دەکەن.

هەموو دەقێکی گێڕانەوە دانەرێکی راستەقینە و دانـەرێکی خـەیاڵی هەیـە کـە رۆڵــی گێــڕەرەوە دەبینــێ ئــەو جیاوازییــە رێ بــە نووســەر دەدات لــە هــەموو گێڕانەوەیــەك جیهــانێکی جیــاواز وێنــە بکێشــێ، بــەجۆرێك بــۆ هــەر رۆمانێــك گێڕەرەوەیەك دابنــێ، کـە دەکـرێ ئافرەتێـك، پیاوێـك، منـداڵێك یـان هەنـدێ جـار ئاژەڵێك، یا شتێکی بێ گیان ئەو رۆڵە ببینێ، هەندێك جار جیهانی واقعی (جیهـانی دانەر) لەگەڵ جیهانی گێڕانـەوە یـەك دەگرێتـەوە بەتایبـەت لـە ژیاننامـەی خـودی کاتێك دانەر بـاس لـە ژیـانی خـۆی دەکـات، بـەلاًم ئـەو یەکگرتنـە بەشـێوەی وەك یەکیــەکی تــەواو نــابێ، چــونکە پێویســتی هونــەر ئــەوە بەســەر نووســەرەوە دەسەپێنێ، کە هەندێك شت لەجیهانی واقعی هەڵبـژێرێ و هەنـدێکی تـر پشـتگوێ بخات، ئەمەش وادەکات جیهانی وێنەکێشراوی دەق جیاوازبێ لە جیهـانی واقعـی و دابڕاوبێ لێی، تەنانەت گەر لە هەردوو حاڵەتدا بـاس لـە یـەك شـت بکـرێ (بڕوانـە: لطيف زيتوني ٢٠٠٢:١٣٥).

### ١-٧-١-١. خوێنەری راستەقینە و خوێنەری خەیاڵی (ناوەکی):

مەبەسـت لـە خوێنـەری دەق خوێنـەری راسـتەقینەی دەقـە، نـەك خوێنـەری ناوەکی دەق، ئـەو خوێنـەرەی کتێـب بەدەسـتەوە دەگـرێ و لـە ژێـر کاریگـەرایی هۆکاری دەروونی و کۆتە کۆمەلاًیەتی و رۆشنبیرییە جیاجیاکان، بە پێی شارەزایی کەسی و زیرەکی و لێهاتووییەوە پێشوازی وێنە هۆشـەکییەکانی دەق دەکـات لـە میانــەی پرۆســەی خوێندنــەوەدا، ئــەو وێنانــەش بــە رەنگــی ئــەو ئەزموونــە عەمارکراوەی لای خوێنەر بوونی هەیە رەنگ دەکرێ.

ئەگەر نووسەری ناوەکی بریتی بێت لەو بیرۆکەیەی کە لە مێشکی خوێنەری راستەقینەدایە دەربارەی نووسەری راستەقینە ئەوا خوێنەری راستەقینە ئەو وێنە خەیاڵییەیە کە لەمێشکی نووسەردایە دەربارەی خوێنەری نموونەیی، بەهۆی ئەوەی نووسەر ناتوانێ بەڕێگەی نووسین روو لە خوێنەری راستەقینە بکات، بۆیە روو لە خوێنەری ناوەکی دەکات بۆئەوەی مەبەستەکەی بگەیەنێ.

خوێنەری ناوەکی کە دانەر لەکاتی نووسینی دەقدا لە خەیاڵی خۆی وێنەی دەکێشێ و بە خوێنەری خەیاڵیش ناودەبرێ، وەك پێشنیازێکە بۆ خوێنەری راستەقینە و نزیکبوونەوەی ئەم دوو جۆرەی خوێنەر لە یەکتر پەیوەستە بە رادەی جیاوازیی نێوان بیروباوەڕی خوێنەری راستەقینە و بیروباوەڕی دانەر، کە لە رێگەی دەقەوە پێشکەشی دەکات، (خوێنەری راستەقینە لەگەڵ خوێنەری ناوەکی (Implied reader) و بۆگێڕەوە (Narrate) جیادەبێتەوە، لەوانەیە دوو رۆمان خوێنەری ناوەکی و بۆگێڕەوەی جیاوازیان هەبێ، بەلاّم هەمان خوێنەریان هەبێ، هەروەها گێڕانەوە یەك خوێنەری ناوەکی و یەك بۆگێڕەوە لەخۆ دەگرێ، بەلاّم دەکرێ زیاتر لە خوێنەرێکی هەبێ (جیرالد پرنس ٢٠٠٣: ١٦٣).

باسکردنی خوێنەری راستەقینە و جیاکردنەوەی لە خوێنەری ناوەکی و بۆگێڕەوە بابەتێکە دەچێتە بواری مێتا دەق و بەستنەوەی ئەدەبە (دەقی نووسراو) بە پڕاگماتیکەوە.

بە رای "ئیسر" خوێنەری ناوەکی کەسێ نییە، کە دانەری ناوەکی، یان راستەقینە دەیدوێنێ، بەڵکو بریتییە لە توانایەکی نادیار کە بوون و دەرکەوتنی تەنها لە پرۆسەی خوێندنەوەدا دەبێ، ئەگەر چەمکی خوێنەری ناوەکی یارمەتیمان بدات بۆ تێگەیشتن، لەوەی چۆن رواڵەتی دەق کار دەکات ئەوا تێڕوانینمان بۆ خوێنەری راستەقینە کە هەڵگری وەلاّمەکانی کردە دەروونییەکان و ئەو ئارەزووانەیە، کە خەڵکان هەموو بەشدارن تیایدا و یارمەتیمان دەدات بۆ تێگەیشتن لەوەی چۆن ناوەوەی دەق کار دەکات.

**١ـ٧ـ١ـ٢. دانەری ڕاستەقینە و دانەری خەیاڵی (ناوەکی):**

دانەری ڕاستەقینە ئەو لایەنە هۆشمەندەیە کە دروستکەری دەقە و خاوەن کەسایەتییەکی دیار و بەتوانایە و هەموو کارێکی ئەدەبی دانەرێکی هەیە، کە بە دەقەکەیەوە نووساوە وەك نووسانی خاك بە ڕەگ و دەیەوێ لە ڕێگەی دەقەکەیەوە نامەیەك بگەیەنێ، هەرچی دانەری ناوەکییە کە دەرکەوتنی بەستراوەتەوە بە دەق، (لە ئاستی ئایدۆلۆژیای بەرهەمی ئەدەبیدا دەکرێ ئایدۆلۆژیای دانەری ناوەکی بۆ دەقە گێڕدراوەکە جیابێ لە بۆچوونی دانەری واقعی کە لە جیهانی ئاسایی خۆی گوزارشتی لێدەکات (رولان بارت ١٩٩٢: ٩٠).

ئەو بیروڕایانەی لە ئارادان دەربارەی بوون و جیاوازیی دانەری ناوەکی لەگەڵ دانەری ڕاستەقینە زۆرن و هەوڵ دەدەین هەندێك لە بیروڕاکانی ئەو زانا و لێکۆڵەرانە بخەینە روو[٧]:

دانەری ناوەکی لەلای "بۆث" (Wayne Both) کە خاوەنی ئەم زاراوەیە، ("من"ی دووەمە (الأنا الثانية) بۆ دانەر کە لە (من)ی پەیوەستدار بە مەرجەکانی واقیع جیا دەبێتەوە و لەگەڵ جیهانی خەیاڵی یەك دەگرێ، بەجۆرێك ئەو (من)ە توانای جێبەجێکردنی بابەتییانەی کاری ئەدەبی هەیە، کە دەگۆڕێ بۆ دەنگی هاوسێ (متجاور) لە هەموو بەرهەمێك و بە بیروباوەڕەکانی دانەری ڕاستەقینە نەبەستراوەتەوە ( عبدالناصر حسن ١٩٩١: ١٣٢).

بەلام "ئیسر" (Wolfgang Iser) بەرهەڵستی ئەم رایەی "بۆث" دەکات سەبارەت بە دانەری ناوەکی دەق، بەڕای ئەو دەق دانەری ناوەکی نییە، بەڵکو (جۆرێکە لە ئاڕاستەکردنی ناوەکی کە لە ڕێگەی کاری ئەدەبییەوە ئاڕاستەی وەرگر دەکرێ و هیچ بەرهەمێکی ئەدەبی لەو ئاڕاستەیە بێبەری نییە و بنەمایەکە بۆ پرۆسەی پەیوەندیکردن لەڕێگەی کارلێکردنەوە (عبدالناصر حسن ١٩٩١: ١٣٣).

هەرچی "تۆدۆرۆف"ە نووسەری ڕاستەقینە و نووسەری ناوەکی جیا دەکاتەوە، بەجۆرێك کە نووسەری ناوەکی لەناو دەقدا بوونی هەیە، بەلام نووسەری ڕاستەقینە لە جیهانی واقعیدایە، نووسەری ناوەکی چیرۆك ڕێکدەخات و بەرپرسیارە لە ئامادەبوون، یان ئامادەنەبوونی بەشەکانی چیرۆکەکە، ئەگەر هیچ

کەسایەتییەك نەبێ بۆ نواندن و جیاکردنەوەی نووسەری ناوەکی، ئەوە واتای ئەوە دەگەیەنێ گێڕەرەوە و نووسەری ناوەکی یەکیان گرتووە.

"گینیت" ئەرکی نووسەری ناوەکی رەت دەکاتەوە و بە رای ئەو چیرۆك نووسەرێکی راستەقینەی هەیە دەینووسێ و گێڕەرەوەیەکی خەیاڵی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە و پێویست بە بوونی سێیەم (نووسەری ناوەکی) ناکات و بوونی نییە، ئەگەرچی نووسەری ناوەکی زانیارییەکان پێشکەش دەکات، ئەوە تەنها وێنەیەکی نووسەری راستەقینەیە و هیچ تایبەتمەندییەك نییە وێنە لە راستەقینە جیابکاتەوە، کە مایەی گرنگیپێدان بێ تەنها ئەگەر وێنەیەکی ساختە بێ.

"بەختیار عەلی" لە رۆمانی (جەمشیدخانی مامم کە هەمیشە با لەگەڵ خۆیدا دەیبرد)، لە کۆتایی رۆمانەکەدا لەسەر زاری (سالار) کە گێڕەرەوەی سەرەکی دەقەکەیە وەك ئاماژەکردنێك بە نووسەری ناوەکی و پێدانی رۆڵی نووسەری ناوەکی بە (سالار) و دروستکردنی تەمومژی و گرێیەك لەلای خوێنەری دەق دەربارەی ئەوەی ئایا نووسەری ناوەکی و نووسەری راستەقینە هەمان کەسن یاخود نا؟ لە رێگەی کۆتاییهێنان بە دەقی رۆمانەکە بەم شێوەیە:

(با لە دەرەوە وەك درندەیەکی بریندار دەناڵێنێت، من بێ ئەوەی گوێ لە هەرەشەکانی بگرم دەنووسم "لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٩دا کە جەمشیدخان بۆ یەکەم جار گیرا تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو..." ئەوە دەنووسم و دەوەستم... دوودڵم لە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە، کە دەزانم ئەوانەی جەمشید خانیان بە راستی نەبینیوە، نە هەرگیز باوەڕی پێدەکەن، نە هەرگیز تێیدەگەن) (بەختیار عەلی: ٢٠١٠:١٥١).

**١-٧-٢. دانەر و نووسەر** (Author and Writer) :

زۆرجار زاراوەی دانەر و نووسەر (مەبەست دانەر و نووسەری راستەقینەیە) تێکەڵ بەیەکتر دەکرێن و بەبێ گوێدانە جیاوازیی نێوانیان لەشوێنی یەکتر بەکاردێن، دانەر داهێنەری دەقە و مەبەست بە دەق دەدات و بیرۆکەی دەق بیرۆکەی دانەرەکەیەتی، بەرپرسیاریەتی ئامانجەکانی دەگرێتە ئەستۆ، کاتێك

خوێنەر ئاماژە بە دەقێك دەكات بێگومـان ئامـاژە بـە دانەرەكـەی دەكـات، دانـەر لەوانەیـە كەسـێك یـان ڕێكخراوێـك بـێ زۆربـەی كـات دانـەر نووسـەرە و خـۆی هەڵدەستێ بە نووسـین و داڕشـتنی بیرۆكەكـەی، نووسـەر دەق دروسـت دەكـات و بەرپرسـیارە لـە زمـانی دەق و زۆربـەی كـات كەسـێكە، بـەڵام هەنـدێ جـار چـەند نووسەرێك بەیەكەوە كار دەكەن.

نووسینی داڕشتن لەلایەن قوتابیـان دوای دیـاریكردنی بابەتەكـە نموونـەی ئـەم جۆرەی نووسینە كە مامۆستا بیرۆكەی بابەتەكە پێشكەش بە قوتابیـان دەكـات و داوا لە هەریەكێكیان دەكات بـە شـێوازی خـۆی بابەتەكـە بنووسـێ، ئـەم جـۆرەی نووسـین زیـاتر لـە نووسـراوە ریكلامییـەكان و لیسـتی فرۆشـگاكان و تێبینـی و ڕێنماییەكانی دام و دەزگاكان دەبینرێ، كە دانەر بیرۆكەی بابەتێك دادەنێ و داوا لە كەسانی تـر دەكـات بینووسـنەوە، یـاخود كاتێـك دانـەرێك كتێبێـك دادەنێـت و بابەتی چەند نووسـەرێكی تـری تیـادا بـڵاو دەكاتـەوە، ئـەوكات دانـەری كتێبەكـە لەگەڵ دانەر و نووسەری بابەتەكان جیادەبێت، بەڵام لە دەقـی گێڕانـەوەدا هـەموو كات دانەر و نووسەر یەك كەس دەبێ.

### ١-٧-٣. خوێنەر و جەماوەر[٨] (Reader and Audience):

دانەر كاتێك دەست دەكات بە نووسینی بابەتێك سەرەتا پێشگریمانەیەك بـۆ ئاستی مەعریفی و ڕۆشنبیریی ئەو كەسانە دادەنێ، كە دەقەكەیان بـۆ دەنووسـێ، هەر دانەرێك جەماوەری خۆی هەیە، كـە لـە خـەیاڵی دانـەردان و هـەوڵ دەدات لـە ڕێگـــەی دەقەكەیـــەوە پەیوەنـــدییان لەگـــەڵ بكـــات و بیانـــدوێنێ و وەڵامـــی پرسیارەكانیان بداتەوە، (لە گفتوگۆیەك لەگەڵ "ئەدۆنیس" دەڵێ: من جـەماوەرم نییـە و جـەماوەرم نـاوێ دواتـر بەماوەیـەكی كـورت گـوتی: داهێنـەران تـەنها خوێنەریان هەیە، كەواتە جیاوازیی هەیە لـە نێـوان جـەماوەر و خوێنـەر جـەماوەر تـەنها ئامـاژە بـە حاڵـەتێكی گشـتی وەرگـرتن دەكـات بـۆ ئاسـۆیەكی گشـتی لـە پێكهاتەی دەروونی و ئارەزوو و بۆچوونی دەسـتەیەك كـە چـونیەكی دەیجـووڵێنێ نەك جیاوازیی لە گیانی گشتی و تایبەتمەندیی تاك (عبدالناصر حسن ٩٦:١٩٩١) .

جەماوەر خوێنەری نموونەیی و مەبەستدارن، ئەوەی راستی بێ هیچ دانەرێك نییە هەرچەندە بەتوانابێ بتوانێ دەقێك بنووسێ بێ ئەوەی کەسانێك هەبن لە مێشکیدا گریمانەی خواست و ویستەکانیان بکات و ئاستی مەعریفی و ئارەزووەکانیان لەبەر چاو بگرێ .

هەرچی خوێنەرە کە مەبەست لێی خوێنەری راستەقینەیە ئەو کەسەیە کە بە(فعلی) دەق دەخوێنێتەوە و مامەڵەی لەگەڵ دەکات و مەرج نییە وەڵامدانەوەکەی ئەوە بێ کە دانەر چاوەڕوانی دەکات، ئەوە تەنها لەلای خوێنەری نموونەیی روودەدات.

ئاڕاستەی وەرگرتن و وەڵامدانەوە لە چوارچێوەی پەیڕەوی گەیاندنی ئەدەبیدا لە نێوان دانەر و جەماوەر جیایە لەوەی کە لە نێوان دانەر و خوێنەردا روودەدات، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی جەماوەر لە خوێنەر، لە کاتێکدا کە خوێنەر کەسایەتییەکی راستەقینەیە و لە جیهانی واقعیدا بە(فعلی) دەق دەخوێنێتەوە، بەڵام جەماوەر وێنەی وەرگرێکی خەیاڵییە تەنها لە مێشکی دانەردا بوونی هەیە و ئاڕاستەی وەرگرتن و وەڵامدانەوە لە چوارچێوەی زاراوەی جەماوەر بەیەك ئاڕاستە دەبێ، لە نووسەرەوە بۆ جەماوەر بێ ئەوەی بوار بەو ئاڕاستەیە بدرێ بگەڕێتەوە بۆ دانەر.

**دانەر ⟵ جەماوەر**

لە کاتێکدا دەبینین چەمکی خوێنەر بەئاڕاستەیەکی پێچەوانە دەڕوات، ئەگەر جەماوەر بەرجەستەکردنی ئەو ئاڕاستەیە بێ کە پشت بە تایبەتمەندیی دەنگی دەبەستێ، ئەوا لە چوارچێوەی چەمکی خوێنەر پشتبەستن بە تایبەتمەندیی نووسین و شێوازی رێنووسی دەبێ.

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی جۆری پەیوەندیکردن کە لە جۆری یەکەمدا پەیوەندییەکە لە شێوەی دواندنی خودی دەبێ کە (مۆنۆلۆژ)[٩] ی پێدەگوترێ، بەڵام لە حاڵەتی دووەم کە پەیوەندی خوێنەرە بە دەقی نووسراو، کە پرۆسەیەکی زیندوو و داهێنەرە، وەکو بازنەیەك وایە کە دەق تیایدا داناخرێ و لەگەڵ هەر خوێندنەوەیەك بەردەوام لە نوێبوونەوەدایە.

ئەگەر جەماوەر رەوشی كۆمەڵی وەربگرێ ئەوا خوێنەران دەستە و توێژ نین و نموونــەی دابــڕاون لەیــەكتر یــاخود بەرجەســتەكردنن بــۆ تاكایــەتی وەرگــرتن و تایبەتمەندییــەكانی، كــە هەریــەكێكیان بــە دابڕانــی جەســتەیی و روحــی دیــاری دەكــرێن لــە نزیكبوونــەوە لــە كــاری ئــەدەبی و وەرگرتنــی وردەكارییــەكانی، هەریەكێكیان شێوازێكی تایبەتی هەیە لە خوێندنەوە و وەرگرتن و زەخیرەیەك لـە شارەزایی و مەعریفەی كەسی.

لەو كاتەی كە جەماوەر لە كۆتایی ڕێگا دەوەستێت و گەڕانەوە قبوڵ ناكات، ئەوا خوێنەر نیشانە نییە بۆ ڕێگایەكی داخراو، بەڵكو بەیەكگەیشـتنێكی زینـدووە، بۆ ڕێگای داهاتووی دەق، بۆئـەوەی ڕێگایـەكی تـری لێ پەیـدابێ بـۆ گەڕانـەوە بـۆ دەق، ئەو ڕێگایە دانەر و جەماوەر بەیەكەوە نابەسـتێتەوە و ڕێگـای نێـوان دەق و خوێنەرە، ئەو ڕێگایە یـەك ئاڕاسـتە وەرنـاگرێ، بـەڵكو دوو ئاڕاسـتەی پێچـەوانەی یەكتری هەیە، هەریەكێكیان گەشە دەكات و گەشەپێدەرە لە یەك كاتدا .

خوێنەر ⇄ دەق (بڕوانە: عبدالناصر حسن ١٩٩١:٩٦)

**١ـ٧ـ٤. دانەر و گێڕەرەوە** (Author and Narrator) :

بێگومان دەقەكانی گێڕانەوە شێوەیەكی سەرەكی پەیوەنـدیكردن پێـك دێـنن، مەبەسـت لـە دەقـی گێڕانــەوە هــەموو جــۆرێكی گێڕانــەوە دەگرێتــەوە وەك ئــەو گێڕانەوە سادانەی كـە هەریـەكێك لـە ئێمـە دەربـارەی بەسـەرهات و ڕووداوەكـانی ژیانی ڕۆژانەی خـۆی و كەسـانی دەوروبـەری دەیگێڕێتـەوە، كـە ئەمـە سـادەترین نموونەی گێڕانەوەیە و ئاخاوتنی ڕۆژانە پڕیەتی لە نموونەی ئەو جۆرەی گێڕانەوە، ئـەم جـۆرەی گێڕانـەوە بـە لەبەرچـاوگرتنی ئـەو دەوروبـەرەی گێڕانەوەكـەی تیـا ڕوودەدات، چـیرۆكی سـادە و سروشـتین و لـە شـێوەی زارەكـی لـەنێوان خـەڵكی ئاسایی ڕوودەدات .

جۆرێكی تری گێڕانەوە بریتییە لەگێڕانەوەی نوكتە و چیرۆكی میللی و ئەفسانە و چـیرۆكە خەیاڵییـەكان و بەسـەرهاتی كـۆن و ڕووداوی مێـژوویی، كـە بەشـێوەی

زارەکی باس دەکرێن، بەڵام هەرچی گێڕانەوەی ئەدەبییە ئەوا لە شێوەی دەقی نووسراودایە، پێکهاتەیەکی ئاڵۆزی هەیە، بە شێوازێکی هونەرییانە و لەلایەن کەسانی بە توانا و لێهاتوو لەم بوارە دەنووسرێ، وەکو کورتە چیرۆك و گەشتنامە و رۆمان و ژیاننامە و جۆرەکانی تری گێڕانەوە، رووداوەکانی ئەم جۆرەی گێڕانەوە وەکو رووداوی راستەقینە نییە تەنانەت گەر لە جیهانی واقیعیش وەرگیرابێ، چونکە لەم جۆرەی گێڕانەوە کاتێك نووسەر دەقەکەی دەنووسێ ئەوە هەڵدەبژێرێ، کە لەگەڵ نووسینە هونەرییەکەی دەگونجێ.

گێڕانەوە بەلایەنی کەمەوە لە سێ لایەن پێکدێ، گێڕەرەوە (مەبەست لە گێڕەرەوە گێڕەرەوەی ناو دەقە نەك گێڕەرەوەی چیرۆك لە جیهانی راستەقینە)، کە کەسێکە قسە دەکات و گوتنەکان ئاڕاستەی لایەنی دووەم (بۆگێڕەوە) دەکات و لایەنی سێیەم کە قسەی لەبارەوە دەکرێ، گێڕەرەوە کەسایەتییەکە بوون و دەرکەوتنی بەستراوەتەوە بە دەق و ئەرکی پێشکەشکردنی دەقی گێڕانەوەکە دەگرێتە ئەستۆ، (گێڕەرەوە، وەك یەکێك لە رەگەزە سەرەکییەکانی پرۆسەی گێڕانەوە، سەرەتا لە حیکایەت و داستانی سەرزارییەوە هاتووەتە ناو چیرۆك و رۆمانەوە (جەلال ئەنوەر ۲۰۰۹:۲۹).

دانەر لە گێڕەرەوە جیا دەبێتەوە بەوەی کەسایەتییەکی راستەقینەیە و دروستکەری جیهانە خەیاڵییەکەیە، کە چیرۆکەکەی لێ پێکدێت هەر ئەویشە گێڕەرەوە دیاری دەکات، وەك چۆن تەکنیکی رووداو و کەسایەتییەکانی چیرۆکەکە و سەرەتا و کۆتایی هەڵدەبژێرێ.

لە دەقی چیرۆکدا نووسەر راستەوخۆ دەرناکەوێ، بەڵکو لە پشت رووبەندی گێڕەرەوە خۆی دەشارێتەوە، بەڵام هەندێك جار گێڕەرەوە باس لە رووداوێکی واقیعی دەکات و خۆی بەشێکە لەو رووداوە، وەك ئەوەی لە یاداشتنامە و ریپۆرتاژەکان و رووداو و بەسەرهاتی راستەقینە و گەشتنامەکان دەبینرێ، لەم جۆرەی گێڕانەوە گێڕەرەوە دانەر خۆیەتی و ئەو رووداوانە دەگێڕێتەوە، کە گوێی لێ بووە، یان بینیویەتی ئێمە لەو حاڵەتەدا بەرانبەر گێڕەرەوەیەکی راستەقینەین، نەك خەیاڵی، بەڵام لە دەقی خەیاڵی دانەر خۆی رووداوەکان ناگێڕێتەوە بەڵکو ئەوەی رووداوەکە دەگێڕێتەوە کەسێکی خەیاڵییە، لەلایەن دانەرەوە دروست

کراوە "فۆگێر" لەم بارەیەوە دەپرسێ: (جیاوازیی (انطولوجی) چییە لەنێوان دەقی گێڕانەوەی ئەدەبی و ریپۆرتاژی رۆژنامەوانی، ریپۆرتاژ پێویستی بە پەیوەندییەکی راستەوخۆی نێوان دانەرو رووداوە گێڕدراوەکە هەیە، بەڵام دەقی ئەدەبی تایبەتمەندە بەئامادەبوونی گێڕەرەوەیەك کە وەك نێوەندێك دەبێت لەنێوان دانەر و چیرۆکە گێڕدراوەکە (رولان بارت ۱۹۹۲:۹۱).

ئەم جیاکردنەوەیە ئاشکراتر دەبێ لەو دەقانەی کە زیاتر لە گێڕەرەوەیەکی هەیە، وەك ئەو دەقانەی کە لە چیرۆکێك زیاتری تیایە و جگە لە گێڕەرەوەی سەرەکی کە هەموو گێڕانەوەکە پێشکەش دەکات، چەند گێڕەرەوەیەکی تری تیایە، کە ئەرکی گێڕانەوەی رووداوە لاوەکییەکان دەگرنە ئەستۆ، لەبارەی ئەم جیاوازییەی نێوان دانەر و گێڕەرەوە "کایزیر" Wolfgang Kayser دەڵێ: (گێڕەرەوە کەسایەتییەکی جیاوازە و لە کاری ئەدەبی بوونی هەیە، گێڕەرەوە لە گێڕانەوەی ئەدەبی بەهیچ شێوەیەك دانەر نییە، جا چ ناسراو بێ یا نەناسراو، بەڵکو رۆڵێکە دانەر دەیبەخشێ و دروستی دەکات (رولان بارت ۱۹۹۲:۹۲).

شوێنی گێڕەرەوە و پەیوەندی بە دانەری راستەقینە و رووداوە گێڕدراوەکە[١٠] لە گێڕانەوەیەکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ، مێی زاراوەی (Homodiegetic) بۆ ئەو گێڕەرەوەیە بەکاردێنێ کە بەشێکە لە چیرۆك (Mey2001:239)، زاراوەی دژ بەم زاراوەیە (Hetrodiegetic)ە کە بۆ گێڕەرەوەیەك بەکاردێ لە دەرەوەی دەقی گێڕانەوەکە بێ، دەکرێ حاڵەتەکانی شوێنی گێڕەرەوە بە گوێرەی ئاستی گێڕانەوەکە و پەیوەندی بە چیرۆکە گێڕدراوەکە لەم چەند حاڵەتەی خوارەوەدا دیاری بکەین:

١) گێڕەرەوەیەك لە دەرەوەی چیرۆکەکەیە و بەشێك نییە لە جیهانی دەق ئەمەش گێڕەرەوەی چیرۆکەکەیە بە جێناوی نادیار.
٢) گێڕەرەوەیەك لە دەرەوەی گێڕانەوەکەیە و بەشێکە لێی، ئەمەش گێڕەرەوەی چیرۆکە سەرەکییەکەیە بە جێناوی قسەکەر.
٣) گێڕەرەوەیەك لەناو چیرۆکەکەیە و بەشێك نییە لێی، ئەمەش کەسایەتییەکە لە ناو چیرۆکەکە رووداوێکی ناوەندی دەگێڕێتەوە.

٤) گێڕەرەوەیەك لەناو چیرۆكە و بەشێكە لێی، ئەمەش كەسایەتییەكە لەناو چیرۆكەكەو چیرۆكێكی ناوەندی دەگێڕێتەوە و خۆی بەشداره لە ڕووداوەكانی (عبدالناصر حسن ١٩٩١:٩٦).

**١ـ٧ـ٥. ئەركەكانی گێڕەرەوە:**

" گیرار گینیت" لە ڕوانگەی ئەو ئەركانەی كە "ڕۆمان یاكۆبسن" بۆ زمانی دیاری كردووە ئەركەكانی گێڕەرەوە بەم شێوەیەی خوارەوە دیاری دەكات :

* ئەركی یەكەم تایبەتە بە چیرۆك: ئەمەش ئەركی گێڕانەوەیە، گێڕەرەوە چیرۆك دەگێڕێتەوە.

* ئەركی دووەم تایبەتە بەدەق ئەویش ئەركی ڕێكخستنی دەقە: گێڕەرەوە لە ڕێگەی ڕێنماییەكانی بۆ دەقی چیرۆكەكەی ئەو پەیوەندی و جیابوونەوانەی لە ڕێكخستنی دەقەكەدا هەیە دیاری دەكات.

* ئەركی سێیەم تایبەتە بە حاڵەتی گێڕانەوە: ئەمەش ئەركی دڵنیابوون لە پەیوەندیكردن و مانەوەیەتی لەگەڵ دواندنی بۆگێڕەوە و دروستكردنی كاریگەری، "ڕودجرز" بەو گێڕەرەوانەی جەماوەرەكەیان دەدوێنن دەڵێ (حكائي)، "گینیت" پێشنیازی ئەوە دەكات بەو ئەركە بڵێن ئەركی پەیوەندیكردن.

* ئەركی چوارەم پەیوەستە بە هەڵوێستی گێڕەرەوە لەو دەقەی دەیگێڕێتەوە: ئەمەش ئەركی دانپیانانە، كە گێڕەرەوە بە جێناوی قسەكەر باس لە هەڵوێستێكی بیری یا ڕەوشتی و هەڵچوونی دەكات، لەگەڵ دانپیانان بە سەرچاوەی زانیارییەكان و وردیی یادەوەرییەكان و ئەو هەستانەی هەندێك لە ڕووداوەكانی گێڕانەوەكە تیایدا دروستی دەكات.

* ئەركی پێنجەم پەیوەستە بە هەڵوێستی گێڕەرەوە لە چیرۆك: ئەمەش ئەركێكی ئایدیۆلۆژی، یان لێكدانەوەییە، گێڕەرەوە بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ ڕوونكردنەوە دەربارەی ناوەڕۆكی چیرۆكەكە دەدات بەشێوازێكی فێركاری زانستی (لطيف زيتوني ٢٠٠٢:٩٦).

**١-٧-٦. بۆگێڕەرەوە و خوێنەر** (Narrate and Reader ):

ئەو جیهانە خەیاڵییەی دانەر لە دەقی گێڕانەوەدا وێنەی دەکێشێ، جگە لە گێـڕەرەوە و دانـەری نـاوەکی بـۆگێڕەوەی خـەیاڵیش دەگرێتـە خـۆ، کـە لەگـەڵ خوێنەری ناوەکی تێکەڵ دەبن (لە حاڵەتێکدا ئەگـەر لـە گێڕانەوەکـەدا ئامـاژە بـە بۆگێڕەوە نەکرابێ) بەڵام خوێنەری راستەقینە کە لە جیهـانی دەرەوەی دەقدایـە، بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەم دووانە یەك ناگرێت و کەسایەتییەکی جیایە.

بۆگێڕەوە ئـەو کەسـایەتییە خەیاڵییەیـە کـە گێـڕەرەوە گوتنـەکانی ئاڕاسـتە دەکات، جا چ بەشێوەی راستەوخۆ بێ، وەکو کەسایەتییەکی چیرۆکەکە بەشداری لە رووداوەکان بکات یـاخود بـۆگێڕەرەوە کەسـایەتییەکی نـاو چـیرۆکەکە نـەبێ و بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەشداری لە رووداوەکان نەکات، بەڵام گێڕەرەوە بیدوێنێ و سەرنجی بۆ خاڵێـك رابکێشـێ لـە رێگـەی گوتنـەکانی (ئـەی خوێنـەر، ئـەی ئـەو کەسەی ئەم چیرۆکە دەخوێنێتەوە...)، جۆرێکی تر لە بۆگێڕەوە ئەو بۆگێڕەوەیە کە نە بەشداری لە رووداوەکان دەکات و نە لەلایەن گێڕەرەوە باس دەکرێ، بـەڵام گێڕەرەوە گریمانەی بوونی دەکات لەلای هەرکەسێك کە دەقەکە بخوێنێتەوە.

گێراڵد پرنس"Gerald prince" دەپرسێ، (بۆچـی لـەکاتی لێکۆڵینـەوەمان بـۆ دەقــی گێڕانــەوە هــەموو هــەوڵێکمان دەخەینــە گــەڕ بــۆ جیاکردنــەوەی جــۆرە دیارەکانی گێڕەرەوە و هیچ پرسیارێك دەربارەی ئەوکەسە ناکەین، کە گێـڕەرەوە رووی قسە لەو دەکات،" پرنس" زاراوەی (بـۆگێڕدراوە)ی بـۆ بـەکار دێنـێ و نـابێ لەگـەڵ خوێنــەر تێکــەڵی بکــەین کــە هەنــدێك جــار گێــڕەرەوە لــەناو دەقەکەیــدا دەیــدوێنێ وەك بــەکارهێنانی زاراوەی (گــەورەم) (خــاتوونی بــەڕێز)، یــاخود دیاریکردنی تەمەن و ڕەگەز و چین، وەك (سپی پێست)، ئەمانە هـەموو نموونـەی ئەو بۆگێڕدراوانەن، کە گێڕەرەوە دەیدوێنێ، بـەڵام مـەرج نییـە لەگـەڵ خوێنـەری راستەقینە وەك یەك بن، لەوانەیە خوێنەری راستەقینە گەنجێکی رەش پێست بێت لەشوێنی حەوانەکەی چیرۆك بخوێنێتەوە (عبدالناصر حسن ١٩٩١: ٩٣).

بۆگێڕەوە کەسایەتییەکە لەجیهانی چـیرۆکدا، (لەوانەیـە نـاوێکی دیـاریکراوبێ لەپێکهاتەی گێڕانەوەکەدا، بـەڵام وەك گێـڕەرەوە کەسـایەتییەکە لـە کاغـەز، یـان

بوونەوەرێکی نادیارە، یان خەیاڵییە کە هێشتا دەرنەکەوتووە یاخود کۆمەڵگایەکە بەتەواوی یان بیرۆکە و مەسەلەیەکە دانەر دەیدوێنێ بەمەبەستی هونەری (امنة یوسف ۱۹۹۷:۲۹).

وەك چۆن هەریەك لە خوێنەر و دانەری راستەقینە لەگەڵ خوێنەر و دانەری خەیاڵی بەپێی ئەو جیهانەی تیایدا دەردەکەون جیاواز دەبن، بەهەمان شێوە بۆگێڕەوەی خەیاڵی، کە لە جیهانی هونەریی دەقدایە لەگەڵ ئەو بۆگێڕەوەیە جیاوازە، کە لە جیهانی راستەقینە لەلایەن گێڕەرەوەی راستەقینە گێڕانەوەکەی ئاڕاستە دەکرێ، وەك گێڕانەوەکانی دادگا و گێڕانەوەی چیرۆك لەلایەن داپیرە بۆ نەوەکانی، یان ئەو حاڵەتانەی کەسێك باسی نهێنییەکی خۆی بۆ کەسێك دەکات، یان رووداوێکی بۆ دەگێڕێتەوە، ئەوانە هەموو نموونەی ئەو گێڕانەوانەن، کە لەنێوان گێڕەرەوە و بۆگێڕەوەی راستەقینە روودەدات.

### ۱ـ۸. کردەی خوێندنەوە:

خوێندنەوە کردەی دەرکردنی واتایە لە حاڵەتێکی شاراوە و ونبووەوە بۆ حاڵەتی دەرکەوتن، بنەمای ئەم کردەیەش کارلێککردنێکی هاوبەشە لەنێوان خوێنەر و دەق کە بریتییە لە پەیوەندی ناڕاستەوخۆی نێوان دانەر و خوێنەر بە جۆرێك کە هەرچەندە دانەر بە شێوەیەکی بەرجەستە بوونی نییە لەو پەیوەندییەدا و خوێنەر وەڵامی ناداتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا وا هەست دەکات دانەر دەیدوێنێ.

"تۆدۆرۆف" سێ جۆر لە خوێندنەوە دیاری دەکات:

**۱ـ خوێندنەوەی جێکەوتەیی (القراءة الاسقاطية):**

ئەمە جۆرێکە لە خوێندنەوەی کۆن و شوێنکەوتوو، کە گرنگی بەدەق نادات، بەڵکو لە رێگەی دەقەوە بۆ دانەر و کۆمەڵگا دەڕوات، بەجۆرێك مامەڵە لەگەڵ دەق دەکات، کە وەك بەڵگەیەکە بۆ سەلماندنی مەسەلەی کەسی، کۆمەڵایەتی یا مێژوویی.

**٢ـ خوێندنەوەی ڕاڤەکاری (القراءة الشارحة):**

ئەم جۆرەی خوێندنەوە پابەندی دەق دەبێ، بەڵام تەنها گرنگی بە لایەنی واتایی دەدات و پشت بە لێکدانەوەی واتای رووکەش دەبەستێ کە بریتییە، لە دانانی واتای لەبریتی (بدیل) کە ئەمەش دووبارەکردنەوەیەکی ساویلکانەیە بۆ هەمان وشە.

**٣ـ خوێندنەوەی ئەدەبییانە (القراءة الادبية):**

ئەمەش خوێندنەوەی دەقە لە ڕێگەی شیکردنەوەی کۆدەکان لەژێر ڕۆشنایی دەوروبەرێکی هونەریدا، دەق لەناو ئەم جۆرەی خوێندنەوەدا وەك یەکەیەکی زیندوو دەجووڵێ و هەموو بەربەستەکانی نێو دەق دەشکێنێ، ئەم جۆرەی خوێندنەوە هەوڵی ئاشکراکردنی ئەوە دەدا کە لە ناوەوەی دەقدایە، زیاتر دەخوێنێتەوە لەوەی دەربڕاوە (عبدالناصر حسن ١٩٩١:٥٥).

"ئەمبەرتۆئەکۆ" لەبارەی کردەی خوێندنەوەوە دەڵێ: (کاتێك نووسەر دەقێك نەخشە دەکێشێ پلان بۆ چۆنیەتی خوێندنەوەی ئەو دەقە دادەڕێژێ ئەمەش دوو گریمانەی هەیە: یان ئەوەتە نووسەر خوێندنەوەکەی خوێنەر بەشێوەیەکی تەواو ئاڕاستە دەکات، ئەو کاتە بەرامبەر دەقێکی داخراو دەبین، یاخود بەشێوەیەك نەخشەی دەقەکە دەکێشێ کە خوێندنەوە و لێکدانەوەی جیاجیا قبوڵ بکات، ئەو کاتە بەرامبەر دەقێکی کراوە دەبین (لطيف زيتوني ٢٠٠٢: ١٣١).

خوێندنەوە بە تەواوکەری دەق دادەنرێ و ئەو چالاکییە زیندووەیە کە کەم و کوڕییەکانی دەق تەواو دەکات، بەتایبەتی لە گێڕانەوەدا، کە نووسەر چەند بۆشاییەك بۆ خوێنەر بەجێ دێڵێ بۆ ئەوەی پڕیان بکاتەوە، هیچ دەقێکی ئەدەبی لە توانایدا نییە هەرچەندە لاپەڕەکانی زۆربن جیهانێکی پڕاوپڕ وەك ئەو جیهانە واقعییە دروست بکات، کە تیایدا دەژین، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سنووردارییی توانای نووسەر لە وەسفکردنی جیهانی واقعی، ئەگەر وابێ وەسف کۆتایی نایەت، بۆیە دەکرێ بڵێین (خوێندنەوە پرۆسەیەکی داهێنەرانەیە، لەبارەی

نوێکردنەوەی چالاكییەوە نەك وەکو شتێکی نادیار، بەکارهێنانێکی پێشبینیکراو و مەزەندەکراوە لە تازەکردنەوەیەکی ئاسان (Mey2001:237).

ئەم سنووردارییەی توانای نووسەر لە وەسفکردنی کەسایەتییەکانی ناو چیرۆك و رۆمانەکان بە ئاشکرا دەردەکەوێ، کاتێك نووسەر وەسفی چەند لایەنێك لە روخساری پاڵەوانێك، یاخود کەسایەتییەکی ناو چیرۆکێك دەکات، خوێنەر خۆی ئەو وەسفە تەواو دەکات و وێنەی ئەو کەسایەتییە لە خەیاڵی خۆی دەکێشێت بەجۆرێك کە بەتەواوی لەو کەسایەتییانە بچێت کە لە جیهانی راستیدا دەیانبینێ، ئەم وەسفەش بە پێی لێهاتوویی و توانای نووسەر لە وەسفکردندا لە نووسەرێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ، بۆنموونە نووسەری دەقی "جەمشیدخانی مامم کە هەمیشە با لەگەڵ خۆیدا دەیبرد" لە یەکێك لە برگەکانی گێڕانەوە بەم جۆرە وەسفی پاڵەوانی دەقەکە (جەمشیدخان) دەکات: (جەمشید نیوەرۆیەکی درەنگ دەگاتەوە ماڵی حیسام خانی باپیرم. حیسام خان سەری لەم کورە بێ گۆشت و لەڕە دەسوڕمێت کە هەر پێستێکی ناسکە و بەسەر هەندێك ئێسکی باریکدا وشك بۆتەوە (بەختیار عەلی ٢٠١٠:٦)، دواتر لە برگەیەکی تری گێڕانەوەکە بەم جۆرە وەسفی دەکات:

(من کە بۆ یەکەم جار بینیم، کەسێکی لەڕ و قوپاو بوو لە مەخلووقێك دەچوو لە کاغەزی بۆر دروست بووبێت، پیاوێکی تەنك کە، لەسەر لا وەك خەتێکی باریك دەردەکەوت، هەر بە دەزوویەك دەچوو هەوا بیهێنێت و بیبات، بە تەنێك دەچوو نەسیم بیجووڵێنێت (هەمان سەرچاوە:٧).

خوێندنەوە لە کاتێکا قورسایی سەر شانی خوێنەر لە ژیانی واقعیدا کەم دەکاتەوە و گرانییەکانی ژیانی سانا دەکات، لە هەمان کاتدا لە جیهانێکی تری تایبەت کە جیهانێکی دەستکردە لەلایەن نووسەرەوە لەرێگەی دەق بە جیهانی واقعی ئاشنای دەکاتەوە، ئەمەش بە ئاشکرا لەو حاڵەتانەدا دەردەکەوێ، کاتێك خوێنەر بە شێوەیەکی بێئاگاییانە تێکەڵ بە جیهانی خەیاڵیی دەق دەبێت و خەم بۆ نەهامەتییەکانی ژیانی پاڵەوانێك دەخوات، یان بەشداری ساتە خۆشەکانی دەکات، ئەم کاریگەرییە ئەوە دەسەلمێنێ، کە توانای دەقی ئەدەبی زۆر لەوە

زیاترە کە تەنها گوزارشتێکی زمانی بێت، بەڵکو ئەو لایەنەی چالاکی زمانە کە کاریگەری بەرچاوی هەیە لە سەر هەڵسوکەوتی تاك کە توانای هەیە خوێنەر تووڕە بکات و بیترسێنێ، یان دڵخۆشی بکات و دڵنەوایی بداتەوە .

بەهۆی ئەوەی خوێنەر تاکێکی دابڕاو نییە لە کۆمەڵگا، ئەم کاریگەرییە رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە گەشەسەندنی کۆمەڵگادا بە گشتی بە جۆرێك لەوانەیە دەقێکی کاریگەر ژیانی تاکێك بەتەواوی بگۆڕێت، لە ئەنجامی رەنگدانەوەی ئەو پەیوەندییەی خوێنەر لەگەڵ دەق دروستی کردووە، ئەم کاریگەرییەش ئەوەمان بۆ دەردەخات، ئەگەر ئاخاوتن لە ژیانی رۆژانەدا زیاتر هەوڵێك بێت بۆ راکێشانی لایەنی بەرامبەر بۆ وەرگرتنی هەڵوێستێك، وەك لەوەی کردەی گەیاندنی هەواڵێك بێ، ئەوا ئەو کاریگەرییە لە بەرهەمی ئەدەبیدا زۆر بەهێزتر دەبێ، لەکاتێکدا نووسەر هەوڵ دەدات هیچ شتێك بۆ رێکەوت بەجێ نەهێڵێ، بەجۆرێك کە بە ویستی خۆی دەسکاری دەربڕینەکان دەکات و هەموو هەوڵێکی دەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی بەرهەمەکەی کاریگەرتربێ بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی.

**بەشی دووەم ـ خوێندنەوە و پڕاگماتیك:**

سەرەتا بەرلەوەی باس لە پەیوەندی کردەی خوێندنەوە بە پڕاگماتیکەوە بکەین، دەبێ بزانین خوێندنەوە چی دەگەیەنێ؟ ئایا تەنها پەیوەندیی کاریگەری و کارتێکردنی نێوان دەق و خوێنەرە؟ یا توانستی خوێنەرە لە دۆزینەوەی واتای دەق، یاخود ئەو هێزە شاراوەیەی دەقە، کە خوێنەر بۆ ناو جیهانی دەق کێش دەکات؟ هەموو ئەو بۆچوونانە کردەی خوێندنەوە لە پەیوەندییەکی ئالۆگۆڕی نێوان دوو لایەن چڕ دەکەنەوە بەمەش لایەنی رۆشنبیری و دابونەریت و باری دەروونی و ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییە فەرامۆش دەکرێ، کە دەوری دانەر و خوێنەری دەق دەدەن.

خوێندنەوە تەنها کردەی گەڕان بە دوای واتا نییە لەدەقدا وەك چۆن لە کۆن باو بوو کە بڕوایان وابوو دەق تەنها موڵکی دانەرە و پێکهاتەیەکی داخراوی هەیە لە خودی خۆیدا و واتای دەقیش شتێکی جێگیر و حەتمییە لەلایەن دانەری دەق

دانراوە، بەڵکو واتای دەق تەنها لە چوارچێوەی بازنەی گەیاندندا دیاری دەکرێت، کە هەریەك لە دانەر و خوێنەری دەق بەشدارن لە دروستکردنی ئەو واتایە لـە کـات و شوێنی دیاریکراودا.

خوێنەر نـاتوانێ بـە ویسـتی خـۆی دەق لێـك بداتـەوە و وەك دانەیـەکی دابـڕاو سـەیری بکـات، چـونکە دەق وەك هـەر دانەیـەکی تـری زمـانی لەلایەکـەوە بـە دەوروبەری زمانی و لەلایەکی تریشەوە بە دەوروبەری پڕاگمـاتیکی دەورە دراوە و بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کـە نـاتوانرێ یـەك جـۆر خوێندنـەوە بسـەپێنرێ بەسـەر دەقدا، بـەبێ گوێدانـە ئـەو بارودۆخـەی دەوری دەق دەدات، ئەگـەر خوێندنـەوەی دەق بە ویستی خوێنەر بوایە ئەوا هەموو دەقەکان یەك واتایان دەبوو .

بۆنموونە ئەگەر سەیری لیسـتی فرۆشـگاکان، بکـەین کـە جۆرێکـە لەپەیوەنـدی نێوان بەڕێوەبەری فرۆشگا و کڕیارەکان دەکرێ لـە چـەند ڕوویەکـەوە پەیوەنـدیی خوێندنــەوەی ئــەو دەقــە بــە دەوروبــەرەوە لــە ڕوانگەیــەکی پڕاگمــاتیکی لێـك بدەینەوە، بۆنموونە ئەم وێنەیەی خوارەوە وێنەی لیستی فرۆشگایەك دەنوێنێ کە چەند دەقێك لەخۆ دەگرێ:

**TeaMMart**
**Erbil**

Inv.Date:23/07/2011 — Inv.No:1140301164677
Time:08:13:33pm — Cash:M-PM

| مادده | ژمارە | نرخ | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| پاککەرەوەی ایزی | ٢ | ١٦٠٠ | ٣٢٠٠ خوێی |
| salina | ٤ | ٣٥٠ | ١٤٠٠ |
| کلینس فاین | ٣ | ١٤٥٠ | ٤٣٥٠ |
| شەربەتی سانکویك | ٢ | ٤٥٠٠ | ٩٠٠٠ |

تکایە سەردانی بەڕێوەبەرایەتی بکەن لەکاتی ڕوودانی هەر هەڵەیەك. ١٧٩٥٠

خوێندنەوەی ئەم دەقە بە پێی کات  و شوێن و ئەو بارودۆخەی دەوری خوێنەرانی دەقەکە دەدات و مەبەستی خوێندنەوەکـە دەگـۆڕێ، یەکـەم سـاتی خوێندنـەوەی ئەم لیستە ساتی کڕینـە لـەناو فرۆشـگاکە یـاخود کـەمێك دواتـر  لەلایـەن کڕیـاری

کەلوپەلەکانەوە، لەو کاتەدا خوێنەری ئەم دەقە تەنها گرنگی بە نرخی کەلوپەلەکان دەدات و سەیری کۆی گشتی پارەکە دەکات بە بەراورد لەگەڵ نرخی شتەکان بە تاك، بەبێ گوێدانە زانیارییەکانی تری ناو لیستەکە وەك ناوی فرۆشگا و بەرواری کڕین و تێبینی کۆتایی...، زانینی چۆنییەتی خوێندنەوەی لیستەکەش دەگەڕێتەوە بۆ شارەزایی خوێنەر و ئەزموونی پێشووی، کە هەر شێوەیەکی تری نووسین جگە لەو لیستە بەکاربێت هەمان وێنەمان ناداتێ، بەڵام ئەگەر ئەو کڕیارە لەکاتی چوونەوەی بۆ ماڵ بینی کەموکوڕی لە یەکێك لە کەلوپەلەکاندا هەیە، دووبارە لیستەکە دەخوێنێتەوە بەڵام ئەمجارەیان سەیری بەرواری کڕین و ئەو تێبینییە دەکات کە لەبارەی، دووبارە سەردانکردنی ئەو فرۆشگایەیە لە کاتی ڕوودانی هەڵە یان کەموکوڕی، ئەوە لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئەو کەسە چەند جارێکی تر چووبێ بۆ ئەو فرۆشگایە بەڵام ئەگەر جاری یەکەمی بێ و بە ڕێککەوت چووبێ ئەوە سەرەتا سەیری ناوی فرۆشگاکە و ناونیشانەکەی دەکات بۆ ئەوەی دووبارە سەردانیان بکاتەوە، دوای ئەوەی سەردانی فرۆشگاکە دەکات لیستەکە جارێکی تر دەخوێنرێتەوە، بەڵام ئەوجارەیان لەلایەن کارمەندی فرۆشگاکەیە، لەم خوێندنەوەیە نرخ گرنگی پێ نادرێ بەڵکو ڕێککەوتی کڕین و ماوەی گرەنتی کەلوپەلەکە و زانیاریی تری پێویست بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە گرنگی پێ دەدرێ.

ئەمە کاریگەریی دەوروبەر لەسەر خوێندنەوە دەردەخات لەوەی چۆن یەك دەق لەلایەن چەند خوێنەرێکەوە یاخود لەلایەن هەمان خوێنەر بەپێی کات و شوێن و مەبەستی خوێنەر لە دەقەکە دەگۆڕێ.

**٢-١. توانستی ئەدەبی** Literary competence:

ئەم زاراوەیە بۆ یەکەم جار لەلایەن جوناثان کولر (Jonathan culler)ەوە بەکار هاتووە ئەم بیرۆکەیەی لە تیۆری چۆمسکی بۆ جیاکردنەوەی توانست و چالاکی وەرگرتووە و لەسەر ئەدەب و جۆرەکانی جێبەجێی کردووە و هەوڵی داوە

تیۆرێك بۆ ئەدەب دابنێ وەك ئـەو تیـۆرەی چۆمسـکی کـە بـۆ توانسـت و چـالاکی زمان داینا.

توانستی ئەدەبی بەوە لە توانسـتی زمـانی جیـا دەبێتـەوە، کـە لـەلای هـەموو کەسـێك بـوونی نییـە، لەکاتێکدا قسـەپێکەرانی زمـان هـەموو خـاوەنی توانسـتی زمانین، بەلاّم مەرج نییە هەریەك لەئێمە خـاوەنی توانسـتی ئـەدەبی بـێ، هەرچـی چالاکی ئەدەبیشە، کە بەرهەمی توانستی ئەدەبی نووسەرەکەیەتی، بریتییـە (لـەو کار و بەرهەمانەی کاتێك بواری تێگەیشـتن و دەرکـەوتنیان دەبـێ، کـە خوێنـەر و رەخنەگری ئەو بەرهەمانە خاوەنی توانستێکی ئەدەبی بێ، ئەو کەسـەی دەقێکـی ئەدەبی دەخوێنێتەوە، یا لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکـات دەبـێ سـەرەتا زانیـاری دەربارەی پێکهاتەی کاری ئەدەبی  و درکاندن و نەریت و یاساکانی ئەدەب هەبێ، بـەبێ بـوونی ئـەم زانیارییـە پێشـینەییانە، جـۆرە ئەدەبییـەکان دەگـۆڕێن بـۆ شـێوەیەکی نەخوێنـدراوە لـەلای خوێنـەر، تەنانـەت ئەگـەر بـە زمـانی دایکـیش نووسـرابێ، بۆنموونـە هـۆنراوە ئـەو خوێنەرانـە پەرێشـان دەکـات، کـە خـاوەنی توانستی ئەدەبی نـین، بـەهۆی ئـەوە نییـە کـە لـە زمانەکـە ناگـەن بـەڵکو بـەهۆی نـەبوونی توانسـتی ئەدەبییـە کـە یارمەتیـدەرە بـۆ خوێندنـەوەی هـۆنراوە وەك ئـەدەب، نـەبوونی توانسـتی ئـەدەبی مانـای نـەبوونی شـارەزاییە لـە یاسـاکانی ئەدەب، ئەو یاسایانەی کە بناغەی رێکخستنی ئەدەبین لە رووی پێکهاتە و واتـاوە ( میجان الرويلي و.. ٢٠٠٢:٢٠٨).

ئـەدەب بەگشـتی خـاوەنی نـەریت و یاسـای تایبـەت بەخۆیـەتی و دەقـی ئەدەبیش، وەك چالاکییەکی زمـانی واتاکـەی پشـت بـەتوانا و لێهـاتوویی خوێنـەر دەبەسـتێ لـە زانینـی ئـەو  یاسـا و نەریتانـەی ئـەدەب، وەك چـۆن دانـەر توانـای بەسەریاندا هەبووە، شـارەزایی خوێنـەر لـەو نەریتانـەی ئـەدەب یارمەتیـدەرە بـۆ تێگەیشتنی راست لە بەرهەمی ئەدەبیدا.

توانسـتی گێڕانـەوە "Narrative Competence" کـە بەشـێکە لـە توانسـتی ئەدەبی بریتییە لـە (توانـای بەرهـەمهێنانی چـیرۆك و تێگەیشـتن لێـی، یـەکێك لـە ئامانجـەکانی زانسـتی گێڕانـەوە Narratology[١١] وەسـفکردنی تایبەتمەنـدیی

توانستی گێڕانەوەیە (جیرالد پرنس ۲۰۰۳:۱۲۷)، بۆنموونە (خوێنەری رۆمان دەبێ توانستێکی پێویستی هەبێ بۆ خوێندنەوەی رۆمان، ئەو توانستەش پێویستی بە زیرەکییەکی بێ هاوتا نییە بەڵکو سنوورێك لە توانای بینایی و لێهاتوویی بە یاساکانی زمان (لطیف زیتوني ۲۰۰۲:۱۳۱) .

کاتێك خوێنەر دەقێکی ئەدەبی دەخوێنێتەوە سەرەتا دەبێ شارەزایی لە یاساکانی گوێزانەوە و تێگەیشتنی راست لە نیشانە ئاماژەییەکان، نیشانەکانی دووبارەکردنەوە، کە ئاماژە بە رەگەزێك دەکات پێشتر باسی لێوە کراوە و ناو و جێناوەکانی دانەپاڵ هەبێ، کە یارمەتیدەرن بۆ درککردن بە جووڵەی دەق و بە دواداچوونی برگەکانی گێڕانەوە، ئەمە سەرەڕای زانینی فەرهەنگی بنەڕەتی و تێگەیشتن لە وشە نامۆکان و دارشتنە ئەدەبییەکان و توانای جیاکردنەوەی بارودۆخ و سیاقی دەقەکە، چونکە (زانیارییە زمانییەکان توانای ئەوەی پێدەدات لە فرەیز و رستەکان بگات، بەڵام ناتوانێ لە رووی ئەدەبەوە لەو زنجیرە فرەیزە نامۆیانە بگات، کە لە رووی توانستی ئەدەبییەوە ئاڵۆزە، ئەو توانایەی کە رێگە بە کەسێك دەدات زنجیرەی زمانەوانی بگۆڕێ بە رۆنانی ئەدەبی و واتای ئەدەبی، ئەمە لە کاتێکدا لە ئاخاوتندا تێگەیشتن و بەرهەمهێنان پشت بەبوونی دەسەڵات دەبەستێ بەسەر سیستەمەکەدا، بەڵام کات و توانست رۆڵ دەگێڕن لە هەوڵە ئەدەبییەکاندا، وەك ئەوەی لە قوتابخانە و زانکۆ ئەوە دەردەخەن کەوا تێگەیشتنی ئەدەبی پشت بە ئەزموون و بەهرە دەبەستێ، لەو کاتەی ئەدەب لە ریزبەندی دووەمی سیستەمی هێماکاندایە، کە زمان تیایدا بنجی و بنەڕەتییە .(Culler1975:132)

کاری ئەدەبیش وەك ئاخاوتن خاوەنی تایبەتمەندیی رۆنانی و واتایی تایبەت بەخۆیەتی و بەرهەمهێنانی دەق و تێگەیشتن لێی، وەك تایبەتمەندییەکانی تری ئاخاوتن، پەیوەستە بە توانستی دەق، کە بریتییە لە (خاوەنداریێتی ئاخێوەران بۆ توانستی خوێندنەوە و گوێگرتن، بۆ ئەو دیاردە زمانییە ئاڵۆزانەی لە دەق دەنوێنرێت و تێگەیشتن لێیان و دەستخستنی زانیاریی دیاریکراو تیایاندا، بەلایەنی کەمەوە خەزنکردنی بەشێك لەو زانیارییانە لە هۆشدا و دووبارە

بەرهەمهێنانەوەی، بەپێی ئەو كار و بابەتانەی لەبارەیانەوە دەدوێ، ئەستەمە قسەكەرێكی ئاسایی بتوانێ ڕۆنان و پێكهاتە و هەموو ئەو زانیارییانەی دەق دەیگرێتە خۆ خەزنی بكات و بیگەڕێنێتەوە (نعمان بوقره ٢٠٠٨:٦٥)، لەم بارەیەوە "ڤان دەك" باس لەو زانیارییە سەرەكییانە دەكات كە لە مێشكدا دەمێنێتەوە و گرنگە لەكاتی خوێندنەوەمان بۆ دەق و جیای دەكاتەوە لەو زانیارییە ناوەندییانەی، كە لە یادی دەكەین و ڕۆڵێكی كاریگەر نابینێ لە خوێندنەوەی دەق (بڕوانە: نعمان بوقره ٢٠٠٩:٥٦).

شارەزایی خوێنەر بە بارودۆخی نووسینی پارچەیەكی ئەدەبی یارمەتی دەدات لە لێكدانەوەی بڕگەكان بەشێوەیەك كە لەگەڵ مێژووی نووسینەكەیی و ئەو واتایە بگونجێ، كە دانەر ویستوویەتی بیگەیەنێ، بۆیە دەكرێ بڵێین (توانستی ئەدەبی پشت بە زانینی ئەدەب دەبەستێ كە یارمەتی خوێنەر دەدات بۆ گۆڕینی زانیاریی زمانی و گوێزانەوەی بۆ ئاستێكی بەرزتر لە یەكبەستی و ڕێكخستن (میجان الرويلي و.. ٢٠٠٢:٢٠٨).

كاتێك خوێنەر دەقێكی ئەدەبی لە جۆرێكی دیاریكراو دەخوێنێتەوە (مانای ئەوە ناگەیەنێ كە مێشكی خوێنەر وەك تابلۆیەكی خاو بێت، وەك ئەوەی هیچی تیا نەبێ سەیر بكرێ و ئاڕاستە بكرێ، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی لەوانەیە ئەو كەسە تێگەیشتنێكی نادیاری هەبێ لە پرۆسەی شیكردنەوەی ئەدەبیدا كە پێمان دەڵێ بەدوای چی دەگەڕێین (Culler1975:132)، ئەمەش كاتێك، بەڕوونی دەردەكەوێ، كە خوێنەر پێشبینیی زنجیرە ڕووداوەكانی ئەو جۆرەی دەق دەكات بۆنموونە خوێنەری دەقی پۆلیسی پێشبینیی ئەوە دەكات دەقەكە بە گرتنی تاوانباران و سزادانیان كۆتایی دێت لەكاتێكدا، خوێنەری دەقێكی ڕۆمانسی پێشبینیی كۆتاییەكی دڵخۆشكەر دەكات، خوێنەر ئەو شارەزاییانە لە دەوروبەری كۆمەڵایەتی وەرناگرێ، بەڵكو لە ڕێگەی خوێندنەوەی دەقی ئەدەبی و شارەزابوونە لەو یاسا ناوەكییانەی كە كۆنترۆڵی ڕووداوەكانی دەق دەكەن.

**٢-٢. چەمك و پێناسەی دەق:**

ئەو پێناسانەی وەك چەمكێكی زمانی بۆ دەق كراون زۆرن، هەر پێناسەیەكیش بۆ دەق گوزارشت لەو چوارچێوە تیۆرییە دەكات، كە پێناسەكەی تیا كراوە، كە ئەمەش وای كردووە پێناسەی دەق لە ڕێبازێكی ڕەخنەییەوە بۆ یەكێكی تر بگۆڕێ، جگە لەوەی ڕێبازە زمانەوانییەكان هەرچەندە هۆكاری هاوبەش لە نێوانیاندا هەیە لە پێناسەكردن بۆ دەق جیان و هەر زمانەوانێك بە پێی دید و تێڕوانینی تایبەتیی خۆی پێناسەی دەق دەكات، تەنانەت ئەدیبانی نێو یەك قوتابخانەی ئەدەبیش هەریەكەیان پێناسەیەكی تایبەتییان بۆ دەق هەیە، بەڵكو ئەدیبێك لەوانەیە پێناسەكەی بە پێی ئەو قۆناغە ئەدەبییەی پێیدا تێپەڕ دەبێ بگۆڕێ، بۆنموونە ڕەخنەگرێكی وەك "ڕۆلآن بارت" چەند پێناسەیەكی جیاجیای بۆ دەق كردووە بەگوێرەی ئەو قۆناغە ڕەخنەییانەی كە پێیاندا تێپەڕیوە.

هەربۆیە ئەو پێناساناى بۆ دەق كراون جۆراوجۆرن، هەندێك دەڵێن دەق ڕووداوێكە لە كات و شوێنێكی دیاریكراودا ڕوودەدات، هەندێكی تر دەڵێن دەق نووسراوێكی زمانییە یاخود گوتارە بەهۆی نووسینەوە جێگیر كراوە، هەندێك بڕوایان وایە دەق یەكەیەكی پەیوەندیكردنە ئامانج لێی گوێزانەی ئەزموون و گەیاندنی زانیارییە...، لە خوارەوە پێناسەی چەند زمانەوان و ئەدیبێك بۆ دەق دەخەینە ڕوو[١٢]:

"هیلمسلیف" زاراوەی دەق بە فراوانی بەكاردێنێ بۆ هەر دەربڕینێك نووسراوبێ، یان گۆكراو درێژبێ، یان كورت وشەی (بوەستە) لەلای ئەو دەقە و ڕۆمانێك بە تەواوی دەقە.

پێناسەی دەق لای "تۆدۆرۆف" لەسەر بنەمای دابڕاوی و سەربەخۆییەتی، بە ڕای ئەو دەق بەرهەمێكی زمانی داخراوە لە خودی خۆیدا لە ڕووی واتاوە سەربەخۆیە و دەق لەوانەیە ڕستەیەك بێ لەوانەشە كتێبێك بێ بە تەواوی، ئەمانەش ئەو تایبەتمەندییانەن كە دەق جیا دەكاتەوە و نیزامێكی تایبەت و جیا لە یەكەكانی تری پێدەبەخشێ.

بیر و ڕا نوێیەکان دەربارەی دەق پشت بە سیاقی پەیوەندیکردن دەبەستیٚ دەق لەڕوانگەی پڕاگماتیکەوە زنجیرەیەکی زمانەوانی گۆکراو یان نووسراوە، و ئەرکی پەیوەندیکردنی کۆمەلأیەتییە، (بە پێی تێڕوانینی "هالیدای" دەق تەنها یەکەیەکی سیمانتیکییە زمان لە گەیاندن دەینوێنیٚ، کە وشەیەك، یان رستەیەك، یان کۆمەلە رستەیەك، یان چیرۆکێکە، "هالیدای" دەق بە یەکەی پرۆسەی کارلێککردن لە واقیعی کۆمەلأیەتی دادەنیٚ، کە لە ڕێگەیەوە واتاکان ئالۆگۆڕ دەکریٚ و جۆرێکە لە گفتوگۆ لە نێوان ئاخێوەرانی زمانێك، کە ئەمەش گرنگیی بەستنەوەی دەق بە سیاق لە لایەن هالیدای دەردەخات (نعمان بوقرە ۲۰۰۸:۱۷).

هەندێك لە نووسەران و زانایانی زمان، نووسین دەکەن بە پێوەر بۆ جیاکردنەوەی دەق لە نا- دەق بەوەی کە (دەق لە وشە پێکدێت کە بە نووسین دەچێنرێت و چنینێك کە بە واتای رێکی و گونجان و گرێدان و چون بەناویەکدا (تێکچڕژان) دێت، دەق تەنها بە نووسین دەبێتە چنراو، دەنگ و وشەکان واتایان نابێت تا ئەوکاتەی دەنووسریٚ. دەق لە دیدی "بۆل ریکۆر" نابێت بە چنراو تاوەکو نەنووسریٚ (نهلة فیصل ۲۰۱۰:۲۹)، دەکریٚ بلێین ئەمە پێوەرێکی ورد نییە بۆ جیاکردنەوەی دەق لە نا دەق، بە پێی ئەم تێڕوانینە بێت ئەو دەقە زارەکییانەی لەزمانی رۆژانە بەکاردێت کە زۆربەیان لە تێکەلییەك لە رستە، بەشەکانی رستە و گوزارشتە قسەییە ئامادەکراوەکان پێکهاتوون، وەك گفتوگۆی رۆژانە و ئاخاوتنە تەلەفۆنییەکان...، بەپێی ئەم پێوەرە بە دەق دانانرێن لە کاتێکدا نووسراوی سەر دیوارەکان و لیستی فرۆشگاکان و نووسراوی دامودەزگا فەرمییەکان و ریکلامییەکان...، کە تایبەتمەندیی نووسراویان هەیە بە دەق دادەنریٚ.

لێرەدا مەبەست لە دەق دەقی ئەدەبییە، کە چنراوێکی[13] وشەیی رێکخراوە لە داهێنانێکی دیاریکراودا لە رووی پێکهاتن، یەکبەستی یەکەکانی، داهێنانە هونەرییەکەیی و شێوازی دەربڕینییەوە، لە هەموو جۆرەکانی تری دەق جیادەبێتەوە و شێوەیەك دەسەپێنیٚ، کە بوونێکی سەربەخۆ و دابڕاوی هەیە و بە پێی پێویست جێگیر دەبیٚ.

**٢ـ٣. دەقی ئامادە و دەقی ونبوو:**

زاراوەی دەقـی ونبـوو (الـنص الغائـب) زاراوەیـەکی نوێیـەو لـەژێر ڕۆشـنایی ڕەخنەی نوێدا دەرکەوتووە، مەبەست لێـی ئەوەیـە کـاری ئـەدەبی بـە پەیوەنـدی بەکاری ترەوە دروست دەبێ ئەدەب لە جیهانێکدا گەشە دەکات، کـە پڕیـەتی لـە وشـەی کەسـانی تـر، دەق لـە دەقـی پێشـوو و سـەردەمەوە پێکهـاتووە و بەشێوەیەکی نوێ داڕێژراوەتەوە، هیچ سنوورێك نییە لە نێـوان دەقێـك و یـەکێکی تر بەڵکو دەق لە دەقی ترەوە وەردەگیرێ، لە هـەمان کاتـدا وەرگـر و بەخشـەرە، دەقی ونبوو پێکهاتەیەکی سەرەکییە بۆ دەق و دەق لـە سـفرەوە دروسـت نـابێ، بۆنموونە: چیرۆك وەك هەر نامەیەکی تری ئاسایی کـە دەقێکـی ئاڕاسـتەکراوە بـۆ وەرگر لە نێو کۆمەڵێك دەقی ترەوە سەر هەڵدەدات کە پێشـتر بوونیـان هـەبووە، "ڕۆلان بارت" پەیوەندی دەقـی ئامـادە بـە دەقـی ونبـوو بـە (گرتنەوەیـەکی بـێ پێکداچوون ) ناو دەبات، کە هەر دەقێکی ئامادە کۆمەڵێك دەقی ونبووە.

هیچ دەقێك نییە لە خودی خۆیدا سـەر هەڵبـدات بـەڵکو لـە پەیوەنـدی بـەوانی تـرەوە دروسـت دەبێـت، کـردەی بەرهـەمهێنانی دەق پرۆسـەیەکی هاوبەشـە، کـە تیایـدا کۆمــەڵێك دەقــی ونبــوو بەشــداری دەکــەن و ئــامرازی ســەرەکی ئــەو بەرهەمهێنانەن، خوێنـەر ئـامرازی دووەمـە لـە لێکدانـەوە و شـیکردنەوەی دەقـدا، کردەی خوێندنەوە لە هەمان کاتدا کردەی وەرگرتن و بەخشین دەبێ، بەخشین لە ڕێگـەی زانیارییـە ئـەدەبی و ڕۆشـنبیرییەکان و ڕۆشـنبیریی خوێنـەر دەبـێ، بـەم شێوەیە هەردوو دەقی بەرهەمهاتوو و دەقی ونبوو بەشدار دەبن لـە دروسـتکردنی دەقێکی نوێ، کە بە هەمان شێوە بەیەکداچوونێك لەگـەڵ پێکهاتـەی ڕۆشـنبیریی خوێنەر دەنوێنێ، دەرکەوتنی ئەم بەیەکداچوونەش بە پێی دەوروبەری وەرگرتنـی دەقەکە و ڕێکخستنی ناوەکی و تایبەتمەنـدیی هەریـەك لـە دەقـی ئامـادە و دەقـە ونبووەکان جیاواز دەبێ (بڕوانە: محمد عزام ١٢:٢٠٠١).

**٢ـ٤. کارلێکی دەق و بەرزبوونەوەی دەق** Transtextualite:

بونیادگەرییـەکان بەشـێوەیەك سـەیری دەقیـان دەکـرد، کـە پێکهاتەیـەکی داخـراوی هەیـە لـە خـودی خۆیـدا، بەتـەنیا دەتـوانێ واتـا بـدات بـەجۆرێك تـەنها

گرنگییـان، بـە پێکهاتـەی نـاوەکی دەق و یاسـاکانی دەق دەدا و دەقیـان وەك دانەیەکی دابڕاو لە دەوروبەری دەرەکی و کۆمەڵایەتی و ئەو بارودۆخە مێژووییـە سەیر دەکرد، کـە دەوری دەق دەدات، دوور لـە مەبەسـتی دانـەر و ئامانجـەکانی، ئەرکی رەخنەگری دەقی ئەدەبیش تەنها دۆزینەوەی پەیوەندی یەکەی پێکهاتـەی دەق لەلایەك، پەیوەندی بە سیستەمی گشـتی زمـان لەلایـەکی تـرەوە بـوو، بـەڵام قۆناغی دوای بونیادگەرییەکان[14] کە چەند رەخنـەگر و لێکۆڵەرەوەیـەك دەرکـەوتن دژی ئـەو رایـەی بونیاتگەرییـەکان بـوون لـەبارەی پێکهاتـەی دەق، دابڕانـی لـە دەوروبـەر، لـە لێکۆڵینـەوە رەخنەییەکانیانـدا پشـتیان بـە رێبـازی (وصـفی) نەدەبەست وەك لەلای بونیادگەرییەکان باو بوو لەوانـە (جولیـا کریسـتیڤا، رولان بارت، تۆدۆرۆف، ریفاتیر،...).

ئـەم رەخنەگرانـە لێکۆڵینـەوەکانیان بـۆ دەق لـە گۆڤـاری (Tel Quel)ی فەرەنسـی بڵاودەکـردەوە، کـە دەقیـان وەك دانەیـەکی کـراوە و تـازەکراو سـەیر دەکرد، لێکۆڵینـەوە لـەدەق لـەلای ئـەم نووسـەرانە بـواری پێکهاتـە و پەیوەنـدی یەکـەکانی دەق تێدەپـەڕێنێ بـۆ مەسـەلەی بەیەکگەیشـتن و بەیەکداچـوونی دەق لەگەڵ دەقی تر، ئەم لێکۆڵەرانـە بڕوایـان وابـوو کـە هـەموو نووسـەرێك دەقەکـەی لەناو پێکهاتەی دەقی سەردەم یان پێشووتر وەردەگری.

بەڕای "جولیا کریستیڤا" دەق پێکهاتەیەکی داخراوی نییە لەخودی خۆیدا، بەڵکو دەق کۆمەڵێك لـە پەیوەنـدی یـەکتربڕ و چـوونە ناویـەکی لەگـەڵ دەقـی تـر دەنوێنێ، بـەجۆرێك کـە دەقـی بەرهـەمهاتوو وەرگـرتن و گواسـتنەوەی دەقـی تـر دەبێ، بەم جۆرە پێناسەی دەق دەکات: (دەق گوزارشتێکە لـە رەنگـاو رەنگـی و جۆراوجۆری وەرگـرتن و هـەر دەقێـك بریتییـە لـە وەرگـرتن و گـۆڕینی دەقـی تـر. (محمد عزام ٢٩:٢٠٠١).

("جولیا کریستیڤا (Gulia kristeva)" یەکـەم کـەس بـوو کـە زاراوەی دەق ئـاوێزان/ بەناویەکداچـوونی دەق (تنـاص/Intertextuality)ی بـەکارهێنا، لـە لێکۆڵینەوەکانی لە ساڵی ١٩٦٦ و ١٩٦٧ کـە لـەگۆڤاری (Tel Quel)ی فەرەنسـی بڵاو دەکرانەوە، بیرۆکەی ئەم زاراوەیەی لە لێکۆڵینەوەکانی باختین بـۆ کارەکـانی

"دیستۆویڤسکی" و "رابلیە" وەرگرتووە، بەڵام باختین ناوی (کارلێکی دەق)ی نەهێناوە، بەڵکو باس لە پەیوەندی دەق بە دەقی ترەوە دەکات لەژێر ناوی تیۆری درکاوی کۆمەڵایەتی (سوسیو لفظي) یاخود گفتوگۆگەرایی (الحوارية)[15] و فرە دەنگی (تعدد الاصوات)[16] ، کە تیایدا ئەوە دووپات دەکاتەوە هەموو دەقێکی ئەدەبی دووبارەکردنەوەی دەقێکی ترە، هەموو خوێندنەوەیەکیش لە خودی خۆیدا دەقێك پێك دێنێ و نووسینیش پشت بە سێ شت دەبەستێ دانەر و دەق و وەرگر سەرەڕای رەگەزی پێکداچوونی دەق (تناص)، کە لەگەڵ ئەم سێ رەگەزەدا گفتوگۆی دەکرێ. (محمد عزام ٢٠٠١:٣٤).

دوای ئەوەی"کریستیفا" ئەم زاراوەیەی بەکارهێنا لە قۆناغی دوای بونیادگەرییەکان بەتایبەتی هێماگەری (السيميائية) و هەڵوەشاندنەوە (تفكيكية) لە بەرهەمی گەورە نووسەرانی فەرەنسی بە ئاشکرا دەرکەوت و بڵاوبۆوە لەوانە"جولیا کریستیفا، رولان بارت، تۆدۆرۆف، گیرارگینیت، ریفاتیر..."

لەم بارەیەوە (تۆدۆرۆف) لە کتێبی (poetics) دەڵێ: مافی دەرکەوتنی ئەم زاراوەیە دەگەڕێتەوە بۆ فۆرمالیستە رووسییەکان (شكلانيين الروس)، "شیکلۆفسکی" دەڵێ: کاری هونەری بەپەیوەندی بە کاری ترەوە دەناسرێ، بە پشتبەستن بەو هۆکارانەی بەیەکیان دەبەستینەوە، کە بڕوای وایە "باختین" یەکەم کەسە تیۆری دەربارەی دەقی (چووەناویەك) دانا و بڕوای وابوو، کە وەرگرتن یان رەنگدانەوەی شێوازی ئەدەبیی کۆن لە هەموو شێوازێکی نوێدا دەبینرێ، هونەرمەند لەجیهانێکدا گەشە دەکات، کە پڕیەتی لە وشەی کەسانی تر و لەو ئۆقیانووسەدا بەدوای رێگای خۆی دەگەڕێ، هەربۆیە "تۆدۆرۆف" ئەو گوتارەی کە هیچ شتێك لەوانەی پێش خۆی وەرناگرێ، بە (تاك نرخ) ناوی دەبا و ئەو گوتارەی لە پێکهاتنیدا پشت بەو وەرگرتنە دەبەستێ بە گوتاری (فرە نرخ) ناوی دەبات (هەمان سەرچاوە:٢٨).

قۆناغی دوای بونیادگەرییەکان گرنگییەکی زۆریان بە خوێنەر دەدا بەجۆرێك، کە لە لێکۆڵینەوەکانیاندا خوێنەریان وەك بەرهەمهێنەری دەق سەیر دەکرد نەك بەکارهێنەری دەق، میشیل ریفاتیر بەیەکداچوونی دەق (تناص) بەوە پێناسە

دەکات، کە درککردنی خوێنەرە بۆ بوونی پەیوەندی لە نێوان کارێك و یەکێکی تری پێش خۆی یان ئەو کارەی کە دەقەکە لەدوای هاتووە، بەجۆرێك کە (خوێنەر دەبێتە خاڵی بەیەکگەیشتنی نێوان دانەر و دەقی پێش خۆی کاتێك خوێنەر دەقێك دەخوێنێتەوە دواتر دەقێکی تر دەخوێنێتەوە بازنەی پەیوەندی لە نێوان دەقێك و یەکێکی تردا فراوانتر دەبیٚ، لە نێوان خوێنەر و ئەزموونی لەلایەك و خوێنەر و دەق لەلایەکی ترەوە، کە ئەمەش وا دەکات کارلێکی دەق لە نێوان دوو هزردا رووبدات، کە یەکەمیان هزری خوێنەرە، ئەویتریان بیرۆکەی دەقە واتە خاڵی بەیەکگەیشتنی نێوان دەقێك لەگەڵ دەقی تر لە رێگەی ئەزموونی دانەر و دواتر خاڵی بەیەکگەیشتنی دەق لەگەڵ خوێنەر، بە پێچەوانەوە. (نهلة فیصل ٩٢:٢٠١٠).

"گیرار گینیت" لە ساڵی ١٩٨١ پێنج جۆر لە پەیوەندی دەق جیا دەکاتەوە، ئەم دیاریکردنەی گینیت گەشەپێدانی ئەو لێکۆڵینەوانەیە کە لەبارەی پەیوەندییەکانی دەق لە سەدەی حەڤدە لە ئارادا بوون:

**٢ـ٥. ١. پێکداچوونی دەق/ دەق ئاوێزان** (Intertextuality) :

بەدوای یەکداهاتن و پەیوەندی دەقێکە بە دەقی ترەوە لە رێگەی چەند یاسایەکی ناوەکی، کە لە شێوەی وەرگرتن و گفتوگۆ و بەیەکداچوونی دەق و روونکردنەوە و جۆرەکانی تری کارلێکی دەق دەبینریٚ، "گینیت" لەبارەی ئەم جۆرەی پەیوەندی دەق دەڵیٚ: ( یەکەم کەس ناوی هێناوە "جولیا کریستیفا" بووە، کە چەند ساڵێك ماوەتەوە و ناوی ناوە (Intertextualite)، ئەم ناولێنانەش شێوەی زاراوەییمان پێدەخشیٚ و بەشێوەیەکی تەسك پێناسەی دەکەم کە "پەیوەندی ئامادەبوونی هاوبەشە لەنێوان دوو دەق یان چەند دەقێك بەرێگەی ئامادەبوون "استحضارية"، کە زۆربەی جار ئامادەبوونێکی کارەکییە بۆ دەقێك لە دەقێکی تر. (محمد خیر البقاعي ١٢٥:١٩٩٨).

بەیەکداچوونی دەق بریتییە لە پەیوەندی دەقێکی دیاریکراو بە دەقی تری دەوروبەری، یان پەیوەندی دەقێك بەو دەقانەی لێی پێکهاتووە، وەك بوونی

دەقێك لەشێوەی ڕوونکردنەوەکانی نێوان دوو کەوانە لە دەقێکی تردا کە "گیرار گینیت" بە دیارترین جۆری بەیەکداچوونی دەق (Intertexuality) ناوی دەبات.

پێکداچوونی دەق ئاماژە بە بوونی دەقێکی بنەڕەتی دەکات جا لە بواری ئەدەب بێ، یان ڕەخنە کە لەپەیوەندیی شێوازی و پێکهاتەییدایە لەگەڵ ئەو دەقانەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ کاریگەرییان لەسەر دەقە بنچینەییەکە هەبووە لەکاتێکی دیاریکراودا، (دیکرۆ و تۆدۆرۆف لە فەرهەنگی ئینسیکلۆپیدیای زمان بەو جۆرە پێناسەی دەق دەکەن: هەر دەقێك بریتییە لە وەرگرتن و گۆڕینی کۆمەڵێك دەقی تر، دەقی نوێ بریتییە لە دووبارە بەرهەمهێنانەوەی دەقی پێش خۆی یان سەردەمی خۆی، جا هەستی پێ کرابێ یا نا. (محمد عزام ۲۰۰۱:۲۹)

پێکداچوونی دەق بریتییە لە ڕێکخستنی دەقێکی نوێ لە دەقەکانی پێش خۆی، یان سەردەمی خۆی کە سنوور لەنێوانیاندا دەسڕێتەوە، بەجۆرێك کە لە داڕشتنەوەی پێکهاتەی دەقە نوێکەدا شوێنەواری هیچ یەك لە دەقەکانی تر نەماوە، تەنها لەلای کەسانی خاوەن ئەزموون هەستی پێدەکرێ، هەرچەندە زاراوەی پێکداچوونی دەق (تناص) بۆیەکەم جار لەلایەن "جولیا کریستیڤا" بەکارهاتووە (بەڵام مێژوویەکی کۆنتری هەیە و لە کۆن درکیان بەو پەیوەندییانەی نێو دەق کردبوو لە بواری ڕەوانبێژی و ڕەخنەی ئەدەبیدا لەژێر ناوی وەرگرتن (الاقتباس)، ئاماژەکردن (الاشارة)، گرتنەوە (التضمین)، تێلنیشان (تلمیح)، بەرامبەری (تقابلات)، دزیگەرایی (السرقات) و هاودژی (مناقضات)...هیتر.

"گینیت" باس لە سێ جۆری پەیوەندی بەیەکداچوونی دەق دەکات:

وەرگرتن (Citation): ئەم جۆرەیان ئاشکراترین جۆری بەیەکداچوونی دەقە، کە بریتییە لە وەرگرتن لەنێوان دوو کەوانە بەگەڕانەوە یا نەگەڕانەوە بۆ سەرچاوەیەکی دیاریکراو.

دزیگەرایی (Plagiat): ئەم جۆرەی پەیوەندی شێوەیەکی کەمتر دیار و شەرعییە کە وەرگرتنێکی باس نەکراو و پیت بە پیتە.

تێلنیشان (Allusion): ئەمەش شێوازێکی کەمتر دیار و حەرفییە، کە بریتییە لە تیگەیشتنێکی قووڵ بۆ بەجێهێنانێك و تێبینیکردنی پەیوەندی بە بەجێهێنانێکی تر کە بە پێویستی بۆی دەگەڕێتەوە و بەبێ ئەوە ناتوانرێ لێی تێبگەین. (بڕوانە: محمد خير البقاعي ١٩٩٨:١٢٦).

هەر دەقێکی بەرهەمهاتوو ئەنجامی پەیوەندی و کارلێکی دەقەکەیە لەگەڵ دەقی تر لە چەند ئاسۆیەکی رۆشنبیریی جیاجیا و بە پێی مەبەستی دانەر و ئامانجەکانی، ئەم کارلێکەی دەقیش بەچەند شێوەیەك دەبێ وەك:

١- کارلێکی خودی دەق: ئەم جۆرەی کارلێکی دەق لەنێوان دەقی نووسەرێك و دەقەکانی تری هەمان نووسەر ڕوودەدات.
٢- کارلێکی ناوخۆیی دەق: کاتێك دەقی دانەرێك لەگەڵ دەقی دانەری تری سەردەمی خۆی کارلێك دەکات.
٣- کارلێکی دەرەکیی دەق: کاتێك دەقی دانەرێك لەگەڵ دەقێکی تر، کە لە سەردەمانێکی دوور دەرکەوتوون کارلێك دەکات. (سعيد يقطين: ١٩٨٩:١٠٠).

ئەم جۆرانەی کارلێکی دەقیش، بەشێوەیەکی گشتی لەنێوان دەقێك و دەقی تری هەمان رەگەزی ئەدەبی ڕوودەدات، یان لەنێوان دەقێك و جۆری تری جیاواز لە رەگەزی ئەدەبی ڕوودەدات، بەجۆرێك کە کارلێککردنەکە، یا بە ڕێککەوت دەبێ کە جەخت لەسەر بێئاگایی کردەکە دەکرێتەوە لە لایەن دانەری دەقە نوێیەکە، کە ئەمەش بەهۆی کاریگەریی زانیاری هەڵگیراوەوە دەبێ لەکاتی نووسین یاخود بە نیازەوە کارەکە ئەنجام دەدرێ و لەسەر بنەمای ستراتیژییەتێکی هونەری دەبێ، کە لەگیانی کارەکەوە سەر هەڵدەدات و درك بە پێویستی ئەو پەیوەندییە کراوە لەکاتی نووسینی دەقەکەدا.

زاراوەی بەیەکداچوونی دەق (Intertextuality) وشەیەکی رەخنەیی نوێیە و لە لێکۆڵینەوەکانی زمانی عەرەبی وشەی (تناص)، (التناصية)، (النصوصية)، (تفاعل النصي)، (تداخل النصوص)ی بۆ بەکاردێت، بەلام لە هەندێ لە لێکۆڵینەوەکان لە بەکارهێناندا لەگەڵ وشەی (Transtextuality) ی تێکەڵ دەبێت کە وشەی (تعاليات النص)ی بۆ بەکاردێت.

هەرچەندە هەردوو زاراوەی (Transtextuality) و (Intertextuality) لە رووی واتا و بەکارهێنانەوە تێکەڵ دەکرێن بەوەی هەردووکیان ئاماژەن بۆ کارلێکی دەق و پەیوەندی دەق، بەڵام پێشگری (Trans) لە زاراوەی (Transtextuality) کە لەلایەن "گینیت" بەکارهاتووە فراوانترە لە پێشگری (Inter) لە زاراوەی (Intertextuality) کە لەلایەن "جولیا کریستیڤا" بۆ گوزارشتکردن لە پەیوەندییەکانی دەق بەکارهاتووە، "گیرار گینیت" لەم بارەیەوە دەڵێ: (کارلێکی دەق بە واتای هەر شتێك دێت، کە وا بکات دەق لە پەیوەندییەکی شاراوە، یان ئاشکرا بێت لەگەڵ دەقێکی تر، بە بەرزبوونەوەی دەق ناو دەبرێت و چوونە ناویەکی دەق (التداخل النصي)یش دەگرێتە خۆ، کە لە کۆن (کلاسیك) لەلایەن جولیا کریستیڤا بەکارهاتووە مەبەستیشم لە چوونە ناویەکی دەق: بوونی دەقێکە لە دەقێکی تر، جا بەشێوەیەکی تەواو بێ، یا ڕێژەیی (جیرار جینیت ۱۹۹۵:۹۰)، لێرەدا جیاوازیی ئەو دوو زاراوەیەمان بۆ دەردەکەوێ کە زاراوەی پێکداچوونی دەق (Transtextuality) بەواتای پەیوەندی نێوان دەقێك و دەقێکی تر، یا زیاتر دێت کە مەرج نییە تەنها لەسنووری یەك دەق بێت لە کاتێکدا زاراوەی (Intertextuality) (ئاماژەیە بۆ پەیوەندی دەقێك بە دەقێکی ترەوە لە سنووری یەك دەق. (جان ایف تادییە ۱۹۹۳:۳۱٤).

**۲-٥-۲. پەیوەندی دەقی تەریب** (Paratextuality):

پەیوەندی دەقە بەدەقی دەوروبەرەوە، ئەو دەقانەی کە هاوتا و تەریبن و پێکهاتەیەکی سەربەخۆیان هەیە لەگەڵ دەقە بنجییەکەدا، کە لەشێوەی ناونیشان و ناونیشانی ناوەکی و پەراوێز و پێشەکی و وتەی بڵاوکەرەوە و وێنە و ناونیشانی لقەکان...هیتر دەردەکەوێ.

**۲-٥-۲-۱. دەقی تەریب** (Paratext [17]):

بریتییە لەو دەروازە و پاشکۆیانەی وەك چوارچێوەیەك لە ناوەوە و دەرەوە دەوری دەقی سەرەکی دەدەن و بەشێوەی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لێی دەدوێن

و شی دەکەنەوە، رۆڵێکی گرنگ دەبینن لە ئاماژەپێدان و روونکرنەوەی دەق، وەك ناونیشان و ناونیشانی ناوەکی و گوتاری پێشەکی و وتەی دانەر و پێشکەشکردن و گوزارشتە ئاڕاستەییەکان و یاداشتنامە و بیرەوەرییەکان و روونکردنەوە و پاشکۆکان و پەراوێز و تێبینییەکان و وێنە و رەگەزەکانی جوانکاری و هەموو ئەو هێما و ئاماژانەی دەوری دەق دەدەن، جا چ بەمەبەستی جوانناسی و رازاندنەوەی دەق بێ یا ئەرکی ئاماژەپێدەرێکی واتایی و پڕاگماتیکی ببینێ لە ئاڕاستەکردنی خوێنەر، بۆ ئەوەی خوێندنەوەیەکی بەرهەمهێنی بۆ دەستەبەر بکات.

ئەم جۆرەی دەق (دەوری دەقی سەرەکی دەدەن و دەچنە ناو قووڵایی دەق و ئەو راڕەوانەن وا لە وەرگر دەکەن دەست بە هێڵە سەرەتایی و سەرەکییەکانی کارە پێشکەشکراوەکە بگرن.

"لۆیی بورخیس" (Louis borges) بەم شێوەیە باس لە دەقی تەریب دەکات، بەوەی (ئەو دیدنگەیە لە رێگەیەوە بۆ ناو راڕەوەکانی دەق گوزەر دەکەین، گفتوگۆ لەگەڵ دانەری راستەقینە و خەیاڵی دەکەین لەناو جیهانێك رووناکییەکانی کزن و گفتوگۆکان بەشێوەی ستوونی و ئاسۆیین دەربارەی دەق و پێکهاتە جیاجیاکانی، کە لە رێگەیەوە چەند پەیوەندییەك لەگەڵ دەق دەبەستین (جمیل الحمداوي ٢٠٠٦:٢٢٣ ) .

دەقی هاوتا سەرەڕای ئەوەی لەخودی خۆیدا پێکهاتەیەکی سەربەخۆی هەیە و دەتوانرێ وەك دەقێکی سەربەخۆ مامەڵەی لەگەڵ بکرێ، بەڵام لەهەمان کاتدا ناکرێ ئەو پەیوەندییە فەرامۆش بکەین، کە لەگەڵ دەقە سەرەکییەکە هەیەتی کە وەك دەقێکی تەریب وایە، بوون و دەرکەوتنی بەستراوەتەوە بە دەقە سەرەکییەکەوە، "گینیت" دەڵێ: (دەقی پاشکۆ دەق دەکات بەکتێب بۆئەوەی پێشکەش بە خوێنەران بکرێ بەشێوەیەکی تایبەت و جەماوەر بەشێوەیەکی گشتی واتە دەستەواژەیەکە دەربارەی ئەو دەروازانەی پێیدا تێدەپەڕین بەر لەوەی بچینە ناو بۆشایی ناوەوەی دەق کە وەك بەردەرگایەك وایە بۆ دەق (Genette1991:261)

"گیرار گینیت" لە کتێبەکەی بەناوی دەروازەکان (العتبات) دەقی هاوتا بۆ دوو جۆر جیادەکاتەوە: چێودەق/ النص المحیط (Peritexte) ئەو دەقانەی دەوری دەقە سەرەکییەکە دەدەن لە ناونیشانی دەرەکی و ناونیشانی ناوەکی و پێشەکی و ناونیشانی بەشەکان و تێبینی...هیتر، کە سەر بە جیهانی دەقن، لەگەڵ دەقی سەروو (Epitexte) کە ئەو گوتار و هەڵواسین و بەڵگە و ڕوونکردنەوانە دەگرێتەوە کە لەدەرەوەی جیهانی دەقدان و لەبارەی دەقەوە دەدوێن. (بڕوانە: عبدالحق العابد ٢٠٠٨:٤٤).

دەقی هاوتا، جگە لە ئەرکی جوانناسی و ڕازاندنەوەی دەق ڕۆڵێکی گەیاندنی گرنگ دەبینێ لە ئاڕاستەکردنی خوێنەر لە کردەی خوێندنەوەدا، (کە وەك تۆڕێك لە ڕەگەزی دەق وایە یاوەری دەق دەکات و وای لێدەکات توانای گواستنەوەی هەبێ ئەگەر بەپێی مەبەستی خوێنەریش نەبێ لانی کەم لە ڕێڕەوێکی پراگماتیکی بڕوات و زۆر لە بازنەکەی لانەدات. (محمد دانی ٢٠٠٩:١٩)، ئەمانەی خوارەوە نموونەی چەند دەقێکن لەناو دەقە سەرەکییەکەدا، کە وەك ڕوونکردنەوەکانی نێوان دوو کەوانە دەرکەوتوون:

١– ( ئەو دروشمەی پزیشکە بەعسییەکان لەو دەمەدا کاریان پێدەکرد ئەوە بوو "ئەگەر ساغین یان نەخۆش، لە جەنگدا دەبێ هەموو جەنگاوەر بین و خزمەت بە سەرۆك بکەین"...) (بەختیار عەلی ٢٠١٠:٢٤).

٢– (ڕۆژێك لە کاتێکدا لە بەیانییەوە خەریکی چیلکە کۆکردنەوە و ئاگرکردنەوە بووم، کە گەڕامەوە بۆ کونجەکەی خۆمان مامم وەك هەمیشە تانەبارانی کردم، ئەو قسە توندانە وەها ئازاری دام...، ئەرسەلان کە لە سەرەتاوە ئاگای لە هەموو شتێك بوو، گەلێك دڵی بەمن سووتا و بێئەوەی گوێ لە تکای من بگرێت، چووە ژوورێ بۆ لای جەمشیدخان ((کە بەتانییەکەی لە خۆیەوە ئاڵاندبوو و خەریکی مێوژ خواردن بوو)) و پێیگوت... (هەمان سەرچاوە: ٥٦).

٣– (ئەوەی لە یادی جەمشیددا ماوە ئەوەیە کە سەرەتا هەست بە گێژبوونێکی گەورە دەکات، ترسێکی گەورە دایدەگرێت، هەست دەکات وەك پووش بە خێرایی با دەیبات، لە دیوارەکانی زیندان زیاتر بڵندی

دەكاتەوە، سەرەتا شاقوولّی بەرەو بالاّ هەلّیدەگرێت، دواتر كە دەگاتە سەرووی سەقفەكانی هەیئەتی ئاسایشی باكور ((كە دەبێت ناوی ئەو جێگایە بێت كە جەمشیدی تیا دیل بووە))... (هەمان سەرچاوە:٥).

ئەو دەقانەی ناو دوو كەوانەكان، نموونەی دەقی تەریبن كە لە شێوەی روونكردنەوەی نێوان دوو كەوانە دەركەوتوون، ئەم جۆرەی دەق هەندێ كات دەكرێ دەستبەرداریان بین وەك نموونەی (٢و٣)، بەلاّم لە هەندێ دەقدا وەك پارچەیەك لە پێكهاتەی ئەو دەقە ئەگەر بوونی نەبێ واتای دەق تێكدەچێ وەك لە نموونەی (١).

**٢-٥-٢-٢. ناونیشان و دەق:**

ناونیشان جۆرێكە لە جۆرەكانی دەقی تەریب (Paratext) كە دەوری دەقی سەرەكی دەدەن و وەك بەردەرگا (عتبة الباب) وایە بۆ چوونە ناو دەق و یەكەم بەیەكگەیشتنی فیزیكی هەستپێكراوە لە نێوان دەق و خوێنەر، تاكە رێنیشاندەر و دەروازەی گوزەركردنە بۆ چوونە ناو جیهانی دەق و بەشدارە لە روونكردنەوەی ئاماژەكانی دەق و ئاشكراكردنی واتا و مەبەستە شاراوەكانی لە رووی چەمك و لێكدانەوە و پێكهاتەی دەق.

"لیۆهۆك" (Leohoek) كە یەكەم رابەر و دامەزرێنەری زانستی ناونیشانە بەم جۆرە پێناسەی ناونیشان دەكات: (ناونیشان بریتییە لە كۆمەلّێك هێمای زمانی كە لەسەرووی دەق دادەنرێ بەمەبەستی دیاریكردن و ئاماژەكردن بە ناوەڕۆكی گشتیی دەق و راكێشانی سەرنجی خوێنەری مەبەستدار، بەلاّم بە رای "جاك فۆنتان"، ناونیشان لەگەلّ هێماكانی تر لە بەشە دەگمەنەكانی دەقە و لە سەرووی دەقەوە دەردەكەوێ و دەقێكی هاوتای دەقە سەرەكییەكەیە و جۆرێكە لە جۆرەكانی پەیوەندیی دەق (Transtextuality)، كە ئاڕاستەی خوێندنەوە دیاری دەكات و دەكرێ لە یەكەم بینینی كتێبەوە دەست پێبكات. (عبدالقادر رحیم ٢٠٠٨:١٠) .

ناونیشان سەرەڕای ئەوەی پێكهاتەیەكی سەربەخۆی هەیە لە رووی شێوە و ناوەرۆكەوە، كە دەكرێ وەك دەقێكی سەربەخۆ مامەلّەی لەگەلّدا بكرێ، بەلاّم ئەم

سەربەخۆییە واتای دابڕانی نییە لە دەقدا، ناونیشان وەك بەشێكی سەرەكی دەق وایە، كە ناكرێ بەهیچ شێوەیەك دەستبەرداری بین و ئەمەش بەهۆی ئەو پەیوەندییە پتەوەیە، كە ناونیشان و دەق كۆ دەكاتەوە، هەریەكێكیان بەتەواوكەری ئەویتر دادەنرێ، ئەم گرینگییەی ناونیشان لە پەیوەندی دەق بە دەقەكانی دەوروبەری ئاشكراتر دەردەكەوێ.

ناونیشان تەنها ئاماژەپێدەرێك نییە بۆ دەق كە خوێنەر بەپەلە پێیدا تێپەڕێ بۆ گەیشتن بە دەق، بەڵكو ئاوێنەی پێكهاتەی دەقە و كلیلی مامەڵەكردنە لەگەڵ دەق لە رووی واتا و هێما و رۆڵێكی گرنگ دەبینێ لە نەهێشتنی تەمومژی دەق و ئاشكراكردنی مەبەستە پراگماتیكییەكانی، (ناونیشان تەنیا دەستەواژەیەكی زمانەوانیی دابڕاو نییە بەڵكو كلیلێكی راڤەكاریی بنچینەییە بۆ روونكردنەوەی لایەنە داخراوەكانی دەق. (فوئاد رەشید ٧٣:٢٠٠٧)، ئەمە جگە لەوەی ناونیشان حەزی بەردەوامبوون لە خوێندنەوەی دەق لەلای خوێنەر دروست دەكات بەهۆی دروستبوونی چەند پرسیارێك لەلای، لەكاتی خوێندنەوەی ناونیشانی دەقەكە.

لیۆهۆك لەبارەی گرنگی و كاریگەریی ناونیشانی سەردەم دەڵێ: ( ئەم ناونیشانانەی ئەمڕۆ بەكاریان دێنین وەك ئەو ناونیشانانە نییە كە لەسەردەمی كۆن (كلاسیك) بەكار دەهات، ناونیشان بۆتە بابەتێكی دەستكرد و كاریگەریی زۆری هەیە لەسەر هەریەك لە خوێنەر و رەخنەگر، كە پسپۆرانی بواری ناونیشان گرنگی پێدەدەن و كاری لەسەر دەكەن (عبدالحق العابد ٦٦:٢٠٠٨).

ئەمە گرنگیی ناونیشان دەردەخات، لەوەی كە هەندێك دەق بەهۆی ناونیشانەكەی ناوبانگ پەیدا دەكات و دەمێنێتەوە هەندێك جاریش ناونیشان دەبێتە هۆكاری مردنی دەق، چونكە مەحاڵە كاری ئەدەبی رێگای بۆ وەرگر بدۆزێتەوە بەبێ بوونی ناونیشان، ئەمەش بەهۆی ئەو پەیوەندییە پتەوەی (لەنێوان دەق و ناونیشان لە لایەك و لە نێوان دانەر و ناونیشان لەلایەكی ترەوە دواتر لە نێوان وەرگر و ناونیشاندا هەیە، ئەگەر ناونیشانی دەق ناوێكی ئاماژەپێدەربێ بۆی، ئەوا بەلای دانەر كورتەی ئەزموونی كارە هونەرییەكەیەتی، هەرچی وەرگرە، ئەوا ناونیشان وەك داوێك وایە كە رایدەكێشێ بۆ خوێندنەوەی

دەق بۆیە پەیوەندییەکی ئاڵوگۆڕ هەیە لەنێوان هەرسێکیان کە بریتین لە: دەق-دانەر-وەرگر/ناونیشان (باسمة درمش ٤٢:٢٠٠٧).

زۆر لە رەخنەگران ناونیشان وەك دەقێکی بچووك سەیر دەکەن کە سێ جۆر لە پەیوەندی لەگەڵ دەقی سەرەکی هەیە:

١- پەیوەندییەکی هێمایی (سیمیائي): ناونیشان پەیوەندییەکە لە پەیوەندییەکانی کارە ئەدەبییەکە.

٢- پەیوەندی پێکهاتەیی (بنائیة): پەیوەندی تێکەڵبوون هەیە لە نێوان ناونیشان و کاری ئەدەبی لەسەر بنەمای پێکهاتەیی.

٣- پەیوەندی رەنگدانەوەیی (الانعکاسیة): دەق بەشێوەیەکی گشتی لە رووی پێکهاتە و واتاوە لە ناونیشانەکەی رەنگ دەداتەوە. (عبدالقادر رحیم ١٣:٢٠٠٨)

ناونیشان کورتکراوەی چەمکی دەق دەنوێنێ بیرۆکەیەکی سەرەکییە کارەکە لەدەوری ئەو بیرۆکەیە دەسووڕێتەوە، بۆیە دەکرێ بڵێین (ناونیشان رەگەزێکی زیاد نییە وەك چۆن هەندێك لێکۆڵەر بۆی دەچن[١٨] ئەمەش نەك تەنها لەسەر ناونیشان، بەڵکو لەسەر هەموو رەگەزەکانی تری دەقی هاوتا (Paratext) جێبەجێ دەبێ، بۆیە پێویستە لە رووی پێکهاتە و واتا و ئەرکی پڕاگماتیکییان روون بکرێنەوە، بۆ نموونە ناونیشانی دەق و گوتار و کتێب و تابلۆکان و کارە هونەرییەکان، خاوەنی ئەرکی هێمایی کۆدکراون کە گوزارشت لە جیهانێکی دەوڵەمەند لە واتا و ئاماژەپێدان دەکەن (جمیل الحمداوي ٩٠:٢٠١١).

ئەو میوزیکانەی کە وەکو پارچەیەکی بە ناونیشان دەخرێنە روو وەك، ( ئێستا لەگەڵ پارچە مۆسیقایەك بەناونیشانی ژیانی لادێ)، ئەمە گوێگر بەناچاری بەرەو خەیاڵی ژیانی لادێ دەبات، بەڵام لە گوێگرتن لە مۆسیقایەکی بێ ناونیشان (ئەبستراکت) هەر گوێگرێگ بەپێی واقیع و یادەوەری و ژیانی مێژوویی خۆی بۆ خەیاڵێکی تر دەڕوات.

نووسەر هەموو هەوڵێکی خۆی دەخاتە گەڕ بۆ هەڵبژاردنی ناونیشانێك کە لەگەڵ ناوەڕۆکی بەرهەمەکەی بگونجێ بەمەبەستی هونەری و بازرگانی و

جوانکاریی دەقەکە، ناونیشان وەك ناوێکی تایبەتی وایە بۆ دەق وەك چۆن کەسەکان خاوەنی ناوی تایبەتیی خۆیانن.

ناونیشان جگە لەوەی هەڵگری واتای مەبەستدارە، پێکهێنەری پەیوەندییەکی کاریگەرە لەگەڵ جیهانی دەرەوە بە دیاردە جۆراوجۆرەکانی واقعی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و رەوشتی...، کە وەك نێوەندێك وایە لەنێوان بەرهەمی ئەدەبی و جیهانیی راستەقینە تیشکۆی سەرەکی پەیوەندیکردنە لە پەیڕەویی گەیاندندا، رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە کەمکردنەوەی ماوەی نێوان دانەر و خوێنەر، وەك هەر نامەیەکی تری زمانی بەهۆی ئەو دەوروبەرەی دەوری خوێنەر دەدات لە (کات و شوێن و زانیاریی دنیایی ...) کاری تێدەکرێت، (دەکرێ ناونیشان لە چوارچێوەی کرداری پەیوەندیکردندا (Communication) وەکو پەیامێك (Message) زیاتر بەرجەستە بکرێت، لێرەشدا پەیامەکە تەنیا نییە، بەڵکو بەسەر سەری دەقێکەوەیە کە لەلایەن پەیامدەر (نووسەر)ەوە ئاراستەی پەیامگر (وەرگر) دەکرێت (فوئاد رەشید ٢٠٠٧:٥٨)، بۆنموونە کاتێك خوێنەرێك ناونیشانی دەقی نووسەرێك دەخوێنێتەوە کە پێشتر بەرهەمی تری ئەو نووسەرەی خوێندبێتەوە، لەوانەیە زووتر بگات بەمەبەستی دەق کە لە رێگەی ئەو بیرۆکەیەوە لەلای دروست دەبێ لەکاتی خوێندنەوەی ناونیشانەکە بەهۆی ئاشنایەتیی خوێنەر بەچۆنیەتی بیرکردنەوەی نووسەرەوە .

### ٢-٥-٢-٣. جۆرەکانی ناونیشان:

ناونیشان لە رووی شوێن و دەرکەوتنی لە کاری ئەدەبیدا دەکرێ بۆ چەند جۆرێك دیاری بکرێت:

١- ناونیشانی دەرەکی: ئەم جۆرەی ناونیشان لە بەرگی پێشەوەی کتێب یان هەر بەرهەمێکی تر بە فۆنتێکی دیار و ئاماژەپێدەر دەردەکەوێ .

٢- ناونیشانی دیاریکەر: ئەم جۆرەی ناونیشانە، کە رەگەزە ئەدەبییەکە (شیعر، رۆمان، چیرۆك، ژیاننامە،....) دیاری دەکات و زۆربەی کات لەگەڵ ناونیشانی دەرەکی لە بەرگی کارە ئەدەبییەکە دەردەکەوێ.

٣- ناونیشانی سەرەکی: ئەم جۆرەی ناونیشان لە سەرووی دەقەکە دەردەکەوێ، کە ناونیشانی شیعرێك یا پەخشانێك یا چیرۆکێك یان بەشێکی لێکۆڵینەوەکەیە.
٤- ناونیشانی ناوەکی: ئەمەیان لە ناونیشانی سەرەکی جیا دەبێتەوە.
٥- ناونیشانی بڕگەکان: ئەو ناونیشانەیە کە بڕگەکان لە یەکتر جیا دەکاتەوە.
٦- ناونیشانی ناوەڕۆك: ناوەڕۆکی کارەکە دیاری دەکات و پێکهاتە ناوەکییەکانی دەردەخات. (بڕوانە: جمیل الحمداوي ٢٠١١:٨٥)

بۆنموونە رۆمانی "جەمشیدخانی مامم کە هەمیشە با لەگەڵ خۆیدا دەیبرد" جگە لەو ناونیشانەی کە ناونیشانێکی سەرەکییە و لە سەر بەرگی کتێبەکە بە خەتێکی دیار نووسراوە کە لە سەرووپەوە ناونیشانی دیاریکەر دەرکەوتووە، کە رەگەزە ئەدەبییەکەی دیاری کردووە لەگەڵ ناوی نووسەری دەقی رۆمانەکە، چەند ناونیشانێکی تری ناوەندی لە خۆ دەگرێ وەك: (لەگەڵ جەمشیدخان لە مەیدانەکانی جەنگدا، حەشارەکانی بارانۆك، گەڕانەوە بۆ شار، جەمشیدخان و خودا، سەفەرەکانی جەمشیدخان، ئاژانسەکەی جەمشیدخان، کۆتاییەکانی جەمشیدخان).

ناونیشان لە رووی ئەرك و پەیوەندی بەناوەڕۆکی دەق دەکرێت بە دوو جۆری سەرەکی ناونیشانی نیشانەیی و ناونیشانی ئاماژەپێدەر:

**ناونیشانی نیشانەیی:**

ئەم جۆرەی ناونیشان بەگشتی کورتن و لە یەك وشە یا گوزارشت پێکدێت بەرهەمەکە بەشێوەیەکی بابەتی پێشکەش دەکات، کە چەند جۆرێکی هەیە وەك ژمارە (هۆنراوەی یەکەم ، دەقی یەکەم،...) یا لە شێوەی ئەستێرە و هێمای کورت کە هیچ ئاماژەیەك بۆ واتا و ناوەڕۆکی دەقەکە ناکات.

**ناونیشانی ئاماژەپێدەر:**

ئەم جۆرەی ناونیشان لەگەڵ ئەوەی بەرهەمەکە دیاری دەکات و ئەرکی ناولێنان دەبینێ بیری خوێنەر بەئاڕاستەی جیاجیادا دەبات، ناونیشانی کورتکراوەشی پێدەڵێن کە کورتکراوەی بیرۆکەی دەقە لە گۆشەنیگای نووسەرەوە.

**٢ـ٥ـ٢ـ٤. ئەرکەکانی ناونیشان:**

لەگەڵ ئەوەی ناونیشان دەچێتە ریزی دەقی پاشکۆ (Paratext) و بەشێکە لە پێکهاتەکانی دەق لەبەرئەوە ئەرکەکانی بەشێکن لە ئەرکەکانی دەقی پاشکۆ، بەڵام لە هەمان کاتدا بەچەند تایبەتمەندییەك لێی جیا دەبێتەوە، کە ئەمەش وای کردووە لە گرنگترین رەگەزەکانی دەقی پاشکۆ بێت، هەر ئەمەشە بۆتە هۆی زۆریی لێکۆڵینەوە و گرنگیدان بە ناونیشان و ئەرکەکانی. ناونیشان لەلایەن زۆر لە لێکۆڵەرانەوە گرنگی پێدراوە و بۆتە بابەتێکی سەرەکی لە زانستی کتێبخانەکان و بیبلۆگرافیا و هێماسازی و زانستی زمان و واتاسازی، ئەو زانایانەی باسی ناونیشان و ئەرکەکانیان کردووە زۆرن لەوانە: گیرار گینیت، لیۆهۆك، کلۆد دوشی، هنری میتران، شارل کریفل، ئەمبەرتۆ ئەکۆ، لوسیان کۆڵدمان، جان ریکاردو...

بەهۆی ئاڵۆزیی لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەرکەکانی ناونیشان هەندێك لێکۆڵەر لە رێگەی ئەو ئەرکانەی کە "یاکۆبسن" بۆ زمانی دیاری کردووە لە پەیڕەویی گەیاندندا ئەرکەکانی ناونیشان دیاری دەکەن لە روانگەی ئەوەی ناونیشانیش وەك نامەیەکی زمانی خاڵی بەیەکگەیاندنی نێوان دانەر و خوێنەرە لە پەیڕەویی گەیاندندا و ئەرکێکی پڕاگماتیکی دەبینێ، "لیۆهۆك" لە پێناسەکەی بۆ ناونیشان سێ ئەرکی بۆ دیاری کردووە:

١– ئەرکی ناولێنان.

٢– ئەرکی دیاریکردن.

٣– ئەرکی راکێشان و ئارەزوومەندی، لیۆهۆك ئەمە بە ئەرکی پڕاگماتیکی دادەنێ.

"گینیت" وا دەبینێ کە ئەم سێ ئەرکەی ناونیشان مەرج نییە هەموویان لە یەك ناونیشان کۆ ببنەوە، سەرەڕای ئەوەی ئەرکی یەکەم گرنگە و دەبێ لە هەموو ناونیشانێکدا بوونی هەبێ[١٩].

**٢ـ١٣ـ٣. پەیوەندی پشتەوەی دەق/ ماوراء النصية (Metatextuality):**

ئەو پەیوەندیی روونکردنەوە و شیکردنەوەیە، کە دەقێك بەدەقێکی تر دەبەستێتەوە، لە بارەیەوە دەدوێ و وەسفی دەکات، هەندێ جار ناویشی ناهێنێ، ئەمەش دەچێتە قاڵبی پەیوەندیی رەخنەیی و دەکرێ هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی لە بارەی دەقێك ئەنجام دەدرێت بەمەبەستی روونکردنەوە و تیشك

خستنە سەر لایەنی باش و کەموکوڕییەکانی ئەو دەقە بخرێنە قاڵبی ئـەم جـۆرەی پەیوەندیی دەقەوە. جگە لەو لێکۆڵینەوانە ئـەو دەقانـەش دەگرێتـەوە، کـە لـەناو پێکهاتـەی دەقـە سـەرەکییەکەن و لەبارەیـەوە دەدوێـن، بۆنموونـە ئەگـەر دەقـی گێڕانەوە وەربگرین ئەوا ئەو دەق و بڕگانەی پەیوەستن بە شـیکردنەوە، یـان دوان لەبارەی بڕگەیەك لە بڕگەکانی ئەو دەقەی گێڕانەوە، ئەوا بە مێتا دەق نـاودەبرێ، بەتایبەتی ئەو شیکردنەوانەی تایبەتن بەو کۆدانەی گێڕانەوەکەی لـێ پێکهـاتووە، کە بە مێتاگێڕانەوە یاخود سەرووی گێڕانەوە (Metanarrative) نـاودەبرێ، ئەمـە سەرەڕای ئەو دەقە گێڕدراوانەی دەربـارەی دەقێکـی تـری گێـڕدراوەن، بۆنموونـە کاتێك دەقـی چـیرۆکێك لـەبارەی رووداوەکـانی چـیرۆکێکی تـر دەدوێ. "گینیـت" لـەبارەی ئـەم جـۆرەی دەق دەڵـێ: کاتێـك ئـەرکی گێڕانـەوە دەبینـێ، کـە دەقـە بنجییەکـە لـەبیر کرابـێ (بڕوانـە: جیرالـد پـرنس ٢٠٠٣: ١٠٧ــ١٠٩)، سـالار کـە گێڕەرەوەیە لە دەقی (جەمشیدخانی مامم کە هەمیشە با لەگەڵ خۆیـدا دەیـبرد)، لەسـەر زاری پاڵـەوانی رۆمانەکـە، کـە جەمشـید خانـە، چـیرۆکی (دەرکردنـی بابـە ئادەم لە بە هەشت دەگێڕێتەوە)، بە جۆرێك چیرۆکەکەی پێچـەوانە کردۆتـەوە کـە هەرکەسێك گوێبیستی ئەو چیرۆکە بووبێت هەست بەوە دەکات، کە ئەمە چیرۆکی راستەقینەی  دەرکردنی بابە ئادەم نییە لە بەهەشتدا، ئەمەش نموونەیەکی دیاری مێتا دەق دەنوێنێ، ئەم دەقـە کاتێـك وەك دەقێکـی گێڕانـەوە سـەیر دەکـرێ کـە چیرۆکی راستەقینەی دەرکردنی بابە ئادەم لە بە هەشت لە بیر کرابێ.

**٢ـ٥ـ٤. پەیوەستبوونی دەق یان هەڵواسینی دەق/ تعالق النص** (Hypertextuality) :

ئەمەش پەیوەندی نێوان دوو دەق دەنوێنێ، کە دەقی پاشکۆ (النص اللاحق/ hypertext) بەدەقی پێش خۆی (النص السابق/hepotext) لە رێگەی ئاماژەکـانی دەقی پێشووەوە، بۆ نموونە نووسەری دەقی رۆمانی (جەمشید خانی مامم) لە ناو دەقەکەیدا ئامـاژە بـە چـەند دەقێکـی تـر دەکـات کـە تـەنها ناویـان دێنـێ یـاخود بیرۆکەیەکی سادە و کورت دەربارەیان دەدات، وەك: ( تیۆری ئەسڵی چەشـنەکان لای داروین، گەشتی ئۆدیسۆس...هیتر).

"گینیت" ئەم جۆرەی پەیوەندی دەق بە فراوانبوونی دەق ناودەبات (الاتساعیة النصیة) مەبەست لێـی هـەموو پەیوەندییەکـە دەقـی (B) کـە بـەدەقی فراوانکـراو

ناودەبات بە دەقێکی پێشوو (A) کە بەدەقی کورتکراوە ناوی دەبات دەبەستێتەوە.

"گینیت"دەڵێ: ئەوەی پێشگری (Hyper) و(Meta) بەیەکەوە دەبەستێتەوە تایبەتمەندیی وەرگرتنی دەقێکە لە یەکێکی تر کە پێشتر بوونی هەبووە، دەکرێ ئەم وەرگرتنە لە ڕێکخستنێکی وەسفی و ڕۆشنبیری بێ.

(پەیوەندی دەقی مێتا (B) بەو دەقەی لەبارەیەوە دەدوێ (A) پەیوەندییەکی وەسفی و شیکارییە (B) بەبێ بوونی (A) بوونی نابێ هەرچەندە ناویشی نەهێنێ، کەچی ئەم پەیوەندییە لە نێوان دەقی (A و B) کە پەیوەندی Hypertexyualit کۆیان دەکاتەوە بە ڕێکخستنێکی تر دەبێ کاتێك دەقی پێشوو لە دەقی داهاتوو نادوێ تەنها ناوی دەهێنێ و ئاماژەی پێدەکات بێ ئەوەی ڕوونکردنەوەی لەبارەوە بدات، "گینیت" ئەم پەیوەندییە بە کردەی گوێزانەوە Transformation ناو دەبات. (بڕوانە: محمد خير البقاعي ١٣٠:١٩٩٨).

ئەو دەقانەی لە تۆڕی ئینتەرنێت دەیانخوێنینەوە، کە پێکهاتەیەکی ئەلیکترۆنییان هەیە نموونەی ئەم جۆرەی پەیوەندی دەقن کاتێك لەناو دەقەکان لینکێك بەرچاو دەکەوێ بۆ ئاماژەکردن بە دەقێکی تر، "ئەمبەرتۆ ئەکۆ" لە یەکێك لە وانەکانی دەربارەی "دوارۆژی کتێب" باس لە زاراوەی Hypertextuality دەکات بە تایبەت لە بواری ئاماژەکردن لە بەیەکگەیشتنی تەکنۆلۆژیا و تیۆری ڕەخنەیی سەردەم[٢٠].

**٢-٥-٥. تەلارسازیی دەق** (Architextuality):

ئەمەش بریتییە لە دیاریکردنی جۆری ئەدەبیی کارەکە وەك شیعر، ڕۆمان، چیرۆك....، کە وەك شێوازێکی دابڕاو وایە بە پشتبەستن بە تایبەتمەندیی شێواز و قالبی پێکهاتنی جۆرە ئەدەبییەکان، "گینیت" ئەم جۆرە پەیوەندییە بەوە پێناسە دەکات، کە (زیاتر لە هەموو شێوازەکانی تر ناوەکی و دابڕاوە و بە پەیوەندییەکی لاڵ و بێ زمان ناوی دەبات، کە تەنها لە ڕێگەی دەقی هاوتا (Paratext) بە باشترین شێوە دەردەکەوێ.

"گینیت" ئەم پەیوەندییە بە پەیوەندییەکی لاڵ ناودەبات لەبەرئەوەی ئاماژەکردن بەشتێکی دیار ڕەت دەکاتەوە و لێی رادەکات، ئەوەی ڕاستی بێ دەق

داوای لێ ناکرێ جۆر و رەگەزەکەی دیاری بکات بۆنموونە، رۆمان خودی خۆی دیار بکات لەوەی کە رۆمانە، هەروەها هۆنراوە لەوەی کە هۆنراوەیە، دیاریکردنی رەگەزە ئەدەبییەکەی تەنها جۆرێکە لە جۆرەکانی (Paratext)، ئەم دیاریکردنە ئەرکی خوێنەر و رەخنەگران و جەماوەری دەقە، کە دەتوانن بەتەواوی ئەو دیاریکردنە رەت بکەنەوە، بۆنموونە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژوو ئەو چیرۆکە درێژانەی بەهۆنراوە نووسراون ئێستا ناچنە خانەی شیعرەوە و چەمکی شیعر تەسك بۆتەوە و تەنها شیعری گۆرانی دەگرێتەوە، بەڵام ئەمە لە گرنگییەکەی کەم ناکاتەوە، دیاریکردنی وێناکردنی جۆر بەشێوەیەکی فراوان ئاسۆی پێشبینییەکانی خوێنەر دیاری دەکات و ئاراستەی دەکات وەك چۆن وەرگرتنی کارەکە دیاری دەکات و ئاراستەی دەکات (هەمان سەرچاوە: ١٢٨).

هەندێك لە نووسەران رەخنە لەو پۆلکردنەی "گینیت" دەگرن لەبارەی تەلارسازیی دەق لەوانە "شافر"، لەوەی کە تەلارسازی تەنها جۆرێکە لە دیاردەکانی پەیوەندی دەقی بنچینەیی بە دەقی هاوتا (paratextuality) کە پەیوەندیی دەقە بە دەقی دەوروبەری وەك پەیوەندیی دەق بە ناونیشان و ناونیشانی ناوەکی و پەراوێز .... لە لایەکی ترەوە جیاوازییەکی یەکلاییکەرەوە هەیە لە نێوان تەلارسازیی دەق و شێوەکانی تری پەیوەندیی دەق کە هەریەك لەو پەیوەندییانە خاوەنی دەقێکی تایبەت بە خۆیانن، وەك دەقی پاشکۆ و دەقی پێشوو لە پەیوەندیی دەقی پاشکۆ، بەڵام دەقی تەلارسازی بوونی نییە بەشێوەیەکی ماددی وەك شێوەکانی تری پەیوەندیی دەق، بەڵکو تەنها ناوێکی خوازراوە بۆ دیاریکردنی جۆر و رەگەزی کارە ئەدەبییەکە.




کارلێکی دەق بریتییە لە هەموو ئەو پەیوەندییانەی دەقێك لە رووی شێواز و ناوەرۆکەوە لەگەڵ دەقی تر هەیەتی، جا لە سنووری یەك دەق بێت، یان زیاتر، بەشێوەی راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، لە رووی پێکهاتن و چوونە ناویەکی دەق، کە

سنوورێك نییە بۆ جیاكردنەوە و دیاریكردنی دەقێك لەگەڵ دەقێكی تر و كارێكی ئەستەمە بتوانین هەموو جۆرەكانی كارلێكی دەق دیاری بكەین، جا چ بەشێوەی ئاشكرا بێت، یا شاراوە، چونكە پێویستی بە ئەزموون و لێهاتووییەكی تەواو هەیە لە بواری مێژووی بەرهەمی ئەدەبی و هونەرەكانی رەوانبێژی و تەكنیكی نووسین، ئەمە سەرەڕای شارەزایی لە بواری كۆمەڵایەتی و یاساكانی پڕاگماتیكی و مێتاپڕاگماتیكی، لێكۆڵینەوە لەم جۆرانەی پەیوەندی دەق شوێنێكی زۆر دیاری هەیە لە بواری پڕاگماتیكدا، وەك "گینیت" باسی لێوە دەكات ئەمەش بەهۆی ئەو كاریگەرییەیە، كە لەلای خوێنەر دروستی دەكات.

پەیوەندییەكانی نێو دەق بەگشتی لەسەر دوو ئاست دەبێ لە ئاستی داڕشتن و پێكهاتەیی ئەمەش هەموو جۆرەكانی پەیوەندیی دەق دەگرێتەوە كە لە سنووری پێكهاتەی كارێكی ئەدەبی روو دەدەن، هەرچی ئاستی دووەمە ئەوە لەسەر ئاستی شێوازە لە پەیوەندی كارێك بە كار و بەرهەمی ترەوە جا هی هەمان دانەر بێ، یاخود دانەری تر بەرهەمەكانیان نووسیبێ، دەكرێ ئەم پەیوەندییانەی نێوان دەق لە رێگەی وێنەوە زیاتر روون بكەینەوە، بۆ نموونە ئەگەر وێنەیەك سەیر بكەین كە وێنەی چەند كەسانێك بێ، پەیوەندی ئەو كەسانەی لەناو وێنەكەن پەیوەندییەكی ناوخۆییە و لە سنووری ناوەوەی وێنەكەدایە، لەلایەكی ترەوە پەیوەندی كەسەكانی ناو وێنەكە بە رەنگ و جۆری كاغەزی وێنەكە و ناونیشانی وێنەكەوە...، پەیوەندی كەسەكانی ناو وێنەكەیە بە رەگەزی تر لەناو وێنەكەدا كە دەوریان دەدەن، ئەمە جگە لەپەیوەندیی هەریەكێك بەویترەوە لەناو وێنەكە ئایا ئەو كەسانەی لە وێنەكەدا دەركەوتوون، چ پەیوەندییەك كۆی كردوونەتەوە بە پەیوەندییان بە دەركەوتنیان لەو هۆكارەی، كە كۆی كردوونەتەوە، كە وێنەكەیە لە سنووری وێنەكەدا ئەمانە نموونەی پەیوەندیی ناوخۆیی وێنەكە بوون، بەڵام لە هەمان كاتدا ئەو وێنەیە پەیوەندی بە دەوروبەریشەوە نەبڕاوە بەوەی بەشێكە لە دەوروبەر و پەیوەندی بەو رووداوەوە هەیە لە رووی رێكەوت و كات و شوێن، ئەو بۆنەیەی وێنەكەی لێ گیراوە، یاخود وێنەی كێشراوە لەلایەك و پەیوەندی لەگەڵ وێنەی تر لە دەوروبەر لە لایەكی ترەوە جگە لەوەی كاتێك ئەو وێنەیە لە رۆژنامەیەك یا گۆڤارێك یا كتێبێك یا هەر هۆكارێكی تر بڵاو كرابێتەوە پەیوەندی ئەو وێنەیە بەو بابەتەی پەیوەستە پێیەوە جۆرێكی تر لە پەیوەندی دەنوێنێ، كە پەیوەندییە دەرەكییەكانی دەق یاخود پەیوەندی دەق بە دەقی ترە لە دەرەوە.

## ئەنجامەكان

ئەم لێكۆڵینەوەیە ئەو ئەنجامانەی خوارەوەی لێ كەوتۆتەوە :

١ـ شیكردنەوەی دەق واتە هەڵوەشاندنەوەی دەق و داڕشتنەوەی لە بنچینەدا كاری مێتا پڕاگماتیكە، بەڵام ئەم داڕشتنەوەیەی دەق ناكرێ بكرێت بە تیۆر و چوارچێوەی بۆ دابڕێژرێ، چونكە ئەم داڕشتنەوەیە بەپێی جۆری دەقەكە دەگۆڕێ، بەمەش مێتا پڕاگماتیك چوارچێوەیەكی كراوەی دەبێ لە بە تیۆركردنی دەقەكاندا.

٢ـ ئەگەر توانستی مرۆڤ لە بەكارهێنانی دروستی زمانەكەیدا بە رەسەنایەتی لەقەڵەم بدرێ (وەكو هەندێ وای بۆ دەچن)، ئەوكاتە هەر ئەدیب و نووسەرێك خاوەن دوو توانست یان رەسەنایەتی دەبێ، یەكەمیان وەكو قسەكەری زمانەكە، دووەمیان توانستی داهێنانە، كە زیاتر دەچێتە چوارچێوەی گەمەكردن بە وشەكان و بەزاندنی سیاقەكانیان.

٣ـ رەخنەگر كاتێك دەقێك هەڵدەسەنگێنێ، دەبێ لە تۆنێلی واتایی دەقەكەوە بۆ بەهای دەقەكە بچێ، ئەمەش لە رێگەی مەودای پەیوەندی و كارلێككەری دەقەكە بەسەر خوێنەرەوە دەبێ، كە رەخنەگر خۆی یەكێكە لەو خوێنەرانە.

٤ـ جیاوازیی نێوان دەقی داخراو و دەقی كراوە لەوەدایە، كە ئەوەی یەكەم نووسەر بەجۆرێك كە دایدەڕێژێ زیاتر لە خوێندنەوەیەكی هەبێ، دەقی نەخوێندراوە بە دەقێكی مردوو یان نا تەواو لەقەڵەم دەدرێ، چونكە خوێندنەوە بەشێكی تەواوكەری دەقە.

**پەراوێزەکان:**

١ مستل لە نامەی ماستەر.

٢ **بابەت:** ناوەڕۆکی ئەو پەیامەیە کە نێرەر دەیەوێ بیگەیەنێتە گوێگر و ئەرکێکی کۆمەڵایەتی لە خۆ دەگرێ کە کرۆکی پەیامەکە دەنوێنێ، وەك ( پرسیارکردن، فەرماندان، پێدانی زانیاری...)، کارامەیی پەیوەندیکردن دەوەستێتە سەر بڕی ئەو زانیارییەی نێرەر بۆ وەرگری دەنێرێ بۆیە دەبێ زانیارییەکان بەپێی پێویست بێ، چونکە کەمیی زانیارییەکان لەوانەیە وەڵامی پرسیارەکانی گوێگری پێ نەدرێتەوە، ئەگەر زیاد لەپێویستیش بێ وەرگر ناتوانێ لەیەك کاتدا بڕی ئەو زانیارییە زۆرە وەربگرێ.

٣ مەبەست لە بەستراوەی شوێن پەیوەست بە کاری ئەدەبی بریتییە لەوەی (هەر بەرهەمێکی ئەدەبی بە دوو ڤالا (فضاء) بەستراوەتەوە، یەکەمیان پێکهاتەییە پەیوەستە بە پێکهاتەی کاری ئەدەبی، دووەمیان ناوەڕۆکییە پەیوەستە بە بابەتەکەوە، "گیرارجینیت" چوار بۆشایی پەیوەست بە کاری ئەدەبی دیاری کردووە (بۆشایی زمان، بۆشایی نووسین، بۆشایی گوزارشتکردن، بۆشایی ئەدەب (بڕوانە: لطیف زیتوني ٢٠٠٢:١٢٧).

٤ دیالێکتیکی: پەیوەندی دیالێکتیکی بۆچوونێکی مارکسییە لەلایەن (Dittmar)، ساڵی ١٩٧٩ خرایە روو، ئەوەی خستە روو کەوا رەفتاری ئاخاوتن و رەفتاری کۆمەڵ کاریگەرییان بەسەر یەکەوە هەیە (پەیمان حسن ٢٠١٠:٤).

٥ * (ئەمبەرتۆ ئەکۆ) لە تیۆری خوێندنەوەدا باسی خوێنەری نموونەیی دەکات کەلە بیروڕاکانی (ئیسر)ەوە دەستی پێکردو لەو گۆشەنیگایەوە هەوڵی فراوانکردنی تیۆرەکەی دا لە چوارچێوەی هێماکاریدا کە خوێنەر پشت بە شیکردنەوەی کۆدەکان (هێماکانی زمان) دەبەستێ، کە خوێنەری نموونەیی وەك بەشێك بۆ ستراتیژییەتی دەق پێشنیاز کرد و بەوە پێناسەی دەکات: (ئەو خوێنەرەیە ئەرکی شیکردنەوەی کۆدەکان بە باشترین شێوە ئەنجام دەدات)، بە واتایەکی تر ئەو خوێنەرەیە کە وەڵامدانەوەکانی بۆ دەق لەگەڵ ئارەزووەکانی نووسەر چۆنیەك دەبێ و توانای هەیە بۆ دەستخستنی واتای راستەقینەی دەق (بڕوانە: عبدالناصر حسن ١٩٩١:١٤٣).

٦ بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:

- A.S.Byatt (1997:213), Babel tower, Random House: London.

-Cutting Joan (2002:8), Pragmatics and Discourse, Rotledge:London.

٧ بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: (عبدالناصر حسن ١٩٩١:١٢١).

٨ مەبەست لە جەماوەر خەڵکی بینەر و گوێگرە کە لە ئینگلیزی وشەی (Audience) ی بۆ بەکاردێت.

٩ یەکەم کەس کە زاراوەی مۆنۆلۆژی ناوەکی بەکارهێنا (ئێدوارد دوجاردن) بوو لە رۆمانەکەی بەناوی"ئەشکەوتی دابڕاو"، کە شێوازی مۆنۆلۆژی ناوەکی بەم شێوەیە پێناسە دەکات (گوتارێکی گۆنەکراو و نەبیستراوە، کەسێك گوزارشتی لێدەکات دەربارەی بیرۆکە راستەقینەکانی و نزیك لە بێئاگایی، ئەو گوتارەیە کە نەکەوتۆتە ژێر کاری لۆجیك و لە حاڵەتێکی سەرەتاییە و رستەیەکی راستەوخۆیە، کەمتر بەستراوەتەوە بە یاساکانی رێزمان، وەك ئەوەی بیرۆکە بن و هێشتا دانەڕێژرابن (لطیف زیتوني ٢٠٠٢:١٦٣).

١٠ پەیوەندی گێڕەرەوەی چیرۆك بە چیرۆکە گێڕدراوەکە پێی دەگوترێت گۆشەنیگای گێڕانەوە، بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی گۆشەنیگای گێڕانەوە و چەمکی گۆشە نیگا (بڕوانە: جەلال ئەنوەر٢٠٠٩:١٧٥).

١١ شیکردنەوەی رۆنانی گێڕانەوە بە زانستی گێڕانەوە (Narratology) ناسراوە (Crystal1992:346).

١٢ بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی پێناسەی دەق و تێڕوانینی رێبازە رەخنەییەکان بۆ دەق. (بڕوانە: محمد عزام ٢٠٠١:١٤).

١٣ دەق لە فەرهەنگی ئینگلیزی وشەی (Text)ی بۆ بەکاردێت، کە لە وشەی یۆنانی (Textus) وەرگیراوە کە بە واتای چنین دێت.

١٤ لەگەڵ ئەوەی زاراوەی (دوای بونیادگەرییەکان) راستەوخۆ گوێزانەوەیە بۆ بونیادگەری، بەڵام (دوای بونیادگەرییەکان) گەشەسەندنێکی ئەندامی نییە بۆ بونیادگەری، بەوەی چەند ئەندامێك لەناو بونیادگەرییەکان جیابوونەوە (نهلة فیصل ٢٠١٠:٦١).

١٥ گفتوگۆگەرایی (الحوارية– نظرية الملفوظية Dialogism ): بریتییە لەوەی هەموو کارلێکێکی گوتن لەشێوەی گۆڕینەوەی نێوان ئاخاوتنەکان روودەدات واتە لە شێوەی دیالۆگ. (نهلة فیصل ٢٠١٠:١٠٢).

١٦ مەبەست لە فرە دەنگی"تعدد الاصوات " ئەوەیە هەموو قسەکردنێك ئاڕاستەکراوە بە ئاڕاستەی ئاسۆیەکی کۆمەڵایەتی و هەموو جۆرێکی دەربڕین بەپێویستی دەکەوێتە نێو یەك یان زیاتر لە شێوازێکی ئاخاوتن کە هەمان شێواز دیاری دەکات.(نهلة فیصل ١٠٣:٢٠١٠).

١٧ پێشگری (para) تەنها بەواتای سنووری دوولایەنی جیاکراوە نایەت لەنێوان ناوەوە و دەرەوە بەڵکو سنوورەکەش خۆیەتی و ئەو بەربەستەیە، کە ئەو تایبەتمەندییە بە بەرگی جیاکردنەوە دەدات، کە توانای تێپەڕبوونی لەناوەوە و دەرەوە هەبێ و دوو روو لێك جیادەکاتەوە بۆئەوەی لەهەمان کاتدا بەیەکیان بگەیەنێتەوە. (عبدالحق العابد ٤٢:٢٠٠٨).

١٨ لێکۆڵینەوەی رەخنەی ئەدەبی کلاسیك تەرکیزیان لەسەر ناوەڕۆکی دەق دەکرد و لە شیکردنەوەکانیان ناونیشانیان بەلاوە نابوو، بەلام لێکۆڵینەوەکانی سەردەم ، لەپێش هەموویانەوە زانستی هێما بایەخێکی زۆر بە ناونیشان دەدات. (احمد المنادي ١٤٩:٢٠٠٧).

١٩ بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەرکەکانی ناونیشان. (بڕوانە: عبدالحق العابد ٧٣:٢٠٠٨)

٢٠ بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی ئەم بابەتە بڕوانە ئەم لینکە:

http://www.montadabaja.com/vb/showthread.php?s=828a9f2b5ff146aee927c0c13e54ca6a&t=3065.

**سەرچاوە کوردییەکان:**

١ـ بەختیار عەلی (٢٠١٠)، جەمشیدخانی مامم کە هەمیشە با لەگەڵ خۆیدا دەیبرد، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی ئەندیشە، چاپخانەی کارۆ.

٢– پەیمان حسن محمد سلیم (٢٠١٠)، پەیوەندی نێوان زمان و کەلتوور"لێکۆڵینەوەیەکی وەسفی– شیکارییە"، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین.

٣– جەلال ئەنوەر سەعید (٢٠٠٩)، تەکنیکی گێڕانەوە لە رۆمانی (ئێوارەی پەروانە)ی بەختیار عەلی دا، چاپخانەی کەمال، سلێمانی.

٤– سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو (٢٠٠٨)، زمانەوانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر.

٥ـ عەبدولواحید مشیر دزەیی (٢٠٠٩)، کاریگەریی دەروونی لە بواری راگەیاندندا "لێکۆڵینەوەیەکی سیمانتیکی و پڕاگماتیکییە"، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر.

٦ـ عومەر مەحمود کەریم و شێرکۆ حەمە ئەمین قادر (٢٠١٠)، بنەمای هاریکاری لە گوتاری سیاسی کوردیدا، گۆڤاری ئەکادیمی ژمارە (١٥).

٧ـ فوئاد رەشید (٢٠٠٧)، دەقی ئەدەبی"ئەدگار. چێژ. بەها"، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر.

٨ـ قەیس کاکل تۆفیق (٢٠٠٢)، پەیوەندییەکانی نێو دەق، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سەلاحەددین، کۆلێژی ئاداب.

٩ـ محمد معروف فتاح (٢٠١٠)، لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر.

### سەرچاوە عەرەبییەکان:

١٠ـ ادوارد ساپير وآخرون (١٩٩٣)، اللغة والخطاب الادبي، ترجمة: سعيد الغانمي، الطبعة الاولى، المركز الثقافي العربي، بيروت.

١١ـ الطاهر بومزبر (٢٠٠٧)، التواصل اللساني والشعرية" مقارنة تحليلية لنظرية رومان جاكوبسن"، منشورات الاختلاف، جزائر.

١٢ـ امنة يوسف (١٩٩٧)، تقنيات السرد في النظرية والتطبيق، الطبعة الاولى، دار الحوار للنشر والتوزيع، سورية.

١٣ـ بيير جيرو (١٩٩٢)، علم الاشارة السيميولوجيا، ترجمة: منذر العياشي، دار طلال، سورية.

١٤ـ تون ا. فان دايك (٢٠٠١)، علم النص (مدخل متداخل الاختصاصات)، ترجمة: سعيد حسن بحيري، الطبعة الاولى، قاهرة.

١٥ـ جان ايف تادييه (١٩٩٣)، النقد الادبي في القرن العشرين، ترجمة: قاسم مقداد، منشورات وزارة الثقافة، دمشق.

١٦ـ جميل الحمداوي (٢٠٠٦)، لماذا النص الموازي؟، مجلة الكرمل فلسطين.

١٧ـ ــــــــــــ (٢٠١١)، سيموطيقيا والعنونة، مجلة عالم الفكر مجلد (٢٥)، عدد (٣)، كويت.

١٨ـ جيرار جينيت (١٩٩٥)، مدخل لجامع النص، ترجمة: عبدالرحمن ايوب، دار الشؤن الثقافية (افاق عربية)، بغداد.

١٩ـ جيرالد برنس (٢٠٠٣)، قاموس السرديات، ترجمة: السيد امام، قاهرة.

٢٠ـ رومان ياكوبسن (١٩٨٨)، قضايا الشعرية، ترجمة: محمد الولي، الطبعة الاولى، مغرب.

٢١ـ رولان بارت وآخرون (١٩٩٢)، طرائق تحليل السرد الادبي، منشورات اتحاد كتاب المغرب، رباط.

٢٢ـ سحر كاظم حمزة الشجيري (٢٠١١)، نظرية التوصيل في النقد الادبي العربي الحديث، دار صفاء للنشر والتوزيع، الطبعة الاولى، عمان.

٢٣ـ سعيد يقطين (١٩٨٩)، انفتاح النص الروائي، الطبعة الاولى، المركز الثقافي العربي، بيروت.

٢٤ـ سليم حمدان (٢٠٠٩)، اشكال التواصل في التراث البلاغي العربي (دراسة في ضوء الليسانيات التداولية)، مذكرة مقدمة لنيل درجة الماجستير في ليسانيات الخطاب، كلية الآداب والعلوم الانسانية، قسم اللغة العربية وآدابها.

٢٥ـ سمير شريف استيتية (٢٠٠٨)، اللسانيات"المجال، والوظيفة، والمنهج"، الطبعة الثانية، عالم الكتب الحديث، اربد.

٢٦ـ شجاع مسلم العاني (١٩٩٤)، البناء الفني في الرواية العربية في العراق، دار الشؤن الثقافية العامة، بغداد.

٢٧ـ عبدالحق العابد (٢٠٠٨)، عتبات (جيرار جينيت من النص الى المناص)، الطبعة الاولى، منشورات الاختلاف، الجزائر.

٢٨ـ عبدالقادر رحيم (٢٠٠٨)، العنوان في النص الابداعي اهميته وانواعه (ملخص)، مجلة كلية الآداب والعلوم الانسانية والاجتماعية، العددان ٢و٣.

٣٩ـ عبدالقادر عبدالجليل (٢٠٠٦)، المعجم الوصفي لمباحث علم الدلالة العام، الطبعة الاولى، دار صفاء للنشر والتوزيع، عمان.

٣٠ـ عبدالناصر حسن محمد (١٩٩١)، نظرية التوصيل وقراءة النص الادبي، المكتب المصري لتوزيع المطبوعات، قاهرة.

٣١ـ عبدالهادي بن ظافر الشهري (٢٠٠٤)، استراتيجيات الخطاب (مقاربة لغوية تداولية)، الطبعة الاولى، ليبيا.

٣١- فتح الله احمد سليمان (٢٠٠٤)، الاسلوبية "مدخل نظري ودراسة تطبيقية، مكتبة الآداب، قاهرة.

٣٣- فطومة لحمادي (٢٠٠٨)، السياق والنص: استقصاء دور السياق في تحقيق التماسك النصي، مجلة كلية الآداب والعلوم الانسانية والاجتماعية، العددان الثاني والثالث.

٣٤- لطيف زيتوني (٢٠٠٢)، معجم مصطلحات نقد الرواية، دار النهار للنشر، الطبعة الاولى، لبنان.

٣٥- محمد خير البقاعي (١٩٩٨)، دراسات في النص والتناصية، طبعة الاولى، مركز الانماء الحضاري، حلب.

٣٦- محمد عزام (٢٠٠١)، النص الغائب (تجليات التناص في الشعر العربي)، منشورات اتحاد الكتاب العرب، دمشق.

٣٧- منذر العياشي (٢٠٠٢)، الاسلوبية وتحليل الخطاب، طبعة الاولى، مركز الانماء الحضاري.

٣٨- ميجان الرويلي وسعد البازعي (٢٠٠٢)، دليل الناقد الادبي، الطبعة الثالثة، المركز الثقافي العربي، مغرب.

٣٩- نهلة فيصل الاحمد (٢٠١٠)، التفاعل النصي (التناصية، النظرية والمنهج)، الهيئة العامة لقصور الثقافة، قاهرة.

٤٠- نعمان بوقرة (٢٠٠٨)، مدخل الى التحليل اللساني للخطاب الشعري، الطبعة الاولى، عالم الكتب الحديث، الاردن.

٤١- ________ (٢٠٠٩)، المصطلحات الاساسية في لسانيات النص وتحليل الخطاب، الطبعة الاولى، الاردن.

٤٢- هدسن (١٩٨٧)، علم اللغة الاجتماعي، ترجمة: محمود عبدالغني عياد، دار الشؤن الثقافية العامة، بغداد.

### سەرچاوە ئینگلیزییەکان:

43- Crystal, D. (1992) A Dictionary of Linguistics and phonetics. Blackwell: oxford.

44- _______(2006)، How language Works، Penguin Group:London.

45- Donna Jo Napoli(2010), Language matters, Oxford University

46- Floderink, M. (1993), The fiction of Language and the Language of fiction, Routledge: London.
47- Genette, G.(1987), Introduction to the Paratext, in(New Literary History(1991),22(261-272).
48- Herman, D.(2007) The Language of fiction, Narrative, Cambridge University Press: Cambridge.
49- Levinson, S.C.(1997) Pragmatics ،Cambridge University Press: Cambridge .
50- Trask,R,L.(2007), Language and Linguistics: The Key Concepts, New york: Routledge .

**ملخص البحث**

كُـرِّس البحـث لتحليـل موضـوع الأدب والتداوليـة الموسـعة للتطـرق إلى مفـاهيم التداولية الموسعة في إطارها اللغوي والتواصلي وانماطه، وكذلك عن كيفية أداء اللغـة لوظائفهـا في اطـر آليـات التواصـلية، ثُـم التعريـف بـالمؤلفين والكُتَـاب والسـاردين في الأدب، من ثم الخـوض في تفاصـيل علائـق التداوليـة بـالقراء، وأنـواع القـراءات، ثـم التعريف بالنص وأنواع النصـوص. يتـوزع البحـث علـى مبحـثين: يتنـاول المبحـث الاول مفردات اللغة والتواصلية في اطارها النظري، ويركز المبحث الثاني علـى علاقـة الادب بالتداوليـة وانمـاط النصـوص المحللـة في ضـوء التداوليـة الموسـعة وتكـون الخلاصات وما سبقها من تصفيف المصادر خاتمة البحث .

**Abstract**

This research which is entitled (Macro Pragmatics and Literature) deals with the major concepts of macropragmatics in its linguistic and communicative context as well as its realizations. It also provides definition for some technical terms essential for our research، such as communication ،addressee ، massage، context، etc. The study falls into two parts، the first treats of the above mentioned topics whereas the second chapter explores the relation found between literature and to pragmatics in addition to the text types analyzed in the light of macropragmatics.

# فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی
# لە ڕوانگەی تیۆری ڤۆستەرەوە

**پ.ی. د. قەیس کاکل تۆفیق**
زانکۆی سۆران

**م.ی. دانا تەحسین محەمەد**
زانکۆی سەلاحەدین

## ١. پێشەکی:

### ١-١. ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە:

ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە (فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی، لە ڕوانگەی تیۆری ڤۆستەرەوە[1])یە. هەڵسەنگاندنێکە بۆ ( فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی) کە لەلایەن لێژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان بە هەرسێ زمانی: کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی، ئامادە کراوە.

### ١-٢. سنووری لێکۆڵینەوە:

ئەم لێکۆڵینەوەیە سەرەڕای ئەوەی، کە خستنەڕووی تیۆرێکی فەرهەنگسازییە، وەك لایەنی تیۆری، هەڵسەنگاندنێکی کارەکیشە بۆ فەرهەنگی (زاراوەی ئەدەبی، لێژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان).

### ١-٣. گرفتی لێکۆڵینەوە:

لە زمانی کوردیدا کۆمەڵێ فەرهەنگی گشتی چاپ کراوە، بەڵام فەرهەنگی زاراوە تاڕادەیەك سنووردارە. دانانی فەرهەنگی زاراوەش کۆمەڵێ تایبەتمەندی هەیە، کە لە فەرهەنگی گشتی جیای دەکاتەوە. یەکێك لەو فەرهەنگانەی کە دەزگایەکی ئەکادیمی بڵاوی کردۆتەوە، فەرهەنگی (زاراوەی ئەدەبی، لێژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان)ە.

پرسیاری لێکۆڵینەوەکە ئەوەیە، کە ئایا لەم فەرهەنگەدا تا چ ڕادەیەك بنەما و تایبەتمەندیی فەرهەنگی زاراوەیی تێدایە؟ ئایا جیاوازە لە فەرهەنگی گشتی؟ چ تیۆر یان ڕێبازێکی فەرهەنگسازی لەم فەرهەنگەدا پیادە کراوە؟ ئەمانە پرسیاری ئەم لێکۆڵینەوەیەن. لێکۆڵینەوەکە هەوڵدەدا وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە و هەڵسەنگاندنێك لەبەر ڕۆشنایی تیۆری فەرهەنگسازی ئەنجام بدا.

**١-٤. گرنگی لێکۆڵینەوەکە:**

بایەخی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە دوو ڕووەوە دەردەکەوێ: یەکەمیان لە ڕووی تیۆرییەوە. هەوڵدەدا فەرهەنگی زاراوە بناسێنێ و تایبەتمەندییەکانی و جیاوازییەکانی لەگەڵ فەرهەنگی گشتیدا بخاتە ڕوو، کە تا ڕادەیەکی زۆر لە بواری فەرهەنگسازیی کوردیدا هەژاری بەم لایەنە تیۆرییەوە دیارە.

لە ڕووی کارەکیشەوە: هەڵسەنگاندنێکی ئەکادیمییانەیە، کە پشت بە ئامار دەبەستێ بۆ فەرهەنگی ( زاراوەی ئەدەبی، لێژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان). لەلایەکەوە هەڵسەنگاندنە بۆ فەرهەنگەکە و دەوڵەمەندکردنی ئەزموونی ئامار و هەڵسەنگاندنی ئامارییە لە بواری زمانەوانیی کوردیدا. لەلایەکی تریشەوە بنەما دادەنێت بۆ ئەوەی لە داهاتوودا ئەوانەی کار لە فەرهەنگی زاراوەیی دەکەن سوودی لێ ببینن و لەم بوارەدا پشت بە تیۆری زانستی ببەستن.

**١-٥. هۆی هەڵبژاردنی بابەتەکە:**

جگە لەو خاڵانەی لە (١-٤) کە گرنگیی بابەتەکەیان خستەڕوو. چەند هۆکارێکی تریش لە ئارادا بوون بۆ ئەوەی کار لەسەر ئەم بوارە بکەین، لەوانە:

ئەگەرچی ژمارەی فەرهەنگی گشتی لە زمانی کوردیدا تاڕادەیەك پێداویستییەکانی خوێنەری کورد دابین دەکات و تەنانەت بازاڕ و پێداویستیی سەردەم وای کردووە کۆمەڵێ فەرهەنگ بکەوێتە بازاڕەوە، کە لە ڕووی جۆر و بایەخی زانستی لە ئاستێکی نزمدا بێت. تەنانەت هەندێکیان بە تایبەتی فەرهەنگی کوردی و زمانەکانی تر مۆرکی قازانج و بازرگانییان پێوە دیارە. ئەوەی بە لای ئەم لێکۆڵینەوەیە گرنگ بووە فەرهەنگی پسپۆرییە، کە هەموو کەسێك توانای دانانی نییە و پێویستی بە بنەمای تیۆری هەیە. لەبەر ئەوەی لەم بوارەدا

تاڕادەیەك زمانی کوردی لە سەرەتادایە و چاوەڕوان دەکرێ، کە لەم بوارەشدا (فەرهەنگی پسپۆری) هەنگاوی گەورە لە داهاتوودا بهاوێت، بە پێویستمان زانی بەرلەوەی ئەم بوارەش بکەوێتە نێو هەڵەی زانستییەوە بەری لێ بگیرێ، ئەم لێکۆڵینەوەش دەبێتە چوارچێوەیەکی تیۆری بۆ هەموو پسپۆرییەکان بۆ ئەوەی سوود لە بۆچوونە زمانەوانییەکان لە دانانی فەرهەنگدا وەربگرن.

**١-٦. کەرستەی خاوی لێکۆڵینەوەکە:**

لەلایەنی کارەکی تەنیا فەرهەنگی (زاراوەی ئەدەبی، لێژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان) وەك نموونەیەك بەکار هاتووە بۆ هەڵسەنگاندن و شیکردنەوە. هۆی هەڵبژاردنی ئەو فەرهەنگەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە دەزگایەکی ئەکادیمی ئامادەی کردووە و بەرهەمی تاکە کەس نییە، بەڵکو لێژنەیەکی پسپۆری بواری ئەدەب ئامادەی کردووە. بێگومان ئەوە وا دەکات، کە بەرپرسیاریەتی و وردەکاری لە کارەکەیان زیاتر بێت و زیاتر ئەکادیمییانە بێت. سەرەڕای ئەمەش ڕێنمایی و فەرهەنگ و هەموو ئەو بابەتانەی کە لە کۆڕی زانیارییەوە دەردەچن، متمانەی زانستییانەی هەیە و بە فەرمی دەناسرێن. هەر لەبەر ئەوە بە پەسندمان زانی ئەم فەرهەنگە بکەینە کەرستەی خاو بۆ لێکۆڵینەوەکەمان.

**١-٧. ئامانجی لێکۆڵینەوەکە:**

لە کوردیدا جگە لەم فەرهەنگەی، کە ئێمە کاری لەسەر دەکەین، چەند فەرهەنگێکی تریش لەم بوارەدا بەدی دەکرێ. سەرەڕای ئەمانەش، لە زۆربەی ئەو نامە ئەکادیمییانەی کە بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماجستێر و دکتۆرا بە زمانی کوردی نووسراون. خاڵی نین لە فەرهەنگۆکی پسپۆری. لەم لێکۆڵینەوەدا ئامانجمان شیکردنەوە و لێکدانەوە یان بەراوردکردنی ئەم فەرهەنگۆکانە نییە، بەڵکو زیاتر ناساندنی فەرهەنگی پسپۆری و تایبەتمەندییەکانیەتی. سەرەڕای ئەوەش بۆ ناساندنەکە وەك نموونە بۆچوونەکان لەسەر فەرهەنگی (زاراوەی ئەدەبی ، لێژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان) پیادە دەکەین.

### ١-٨. ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکە:

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە دوو بەش پێك دێت. لە بەشی یەکەمدا کە بەشێکی تیۆرییە هەوڵدەدا چوارچێوەیەکی تیۆری بۆ فەرهەنگی پسپۆری دەستنیشان بکا، بۆ ئەمەش سوود لە تیۆری ڤۆستەر وەردەگرێ. لە بەشی دووەمیشدا بە شێوەی ئامار فەرهەنگی ( زاراوەی ئەدەبی، لێژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان) لە ژێر ڕۆشنایی ئەو تیۆرە شی بکاتەوە. شایانی تێبینییە بە پێویستمان نەزانی لە کۆتاییدا ئەنجامەکان لە چەند خاڵێکدا کۆبکەینەوە، لەبەر ئەوەی لێکۆڵینەوەکە شیکردنەوەیەکی ئامارییە، ئەوا دەشێ سەرجەم بەشی دووەم وەك ئەنجام لێك بدرێتەوە. هەر لەبەر ئەوەش بە پێویستمان نەزانی دووبارە بە شێوەیەکی کورت یان لە چەند خاڵێکدا بەشی دووەم دووبارە دابڕێژینەوە.

## ٢. بەشی یەکەم: زاراوە و تیۆری ڤۆستەر

### ٢-١. سەرەتا:

زاراوەسازی بەوە پێناسە دەکرێت: ( ئەو زانستەیە، کە گرنگی بە پێوەندی نێوان چەمك و ئەو دەربڕینە زمانییانە دەدات، کە تەعبیر لە چەمکەکان دەکات)[٢].

هەر لقێك لە لقەکانی زانست ژمارەیەکی زۆر لە چەمك لەخۆ دەگرێت، کە وەکو ڕێکخستنێکی چەمکی لە ڕووی پێوەندی چەمکەکان بەیەکەوە خۆیان نیشان دەدەن.

هەروەها هەر لقێکی زانستیش ژمارەیەکی زۆر لە زاراوە لەخۆ دەگرێت، کە ئەرکی تەعبیرکردن لەو چەمکانە دەبینن، کە ئەمانیش وەکو ڕێکخستنێکی زاراوەیی خۆیان نیشان دەدەن. واتە هەر لقێکی زانستی ڕێکخستنێکی زاراوەیی لەخۆ دەگرێت، کە هاوشان و بەرانبەر بەو ڕێکخستنە چەمکییە دەوەستێتەوە.

ڕێکخستنە زاراوەیییەکانی هەموو لقەکانی زانستیش لە زمانێکی دیاریکراودا سیستەمێکی زاراوەیی دروست دەکەن. ئەم سیستەمە زاراوەیییەش لە زمانێکی دیاریکراودا دروست نابێت تا پێوەندی ئالوگۆڕی لەنێوان سیما جیاکەرەوەکانی واتایی نێوان ئەم زاراوانە نەخاتە ڕوو، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تر دەبێ ئەو زاراوانە وەڵامدانەوەیەکی ڕوون و دیاری سیستەمە چەمکییەکان بن[٣].

**٢-٢. زاراوەسازی تیۆری و زاراوەسازی پراکتیکی:**

زاراوەسازی تیۆری بەشێوەیەکی گشتی دوو بواری لێکۆڵینەوە لەخۆ دەگرێت: کە بریتین لە زاراوەسازی گشتی و زاراوەسازی تایبەتی:

**٢-٢-١. زاراوەسازی گشتی.**

ڤۆستەر گرنگترین بابەتی زاراوەسازی گشتی دیاری کردووە، کە بریتین لە: ( سروشتی چەمکەکان، سیفەتی چەمکەکان، پێوەندی نێوان چەمکەکان، سیستەمی چەمکەکان، وەسفکردنی چەمکەکان ( پێناسە و باسکردنی چەمکەکان)، (سروشتی زاراوەکان، پێکهاتەی زاراوەکان، پێوەندیی نێوان زاراوەکان، زاراوە کورتکراوەکان، هێما و وێنەکان، شێوەکانی وشە و زاراوە، یەکخستنی چەمك و زاراوەکان، کلیلەکانی زاراوەی جیهانی، تۆمارکردنی زاراوە، فەرهەنگی زاراوەیی، ڕێگاکانی دانانی فەرهەنگی زاراوەیی). ئەم بابەتانەی سەرەوە، هەموویان بابەتی گشتین و بەشێوەیەکی گشتی پێوەندییان بە هەموو مرۆڤایەتییەوە هەیە. واتە زاراوەسازی گشتی بە زمانێك یان بوارێکی زانستی دیاریکراو نەبەستراوەتەوە[٤].

ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی ئەم بوارەش وەکو بنەمایەك بۆ پێشخستنی بنەماکانی دانانی فەرهەنگی زاراوەیی بەکار دێن. هەروەها بۆ یەکخستنی زاراوە لەسەر ئاستی جیهان بەکار دێن.

**٢-٢-٢. زاراوەسازی تایبەتی.**

زاراوەسازی تایبەتی گرنگی بە وەسفکردنی ئەو بنەمایانە دەدات، کە کار لە دانانی زاراوە دەکەن لە بوارێکی پسپۆریی دیاریکراو. وەك: ( کیمیا، زیندەوەرزانی، پزیشکی، زمان...هتد). ئەوەی شایانی باسە کۆمەڵە ڕێکخراوێکی جیهانیش هەن، ڕۆڵیان لە پێشخستن و گەشەکردنی زاراوەسازی تایبەتی هەیە. لەو ڕێکخراوانە: ( ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی، ڕێکخراوی جیهانی بۆ تەکنیکی کارەبا)[٥].

زاراوەسازی پراکتیکیش ئەرکی دانان و یەکخستن و سەلماندن و چەسپاندنی زاراوەیە.

**٢-٣. پێناسەی زاراوە:**

زاراوەسازەکان زاراوەیان بەچەند شێوەیەك پێناسە کردووە، کە دیارترینیان، ئەمانەن:

- کۆبکی دەڵێ: زاراوە وشەیەکە لەشێوەی ئاخاوتنی کۆمەڵێکی تایبەتی کۆمەڵگادا بەکاردێت، خاوەن واتا و وێنەیەکی دەنگی دیاریکراوە، کاتێکیش لە زمانی گشتی بەکاردێت ڕاستەوخۆ دەزانرێ کە ئەم وشەیە سەر بە پسپۆڕییەکی دیاریکراوە[٦].

- کۆکلێرك دەڵێ: زاراوە وشەیەکە یان کۆمەڵە وشەیەکە، کە لە بواری پسپۆرییەك بەکاردێت. دەشێ وشەکە خۆماڵی یان لە زمانیکی ترەوە وەرگیراو بێت. بەمەبەستی دەربڕینێکی ورد و روونی چەمکەکان و دەلالەتکردن لە شتە مادییەکان بەکار دەهێنرێ[٧].

- ڕێکخراوی جیهانی بۆ پێوانەکردن (ISO) بەم شێوەیە پێناسەی زاراوە دەکات: (زاراوە بریتییە لە هەر هێمایەك، کە لەسەری ڕێککەوتبن بۆ دەلالەتکردن لە چەمکێك، ئەم زاراوەیەش کە لە چەند دەنگی یەك بەدوایەکدا هاتوو یان وێنەیەکی نووسراو پێك دێت، جا وشەیەك بێت یان دەربڕینێك بێت)[٨].

کەواتە زاراوە: ئەو هێمایە ( زمانی بێت یان نازمانی)، کە لە بوارێکی پسپۆریدا بۆ تەعبیرکردن لە چەمکێکی دیاریکراو بەشێوەیەکی ورد و روون بەکار دێت، بەشێوەیەك کە لە سیستەمێکی تەواوکاریدا شوێنێکی دیاریکراوی هەبێت.

**٢-٤. بنەماکانی دانانی زاراوە:**

دانانی زاراوە چەند مەرجێکی هەیە، کە گرنگترینیان ئەمانەن[٩]:

١- ڕێککەوتنی پسپۆران لەسەر زاراوەیەك بۆ گەیاندنی چەمکێك.

٢- جیاوازیی واتا نوێیەکەی لەو واتا زمانییەی کە پێشتر هەیبووە.

٣- بوونی پێوەندییەك یان لێکچوونێك یان هاوبەشییەك لەنێوان واتا گشتییەکەی لەگەڵ واتا پسپۆرییە نوێیەکەیدا.

٤- بەکارهێنانی تەنیا یەك زاراوە لە بوارێکی پسپۆریی دیاریکراودا، بۆ دەلالەتکردن لە یەك چەمکی زانستیدا. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ناکرێ چەند

زاراوەیەك بۆ یەك چەمکی زانستی بەکاربهێنرێت، هەروەها بە پێچەوانەوەش ناکرێ یەك زاراوە بۆ چەند چەمکێك بەکاربهێنرێت.

**٢-٥. وشە و زاراوە:**

هەر چەندە وشە و زاراوە لە هەندێك ڕووەوە لە یەك دەچن، لەگەڵ ئەوەشدا زاراوەسازەکان جیاوازی لەنێوان وشە و زاراوە دەکەن، کە دەکرێ جیاوازییەکان بەم شێوەیە بخرێتە ڕوو(١٠):

١- وشە بەپێی ئەو دەوروبەرە زمانییەی کە تێیدا دەردەکەوێت واتاکەی دەگۆڕێت. واتە هەر وشەیەك بەپێی دەرکەوتنی لە دەوروبەری جیاوازدا واتای جیاواز دەبەخشێ. واتە دەتوانێ چەند واتایەك لەخۆوە بگرێت، بەڵام زاراوە لەبەر ئەوەی لە بوارێکی زانستیی دیاریکراودا، دەلالەت لە چەمکێکی دیاریکراو دەکات، واتاکەی ناگۆڕێت لەم بوارە زانستییەدا، بەڵام ئەگەر بوارە زانستییەکەی گۆڕا، ئەوا دەلالەتی زاراوەکەش دەگۆڕێت.

٢- وشە دەکەوێتە ناو کێڵگەی واتایی بەڵام زاراوە دەکەوێتە ناو کێڵگەی چەمکی.

٣- لە ڕووی دەرکەوتنەوە: وشە لەناو فەرهەنگی گشتی دەردەکەوێت. واتە وشە لەناو ئەو فەرهەنگە دەردەکەوێت کە دانەرانی فەرهەنگ هەوڵدەدەن هەموو وشەکانی زمانێکی دیاریکراوی تێدا کۆبکەنەوە، کەچی زاراوە لە فەرهەنگی تایبەت بە پسپۆرێکی دیاریکراو دەردەکەوێت، کە زاراوەسازەکان هەوڵ دەدەن شوێنی ئەو زاراوە لەناو زاراوەکانی دیکەی ئەو بوارە پسپۆرییە دەستنیشان بکەن.

٤- لە ڕووی بەکارهێنانەوە: وشە هەموو قسەپێکەرانی زمانەکە بەکاری دەهێنن، بەڵام زاراوە تەنها کۆمەڵێکی دیاریکراو بەکاری دەهێنن، ئەگەر زاراوە لە ئاخاوتنی کەسی ئاسایی بەدەرکەوت، ئەوا ڕاستەوخۆ دەزانرێ کە ئەم دەربڕینە تایبەتە بە بواری پسپۆرییەکی دیاریکراو.

٥- وشە گوتە و واتایە. واتە وشە لەڕێگای شیکردنەوەی زمانی و واتایی شی دەکرێتەوە، کەچی زاراوە ناولێنان و چەمکە. واتە زاراوە لەڕێگای شیکردنەوەی زمانی و چەمکی و وێنەی هۆشەکی شی دەکرێتەوە.

**٢-٦. تیۆری ڤۆستەر:**

تیۆری ڤۆستەر یان تیۆری گشتیی زاراوە، لە بنەڕەتدا ڤۆستەر (Wüster) تیۆرەکەی دانەناوە، بەڵکو ئەو قوتابیانەی کە کاریگەر بوون بە بۆچوونەکانی ڤۆستەر، وەك:} هیلمۆت، فیلبەر (Felber)...هتد دایاننناوە{، ئامانجی ئەم تیۆرە: ( ڕێکخستنی بنەما گشتییەکانی دانانی زاراوە بوو، بەپێی ئەو پێوەندییەی کە لەنێوان چەمکە زانستییەکاندا هەیە، جگە لەمەش ئەم تیۆرە چارەسەری ئەو کێشانە دەکات، کە هەموو زمانەکان و گشت بوارەکانی زانست لە دانانی زاراوە بەدەستییەوە دەناڵێنن).

ئەم تیۆرە لە سێ ڕوانگەوە بنیاد نراوە، کە ئەمانەن:

١- وەك یەکی (Homogeneity).

٢- جیهانی (Universality).

٣- یەکخستنی شێوەکانی دەربڕین (unification forms of expression)[11].

ئەم تیۆرە کۆمەڵێ بنەمای سەرەکی لەخۆ دەگرێت، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- ڤۆستەر زاراوەسازی بە لقێکی زانستی دادەنێت، کە بەهۆیەوە زمانەوانی بە زانستی لۆژیك و ئەنتۆلۆژیا و لقەکانی تری زانست دەبەستێتەوە.. لە کاتێکدا زمانەوانی تەنیا لە دەنگ و ڕۆنانی وشە و ڕستەی دەکۆڵییەوە. ئەمەش وای لە ڤۆستەر کرد، کە زاراوەسازی بە ئەڵقەیەکی پێوەندیی نێوان زمانەوانی و چەند زانستێکی تر دابنێت، بەڵام دواتر قوتابیانی ڤۆستەر و پێڕەوکەرانی بیری ڤۆستەر بەتایبەتی دامەزرێنەرانی تیۆری گشتی زاراوە، زاراوەسازییان بە بەشێك لە زمانەوانی پراکتیکی دانا، لەبەر ئەوەی هەر چەندە زاراوەسازی لەڕووی ڕوانگەوە لە زمانەوانی گشتی جیایە، بەڵام ئامانجی زاراوەسازی لەگەڵ ئامانجە گشتییەکانی زمانەوانی پراکتیکی یەك دەگرێتەوە. هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە زاراوەسازی بە بەشێکی زمانەوانی پراکتیکی دابنرێت[12].

هەروەکو ئاشکرایە زمانە پسپۆرییەکان لەسەر زاراوە بنیاد نراوە. زاراوەش خۆی لەخۆیدا سێ ڕەهەند لەخۆ دەگرێت کە بریتین لە: (ناولێنان، چەمك، خودی ناولێنراوەکە). ناولێنان دەچێتە ناو زمانەوانی، چونکە دەکەوێتە

ژێــر وەســفی زمانــەوانی، هەرچــی چــەمکە و پێوەنــدیی نێــوان چــەمکەکان ئــەوا بەستراوە بە زانستی مەنتیقەوە و ناتوانین لـە لێکۆڵینـەوەی زاراوەیـی پشـتی پـێ نەبەستین. واتاسازیش کە لقێکی زمانەوانییە ئەڵقەی پێوەندی لە نێوان مـەنتیق و زمانـەوانی. ئەمـە لـە بـواری وەسـفی چـەمکەکان، بـەڵام لـە بـواری پـۆلینکردن و ڕێکخستنی زاراوەکـان ئـەوا زانسـتە سروشـتییەکان ڕۆڵیـان هەیـە لـە پـۆلینکردنی بوونەوەرەکان، کە بەهۆیانەوە دەلالەت لە زاراوەکان دەکەن. هـەروەها ڕۆڵیشـیان هەیە لە ڕێکخستنی پێوەندیی نێـوان بوونـەوەرەکان، جگـە لەمانـەش ڕاگەیانـدنی ئامێری بە شێوەیەکی کردەیی ڕۆڵی هەیە لە چەسپاندنی زاراوە[١٣].

٢– بابەتی لێکۆڵینەوە لەم تیـۆرەدا، چـەمکەکانە. چـەمکیش دەکـرێ یـان لـە ڕێگـای یەکـە زمانییـەکان بگەیـەنرێت، یـان لـە ڕێگـای ئامـاژە دیاریکراوەکـانی بگەیەنرێت کە زمانی نین و سەر بـەبوارێکی پسـپۆریی دیـاریکراون، بـەکارهێنان و سوود وەرگرتن لەو سیستەمە ئاماژییانە لە زۆر بواردا گرنگیی خۆی سـەلماندووە و پێویستە لەناو فەرهەنگی زاراوەیـی ئـەو بـوارە پسـپۆرییە تۆمـار بکـرێن. وەك: $(H_2O)$[١٤].

٣– زاراوەکـان لـەڕێگای ئـەو دەلالەتـەی کـە لـە چـەمکەکان دەکـات شـی دەکرێتەوە. هەر بۆیە پێیان وایە کە چەمك کۆنترە لە ناولێنان[١٥].

٤– ئامانج لە کاری زاراوەیی بـە پێـی ئـەم تیـۆرە، بریتییـە لـە: لێکۆڵینـەوەی زاراوە لە گۆشەی پێوانەکردنی چەمکی و ناولێنانەوە، جا ئەگـەر توێژینەوەکـە لـە چوارچـێوەی زمـانێکی دیـاریکراو بێـت، ئەمـەش کاتێـك کـە کـاری زاراوەیـی لـە پێوەندیکردنی پیشەیی نیشتیمانی دەکۆڵێتەوە، یان توێژینەوەکە لە چوارچێوەی چەند زمانێکی دیاریکراو بێت، ئەمەش کاتێك کە کاری زاراوەیـی لـە پێوەنـدیکردن لەسەر ئاستی جیهان بکۆڵێتەوە[١٦].

٥– مەبەست لە کاری زاراوەیـی بـە پێـی ئـەم تیـۆرە لـە ڕووی پراکتیکییـەوە، بریتییە لە: (یەکخستنی زاراوە). یەکخستنی زاراوەش لـەڕێگای دەستنیشـانکردنی هەر دالێك بۆ یەك مەدلوول و بەپێچەوانەش هەر ڕاستە کە هەر مەدلوولێك دەبێـت یەك دالی هەبێت.

واتە بە پێی ئەم تیۆرە: ( هاوبێژی و هاوواتایی لە زاراوەدا بوونی نییە) و پێی وایە، کە: (دەبێ تەنیا یەك زاراوە لەنێو ئەو هاوواتانەی کە پێشتر بوونیان هەبووە بۆ چەمکێك هەڵبـژێردرێت. ئەم هەڵبژاردنەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ناوەکە (زاراوەکە) لەو هەموو چەمکانەی کە پێشتر دەیگەیاند بەتاڵ بکرێتەوە). چەمکەکان بەهۆی ئەو پێوەندییە جۆر بەجۆرانەی کە هەیانە لە بوارێکی پسپۆریی دیاریکراو بەیەکتر دەبەسترێنەوە. ئەو کۆمەڵە پێوەندییانەی کە چەمکەکان بەیەك دەبەستێتەوە پێی دەگوترێت پێکهاتەی چەمکەکانی پسپۆرییەکی دیاریکراو و تێیدا ڕۆڵ و شوێنی هەر چەمکێك لەم پێکهاتەدا دیاری دەکرێت[١٧].

### ٣. بەشی دووەم: شیکردنەوەی فەرهەنگی ئەدەبی

**٣-١. سەرەتا:**

لێکۆڵینەوە لە فەرهەنگی زاراوەیی و ئەو بنەمایانەی کە فەرهەنگە زاراوەییەکان لەسەری دانراون، بەمەبەستی دەستنیشانکردنی لایەنی باش و لایەنی کەم و کورتی لەناو فەرهەنگە زاراوەییەکان بە یەکێك لە ئەرکەکانی زاراوەسازی بەگشتی و زاراوەسازی پراکتیکی بەتایبەتی دادەنرێت.

لەم بەشەدا، لە ژێر ڕۆشنایی ئەو بنەمایانەی کە لە بەشی یەکەمدا خستمانە ڕوو بۆ فەرهەنگی پسپۆری. فەرهەنگی ئەدەبی شی دەکەینەوە و هەڵسەنگاندنێکی ئاماری بۆ دەکەین.

**٢-١. پوختەیەك لەبارەی فەرهەنگی ئەدەبی:**

ئەم فەرهەنگە لەلایەن لێژنەیەکی تایبەت و پسپۆر لە کۆڕی زانیاری دانراوە، کە لە چوار کەس پێکهاتوون و بریتین لە : (د. مارف خەزنەدار، د. محەمەد نووری عارف، د. عەبدوڵا یاسین ئامێدی، د. پەخشان سابیر). جگە لەمانەش وەك لە پێشەکییەکەیدا ڕوون کراوەتەوە چەندین کەسی تریش پێداچوونەوەیان بۆ کردووە، کە بریتین لە :( تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، د. ئیسماعیل فەهمی، سەلام ناوخۆش، کەمال غەمبار) ئەم فەرهەنگە لە ساڵی ٢٠٠٦ لە قەبارەی ٣١٨ لاپەڕە، لە هەولێر چاپ کراوە. فەرهەنگەکە بە سێ شێوە وشەکانی ڕیز کردووە، کە بریتین لە: ( کوردی–

عەرەبی– ئینگلیزی) لە لاپەرە ٧ تا ١٠٥ . (عەرەبی– کوردی– ئینگلیزی ) لە لاپەڕە ١٠٩ دەست پێ دەکا تا لاپەڕە ٢١٤. دوا بەشی فەرهەنگەکە بە شێوەی (ئینگلیزی– کوردی– عەرەبی) لە لاپەڕە یەك لای چەپەوە تا لاپەڕە ١٠٤ بە ئاڕاستەی چەپ بەرەو ڕاست دەست پێ دەکا.

ژمارەی زاراوەکان (چەمکەکان) لەم فەرهەنگەدا، بەبێ دەرهێنانی زاراوە دووبارەکراوەکانی. (وەك زاراوەی (pun) دووجار لە لاپەڕە (82) بەکارهاتووە[(١٨)])، بەم شێوەیەیە:

| جۆری فەرهەنگ | ژمارەی وشەکان | | |
|---|---|---|---|
| | کوردی | عەرەبی | ئینگلیزی |
| کوردی – عەرەبی– ئینگلیزی | 3,915 | 2,061 | 3,872 |
| عەرەبی – ئینگلیزی– کوردی | 3,872 | 2,261 | 2,055 |
| ئینگلیزی – کوردی– عەرەبی | 3,909 | 2,261 | 2,052 |

**خشتەی ژمارە (١) ڕێژەی چەمکەکان لە فەرهەنگەکەدا**

### ٣-٢. هەڵسەنگاندنی فەرهەنگەکە:

فەرهەنگەکە لە چەند لایەنێکەوە شی دەکەینەوە، کە دەکرێ بەم شێوەی خوارەوە بیانخەینە ڕوو:

١– بەکارهێنانی یەك زاراوەی کوردی بەرانبەر بە یەك زاراوەی ئینگلیزی.

٢– بەکارهێنانی چەند زاراوەیەکی کوردی بەرانبەر بە یەك زاراوەی ئینگلیزی.

٣– دووبارەکردنەوەی زاراوەیەکی کوردی بەرانبەر بەچەند زاراوەیەکی ئینگلیزی.

٤– بەکارهێنانی زاراوەی کوردی و ناکوردی لە یەك کاتدا.

٥– هەندێ تێبینی گشتی تر.

**٣-٢-١. بەکارهێنانی یەك زاراوەی کوردی بەرانبەر یەك زاراوەی ئینگلیزی:**

دەستنیشانکردن و دانانی یەك زاراوە بۆ یەك چەمك لە بوارێکی پسپۆریی دیاریکراو و دوورکەوتنەوە لە هاوواتایی و هاوبێژی، ئەم کارە لەگەڵ تیۆرەکەی ڤۆستەردا یەك دەگرێتەوە، لە فەرهەنگی زاراوەیی ئەدەبیشدا چەندین نموونەمان بەرچاو دەکەوێت، کە یەك زاراوەی کوردی بەرانبەر بە یەك زاراوەی ئینگلیزی دانراوە، واتە یەك زاراوە بەرانبەر بە یەك چەمك دانراوە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا لەگەڵ بنەما سەرەکییەکەی تیۆری ڤۆستەردا دەگونجێت. ژمارەی زاراوەکانیش ، کە بەم شێوەیە لەم فەرهەنگە دانراوە، بریتییە:

١- لە فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی (کوردی- عەرەبی- ئینگلیزی) (٤٥٢) زاراوە بە زمانی کوردی .

٢- لە فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی (ئینگلیزی- کوردی- عەرەبی)، (٤٥٢) زاراوە بە زمانی کوردی دانراوە.

هەرچەندە پێویست بوو سەرلەبەری فەرهەنگەکە بەم شێوەیە بوایە و ئەم بارە کۆکە لەگەڵ بنەما گشتییەکانی فەرهەنگی پسپۆری. لەم خشتەیەی خوارەوەدا هەندێ نموونەی ڕوون خراوەتە ڕوو:

| زاراوەی کوردی | زاراوەی ئینگلیزی |
|---|---|
| ئەدەبی دان پیانان | Confessional literature |
| ئەدەبی شێتان | Folly literature |
| نزمەخود | Id |
| ئاڵۆزاو | Chaotic |
| ئاواز | Tune |
| ئاماژەیی | Heraldic |
| ئاسۆ | Horizon |
| ئەفلاتونیزمی نوێ | Neo-Platonism |
| بابەتێتی | Objective |
| بەرجەستەکراو | Embodied |
| بەرهەڵستکار | Concr |
| بەرهەم هێنەر | Producer |
| یەکبوون | Empathy |
| بەهرە | Talent |

| نزیکایەتی | Convergence |
|---|---|
| ئەزموونی | Experimental |
| هەڵوەشێنەرانە | Deconstructive |
| ئەفسانە | Myth |
| هەڵوێست | Responsive |
| ئەفسانەی نەتەوەیی | Folk tales |
| پاساو کردن | Justify |
| پەخشان | Prose |
| پێش گریمانە | Presupposition |
| پێشەکی | Prologue |
| ڕوونبێژی | Elegance |
| ڕۆژهەڵاتناس | Orientalist |
| تاکەکان | Individuals |
| بۆچوون | Approach |
| بێ نیشان | Unmarked |
| بێ هەست | Philistine |
| بیریی | Psychic |
| بڕگەی درێژ | Long syllable |
| پارێزکار | Preserver |
| نموونەیی | Typical |
| پێش گەڵاڵە | Sketch |
| پێشبینی | Anticipation |
| تاوتوێکردن | Argument |
| تەوەر | Axis |
| لێکدانەوە | Interpretation |
| تایبەتمەندی | Characteristic |

**خشتەی ژمارە (٢) نموونەی یەك زاراوەی کوردی بەرانبەر یەك زاراوەی ئینگلیزی**

### ٣-٣-٢. چەند زاراوەیەکی کوردی بەرانبەر بە یەك زاراوەی ئینگلیزی:

یەکێ لە هەڵەکانی ئەم فەرهەنگە ئەوەیە، کە جیاوازی لەنێوان وشە و زاراوە نەکردووە، دەشێ لە فەرهەنگی گشتیی زماندا چەند وشەیەکمان هەبێ کە یەك واتایان هەبێ یان واتاکانیان لەیەکتر نزیك بێت، بەڵام لە زاراوەسازیدا نابێ کۆمەڵە زاراوەیەکمان هەبێ بۆ یەك چەمك، چونکە زاراوە خۆی ناولێنانە لە چەمکێك. یەکێ لە بنەما گرنگەکانی فەرهەنگی زاراوە: ( دەبێ یەك زاراوە بۆ یەك چەمك بەکار بهێنرێت).

ئەوەی شایانی باسە لەم فەرهەنگەدا بەرانبەر بە یەك زاراوەی ئینگلیزیدا چەندین زاراوەی كوردی بەكار هاتووە. دیارە ئەم هەڵەیەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، كە جیاوازی لە نێوان فەرهەنگی گشتی لەگەڵ فەرهەنگی تایبەتی- زاراوەیی نەكراوە. فەرهەنگی گشتی هەموو وشەكانی زمانێكی دیاریكراو بەهەموو واتاكانی ئەو وشانە لەخۆ دەگرێت، بەڵام فەرهەنگی زاراوەیی (تایبەتی) تەنیا زاراوەی بوارێكی پسپۆری دیاریكراو لەخۆ دەگرێت[١٩] و دەبێ یەك زاراوەش بۆ یەك چەمك دابنرێت.

لەم فەرهەنگەشدا چەندین نموونەی لەو شێوەیە بەرچاو دەكەوێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، كە لەم فەرهەنگەدا چەند زاراوەیەك (ناولێنانێك) بۆ یەك چەمك دانراوە و ئەم حاڵەتەش لە فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی (كوردی- عەرەبی- ئینگلیزی)دا نزیكەی (١٣٣٠) جار دووبارە بوویتەوە. واتە لە كۆی (١٨٦٧) حاڵەتی دانانی زاراوە لە فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی (كوردی- عەرەبی- ئینگلیزی) (١٣٣٠) جار لە بنەمای فەرهەنگی زاراوەسازی لایداوە كە ئەوەش ڕێژەیەكی یەكجار زۆرە و دەگاتە نزیكەی (٧١,٢٪)ی كۆی حاڵەتەكانی دانانی زاراوەی فەرهەنگەكە. لە فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی (ئینگلیزی- كوردی- عەرەبی)شدا لە كۆی (١٩٤٦) حاڵەتی دانانی زاراوە نزیكەی (١٣٠٥) جار دووبارە بوویتەوە. نموونەی دانانی چەند زاراوەیەكی كوردی بۆ یەك زاراوەی ئینگلیزی. لەم خشتەیەدا خراوەتە ڕوو:

| زاراوەی ئینگلیزی | زاراوەی كوردی |
|---|---|
| Speech | ئاخاوتە، ئاخاوتن، گوتە، قسە، وتە، گوتن |
| Free | ئازاد، سەربەست، سەرفرازی |
| Suffering | ئازار، دەرد، ئێش |
| Clarification | ئاشكراكردن، ڕوونكردنەوە |
| Deduction | ئاكامگیری، ئەنجام |
| Pitch | ئاوازەی دەنگ، بەزم و ڕەزم |
| Applied literature | ئەدەبی پراكتیكی، ئەدەبی پەیرەوی، تۆری پراكتیكی |
| Literary | ئەدەبی، تۆرەیی، وێژەیی |
| Expressive function | ئەركی دەربرێنراو، كاری دەربرین |

| | |
|---|---|
| Empiricism | ئەزموونگەریی، تاقیگەیی |
| Rationality | ژیرێیەتی، ژیرانی، ئەقلانی، ئاوەزەیی، ئاوەزیانە، هۆشەکی |
| Epilogue | ئەنجام، کۆتایی ئەنجام |
| Quantum | ئەندازە، چەندی |
| Obscene | بەد ڕەوشتی، بەد کرداری |
| Sequence of actions | بەدواداهاتنی کردەکان، دوا کردەکان، دواهاتنی کردەکان |
| Inward | بەرەو ناوەوە، کرۆك، کاکڵ |
| Didactic poetry | شیعری فێرکردن، پەروەردەیی، شیعری فێرکاری، شیعری فێربوون، هۆزانا فێرکرنێ |

**خشتەی ژمارە (٣) نموونەی فرە زاراوەی کوردی بەرانبەر یەك زاراوەی ئینگلیزی**

### ٣-٣-٣. دووبارەکردنەوەی یەك زاراوەی کوردی بەرانبەر بەچەند زاراوەیەکی ئینگلیزی:

یەکێ لە بنەما گرنگەکانی زاراوەسازیی پراکتیکی ئەوەیە، کە لەکاتی دانانی زاراوە لە هەر بوارێکی پسپۆری دیاریکراودا دەبێ ڕەچاوی ئەوە بکرێت، کە یەك زاراوە بۆ یەك چەمك دابنرێت و نابێت ئەو زاراوە لە هەمان بواری پسپۆریدا بۆ چەمکێکی تر بەکار بهێنرێت، چونکە دەبێتە هۆی تێکچوونی سیستەمی ڕێکخستنی زاراوەیی و چەمکی لەم بوارە پسپۆرییە دیاریکراوەدا، بەڵام ئەگەر زاراوەکە لە بوارێکی پسپۆری جیادا بەکارهات، ئەوا دەکرێ بۆ چەمکێکی تر بەکاربێت، چونکە یەك لە بنەما گرنگەکانی زاراوە ئەوەیە، کە زاراوە دەکەوێتە ناو کێڵگەی چەمکی.

کەم و کورییەکی تری ئەو فەرهەنگە ئەوەیە ، کە زاراوەیەکی دیاریکراوی کوردی چەند جارێك دووبارە دەبێتەوە و چەند جارێك بەکاری دەهێننەوە بۆ دەلالەتکردن لە چەمکی جیاجیادا. دیارە ئەمەش لەگەڵ بنەماکانی دانانی زاراوە ناگونجێت. کردەی دووبارە بەکارهێنانەوەی چەند زاراوەیەکی کوردی بەرانبەر بە چەند زاراوەیەکی ئینگلیزی لە فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی ( کوردی- عەرەبی-

ئینگلیـزی) دەگاتـە نزیکـەی (٣٥) حاڵـەت، لـە فەرهـەنگی زاراوەی ئـەدەبی (ئینگلیزی– کوردی– عەرەبی)شدا دەگاتە نزیکەی (١٢٦) حاڵەت.

نموونـەی دووبـارە بەکارهێنانـەوەی چـەند زاراوەیـەکی کـوردی بەرانبـەر بەچەند چەمکێکی جیاجیا لە فەرهەنگی زاراوەیی ئەدەبی. وەك:

| | | | |
|---|---|---|---|
| Allusion | تیلنیشان، تەلمیح | Implication | تەلمیح، تیلنیشان |
| Print, Publish | چاپ | Edition | چاپ |
| Kind, Genre | جۆر، چەشن | Type | چەشن، جۆر |
| Forms | | | چەشنەکان، جۆرەکان، شێوەکان |
| Pleasure | چێژ | Decorum | چێژ |
| Norm | بەها، نرخ | Value | بەها، گرنگی پێدان |
| Diffusing | درێژدادڕ، پڕبێژ | Verbose | درێژدادڕ، زۆربڵێ، چیرەدرێژ |
| Anguish, anxiety | دوودڵی، دڵەڕاوکێ | Tension | دڵەڕاوکێ |
| Race | ڕەگەز، نفش، قنێت | Element | ڕەگەز، چین، توخم |
| Distance | ڕەهەند، ماوە | Dimension | ڕەهەند، دووری |
| Eloquent | ڕەوانبێژ، ئەزمان خۆش، ڕەهوان | Elegant | ڕەوانبێژ |
| Appearance | ڕواڵەت، ڕەنگ، سەروبەر | Figure | ڕواڵەت، فۆرم |
| Thinker | بیریار، بیرمەند، هزرڤان | Ideologue | بیریار، بیرمەند، هزرڤان |
| Panegyric | پیاهەڵدان، ستایش، پەسن | Eulogy | پیاهەڵدان، ستایش |

**خشتەی ژمارە (٤)**

**دووبارەکردنەوەی یەك زاراوەی کوردی بەرانبەر بەچەند زاراوەیەکی ئینگلیزی**

**٣-٣-٤. بەکارهێنانی زاراوەی کوردی و ناکوردی لە یەك کاتدا:**

بەکارهێنانی زاراوەی کوردی و ناکوردی لەیەك کاتدا بەرانبەر یەك زاراوەی ئینگلیزی هەر چەندە بۆچوونەکانی ڤۆستەر پشتگیری بە جیهانیبوونی زاراوە دەکا، بە ئاسایی دەیبینێ، بەڵام لە بابەتێکی ئەدەبی و بۆ ئێستای کورد و لەگەڵ بوونی زاراوەی کوردی گونجاو و لەبار بە پێویست نابینرێ و بە خاڵێکی ئیجابی دانانرێ کە لە فەرهەنگی زاراوەکاندا وشە بیانییەکە دووبارە لەپاڵ وشە کوردییەکەدا بنووسرێتەوە، ئەگەر ئەدیبێك یان ڕەخنەگرێك زاراوە بیانییەکەش بەکار بهێنێ ئاساییە، بەڵام دانانی لە فەرهەنگێکی فەرمی وەك فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی ئەوا بە لەنگی دادەنرێت، بە تایبەتی لەبەر ئەوەی یەکێ لە ئەرکەکانی ئەم فەرهەنگە ڕوونکردنەوەی زاراوە بیانییەکانە نەك دووبارە نووسینەوەی هەمان وشە بە ئەلفوبێی کوردی. ئەوەی شایانی باسە (٥٠) نموونەی بەکارهێنانی زاراوەی کوردی و ناکوردی لە یەك کاتدا لەفەرهەنگی زاراوەی (کوردی– عەرەبی– ئینگلیزی) بەرچاو دەکەوێت و (٦٣) حاڵەتیش لە فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی (ئینگلیزی– کوردی– عەرەبی)دا بەرچاو دەکەوێت. وەك:

| | | | |
|---|---|---|---|
| پانسیزم، یەکبوونی بوون، یەکێتی بوون، ئێکەتیا بوونێ: | Pantheism | | |
| پرەنسیب، بنەواشە، بنەمایەکان: | Principles | | |
| پۆزەتیف، ئیجابی، ئەرێیانە، باش: | Positive | | |
| تاراوگە، مەنفا، دویرخستن: | Exile | دەستەواژە، فرێز: | Phrase |
| تەکنیك، هونەر: | Technique | دەق، تێکست: | Text |
| جیناس، ڕەگەزدۆز، کایەکردن بە وشە: | Pun | دراما، شانۆ: | Drama |
| حەقیقەت، راستی: | Truth | ڕەمز، نیشان: | Emblem |
| دەروونناسانە، سایکۆلۆجی: | Psychological | سەلەف، پێشینی: | Ancestor |
| سادیزم، ئازاردانی زایەندی: | Sadism | قەسیدە، چامە: | Ode |
| فێمینیزم، مێخوازی، بزاڤا ژنان: | Feminism | سینتاکس، رستەسازی: | Syntax |

**خشتەی ژمارە (٥) بەکارهێنانی زاراوەی کوردی و ناکوردی لەیەك کاتدا**

لە کۆتاییشدا دەتوانین خشتەیەك بە ژمارە و ڕێژەی سەدی شێوەی دانانی زاراوەی کوردی بەرانبەر بەزاراوەی ئینگلیزی لە فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی، بەم شێوەیە بخەینە ڕوو:

١– ژمارە و ڕێژەی سەدی زاراوەی کوردی بەرانبەر زاراوەی ئینگلیزی، لە فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی ( کوردی– عەرەبی– ئینگلیزی)دا بە شێوەیەکە، کە نا هاوسەنگی و نەبوونی بنەمای زانستی تێدا بەدی دەکرێ. وەك لەم خشتەیەدا ڕوون کراوەتەوە:

| شێوەی دانانی زاراوەی کوردی | بەژمارە | بەڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| تاك زاراوە | ٤٥٢ | ٪٢٤,٢ |
| فرە زاراوە | ١٣٣٠ | ٪٧١,٢ |
| زاراوەی دووبارە | ٣٥ | ٪١,٨ |
| زاراوەی بیانی | ٥٠ | ٪٢,٦ |
| کۆی گشتی | ١٨٦٧ | ٪١٠٠ |

ئەوەی جێگای سەرنجە ڕێژەی وشەی تەندروست لەم فەرهەنگەدا تەنیا (٪٢٤)ە و ڕێژەی فرەزاراوەیی بە شێوەیەکی نا ئاسایی زیاترە کە بریتییە لە (٪٧١). وەك لەم هێڵکارییەی ژمارە (١)دا ڕوون کراوەتەوە.




**هێڵکاری ژمارە (١)**
**ڕێژەی زاراوە کوردییەکان لە فەرهەنگی کوردی– عەرەبی– ئینگلیزی**

٢- لـە فەرهـەنگی زاراوەی ئـەدەبی (ئینگلیـزی- کـوردی- عـەرەبی)دا، ئەگەرچی تاك زاراوەکان فرە زاراوە بە بەراورد لەگەڵ بەشی فەرهەنگی (کوردی- عـەرەبی- ئینگلیـزی)دا لەیـەکتر نـزیکن، بـەڵام زاراوەی دووبـارە ڕێژەکـەی زۆر جیاوازە، وەك لەم خشتەیەدا خراوەتە ڕوو:

| شێوەی دانانی زاراوەی کوردی | بەژمارە | بەڕێژەی سەدەی |
|---|---|---|
| تاك زاراوە | ٤٥٢ | ٪٢٣،٢ |
| فرە زاراوە | ١٣٠٥ | ٪٦٧ |
| زاراوەی دووبارە | ١٢٦ | ٪٦،٤٧ |
| زاراوەی بیانی | ٦٣ | ٪٣،٢ |
| کۆی گشتی | ١٩٤٦ | ٪١٠٠ |




**هێڵکاری ژمارە (٢)**
**ڕێژەی زاراوە کوردییەکان لە فەرهەنگی ئینگلیزی - کوردی- عەرەبی**

### ٣-٤. هەندێ تێبینی گشتی :

سەرەڕای دەستنیشانکردنی ئەو لایەنانەی کە (بە پێی بۆچوونەکانی ڤۆستەر) لە بنەمای فەرهەنگی پسپۆری لایداوە، لەگەڵ بنەما گشتییەکانی فەرهەنگی پسپۆریدا یەك ناگرێتەوە. ئەوا وەك فەرهەنگێکی کوردی هەندێ تێبینی یان کەموکوری تریش لەم فەرهەنگەدا بەرچاو دەکەوێ. لە خوارەوە لە چەند خاڵێکدا دەیانخەینە ڕوو:

١- **پێناسەی چەمکەکان**: ئەم فەرهەنگە بۆ کوردزمان دانراوە. ئەوەی جێگای سەرنجە فەرهەنگی زاراوە پێویستە چەمکی زاراوەکە ڕوون بکاتەوە و پێناسەی بکا. کەچی لەم فەرهەنگەدا تەنیا وەرگێڕان بۆ زاراوەکە کراوە، بەبێ ئەوەی ڕوون بکرێتەوە، کە ئەو زاراوەیە چی دەگەیەنێ. ئەوەی بارەکە ئاڵۆزتر و کەم و کورییەکە زیاتر زەق دەکاتەوە، ئەوەیە کە دوو لێژنەی بۆ دانراوە لە کاتێکدا وەرگێڕانی لەم شێوەیە کاری تاکە کەسییە و ئەو کەسانەی، کە لە بواری فەرهەنگی گشتیدا کار دەکەن زۆر بە ئاسانی دەیانتوانی ئەم کارە بکەن، نەك لێژنەی پسپۆر، کە چەندین کەسی پسپۆری ئەم بوارەی تێدایە. لەلایەکی تریشەوە واتای ئەم وشانە بە شێوەیەکی فراوان لە فەرهەنگە گشتییەکاندا بەدی دەکرێ. ئەگەر تەنیا واتای وشەکان مەبەست بێ.

٢- **زاراوە تایبەتییەکانی ئەدەبی کوردی تێدا نییە**. ئەو زاراوە ئەدەبییانەی کە تایبەتن بە کورد و ئەدەبی کوردی و لە لێکۆڵینەوە و سەرچاوە ئەدەبییەکاندا بەدی دەکرێن. بە تایبەتیش زاراوەکانی بواری فۆلکلۆری کوردی، ئەوا لەم فەرهەنگەدا نەخراونەتە ڕوو. بۆنموونە: پەندی پێشینان، بەیت، لاوك، حەیران، بەیاز، سیا چەمانە، قۆریات، سەردوولکە، نوشتە و دەیان زاراوەی تری ئەدەبی، کە تایبەتن بە کورد و لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستان بەکار دێن لەم فەرهەنگەدا بەدی ناکرێ. واتە ئەم فەرهەنگە مۆرکی ئەدەبی کوردی پێوە دیار نییە، بەڵکو وەرگێڕانێکی ئاسانی وشە بە وشەی فەرهەنگی ئەدەبی عەرەبییە. دەکرا لە ڕووی خزمەتکردن بە زارە کوردییەکان بەم شێوەیە بکرابوایە، کە هەموو ئەو زاراوانەی تایبەت بە جۆرەکانی مقامات و مۆسیقای. وەك: بەیات و حیجاز و خاوکەر و سیاچەمانە و ...هتد جۆرەکانی یان زاراوەکانی تایبەت بە بەیت و

حیکایــەت و ئــەو جــۆرە شــیعر و هۆنراوانــەی، کــە لــە بۆنــە تایبەتییــەکان وەك دروونەکردن و تازیە و شین گێڕان و زەماوەنـد بـەکار دەهـاتن، پێویسـت بـوو لـەو فەرهەنگەدا تۆمار کرابان. کەچی ئەمانە بەدی ناکرێت. سەرەڕای ئەوانەش هەندێ زاراوەی عــەرووزی عــەرەبی لــە ئــەدەبی کوردیــدا ڕەنگــی داوەتــەوە و لــە لێکۆڵینەوەکانـدا بـە شـێوەیەکی فـراوان بـەدی دەکـرێ، کەچـی لـەم فەرهەنگـەدا بوونیان نییە. ئەمە جگە لەوانەش کۆمەڵێ شەپۆل و ڕێبازی ئەدەبی لە سەردەمە جیاوازەکـان لـە کوردسـتان دروسـت بـوون یـان کۆمـەڵێ گرووپـی ئـەدەبی ( لـە هەشتاکان لە هەولێر یان لە هەندەران ) دروست بوون. وەك ڕەهەند و فۆرمی گران و وێـران و ڕوانگـە و (نویکرنـا هەروهـەر) لـە بادینـان ...هتـد ئـەم زاراوانـە بـەدی ناکرێن، کە ئەمەش کەموکورییەکی گەورەیە و بۆتە هۆی ئەوەی، کـە بـوترێ ئـەم فەرهەنگە تەعبیر لە ئەدەبی کوردی ناکات، ڕەنگدانەوەی بارودۆخ و تایبەتمەندیی ئەدەبی کوردی تێدا بەدی ناکرێ.

**٣- کێشەی زارە کوردییەکانی زیاتر ئاڵۆز کردووە لە جیاتی چارەسەرکردن.**

یەکێك لە کەموکورییـەکانی ئـەو فەرهەنگـە، کـە نـە لەگـەڵ بۆچـوونەکانی ڤۆسـتەردا دەگـونجێ و نــە لەگــەڵ پــەیام و ئامــانجی کــۆڕ یــەك دەگرێتــەوە، ڕەنگدانەوەی زارە کوردییەکانـە لـە فەرهەنگەکـەدا، چـونکە ناشـێ زاراوە تایبـەت بێت بە زارە جیاوازەکان.

لەبــەر ئــەوەی وشــەی گشــتی زمــان نییــە و تایبەتــە بــە پســپۆڕییەکی دیاریکراو، لەم فەرهەنگەدا زارە کوردییەکان نابن بە تەوەرەی بایەخپێدان، بـەڵکو زانستەکە دەبێ بە تـەوەرەی سـەرەکی. بـۆ نموونـە دەیـان زاراوەی تێدایـە، کـە هەوڵدراوە هاوسەنگی لە نێـوان زاری کرمـانجی خـواروو و ژووروو ڕابگرێـت. وەك: یەکەم وشەی فەرهەنگەکە ( ئاخاوتە، گوتە، وتە، گوتن، ئاخاوتن، ئاخافتن)ە.

لەلایەکی تریشەوە یـەکێك لـە ئەرکـەکانی کـۆڕ و ئـەو ئامانجـەی کـە بـۆی دامەزراوە بریتییە لە (یەکخستنی زاراوەکان)، کەچی بـەم کـارەی ئـەو زاراوانـەی، کە بڵاو بوونەتەوە و بەکارهێنانێکی سەرتاسەری نییە، بەشێوەیەك هانی زارەکان دەدا، کــە هەریەکــەو زاراوەی خــۆی بــەکار بهێنــی، بەشــێوەیەك فەرهەنگەکــەی

داڕشتووە، کە هیچ جیاوازییەکی نەبێ لەگەڵ فەرهەنگی ئاساییدا یان تا ڕادەیەك لە فەرهەنگی زارە کوردییەکان دەچێت. بەمەش دوورکەوتنەوەیەك لە پەیامی خۆیدا تێدا بەدی دەکرێ. کۆڕ دەیتوانی لە نێوان ئەو زاراوانەدا یەکێك هەڵبـژێرێ، کە زۆرترین بەکارهێنانی هەیە، تاڕادەیەکیش زارەکان تێدا هاوبەشن. هەرچەندە وەکو واقیعی زمانی کوردی ئەوە لەبەر چاو دەگرین، کە لە کاتی ئەمڕۆدا کۆڕ هەوڵ دەدا کە هاوسەنگی لە نێوان ( بادینی و سۆرانی) ڕابگرێت، بەڵام ئەوە بەو شێوەیە ناکرێ، کە لەسەر لایەنی زانستی ئەم هاوسەنگییە بپارێزی، بواری پسپۆرییەکە بکاتە قوربانی کێشەی زارەکان. بەم هەنگاوە هەردوو بوار سوودمەند نابن، نە زانستەکە (پسپۆرییەکە) و نە زارە کوردییەکان و نە زمانی یەکگرتووی کوردی، دەکرا لە جیاتی ئەم شێوازە بنەمایەکی تری بەکار بهێنابوایە، کە ئەویش تەنیا یەك زاراوەی بەکار بهێنابایە. جا ڕێژەیەك لەو زاراوانە (بادینی) و ڕێژەیەکیش سۆرانی. ڕێژەیەکیش زاراوەی هاوبەش بەکار بهاتبوایە. بۆنموونە لە کۆمەڵێ زاراوە تەنیا دەنگێك دەگۆڕێ بە پێی زارەکان لەم بارەدا پێویست ناکا هەردوو وشە وەك زاراوە لە فەرهەنگەکەدا بەکار بێت. تەنیا یەکێکیان دەشێ بکرێ بە زاراوەیەکی گشتی. بۆ نموونە: (داهێنانی سەرەکی– داهێنانا سەرەکی)، (کێشی بەردەوام– کێشا بەردەوام، جودایی– جوداهی، بەکارهێنەری زمان– بکارهێنەرێ زمانی)...هتد. تەنانەت لە هەندێ باردا نەبوونی وشە لە زارەکی تر وای کردووە کە لە شێوەی گرێدا دەربڕینی بۆ دابتاشن. وەك (دەگمەن، گەلەك کێم).

٤– **ئەوەی سەرنجڕاکێشە ژمارەی زاراوەکان لەم سێ جۆر ڕیزکردنە گۆڕانێکی زۆری بەسەردا دێت**. بۆنموونە زاراوە کوردییەکان لە فەرهەنگی کوردی– عەرەبی ئینگلیزی ٣٩١٥ زاراوەیە کەچی لە فەرهەنگی عەرەبی ئینگلیزی کوردی دەبێتە ٣٨٧٢ و لە فەرهەنگی ئینگلیزی – کوردی– عەرەبی ژمارەکە دەبێتە ٣٩٠٩. ئەمەش نەچەسپاوی و بێ متمانەیی دەگەیەنێ لە فەرهەنگەکەدا.

## پەراوێزەکان

[1] – یوجین ڤۆستەر (١٨٩٨–١٩٧٧) ئەندازیارێکی نەمساوییە، لە بواری کارەبا، بە ڕابەر و باوکی زاراوەسازیی نوێ ناسراوە و نوێنەری سەرەکی قوتابخانەی زاراوەسازیی ڤیەننایە.

[2] – علي القاسمي، المصطلحية (علم المصطلحات)، مجلة اللسان العربي، ع١٨، ص٩.

[3] – علي القاسمي: علم المصطلح: اسسه النظرية **وتطبيقاته العملية**، ص١٠.

[4] – محمود فهمي حجازي: الاسس اللغوية لعلم المصطلح، ص٢٠.

[5] – علي القاسمي، المصطلحية (علم المصطلحات)، مجلة اللسان العربي، ع١٨، ص١٠.

[6] – محمود فهمي حجازي: الاسس اللغوية لعلم المصطلح، ص١١.

[7] – سەرچاوەی پێشوو، لا ١١.

[8] – البرنامج العربي لمنظمة الصحة العالمية، علم المصطلح لطلبة العلوم الصحية والطبية، ص٢٥.

[9] – بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

أ– مهدي صالح سلطان الشمري، في المصطلح ولغة العلم، ص(٧٣–٧٤).

ب– احمد مطلوب، بحوث لغوية، ص(٢٠٧–٢٠٨).

[10] – بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

أ– خليفة الميساوي، المصطلح اللساني وتأسيس المفهوم، ص١٣–٢٠.

ب– البرنامج العربي لمنظمة الصحة العالمية، علم المصطلح لطلبة العلوم الصحية والطبية، ص٣٠–٣٩.

[11] – سەرچاوەی پێشوو، لا ٩.

[12] – محمود فهمي حجازي: الاسس اللغوية لعلم المصطلح، ص١٩–٢٨.

[13] – يوسف مقران، المصطلح اللساني المترجم (مدخل نظري الى المصطلحات)، ص٨٤.

[14] – محمود فهمي حجازي: الاسس اللغوية لعلم المصطلح، ص٢٠.

[15] – البرنامج العربي لمنظمة الصحة العالمية، علم المصطلح لطلبة العلوم الصحية والطبية، ص١٠.

[16] – يوسف مقران، المصطلح اللساني المترجم (مدخل نظري الى المصطلحات)، ص٨٥.

[17] – يوسف مقران، المصطلح اللساني المترجم (مدخل نظري الى المصطلحات)، ص٨٤.

[18] – هەندێك زاراوەی ئینگلیزی لەناو فەرهەنگەکەدا هەن، چەند جارێك دووبارە کراونەتەوە و هەر جارێکیش چەند زاراوەیەکی کوردییان بەرانبەر داناوە.

[19] – جواد حسني سماعنه، المعجم العلمي المتخصص (المنهج والمصطلح)، مجلة اللسان العربي، ع٤٨، ص٣٦.

## سەرچاوەکان:


١- بە زمانی کوردی:

- لێژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان، زاراوەی ئـەدەبی، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.

ب- بە زمانی عەرەبی:

١- احمد مطلوب، بحوث لغوية، دار الفكر للنشر والتوزيع، عمان، ط١، ١٩٨٧.

٢- البرنامج العربي لمنظمة الصحة العالمية، علم المصطلح لطلبة العلوم الصحية والطبية، فاس، ٢٠٠٥.

٣- جواد حسني سماعنه، المعجم العلمي المتخصص (المنهج والمصطلح)، مجلـة اللسـان العربي، ع٤٨، ١٩٩٩.

٤- خليفـة الميسـاوي، المصـطلح اللسـاني وتأسـيس المفهـوم، دار الامـان، الربـاط، ط١، ٢٠١٣.

٥- علي القاسمي، المصطلحية (علم المصطلحات)، مجلـة اللسـان العربـي، الربـاط، ع١٨، ج١.

٦- علي القاسمي: علم المصطلح: اسسه النظرية **وتطبيقاته العملية**.
http://www.4shared.com/file/3-lzcxo/_online.html.

٧- محمود فهمي حجازي: الاسس اللغوية لعلم المصطلح، دار غريب للطباعة، القاهرة.

٨- مهدي صالح سلطان الشمري، في المصطلح ولغة العلم، جامعة بغداد، بغداد، ٢٠١٢.

٩- يوسـف مقـران، المصـطلح اللسـاني المترجـم (مـدخل نظـري الى المصـطلحات)، دار ومؤسسة رسلان، دمشق، ٢٠٠٩.

## ملخص البحث

هذا البحث بعنوان (معجم المصطلحات الأدبية، من منظور نظرية فوستر)، عبارة عن تقيم (معجم المصطلحات الأدبية) الذي تم اعداده من قبل لجنة الادب في المجمع العلمي الكوردستاني بلغات ثلاث، وهي: الكوردية، العربية، الانكليزية.

إلى جانب تقيمه لـ(معجم المصطلحات الأدبية) في ضوء النظرية الاصطلاحية، ويحاول البحث الحالي الاجابة على الاسئلة الآتية: الى أي مدى توجد في معجم المصطلحات الادبية اسس وخصائص المعجم الاصطلاحي؟ وهل يختلف عن القاموس العام؟ وأي نظرية أو اتجاه اصطلاحي تم اتباعه في هذا المعجم؟

ويحاول البحث في الفصل الاول والذي هو فصل نظري وضع اطار نظري عام لمعجم اصطلاحي، ولهذا تم الاستفادة من نظرية فوستر. وفي الفصل الثاني تم اجراء تحليل احصائي لـ(معجم المصطلحات الادبية، للجنة الادب في المجمع العلمي الكوردستاني) من منظور هذه النظرية.

## Abstract

This study, which is captioned "Lexicon of Literary Terms from E.Wüster's Standpoint", analyses and evaluates the "Lexicon of Literary terms" written by Literary Committee of Kurdish Academy Assembly that covers Kurdish, Arabic and English languages. The study questions to what extent the work has operated the principles and incorporated the characteristics of lexicography? Is it different from general dictionaries? What theory or approach has been employed on which the lexicon is based? Those form research questions. The study attempts to answer the aforesaid questions and assess the work under the light of lexicography principles. Chapter one is dedicated to set a frame for specialized lexicon in the light of E.Wüster's viewpoint, while chapter two is set to statistically assess "Lexicon of Literary terms by Kurdish Academy Assembly" according to E.Wüster's theory.

# بۆچوونە سۆفییانەکان لە دیوانی ئەحمەدی خانی

**ئیبراهیم ئەحمەد شوان**
زانکۆی سەلاحەدین/هەولێر
کۆلیژی زمان – بەشی زمانی کوردی

## پوختە

ئەم لێکۆڵینەوەیە کە بەناونیشانی (بۆچوونە سۆفییانەکانی دیوانی ئەحمەدی خانی) یە، باسی لایەنی سۆفییانەی خانی دەکا لە دیوانە شیعرەکەیدا. سەرەتا باسی رابەری تەریقەت و رێبازی سۆفییانە و پێوەندیی مورید بەڕابەرەوە کراوە و پاشان بە متماکردنە سەر نموونە شیعرییەکان لایەنی سۆفیگەریی مەجازی و حەقیقی دەستنیشان کراوە و ئاماژە بە قۆناغەکانی سۆفییانەی کراوە.

## پێشەکی

هەتا ئەم ساڵانەی دوایی (ئەحمەدی خانی) هەر بە مەم و زینەکەی دەناسرایەوە و لێکۆڵینەوەی توێژەران لە چوارچێوەی ئەو داستانە مەزنەدا بوو، جا لێکۆڵینەوەکان رامیاری بان یان نیشتمانی یاخود سۆفیگەری و فەلسەفی.

هەر کە دیوانەکەی (خانی) لە ساڵی ٢٠٠٥دا کەوتە بەر دیدی خوێنەرانی، مەیدانی لێکۆڵینەوەکان فراوانتر بووە و غەزەل و قەسیدەکانی بوونە کۆمەڵێ کەرەستەی خاوی دیکە کە دەتوانرێ چەند لایەنێکی دیکەی بیروباوەڕەکانی ئاشکرا بکرێن.

یەکێك لەو لایەنانەی کە توێژەر مەبەستیەتی نووکی خامەی لێ بەگەڕ بخات، ئەوەش لایەنی سۆفیگەرییە لە دیوانەکەی خانیدا.

لێکۆڵینەوەکە لە دوو تەوەرە پێك هاتووە:

تەوەرەی یەکەم: ڕابەر و تەریقەت لای خانی، پێوەندیی مورید بە ڕابەرەوە، خانی و ئاماژەکردن  بە ڕابەری تەریقەت.

تەوەرەی دووەم: قۆناغەکانی خۆشەویستی لای (خانی) کە ئەمانەن:

١- خۆشەویستیی  مەجازی.

٢- خۆشەویستیی پێغەمبەر (ص).

٣- خۆشەویستیی خوایی. لە دوای ئەمانە دەچینە سەر بابەتی: خانی و فەنابوون، لە فەناوە بەرەو بەقا، خانی و خۆشییەکانی بەهەشت.

## تەوەرەی یەکەم

## ڕابەر و تەریقەت لای خانی:

هەر شاعیرێك گەر لە ڕووی سۆفیگەرییەوە باسی لێوە بکرێ، دەبێ بە بەڵگە بسەلمێنرێ کە سۆفییە، بەڵام لەبەر ئەوەی (خانی) سەلمێنراوە کە سۆفییە بۆیە ئەم بوارە دەبوێرین و تەنیا ئاماژە بە هەندێ زاراوەی سۆفیگەری دەکەین کە لە یەکەم غەزەلی دیوانەکەیدا بەرچاو دەکەون بە ناونیشانی (نەققاشێ ئەزەل رۆژا سەر لەوحەیێ رەنگین دا) کە ئەمانەن ((نەققاش، ئەزەل، رۆژ، لەوح، کیتاب، عەشق، رەسم، نەفخ، مەلەك، عیلم، خەت، سەجدە، مەحبووب، ئیبلیس، دێر، رووح، ئەنەل حەق، واحید، ساقی، جام، مەی، سەرخوەش، دڵ، دین، پەرتەو، مەزاهیر، مومکین، نوور، تەمکین، زولەیخا، یووسف، میسباح، ئەبەد، قەندیل، گەنج، جان، جەمال، عیرفان، زاهید، شاهید، سۆفی، سیر، نوقتە)) دیوانی خانی،ل ٤٩ — ٥٠.   جا ئەگەر بە سەرجەم  دیوانەکەیدا بچین ئەوا بە سەدەها وشە و زاراوەی سۆفییانەمان بەرچاو دەکەوێت کە (خانی) لە شوێنی گونجاوی خۆیان بەکاریانی هێناون و ئەمەندەی سەرەوە نموونەی مشتێکە لە خەروارێك.

هەر چەندە ڕێبازی نەقشبەندی لە سەردەمی جزیری و خانیدا بە شێوەیەکی فــراوان وەك ســەردەمی مــەولانا خالیــد و خەلیفــەکانی لــە کوردســتان بــڵاو نەبووبوویــەوە، بــەڵام وەك ڕێبــازێکی دێــرین بــوونی خــۆی ســەلماندبوو. بــەپێی بۆچوونی (زەڤەنگی) و هەندێ لە نووسەرانی دیکە لەوانەش خۆم، جزیری سەر بـە ڕێبازی نەقشبەندی بووە[1]، بەڵگەی ئەمەش لە دیوانەکەیدا بەرچاو دەکەوێ[*].

لـە دوای جزیـریش (خـانی) تاکـە سـوارەی مەیـدانی ئـەدەب بـووە و هـەر دوو بەرهەمی (مـەم و زیـن و دیوانەکـەی) ئاماژەیـان بـە لایـەنی سـۆفیگەری کـردووە. (خانی) بە ئاشکرا ناوی (نەقشـبەندی) دێنـێ و نیشـانی دەدا کـە ڕێبـوارێکی ئـەو ڕێبازە بووە:

**مەدی نەقشەك ژ نەقشێ نەقشبەندان**

**ڤە بوو قەیدێ دمن یەك یەك ژ ڕەندان** /د.خ/٢٤٥

واتا: من نەخشێکی شێخی نەقشبەندییەکانم بینی و یەکە یەکە کۆتـەکانی دەسـتم بوونەوە و ئازاد بووم. بینینەکەشـی هەسـتییە یـا مەعنەوییـە، هەسـتی بـە چـاوی سەرە و مەبەست لە مەعنەویش پێوەندییە (رابطە) کە نەقشـبەندییەکان باوەڕیـان پێی هەیە و بە مەزنترین هۆکارەکانی گەیشتنە خوای دادەنێن، چـونکە فەنایـە لـە شێخ و پێشەکیی فەنابوونە لە خودادا.

(خــانی) وەکــو نەقشــبەندییەك کــە (مجــذوب ســالك)ە زۆران جــار وشــەی (مجـذوب)ی بـەکارهێناوە، چـونکە نەقشـییەکان بـە جەزبـە دەسـت پێدەکـەن، هەروەکو شێخی نەقشبەندی دەڵێت ((بداية طريقتنا نهاية الطرق الاخرى))[2].

## خانی و ڕابەری تەریقەت

ئەحمەدی خانی ڕاستەوخۆ ناوی ڕابـەی تەریقـەتی نـەهێناوە، بـەڵام بـە چـەند شێوازێك هێمـای بـۆ کـردووە، لەمەشـدا جـۆرە لێکچـوونێك بـەدی دەکـرێ لەگـەڵ

* بروانە لێکۆڵینەوەیەکی / د.ابراهیم احمد شوان، شیعری عیرفانی لە نێوان باباتاهیر و جزیریدا. گۆڤاری (الاستاذ) ژمارە /٥٣ ساڵی ٢٠٠٥، ل ٨١٧ – ٨١٨ .

(مەلای جزیری)دا، چونکە ئەویش ناوی رابەری نەهێناوە و بە ((مورشید و پیر و خدر))[٣] ناوی بردووە. ئەمەش شتێکی ئاساییە چونکە (خانی) لە رووی سۆفیگەرییەوە شاگردی (جزیری) بووە و گەلێ لە شیعرەکانی کاریگەریی جزیرییان پێوە دیارە.

گەر سەیری دیوانەکەی (خانی) بکەین دەبینین بەم وشانەی خوارەوە ئیشارەتی بە رابەری تەریقەت کردووە کە ئەمانەن:

١- شەیخێ مە:

**شاهید بی تۆ ئەی زاهید مەحبووب پەرەستم ئەز**

**بێ شاهید و مەی نابم شەیخێ مە ئەو ئایین دا** /د.خ/٥

٢- شەیخێ جام:

**شەیخێ جام ئەر نەفەسێ هەمدەمێ دل کەت ب موراد**

**لێ مورادێ دلێ مورد بتن کەشفێ قوبوور** / د.خ/١٤١.

٣- مورشیدێ کامل:

**رەمز و ئیعجازێ دخووبان بێ عیبارەت مەدح دکەم**

**مورشیدێ کامل ئەزم ئیرۆهە ساحێب رازم ئەز**/ د.خ/ ١٧٨.

لەم بەیتەی سەرەوەدا وا پێدەچێ (خانی) خۆی لە پلەی رابەری دابێ و پێویستی بە رابەریی کەسی دیکە نەبێ.

٤- نەقشی نەقشبەندان: لەم بەیتەی دادێ مەبەستی لە نەقشبەندان رابەری ڕێبازی نەقشبەندییە کە رابەریەتی کردووە بەرەو ڕێگەی ڕاست:

**مە دی نەقشەك ژ نەقشێ نەقشبەدان**

**ڤە بوو قەیدێ د من یەك یەك ژ زەندان** /د.خ/٢٤٥ .

ئەو بەیتانەی کە تۆمار کران هەموویان بەڵگەن لەسەر هەبوونی رابەر لای ئەحمەدی خانی، کەوابوو (خانی) سۆفی بووە.

## پێوەندیی ڕێبواری سۆفیگەری بە ڕابەرەوە

ڕابەری تەریقەت بە گشتی و لای نەقشبەندییەکان بە تایبـەتی پلـە و پایەیـەکی بەرزی هەیە و جێگەی ڕێزی ڕێبوارانی سۆفیگەرییە و لە هەموو کار و فەرمانێکیـدا گوێڕایەڵی دەکەن و بێ فەرمانی ناکەن، چونکە بەلای ئەوانەوە چۆن ((حـەزرەتی جوبرائیل ئەمینی وەحییە بەم جۆرە شێخ ئەمینی ئیلهامە))[٤] لە خۆیەوە فەرمان ناکات و بەگوێکردنی شێخ ڕەزامەندیی خودایە و ئەوەی گازاندەی هەبێ لـە ریـزی تەریقەت دەردەکرێ. هەر لەم بارەیەوە گوتراوە ((هەر کەسێ شـێخێکی نـەبێ بـۆ ئەوەی لە دونیا پەرستی و خۆبەزلزانین و عوجب و ریا و حەسوودی بیپارێزێ ئەوا بەرامبەر خودا گوناهبارە))[٥].

(خانی) پێی وایـە ئـەوەی لـە عیشـقەکەی راسـتبێ و لەگـەڵ دولبەرەکـەی دووڕوو نەبێ، دەبێ لەگەڵ رای ئەو بێ و سەرپێچیی فەرمانەکانی نەکات و وەکو سەنعانی فەرمانی یارەکەی جێبەجێ بکا بـە فـەرمانی ئـەو کـافر بـێ و قورئـان بسـووتێنێ، لێرەدا دولبەر شوێنی رابەری گرتۆتەوە:

د فەرمانی کێ صادق بت　　و ناخوازێ مونافق بت
دڤێ هەردەم موافق بت　　وەکی شەیخی د سەنعانی
وەکی شێخی دهادر بت　　د فەرمانێ دە نازر بت
ب ئەمرێ دۆستێ کافر بت　　بسووژی صوحفێ قورئانێ /د.خ/٣٣٦

(خـانی) لـەو باوەڕەدایـە ڕابـەری کامـڵ هەڵـە ناکـا و گـەر لـە رووکەشـەوە فەرمانەکەی نەشیاو بێ، بەڵام لـە ناخـەوە حیکمـەت زانـە و دەزانـێ ئەنجامەکـەی چی دەبێت، هەروەکو سەنعانی کە لە رووکەشیدا کارەکانی هـەمووی دژی ئیسـلام بوون و پاشان بە کچەکەوە بەرەو ئیمان و خۆشەویستیی حەقیقی گەڕانەوە.

(خانی) لەم هەڵوێستـەیدا تانـە لـە سـۆفی دەدا کـە هـەر رووکەشـی کارەکـانی بەدی دەکا و بێ ئاگایە لە ناخ و حیکمـەتی کارەکـانی، خـانی لـە سـەرووی پلـە و پایەی سۆفییەوە دەدوێ و وەکو عاریفێ هەڵسوکەوت دەکـا و بـە ئاشـکرا دەڵـێ:

سۆفییەکان شەوکوێرن و چاویان نووری عەشق بەدی ناکات و شتەکان لەسەر حەقیقەتی خۆیان نابینن:

**ئەگەر دلبەر مەجازی بت ژ رەنگێ لبسێ غازی بت**

**بلا سۆفی نەڕازی بت بمینە ئەو د حیرمانێ**

**بنێ سۆفی قەوی دینە وەکی خەففاشێ مسکینە**

**لنك وی رۆژ تو رەنگ نینە چو نابینت ژ عومیانێ** /د.خ/٣٣٧

(خانی) بەهۆی رابەری تەریقەتەوە دڵ و دەروونی کراوەتەوە و لە ڕێگەی هاودەمیی ئەو فەیز و بەرەکەتی بەسەردا باریوە:

**گوشادا دل ژ بۆ من را مویەسسەر نەبوو بێ سوحبەتا سوورەت لەوەندان**/د.خ/٢٤٥

رابەر هەمیشە لە یارمەتیدانی موریدەکەیدایە و وەکو کۆنترۆڵی ئامێر کار لە دڵ دەکات، لەم بەیتەدا بەهۆی رابەرەوە ڕێگەی گەیشتنی کەعبەی پیرۆزی لێ کورت بووەتەوە و مەدەد و یارمەتی شێخی بۆ هاتووە:

**ل من کورت بووریا کەعبا ویسالێ ژ نوورا تەلعەتا بالابلندان** / د.خ/٢٤٥

لە بەیتە شیعرێکی دیکەدا رابەرەکەی (خانی) بە نهێنییەوە خەڵوەتی لەگەڵ کردووە و لە لێوەکانی خۆی شەربەتی خۆی داوەتێ، خەڵوەت یەکێکە لە سرووتەکانی نەقشبەندییەکان و لقێکە لە (سفر) کە دابڕانە لە کۆمەڵگا و ڕوو لە خوا کردنە، بۆ نموونە:

**نیهانی خەلوەتەك دا من ژ لەعلان شەربەتەك دا من**

**بو وەسڵی سوحبەتەك دا من کرم بەندە د فەرمانێ**/ د.خ/٣٣٦

## خانی و خۆشەویستی

خۆشەویستی ئارەزووکردنی دڵە بۆ شتێ، هەرکە ئەو ئارەزووکردنە بەردەوام بوو و چەسپا پێی دەگوترێ عەشق، لەو کاتەدا عاشق ئامادەیە لە پێناو مەعشووقەکەی هەموو شتێ بکات.

ئەو خۆشەویستییەی ئێمە باسی دەکەین سۆفییانەیە، واتا: خواییە، ئەم خۆشەویستییە یا لە ڕێگەی عەشقی مەجازییەوە پەیدا دەبێ، یاخود نوور ئاسایە و دەڕژێتە دڵ و دەروونی دڵدارەوە.

پێناسەی خۆشەویستی هێندە ئاسان نییە و ئەستەمە بکرێت و هەرچی لە بارەوە گوتراوە باسی شوێنەوار و بەروبووم و هۆیەکانێتی چونکە ئەو خۆشەویستییە تایبەتە بە پەروەردگاری مەزنەوە(٦).

خۆشەویستیی خوایی بناغەی سۆفیگەرییە و بێ ئەو سۆفییەتی قالبێکی بۆشە، خۆشەویستی لای ئەحمەدی خانی بە سێ قۆناغدا ڕەت دەبێت کە ئەمانەن:

١) خۆشەویستیی مەجازی: ئەحمەدی خانی لە شیعرەکانیدا ناوی هیچ کچێکی نەهێناوە، بەڵام لە چەند شوێنێك هێما بۆ عەشقی مەجازی دەکات. لەم بەیتەی خوارەوەدا ڕوونی دەکاتەوە کە عەشق یان مەجازییە یان حەقیقی، لە هەردوو باردا دڵ دەسووتێنێ، جا چ بە ئاگر چ بە نوور، گەر مەجازی بێ بە ئاگر و گەر حەقیقی بێ بە نوور:

**عیشقبازی دوو تەریقن، چ حەقیقەت چ مەجاز**

**شەمعێ جان دێ بسووژیتن، چ ب نار و چ ب نوور** /د.خ/١٤٣

لە بەیتێکی دیکەدا باسی دولبەری مەجازی دەکات و ئامادەیە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی، هەرچەندە سۆفی لەم هەڵسوکەوتە ڕازی نییە و بێ خەبەرە لە ئاکامی ئەو کارە. عەشقەکە لێرە مەجازییە بەڵام هەنگاوێکە بۆ عەشقی حەقیقیی خوایی چووە:

**ئەگەر دلبەر مەجازی بت ژ رەنگێ لبسێ غازی بت**

**بلا سۆفی نەڕازی بت بمینە ئەو د حرمانێ** / د.خ/ ٣٣٧

(خانی) کە لە عەشقی مەجازی دەگوازێتەوە یەکسەر بەرەو عەشقی خوایی ناچێت، بەڵکو لە خۆشەویستیی پێغەمبەرەوە بەرەو ئەڤینی خوایی هەنگاو دەنێت.

٢- خۆشەویستیی پێغەمبەر (ص): ئەم خۆشەویستییەش بەشێکە لە خۆشەویستیی مەجازی، چونکە پێغەمبەریش مرۆڤە، بەڵام قۆناغێکە بۆی. لەم دوو بەیتەدا دولبەر بەشێکی لە بوونی (خانی) تێدایە و هەموو جەزبەدارێك ئاگاداری نهێنیی عەشقی خانییە، مەبەست لە جەزبەدار موریدی نەقشبەندییە:

**دلا قەت نینە مەحبووبەك ژ تە جوزئەك نەبت لالی**

**دلاراما نە مەجزووبەك هەیە سڕا تەژی خالی** /د.خ/٣١١

پاشان (خانی) خۆشەویستەکەی خۆیمان بۆ دەستنیشان دەکات و دەڵێ: کێ بێ دوای ئەم هەموو ئازارە ئارەزوو لە یارێکی چواردە ساڵی نەکات، لێرەدا جۆرە وردەکارییەك لە چوارینەکەدا هەیە و مەبەستی (٤ ×١٠ =٤٠) یاری چل ساڵییە کە لە (٤٠) ساڵی بووەتە پێغەمبەر. ئەم بۆچوونەش هەر لە خۆڕا نییە و لەم بەیتانە پەیدا بووە کە لەمەودوا ئاماژەیان پێدەکەین و هەموویان بەرەو ئەو قەناعەتەمان دەبەن کە چواردە ساڵییەکە پێغەمبەرە (ص):

**جەگەر نالی مەهاڤێتن هەمی یەك یەك هلاڤێتن**

**گەلۆکی بت کو ناڤێتن حەبیبەك چاردە سالی** /د.خ/٣١٢

(خانی) لە چوارینەیەکی دیکەدا زیاتر یارەکەیمان پێ ئاشنا دەکا و چەند سیفەت و دەسەڵاتێکی دەداتێ کە هەر شایانی شەئنی پێغەمبەرە (ص)، لەوانەش: لەسەر تەختی دڵی شاعیر سوڵتانە و دڵی ئەو یارە عەرشی یەزدانە و ئاگاداری حاڵە دەروونییەکانی شاعیرە و خاوەنی زانستێکی زۆرە و وەکو (خانی) کۆڵەوار نییە:

**ل تەختێ دل ئەو سوڵتانە          دلێ وی عەرشی رەحمانە**

**وەکی خانی نە نەزانە          دزانت ئەو ب ئەحوالی** /د.خ /٣١٣

لە نیوە بەیتی دووەمدا ئاماژە بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ص) هەیە کە دەفەرمووێ ((قلب المؤمن عرش الرحمان)) (٧).

لە چوارینی کۆتاییدا روونی دەکاتەوە کە یارەکەی ئاگاداری حاڵە سۆفییانەکانی ئەوە و هەرچەندە لە رووکەشدا توندوتیژە، بەڵام لە ناخەوە بە رەحم و دڵسۆزە:

**ب ئەحوالی خەبەردارە          ب سوورەت ئەو خوە غەدارە**

**دباتین ئەو پوڕ دڵدارە          (سبحانە اللە) چ ئەو عالی** /د.خ/٣١٣

٣- خۆشەویستیی خوایی: ئەحمەدی خانی دوای ئەمە بەرەو خۆشەویستیی خوایی دەچێت، بە خۆشەویستیی خوایی شەوی تاریک یان دڵی تاریک دەبێتە رۆژی رووناک، یاخود بەو خۆشەویستییە نەبوون دەبێتە بوون، چونکە مرۆڤ سێبەرە و لەناو دەچێ، هەرکە گەیشتە حەقیقەتی خۆشەویستی بە نەمری دەمێنێتەوە، ئەمەش لە رێگەی ئەو نوورەی کە بەلای سۆفییەکانەوە دەرکەوتنی بوونەوەرانە، لەسەر حەقیقەتی خۆیان، ئامێری ئەو نوورەش رۆژ و دڵە. بە واتایەکی دیکە زیندووکردنەوەی دڵی مردوو بە دەستی رابەری کامڵ لە گینە هەرچەندە بە لای هەندێکەوە ئەستەمە:

**شەبێ زوڵماتێ ب ئیمکانێ دبت سوبحی نوما**

**ئافتابێ ئەحەدییەت ژ فەلەق تێتە زوهوور** /د.خ/١٤٥

(خانی) داوا لە مەیگێڕ (ڕابەر) دەکا کە پێکێکی پاککەرەوە بەسەر دڵیدا بکات، ئەویش سەرو ماڵ و دڵ و گیانی خۆی دەداتێ بۆ ئەوەی چڵکی دڵی بشۆرێتەوە و پێی بگاتە مەقاماتی باڵا و ببێتە خاوەنی کەشف و کەرامەت و دارەکەی حەللاج، مەبەست لەو دارە یان داری مەعریفەیە، یاخود ئەو سێدارەیە کە حەللاجی پێ لە خاچ درا. وشەی (منصور) ئاماژەیە بە حەللاج یاخود ناوی بەرکارە و بە واتای

سەرکەوتوو دێت، چونکە ئەوەی بگاتە ئەم پایەیە سەرکەوتووە جا بمێنێ یان نەمێنێ:

**سەرو مال و دل و جانێ مە فیدایێ تە بتن**

**بکە قەلبێ مە تو ساقی ژ شەرابا خوە تەهوور**

**دا بکەم کەسبێ مەقامات عولوویێ دەرەجات**

**یا بکەم کەشفێ کەراماتێ ژ دارا مەنصوور** /د.خ/١٤٦

شاعیر لەو باوەڕەیە کە داری مەعریفەت یاخود ئەو کانگای مەعریفەیەی کە حەللاج زانستی خوایی لێ وەردەگرت، هەر ئەو دارەیە کە نەوای (أنا الله)ی لێوە هات، بۆیە داوا لە زاهیدی ڕواڵەت بین دەکات کە سەردانی ئەو دارە بکات لە دۆڵی قودس ((**ونودي من شاطیء الوادي الایمن في البقعة المباركة من الشجرة أن یا موسى إني أنا الله**)) القصص /٣٠ تاکو گوێی لە دەنگی (انا الله) بێت لە کێوی طووری دڵی شاعیر:

**ب زیارێ وەرە قەیدا شەجەرا وادییێ قودس**

**کە بزانی ببهی صیتێ (أنا الله) ژ طوور** /د.خ/١٤٨

* * *

لە قەسیدەیەکی دیکەدا (خانی) ئاماژە بە میعراجی دڵی دەکات کە بە دوای نێچیری خۆیدا وێڵە و بێ ویستی ئەو ئارەزووی لە فڕین کردووە، ئەم ئارەزووەش بریتییە لە بێزاربوونی ڕۆح لە ناو چوارچێوەی جەستە و گەڕانە بە شوێن ئەو حەقیقەتەی کە باڵندەی دڵی ئارەزوویەتی:

**دیسان دڵی شەیدا ژ نوو بێ ئیختیار پەرواز کر**

**صەیدەك دیە و بەردایە دوو مەیل و فڕا شەهباز کر** /د.خ/١٥٦

ئارەزووی دڵی (خانی) بۆ حیکمەتە، حیکمەتیش کامڵە و لەجێی خۆیەتی، ئەو عەشقەی شاعیر بەدوایدا وێڵە عەشقێکی حەقیقییە و لە وشەی (عنقا)دا بەرجەستە بووە. غەزالی لە (رسالة الطیر) دا کە میعراجی باڵندەکانە بەرەو خودا وشەی (عنقا)ی بەکارهێناوە و (عطار) یش لە (منطق الطیر) وشەی (سیمورغ)ی

تۆمار کردووه و هەردووکیان یەك شتن و مەبەست لێیان حەزرەتی خواییە، عەنقا شوێنی بەرز و دووره، باڵندەی دڵی (خانی)یش بۆیە بەرەو هەوراز دەچێ تا بگاتە خزمەتی ئاستانەی خوایی:

**مەیلا وی مەحضا حیکمەتە صەیدا وی عەنقا سیرەتە**

**تەیرێ وی بالا هیمەتە لەورا تەلەب ئەفراز کر** /د.خ/١٥٧

(خانی) لەوە ئاگادارە کە گەشتەکەی بەرەو کوێیە و زۆر چاك دەزانێ ئەوەی بەو ڕێگایەدا بڕوات لە دولبەری حەقیقی دەگەڕێ و گەیشتنە ویش کارێکی هەندە ئاسان نییە و وەکو راوکردنی عەنقایە (عەنقاش باڵندەیەکی ئەفسانەییە و نابینرێ و ناگیرێ)، بۆیە نابێ لە تۆڕەکەی خافڵ بێت:

**عەنقا ب دەست کەس ناکەڤت دامەك دڤێ ئەو داکەڤت**

**نابت کو غافل راکەڤت ئێ قەصدێ صەیدا بازکر** /د.خ/١٥٨

ئەحمەدی خانی لێرەدا بەراوردێ دەکا لە نێوان شێوەی یاری مەجازی و حەقیقی، پێی وایە شێوەی مەجازی جوانییەکەی دڵ مەست دەکات بەلاّم زۆرخایەن نییە و جەستەیەکی مردووی بێ گیانە، بە پێچەوانەوە عەشقی حەقیقی کە عەنقا ئاسایە و دەست ناکەوێ، جا ئەوەی بیەوێ بیگاتێ پێویستە گیانی خۆی لە بەندیخانەی جەستەی ئازاد بکا و بە شوێنیدا بڕوات تا دەیگاتێ، ئێمەش بەم شێوەیە هەڵسوکەوتمان کرد:

**شەکلێ مەجازی چەندەکە صەیدا حەقیقی ویردەکە**

**تەیغوونێ قەیدا لێ ڤەکە بەحرێ مە بەر ئەنداز کر** /د.خ/١٦١

## خانی و فەنابوون

فەنا نەمانی بەندەیە لە بوونی حەقدا، واتا: نەمان و توانەوەی سیفەتە مرۆڤییەکانە لە سیفەتە خواییەکاندا، فەنا کۆتایی رۆیشتنە بەرەو خوا و بەقا سەرەتای رۆیشتنە لە خودا.

(خانی) لە چەند بەیتێکدا ئاماژە بە فـەنابوون دەکـات، سـەرەتا مـرۆڤ دەکاتـە دوو بەشەوە، بەشێکیان کە پەیدا دەبن خۆیان لەم دونیایە فانی دەکەن بۆ ئەوەی لە جیهـانی دوایـی بـاقی بـن، هەندێکیشـیان بـێ بەرامبـەر خۆیـان لـە دونیـا فـانی دەکەن، واتا: بە دوای ئارەزووی خۆیان دەکەون و ڕۆژی دواییان لەبیر نییـە و لـە ئەنجامیش لەناو دەچن بێ بەرامبەر و پاداشت.

چینی یەکەم بوونی خۆی فانی دەکا بۆ ئـەوەی بـوونی تـۆ (خـودا) بەدەسـت بێنیٚ و لە ناو بوونی تۆ بتوێتـەوە و لـە سـەودای کڕینـی جـوانیی تـۆدان، خـانیش وەکو ئەو پیرێژنەی کە چەنگێ خوری لە دەستدا بوو و دەیویست جوانیی یوسـفی پێ بکڕێ، ئەویش دەیەوێ بەو سەرمایەوە جوانیی خودایی بەدەست بێنێ و تێیدا فانی بێت:

**هن نەقدێ فەنایێ دگوهۆڕن ب بەقایێ**

**هن نەقدێ وجوودا دکن بێ بەدەل ئەفنا** /د.خ/٧٧

**هەریەك ب وجوودا خوە وجوودا تە دخوازت**

**بیل جوملە خەریدارێ جەمالا تەنە حەققا**

**لەو شوبهەتێ پیرا ب هەوەس تالیبێ یووسف**

**دۆر هاتییە (خانی) کە لە فاریس ددەست دا** / د.خ/٧٨

لە بەیتی دووەم و سێیەم جوانیی خوایی وا لـە خۆشەویسـتانی خـوا دەکـا کـە هەوڵی فەنابوونی خۆیان بـدەن لـەو جوانییـەدا، لـەو بەیتـە شـیعرانەش کـە خـانی تێیاندا وەسفی جوانیی یارە مەجازییەکـەی دەکـات مەبەسـت لێـی جـوانیی یـاری حەقیقییە چـونکە ئـەو جوانییـەی کـە بـە یـاری مـەجازی بەخشـراوە بەشـێکە لـە جوانیی خوایی.

(خانی) لە چەند بەیتێکی دیکەدا ئاماژە بە عاشـقبوونی خـۆی دەکـا بـۆ نـووری خوایی، ئەو نوورە خواییەش بریتییـە لـە جـوانیی خـوایی، بۆیـە دڵـی شـاعیر بـە جوانیی خوایی روونـاك بۆتـەوە و وەکـو ئاوێنەیـەکی لـێ هـاتووە کـە ئـەو نـوور و جوانییەی تێدا تیشك دەداتەوە:

**عاشقێ نوورا خودامە گەر ببینم ئەز جودامە**

**بۆ جەمالێ موبتەلامە کەس ب حالی من نزانی** /د.خ/٣٢٨

**ئەی ئاینەیێ دل ب جەمالا تە موجەللا**

**صەد صەفحە ب یەك زەڕە ژ نوورا تە موتەللا** /د.خ/٨٤

نووری خوایی جوانیی خواییە، عاشق کە عەشقی نووری خوایی دەبێ دڵی پێ ڕووناك دەبێتەوە و عەشقی جوانیی ئەو نووره دەبێت ((الله نور السماوات والارض)) النور /٣٥، لەو عەشقەدا دەتوێتەوە و پێوەندیی بە جیهانی هەستییەوە نامێنێ و لەو جوانییەدا فانی دەبێ و لەدەوروبەری خۆی دادەبڕێ. لەم بەیتەی دادێ (خانی) هەست بە فەنابوونی خۆی دەکات لە نووری جوانیی خودادا و لە خەڵك دابڕاوە و کەس لە حاڵ و حەواڵی نازانێ:

**خەستە حالم پوڕ فەنامە ژ یار و دۆستان ئەز جودامە**

**عاشقێ نوورا خودامە کەس ب حالی من نزانی** /د.خ/٣٢٨

فەنابوونەکەی (ئەحمەدی خانی) وەکو فەنای ئەو سۆفییانە نییە کە هەندێ شەتەحاتیان بەسەر زاریدا دەهات وەکو (انا الله، انا الحق، لیس في جبتي سوی الله)، هەروەها وەکو بیروباوەڕی مەسیحییەکان نییە کە پێیان وایە حەزرەتی مەسیح خوایەتیی تێدا تەجەلی کردووە و کڕنۆشی بۆ دەبەن، لەم بەیتەدا دەردەکەوێ کە (خانی) لە دێرەی مەسیحییەکان هەستی کردووە کە (روح الله — عیسا) لای ئەوان شوێنی دەرکەوتنی خواییە لە هەموو شتێ:

**ئەز چوومە دەری دێرێ، من دیتی کو (روح الله)**

**تەکراری موسەوەر بوو حەتتا د نهالین دا** / د.خ/٥٨

(خانی) لە بەیتی دوای ئەمەدا دەڵێ: ئەو مەسیحییانە کە وایان هەست دەکرد بەشێکن لە خودا (انا الحق) یان بەسەر زاردا دەهات، بەلام خۆی تەنیا ڕەهای (الواحد المطلق) دەگوت و پێی وایە لەو زیاتر بوون نییە:

**وان جوملە (انا الحق) گوت، من واحیدێ موتلەق گوت**

**ساقی ب خوە ئەز گرتم جامەك مەیێ نۆشین دا** / د.خ/٥٩

لەم بەیتەی سەرەوەدا ساقی خودایە و خانێی بۆلای خۆی کێش کردووە و پێکێ مەیی پێشکەش کردووە و فانی بووە. هەرکە مەیگێڕ مەیەکەی بە (خانی) دا، نۆشی کرد و پێی تێکچوو، پاشان بووە جیهانێکی بچووك لەناو جیهانی گەورەدا و پشتی خۆی بە یەکێتی رەها بەست و وای هەست کرد کە هەموو شتێکە لە وجوود:

**من نۆشی و سەرخوەش بووم، فیلحال مشەوەش بووم**

**ئەز چار و نە هوشەش بووم، من تەکیە ب بالین دا** /د.خ/٦١

چوار، رەگەزەکانە (خۆڵ و ئاو و هەوا و ئاگر)، نۆ، نۆ ئەستێرەکانە، شەش، شەش لایەکانە. ئەمە جیهانە گەورەکەیە و (خانی) یش جیهانێکی بچووکە لەو گەورەیەدا.

ئا لەوکاتەدا (خانی) هەست بە پایەی خۆی دەکا و تێدەگات کە مرۆڤێکی کامڵە و لە نەوەی ئادەمە و شایانی ئەوەیە کە فریشتەکان کڕنۆشی رێزی بۆ ببەن و ئەوەی ئینکاری بکا وەکو ئیبلیس بە سزای خۆی دەگات:

**ئادەمیٚ کامل ئەزم، بوویمە مەسجوودیٚ مەلەك**

**موددەعی گەر نەبتن سەجدە ب من هاسەریٚ خشت** /د.خ/١٢٠

لە بەیتێکی دیکەدا بە ئاشکرا ئەوە روون دەکاتەوە کە خودا مرۆڤی کردۆتە نوسخەی جیهانێکی بچووك بۆ جیهانێکی گەورە و دڵ بووەتە عەرشێکی مەزن و نهێنییەکانی خودای تێدا شاردراوەتەوە ((ما وسعني سمائي ولا أرضي بل وسعني قلب عبدي المؤمن))(٨)، لەم رووەوە (خانی) دەڵێت:

**ئینسان تە ژ بۆ عالەمیٚ کوبرا کرە نوسخە**

**لەو موضغە یەکیٚ ژی تو دکەی عەرشیٚ موعەللا** /د.خ/٨٤

بەم پێیە (خانی) کە لە بوونی خوادا فانی بووە، خودا هەندێ لە نهێنییەکانی خۆی نیشان داوە، بۆیە پشتی لە هەموو کەس کردووە و رووی هەر لە خودایە و بەس:

**سڕا خوە نیهانی تەکودا ئەحمەدی خانی**

**(أزغیری برشد به تو اوردی تولاّ)** /د.خ/٨٣

لەم بەیتەی (خانی) کە بە زمانی تورکییە، دەیەوێ لە گۆڕەپانی فەناوە بەرەو عەنقای بەقا بچێت، عەنقا ڕەمزێکی سۆفییانەیە و مەبەست لێی خودایە، کەواتە بەقا مانەوەیە لە بوونی خودا:

**بیدایی فنابنم رهگزرم در        عنقایی بقا هّمت همراه پرم در** /د.خ/١٧٢

## خانی و خۆشییەکانی بەهەشت

(خانی) وەکو عاشقێکی خوایی تەماعی لە خۆشییەکانی بەهەشت نییە و کە بەهەشتی دەوێ بۆ ئەوەیەتی خوای تێدا ببینێ، لێرەدا پێڕەویی رابیعەی عەدەوییەی کردووە کە گوتوویەتی ((الهي ما عبدتك خوفاً من نارك ولا طمعا في جنتك بل عبدتك محبة فيك))(٩)، بە گشتی سۆفییە فەلسەفییەکان هەموو لە سەر ئەم بۆچوونەن، بۆ نموونە:

**بن عاشق دیداری نەحاجت غم دیوار**

**جنه دخی بر پر دەئی قطع نظرم در** / د.خ/١٧٢

هەروەها (خانی) لەم شەشینەیەدا بە ئاشکرا دەڵێ: گەر لە حەشرێ دولبەر (خودا) نەبینم بەهەشتم بۆ چییە و خۆڵەمێشی پێ وەردەکەم:

**گەر د حینا ئەز وەفات بم بێتە سەر من عزرەئیل**

**موژدەیا خولدێ دوێ گاڤێ بدەت من جبرەئیل**

**خضر و ئیلیاس هەم ببێتن هەر ژ بۆمن را دەلیل**

**دێ ببێژم من نەڤێتن خولد و کەوثەر، سەلسەبیل**

**گەر بزانم ئەز د حەشرێ دا نەبینم دلبەرێ**

**دێ چ لێ کەم جەننەتێ پێ وەربکەم خاکستەرێ** / د.خ/٣٦٦

## ئه نجام:

## لێکۆڵه‌ر له کۆتاییدا به‌م ئه نجامانه گه‌یشت:

١- خانی سه‌ر به ڕێبازی نه‌قشبه‌ندی بووه و به شه‌یخ و شه‌یخ جام و مورشیدی کامڵ ئاماژه‌ی به ڕابه‌ره‌که‌ی کردووه.

٢- له زانستی سۆفیگه‌ریدا به‌توانا بووه و به لێشاو زاراوه‌کانی سۆفیگه‌ری له شوێنی شیاوی خۆیان به‌کارهێناوه.

٣- له خۆشه‌ویستیی مه‌جازییه‌وه به‌ره‌و حه‌قیقی چووه و خۆشه‌ویستی پێغه‌مبه‌ری خستۆته نێوان مه‌جازی و حه‌قیقییه‌وه.

٤- له خۆشه‌ویستییه‌که‌ی گه‌یشتۆته پله‌ی فه‌نابوون و به‌هه‌شتی بێ بینینی خودا نه‌ویستووه وه‌کو رابیعه‌ی عه‌ده‌وییه.

## (کورته‌ی لێکۆڵینه‌وه)

ئه‌م لێکۆڵینه‌وه‌یه که به ناونیشانی ((بۆچوونه سۆفییانه‌کانی دیوانی ئه‌حمه‌دی خانی)یه له دوو ته‌وه‌ره پێکهاتووه:

ته‌وه‌ره‌ی یه‌که‌م: بریتییه له رابه‌ر و ته‌ریقه‌ت لای خانی، پێوه‌ندی سۆفی به رابه‌ر، (خانی) و ئاماژه‌کردن به رابه‌ری ته‌ریقه‌ت.

ته‌وه‌ره‌ی دووه‌م: قۆناغه‌کانی خۆشه‌ویستی لای (خانی): خۆشه‌ویستیی مه‌جازی، خۆشه‌ویستیی پێغه‌مبه‌ر، خۆشه‌ویستیی خوایی.

له کۆتاییدا باسی فه‌نا و به‌قا کراوه و به نموونه‌ی شیعری بۆچوونه‌کان پشت ئه‌ستوور کراون.

## پەراوێزەکان

١- العقد الجوهري في شرح ديوان الجزري، ج١، احمد محمد الزڤنگی، ص٤.

٢- الحديقـة النديـة في الطريقـة النقشـبندية، محمـد بـن سـليمان، مكتبـة الحقيقيـة، استانبول ١٩٩٠،ص ١٦.

٣- شیعری عیرفانی لە نێوان باباتاهیر و جزیریدا، د. ابراهیم احمد شـوان، گۆڤـاری الاستاذ، ژمارە / ٥٣، ل ٨١٩.

٤- عوارف المعارف، السهروردي، ص ١٩٩.

٥- الحديقة الندية في الطريقة النقشبندية، ص ٣١.

٦- الفتوحات المكية، ج٢، ابن عربي، دار صادر - بيروت، ص ٣٢٥.

٧- دیوانی مەحوی، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، ل ٥٥.

٨- المعجم الصوفي، د. سعاد الحكيم، ط ١، ١٩٨١، ص ٩١٨.

٩- تذكرة الاولياء، فريدالدين العطار، ط ٣ - ١٣٧٥. ص ٧٧.

## سەرچاوەکان

١- أحمدي خاني، شـاعرا ومفكـرا، فيلسـوفا ومتصـوفا، د.عزالـدين مصـطفى رسـول، مطبعة الحوادث، بغداد ١٩٧٩.

٢- تذكرة الاولياء، فريدالدين العطار، ط٣، ١٣٧٥.

٣- جواهر المعاني في شرح ديوان احمـد الخـاني، تحسـين ابـراهيم الدوسـكي، سـپيريز/ مطبعة وزارة التربية - اربيل ٢٠٠٥.

٤- الحديقة الندية في الطريقة النقشبندية، محمد بن سليمان، مكتبة الحقيقة، ١٩٩٠.

٥- دیوانی مەحوی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، چ٢، چاپخانەی ئۆفسێتی حیسام/ بەغدا ١٩٧٦.

٦- شیعری عیرفانی لـە نێـوان باباتـاهیر و جزیریـدا، د.ابـرهیم احمـد شـوان، گۆڤـاری الاستاذ - زانکۆی بەغدا، ژمارە /٥٣.

٧- عوارف/المعارف، السهروردي، ملحق احياء علوم الدين، المجلد الخامس.

٨- الفتوحات /المكية، ط٢، ابن عربي، دار صادر- بيروت.

٩- المعجم الصوفي، د.سعاد الحكيم/ ط١،١٩٨١.

## ملخص البحث

هذا البحث الموسوم ب (الآراء الصوفية في ديوان احمد خاني) يتكون من محورين:

المحور الاول: عبارة عن المرشد والطريقة الصوفية عند خاني، علاقة الصوفي بالمرشد، خاني والاشارة الى مرشد الطريقة في ديوانه.

المحور الثاني: يتكون من مراحل المحبة عند خاني: المحبة المجازية، محبة النبي، المحبة الالهية.

وفي النهاية تم بحث الفناء والبقاء ومؤيد ذلك بالنموذج الشعري في ديوانه.

## Abstract

This paper is entitled " The Mystic views in Ahmedi Khani's divan (Anthology of poems) ". It consists of two parts. The first deals with the concept of the religious leader and the mystic order to Khani along with the relation between the mysticist with his leader; Khani and indications of the leader and sect. The second part is devoted to dealing with the stages of love to Khani: metaphorical love, prophet love and divine love. At the end, death and survival are explained through examples from the poems.

# بنیاتی شیعرییەتی گێڕانەوە
# لە هەڵبەستی (کەڵەشێر)ی شێرکۆ بێکەسدا

**د. ئەحمەد محەمەد مام عوسمان قەرەنی**
ڕاوێژکاری پەروەردەیی – وەزارەتی پەروەردە

## پێشەکی

شیعرییەتی گێڕانەوە، ڕەگ و ڕیشەیەکی کۆنی لە شیعری کوردیدا هەیە و لە شیعری نوێ و هاوچەرخیشدا پانتاییەکی فراوانی گرتووەتەوە و وەکو بنەمایەکی هونەری بووەتە توخمێکی سەرەکی لە زۆربەی ژانرەکانی دیکەی ئەدەبیدا، بەڵام لە ڕەخنەی ئەدەبی کوردیدا کەم ئاوڕ لەم بابەتە دراوەتەوە. ئەوەی کە کرابێتیش لە بواری ڕەخنەی چیرۆك و ڕۆماندا بووە و لە هەردوو حاڵەتیشدا جەخت لەسەر گێڕانەوە کراوە، نەك شیعرییەتی گێڕانەوە. لە شیعردا ئەوەندە بایەخی پێ نەدراوە و تا ئێستا ـ بەپێی ئاگاداری لێکۆڵەر ـ شتێکی گرنگی لەسەر نەنووسراوە و بۆشاییەکی لەنێو توێژینەوەکانی ڕەخنەی ئەدەبی کوردیدا بەجێ هێشتووە، بۆیە ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ ئەم لایەنە تەرخان کراوە.

سنووری لێکۆڵینەوەکەیش لە ڕووی تیۆرییەوە تەنیا زاراوە و چەمکی شیعرییەتی گێڕانەوەیی پێناسە دەکرێت و بنەما تەکنیکییەکان و بەها ستاتیکییەکانی لە شیعری نوێی کوردیدا دەستنیشان دەکرێن و لە ڕووی پراکتیکیشییەوە لە سەر شیعری (کەڵەشێر)ی شێرکۆ بێکەس جێبەجێ دەکرێت.

بۆ گەیشتن بە ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە لێکۆڵەر پشت بە دوو ڕێباز دەبەستێت:

١– ڕێبازی وەسفی: لەپێناو گەڕانەوە بۆ کتێب و ئەو توێژینەوە و لێکۆڵینەوانەی کە پێوەندییان بەم بابەتەوە هەیە.

٢- ڕێبازی شیکردنەوە: بۆ ئەوەی لایەنی تیۆری تایبەت بە شیعرییەتی گێڕانەوە بە سەر یەکێك لە دەقەکانی شیعری نوێی کوردیدا پراکتیزە بکرێت و بەها ستاتیکییەکانی بدۆزرێنەوە و بنەما تەکنیکییەکانیشی دەستنیشان بکرێن.

لەڕووی ناوەرۆکیشەوە، لێکۆڵینەوەکە لە پێشەکی و دوو بەش پێکهاتووە: بەشی یەکەم لە دوو تەوەرە پێکهاتووە، یەکەمیان بۆ پێناسەکردنی زاراوەی شیعرییەتی گێڕانەوە و باسکردنی چەمکەکەی تەرخان کراوە، لە تەوەرەی دووەمیشدا سیماکانی شیعرییەتی گێڕانەوەی هەڵبەستەکە شی کراوەتەوە.

بەشی دووەمیش بەسەر دوو تەوەرەدا دابەش کراوە: یەکەمیان بۆ بنەما تەکنیکییەکانی شیعرییەتی گێڕانەوە و دووەمیانیش بۆ بەها ستاتیکییەکانی شیعرییەتی گێڕانەوە لە هەڵبەستەکەدا. لە کۆتاییدا گرنگترین ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان دەستنیشان کراون.

**دەق**

**کەڵەشێر**

**کازیوە بوو**
**بە تەنها هەر**
**کەڵەشێرێ چاوی لێ بوو**
**کچەی عاشقی ناو گوندیان**
**لە بنەبانی کادانێ**
**چۆن سەربڕی!**
**بۆیە ئەویش**
**گەڕایەوە بۆ کولانە و**
**مانی گرت و بڕیاری دا**
**بەیانیان ئیتر نەخوێنێ!** (1)

## بەشی یەکەم
## زاراوە و چەمك و سیماکانی شیعرییەتی گێڕانەوە
### تەوەرەی یەکەم: زاراوە و چەمك

زاراوەی شیعرییەتی گێڕانەوە، لە نێو فەرهەنگە ئەدەبییەکانی کوردیدا نەهاتووە[٢]. بەڵکو چەندین زاراوەی نزیك ئەو بەکارهاتوون[٣]. هەندێکیان نە تەنیا باس لە جۆرەکانی گێڕانەوەیان نەکردووە، بەڵکو جیاوازی لەنێوان گێڕانەوە و ژانرەکانی دیکەی وەکو چیرۆك و حیکایەتیشیان نەکردووە و هەرسێکیان بەیەك پێوەر و بۆ یەك مەبەست شی کراونەتەوە[٤]. تەنانەت لەنێو تۆژینەوە ئەدەبییەکان و بابەتە ڕەخنەییەکانیشدا وەکو زاراوەیەکی پێوانەیی نابینرێت[٥]. ئەم بەکارنەهێنانەیش بۆ دوو هۆی سەرەکی دەگەڕێتەوە:

- کەمی توێژینەوە ئەدەبییەکان لەبارەی گێڕانەوە بە بەراورد لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرەی دەقە ئەدەبییەکان کە لەم بوارەدا نووسراون، بۆیە هێشتا چەندین تێرمی ڕەخنەیی ماونەتەوە کە بابەتەکانیان شی نەکراونەتەوە و لەسەر دەقە ئەدەبییەکانی کوردیشدا پراکتیزە نەکراون، بەپێچەوانەوە لە ئەدەبی گەلانی دیکەدا چەندین تێرمی نوێی ڕەخنەیی جێگەیان کراوەتەوە و لەنێو لێکۆڵینە زانستییەکاندا بەکارهاتوون بۆ نموونە: لیریکی گێڕانەوەیی[٦] و شیعرییەتی چیرۆك ئامێز[٧] و شیعرییەتی خوێندنەوە[٨] و شیعرییەتی گێڕانەوەیی چیرۆکی[٩] هەروەها شیعرییەتی گێڕانەوە[١٠] کە بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

- ئەو توێژینەوە ئەدەبییانەی کە لەبارەی گێڕانەوە نووسراون پتر لەسەر ڕۆمان و چیرۆك پراکتیزە کراون و لە شیکردنەوەکانیانیشدا زیاتر پشتیان بە بنەما کۆنەکانی گێڕانەوە بەستووە و کەمتر باس لە بنەما نوێیەکانی کردووە[١١] و شیعرییەتی گێڕانەوەیش لە بنەما هەرە نوێیەکانیەتی کە ڕەخنەی نوێ باسی دەکات، بە تایبەتی لە شیعردا. تەنانەت ئەو لێکۆڵینەوانەی لەبارەی شیعرییەتی ڕۆمانیشەوە ئەنجام دراون باسی شیعرییەتی ناونیشان و شیعرییەتی زەمەن و شیعرییەتی شوێن... لە ڕۆماندا کراوە، بەڵام ئاوڕیان لە شیعرییەتی گێڕانەوە نەداوەتەوە[١٢].

شیعرییەتی گێڕانەوە لە ژانرەکانی ئەدەبدا (هەڵبەست، ڕۆمان، چیرۆك...) وەکو شێوازێکی لیریکی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و لە شیکردنەوە ڕەخنەییەکانیشدا بە زاراوەیەکی پێوانەیی دادەنرێت، کە گوزارشت لەو شێوازە دەکات کە ((کەرەستەی گێڕدراوی تێدا زاڵ دەبێت و بەشەکانیشی بەبێ ئەوەی ببنە هۆی گرژبوونی هیچ ململانێیەك بە جۆرێکی تاکانە ڕێکدەخرێن ))[13]. کەواتە کەرەستەکانی گێڕانەوە کە ((قسەکردن و خوێندنەوەن و پێداچوونەوەیان بۆ دەکرێت و لە سیاقێکدا دادەڕێژرێن))[14] لەگەڵ کەرەستەکانی شیعرییەت کە ((زمان و کێش و ڕیتم))ن[15] لێکدەدرێن و بەیەکگرتنەوەیان چەمکێکی نوێ دروست دەبێت کە شیعرییەتی گێڕانەوەیە و ئەوەی ئەم چەمکە لە حیکایەتی شیعری یان چیرۆکی شیعری یانیش گێڕانەوەی شیعری جودا دەکاتەوە تایبەتمەندییەکانی شێوازی لیریکییە لە گێڕانەوەدا. کرۆکی لیریکیش سۆزە و سۆزیش سەرچاوەی شیعرییەتە. ڕۆڵی شیعرییەتیش یەکێك لەو ئەرکانەیە کە هەڵچوونەکانی نێرەر بە تێگەیشتنی وەرگر دەبەستێتەوە[16]. لە ڕووی ڕامانیشەوە ئەم شێوازە ((دەکرێتە دوو جۆر: شیعری لیریکی خۆیەتی و شیعری لیریکی بابەتی کە هەر یەکێکیان بنەما و خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەیە))[12]. ئەوەی دووەم کە جۆری شیعری لیریکی بابەتییە، پێوەندی بە چەمکی شیعرییەتی گێڕانەوەوە هەیە، چونکە لایەنی بابەتی لە شیعری لیریکیدا خۆی لە خۆیدا گێڕانەوەی ئەزموونێکە، یان ڕووداوێکە کە تێکەڵی سۆزی شاعیر دەبێت و لە ئاوێتەبوونی هەردوو لایەن لە دەقێکی هونەریدا ئەوە گێڕانەوەیەکی ناواخنکراو بە شیعرییەتی تێدا بەرجەستە دەبێت. ئەرکەکەیشی لەم بەرجەستەکردنەدا ئەوەیە کە ((بەرەو هۆشیارکردنەوەیەکی مادی و هەستییەوە ئاراستەمان بکات و قەناعەتیشمان پێ بێنێت کە بابەتەکە شایستەی ئەوەیە بایەخی پێ بدرێت))[17]. ئەم لێکدانەوەیەی سەرەوە دەمانگەیەنێتە ئەو ڕاستییە، کە دەکرێت پێوەندی شیعرییەتی گێڕانەوە لەگەڵ شیعرییەت لە هەڵبەستدا و گێڕانەوە لە پەخشاندا لە لایەکەوە، پێوەندییەکەی لەگەڵ شیعرییەت لە پەخشاندا و گێڕانەوە لە شیعردا لە لایەکی دیکەوە لەم هێڵکارییەی خوارەوە ڕوون بکرێتەوە:




ئەم پێوەندییەی سەرەوە لە چەندین قۆناغدا تێپەڕیوە تا گەیشتۆتە ئەوە کە لە چەمکی (شیعرییەتی گێڕانەوە) لە ڕەخنەی ئەدەبیی نوێدا چەسپیوە و وەکو ڕەوتێکی کاریگەر پەرەی سەندووە و ڕەخنەگرانیش بایەخی پێ بدەن، ئەم بایەخ پێدانەیش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە هەندێك لە پێڕەوکارانی ئەو ڕێبازە لەو باوەڕەدان کە ((هیچ دەقێکی ئەدەبی بەبێ گێڕانەوە نابێت))[18]. ئەم لێکدانەوەیەش دەمانگەیەنێتە ئەو بۆچوونە کە((ئێستە چەمکی گێڕانەوە ئەوەندە لق و پۆپی لێ دەبێتەوە و لەگەڵ زۆربەی جۆرەکانی دیکەی ئەدەبی تێکەڵ دەبێت بە تایبەتی لەگەڵ چیرۆك و ڕۆمان و شیعر..))[19] هەر لەم ڕووەوە ((چەندین تیۆری تایبەت هەن کە مۆرکی دەقەکانی گێڕانەوە شی دەکەنەوە و لەبەر زۆری ئەو تیۆرانە کە لەڕووی بابەت و ڕێبازەوە لەیەکدی جودان، بۆیە گێڕانەوەیش نەبووەتە زانستێکی سەربەخۆ، بەڵکو لە دوو ڕەوتی سەرەکی هاوچەرخی ڕکابەری یەکدیدا ماوەتەوە، ئەوانیش شیعرییەتی گێڕانەوەیی و سیمیایی گێڕانەوەیییە))[20]، کەواتە دوو بۆچوون لەبارەی گێڕانەوەوە هەن و هەردووکیان وەکو دوو لایەنی هاوتەریب لە لێکۆڵینەوەکانی ڕەخنەی نوێی ئەدەبیدا پشتیان پێ دەبەسترێت، لەهەردوو حاڵەتیشدا شیعرییەتی گێڕانەوە گرنگیی خۆی هەیە، چونکە:

ـ ئەوانەی گێڕانەوە بە زانست دەزانن لەو باوەڕەدان کە ((زانستی گێڕانەوە"ناراتۆلۆجی" لەگەڵ زانستی هێماکان"سیمیۆلۆجی" تێکەڵ دەبێت))[21]، لە تێکەڵبوونی هەردوو زانستیشدا پێوەندی لەنێوان پێکهاتەکانیاندا

توندو تۆڵتر دەبێت، بۆیە لە شیکردنەوە، یان لێکدانەوەی پێوەندییەکانیشدا ڕۆڵی شیعرییەتی گێڕانەوە زیاتر دەبێت، بەپێچەوانەیشەوە ئەگەر ئەم ڕۆڵە فەرامۆش بکرێت، ئەوە بۆشاییەك، یان کەموکورییەك لە بۆچوونە ڕەخنەییەکاندا دروست دەبێت.

ـ ئەوانەی گێڕانەوە بە ڕەوتێکی سەرەکی لە ڕەخنەی نوێی ئەدەبیشدا دادەنێن، ئەوە بوارێکی فرەوانتر بۆ شیعرییەتی گێڕانەوە دەڕەخسێنن، کە وەکو هونەرێکی ئەدەبی لێی بکۆڵرێتەوە و لە تەکسۆنۆمی[٢٢] ئەدەبیشدا پێگەیەکی بەرچاوی دەبێت. لە هەردوو حاڵەتیشدا شیعرییەتی گێڕانەوە توانیویەتی ئەو گومانەی بڕەوێنتەوە، کە هەندێك لەو باوەڕەدا بوون کە ((هەر گوتارێك شێوازێکی شیعری سافی تێدا نەبێت "بە مانا تەسکەکەیەوە" لە هەموو گرنگییەکی ئەدەبی دەردەهاوێژرێت))[٢٣] کە ڕۆمان و چیرۆك لەو گوتارانە بوون. بەپێچەوانەیشەوە ((ئەرکی شیعرییەت بە مانا فرەوانییەکەیەوە کە " زانستی شیعر ـ ڕەخنەی شیعر" دەگرێتەوە))[٢٤] لە یاساکانی گوتاری ئەدەبی بە هەموو ژانرەکانییەوە دەکۆڵرێتەوە.

**تەوەرەی دووەم: سیماکانی شیعرییەتی گێڕانەوە**

ئەگەر کێش و سەروا دوو توخمی سەرەکی شیعر بن، شیعریش دەربڕینێکی ڕاستەوخۆی سۆز بێت، ئەوە ((گونجاوترین ڕێگەی ئەدەبی بۆ دەربڕینی سۆزەکان، کە لە وێنە و ڕێچکەکانیدا جیاواز بێت ڕیتمە))[٢٥]. ڕیتمیش کرۆکی سەروایە و لەگەڵ کێشیش هاوتەریبە، بە یەکگرتنەوەی هەرسێکیان زمانی دەقەکە لە زمانێکی ئۆتۆماتیکی باوی ناو خەڵکدا بەرەو زمانی شیعر دەبەن. ئەم گواستنەوەوەیەش لە چوارچێوەی (شیعرییەت)دا لێك دەدرێتەوە. لەم سۆنگەیەوە بە پێویست دەزانین، کە هەر یەك لەم سێ توخمانە (بە کورتیش بێت) لەسەر شیعری (کەڵەشێر) کە هەڵبژاردەی بابەتەکەمانە پراکتیزە بکرێن:

**١- کێش**

شاعیر هەڵبەستەکەی لەسەر کێشی پەنجەیی خۆماڵی هۆنیوەتەوە، دێڕە شیعرەکانیشی بەسەر یەکەوە (١٠) دێڕە شیعرن کە چواریان (٤) برگەیین و شەشیان (٨) برگەیین. دواتر بە یەکسانی ڕیزبەند کراون کە نیوەی یەکەمی هەڵبەستەکە دوو دێڕە شیعری (٤) برگەیی و سێ دێڕە شیعری (٨) برگەیین. لەنیوەی دووەمی هەڵبەستەکەیشدا بەهەمان شێوە دوو دێڕە شیعری (٤) برگەیی و سێ دێڕە شیعری (٨) برگەیین. ئەم جۆرە هۆنینەوەیش چێژەکی دوو لایەنی بە مۆسیقای دەرەوەی دەقەکەی بەخشیوە، یەکەمیان لەڕووی ڕیزبەندکردنی دێڕە شیعرەکان و دووەمیانیش لەڕووی ڕیزبەندکردنی دەستەپێیەکانی هەر دێڕە شیعرێکەوە.

**٢- سەروا**

سەروا یان قافیە تەنیا بە شیعری کۆنەوە پەیوەست نییە کە لە ((دوایی هەموو بەیتەکانی بە درێژیی کشانی قەسیدە، یان غەزەل لەسەر یەك قافیە دەڕوا، بەڵام یەك قافیە لە هەڵبەستی تازەدا دێڕەکان - زۆرتر - دوو دوو دەبەستێ پێکەوە، لای ئەوپەڕی لە قافیە بەندی دێڕەکانی یەك بەند زیاتر تێناپەڕێ))[٢٦]. کەواتە سەروا لە شیعری ئازادیشدا ڕۆڵێکی گرنگی هەیە و ((دیاردەیەکی ڕیتمداری یەکجار ئاڵۆزە و ئەرکێکی تایبەتی گۆرانی ئاسای هەیە، کە "وەکو

دووبارەکردنەوەیەکــە" بــۆ دەنگــەکان))[٢٧]. ئەرکەکەیشــی لــە هەڵبەســتی (کەڵەشێر)دا ئەوەیە کە دەقەکە دەکاتە دوو کەرت. کەرتی یەکەم بە سەروای (نیٚ) ی کادانیٚ بەکۆتا دێت:

**کازیوە بوو**

**بە تەنها هەر**

**کەڵەشێریٚ چاوی لیٚ بوو**

**کچەی عاشقی ناو گوندیان**

**لە بنەبانی کادانیٚ**

کەرتی دووەمیش بە سەروای (نیٚ) ی نەخوێنیٚ بەکۆتا هاتووە:

**گەڕایەوە بۆ کولانە و**

**مانی گرت و بڕیاری دا**

**بەیانیان ئیتر نەخوێنیٚ!**

لــەنێوان هــەردوو کەرتیشــدا کردەوەیــەك هەیــە کــە وەکــو پرســیارێکی سەرسوورهێنەر خراوەتە ڕوو و ئامرازی هۆیێتی لەگەڵ ڕاناوی کەسی سێیەمیشی دراوەتە پاڵ:

**چۆن سەربڕی!**

**بۆیە ئەویش**

لە هەمان کاتیشدا ئـەم دوو دێـڕە کراونەتـە خـاڵی لێکجیاکـەرەوەی نێـوان (هۆ) کە کەرتی یەکەمە و لەنێوان ئەنجامدا کە کەرتی دووەمـە. ئەمـەیش ئـەوە دەگەیەنێت کە سەرواکە ((ئەرکە ڕاستەقینەکەی تەنیا لەو کاتەدا بەدیار دەکەوێت کە پێوەندی بە ماناکەیەوە هـەبێت))[٢٨]. هەرچـەندە سـەرواکانی ئـەم هەڵبەسـتە بەم شێوەیە ڕێکدەخرێت: ( أ، ب، أ، ج، د، هـ، و، ز، ح، د)، بـەڵام تـەنیا لـەم دوو دێڕە شیعرەدا سەرواکان دووبارە بوونەتەوە:

ــ سـەروای (أ، أ) وەکـو کلیلێـك بـۆ دەسـپێکردنی گێڕانــەوە و چـوونەناو بابەتەکەدا بەکارهاتووە و بەشێوەی ( بوو، بوو) خۆی نوانـدووە، کـە سـەروایەکی سادەیە و سەرەتای گێڕانەوە دەستنیشان دەکات و لە فـۆرمی (هـەبوو، نـەبووی)

گێڕانــەوەی حیکایــەت جودایــە، بــەڵام لــە ناوەرۆکـدا هــەردووکیان هــەمان مانــا دەگەیەنن.

ـ لە سەرەتای خستنەڕووی بابەتەکە و تا دوا دێڕی هەڵبەستەکەیش، پـەیتا پەیتا بازنەی سەرواکان فرەوانتر دەبێت و ئەوەی بەکارهاتووە سـەروایەکی کـەرت ئــامێزە کــە ڕامــانێکی بــەهێزی بــە هەڵبەســتەکە بەخشــیوە و کەرتەکانیشــی سەروایەکی ئاوێتەییيان دروست کردووە.

### ٣- ڕیتم

ڕیـتم مۆسـیقای نـاوەوەی هەڵبەسـتە، دەکرێـت بـە چـەند شـێوەیەك لێـی بکۆڵرێتەوە، کـە وەکـو پێکهاتەیـەکی ڕەوانبێـژی یـان وەکـو پێکهاتەیـەکی دەلالی یــانیش وەکــو تۆپۆگرافیــای هەڵبەســتەکە ســەیر بکرێــت. بــەڵام ئــەوەی لــەم لێکۆڵینەوەدا جەختی لەسەر دەکرێت لایەنی دەلالییەتی شیعرەکەیە، کە جووڵەی پێکهاتەکان و چۆنیەتی ڕێکخستنی پێوەندی ڕامانەکانیان دەگرێتـەوە، بەتایبـەتی کە لەم دەقەدا جووڵەی دەربڕینـەکانی زمـان بـە سـەلیقەیەکی خەمگینـەوە لـەنێو فلتەری شیعرییەتدا تێدەپەڕن و جومگە هەستیارەکانی ڕووداوێك دەگێڕنـەوە کـە ڕاستەوخۆ سۆزی وەرگـر دەورووژێـنن. یەکـەم پێکاندنیشـی لـە ناونیشـانەکەیەوە (کەڵەشـێر) دەسـت پـێ دەکـات، کـە وەکـو کلیلێکـی ڕیتمـدار لـە دوو گۆشـەی هاوتەرییەوە، دەرگەی گێڕانەوەیەکی چاوەڕوانکراو دەکاتـەوە. یەکـەمیان: بـەرەو سەربوردەیەکی پیاوسـالارانە دەڕوات و دووەمیـانیش خـۆی بـۆ ئاگادارکردنـەوەی خەڵکەکــە ئامــادە دەکــات و مــژدەی ڕۆژێکــی نوێیــان پــێ دەبەخشــێت. لــەم دۆئالیزمەدا شعرییەتێکی هەست بزوێنەر دروست دەبێـت و خوێنــەر بـۆ نـاوەرۆکی هەڵبەستەکە ڕادەکێشێت. هەڵبەستەکەیش بە دەستەواژەی (کازیوە بـوو) دەسـت پێ دەکات، کە خۆی ڕیتمێکی هێمنە و یەکسەر چاوڕوونییەکی هۆشیارکەرەوە بـە وەرگر دەدات و پەنجەرەیەکیشی بۆ دەکاتەوە کـە بـە ئاسـانی سـنوورەکانی ئـەو هێمنییە لەنێوان بێدەنگیی شەو و گاڵەگاڵی ڕۆژدا بەدی بکات.

سـنوورەکان هێڵێکـی جیاکـەرەوەن و پانتایـەکی چـۆڵکراویان داپۆشـیوە و ژینگەیەکی گونجاو بۆ ڕیتمی (بە تەنها هەر) فەراهەم کردووە. بەشە ڕیتمی (هــەر)

بارگەیەکی بەهێز بە شوێنکاتەکەی تەنیایی داوە و لەنێوان دوو لایەنی هاودژدا دوورپێچ کراوە. لەم پانتاییە قۆرغکراوەدا ڕیتمی (کەڵەشێرێ) وەکو کارێکتەرێکی نەناسراو ئەو بۆشاییە پڕ دەکاتەوە و نیگای بینینی ئامانجێك دەستنیشان دەکات. نیگایەکەیش ساتێکی هەستیار دەستەبەر دەکات و لە بیردانکی زەنگێکی بێ لایەنی لەنێوان هەردوو ڕەنگی ڕەش و سپیدا جێ دەگرێت و بەتەواوەتی ڕووبەری زەمەنێکی مەبەستداری لەنێوان شەو و ڕۆژدا دادەپۆشێت و سنووربەندەکانی هەردوو لایەن نابەزێنێت، بەڵکو لە دوورەوە سەیری بەگژداچوونێك دەکات. ئەم بەدواداچوونی کەڵەشێر یەکەم ڕیتمی کرداری لە دۆخی ڕابردوو ڕێکدەخات، کە گوزارشت لە گێڕانەوەی ڕووداوێك دەکات. ئەم گێڕانەوەیە بەرەو گرژی و ململانێ ناڕوات، بەڵکو چەندین گریمانەی جیاجیا دەخاتە بەر دیدی خوێنەران بۆ ئەوەی بەردەوام تامەزرۆی سەروبەندی وردەکارییەکانیان بێت. شاعیریش هەموو وردەکارییەکان لە ڕیتمێکی مەترسیداردا کۆ دەکاتەوە و بڕگەکانیشی لە سێ دێڕدا چڕ دەکاتەوە:

**کچەی عاشقی ناو گوندیان**

**لە بنەبانی کادانێ**

**چۆن سەربڕی!**

ئەم پرسیارە سەرسووڕهێنەرە، چەندین پرسیاری دیکە لای خوێنەر دروست دەکات، بەڵام شاعیر لەمیانی گێڕانەوەی ڕووداوەکەدا کلیلی وەڵامەکان لەم دێڕەدا کۆ دەکاتەوە:

**بۆیە ئەویش**

وشەی (بۆیە) دوالیزمێکی لێکجیاکەرەوەیە لەنێوان (هۆ) و ئەنجامدا و ڕاناوی کەسی سێیەمیش کە ((لەگەڵ ڕابردووی سادەدا بەکارهاتووە جۆش و خرۆشێکی دیکەی بە ئەرکی گێڕانەوەی بەخشیوە))[٢٩]. هەر لەم زنجیربەندە سەلیقەدارەدا ڕیتمی (بۆیە ئەویش) هۆکارەکانی ڕووداوەکە بەرەو ئەنجامێکی ڕوونکەرەوە دەبات و دەیکاتە ئەڵقەی بەستنەوە لەنێوان کاری ئەنجامدراو کاردانەوەی بڕیاربۆدراو و لە هاوکێشەیەکی ڕیتمداردا هاوسەنگ دەکات:

گەڕایەوە بۆ کولانە و
مانی گرت و بڕیاری دا
بەیانیان ئیتر نەخوێنیٚ!

لەم چەند دێڕەدا، شاعیر کاردانەوەکانی کارەکتەری سەرەکی کە کەڵەشێرە لە بڕیارێکدا چڕ دەکاتەوە، کە تێیدا زمانی شیعری هەر لە ناونیشانی شیعرەکەیەوە هەتا وەرگرتنی دوا هەڵوێست بەرەو فەزایەکی یاخیبوویی دەبات و هەموو سۆز و میهرەبانییەکانی جاران لەگەڵ ئەو گوندەدا دەپچڕێنێت و بەرەو دیوی پێچەوانەی ئەو واقیعە دەڕوات و خوێنەر بە ئاسانی دەزانێت کە کەڵەشێر حەزی لە جیهانێکی بیٚ تۆقاندن و سەربڕینە.

## بەشی دووەم

## تەکنیك و بەها ستاتیکییەکانی شیعرییەتی گێڕانەوە

دەقی (کەڵەشێر) وێنەیەکی ئاوێتـەیی چـڕۆك ئـامێزە، کـە کەسـی سـێیەم پانتـایی گێڕانـەوەی داگـیر کـردووە و بەدووبارەبوونـەوەی کـارە هەڵچـوونە هزرییەکانییەوە بەتەواوەتی سیمایەکی لیریکی بە دەقەکە بەخشیوە و پانتایـەکی لـەباری بـۆ بـەکارهێنانی تەکنیکـەکانی شـیعرییەتی گێڕانـەوە فەراهـەم کـردووە. ئەمەیش ڕێگەمان پیێ دەدات کە بتوانین لە هەر گۆشەیەکەوە بچینە نێـو جیهـانی دەقەکەوە و هەر یەکێك لە تەکنیك و بەها سـتاتیکییەکان لـە تـەوەرێکی تایبەتـدا شی بکرێنەوە:

### تەوەری یەکەم: بنەما تەکنیکییەکانی شیعرییەتی گێڕانەوە

دەستنیشانکردنی ئاستەکانی هەر تەکنیکێکی شـیعری لـە لادانـەوە دەسـت پیێ دەکات. لە ئەنجامی لادانیشدا کەلێنێك دروست دەبێت و کـەلێن لـەم شـیعرەدا وەکو بنەمایەکی ناوەندی لە گێڕانەوەی ڕووداوەکەدا جێگەی گرتـووە، لـە ڕۆنـانی گێڕانەوەکەیشیدا کورتبڕییەکی ڕامـان تـەواو بـەکارهاتووە، بۆیـە بنیـاتی دەقەکـە لەسەر تەکنیکێکی دوالیزمـی نـراوە. لـەڕووی کـورتبڕی لـە گێڕانـەوەدا، پشـت بـە تـەکنیکی ئـابووری ئـەدەبی بەسـتووە. لـەڕووی لادانـی شیعریشـەوە، پشـت بـە تەکنیکی ئاستەکانی لادانەوە بەستراوە. بەپێی یەکگرتنـەوەی پێکهاتەکانیشـیاندا تەکنیکی شیعرییەتی گێڕانەوە دروست بووە. لێرەدا بە پێویست دەزانرێت هەردوو بنەمای تەکنیکی شیعرییەتی گێڕانەوە شی بکرێنەوە:

**یەکەم: ئابووریی ئەدەبی**

پرەنسیپی ئابووری لە ئەدەبدا بە گشتی و بە تایبەتی لە گێڕانـەوەدا پشـت بە قانوونی ئـابووری گشـتی دەبەسـتێت کـە لـە جێبـەجێکردنی هـەر مەبەسـتێکدا جەخت لەسەر کەمترین تێچوو و بە باشـترین ئـەنجام دەکـات[٣٠]، بەهـەمان شـێوە ئابووریی ئەدەبیش جـەخت لەسـەر (( بـەکارهێنانی کـەمترین وشـە لـە دەربڕینـی بیرکردنەوە ویستراوەکاندا دەکات))[٣١]، بەڵام ئەوەی قانوونی ئابووریی ئەدەبی لە

قانوونە ئابوورییەکانی دیکە جودا دەکاتەوە ئەوەیە کە ((وەرگری ئـەدەبی نرخـی ئەو شتانە دەداتـەوە کـە هاوسـەنگی دەروونـی و هەماهـەنگی لەگـەڵ ژینگـەدا بـۆ دروسـت دەکـات و ئەمـەش قـانوونی بنـەڕەتی ئـابووری ئەدەبییـە))[٣٢]، بۆیـە ئەدیبیش ئابووری گێڕانەوە لەسەر سێ کۆڵەگە بنیات دەنێت:

- بەپێویسـت نازانێـت ئـەو ڕووداوە هاوبەشـانەی کـە لـە نێـوان خـۆی و خوێنەردا هەن دووبارە وەسفیان بکاتەوە.

- وزەی خوێنــەر لــە خەیاڵکردنــدا بــەکار دەهێنێــت، بۆیــە تــەنیا هێڵــە گشتییەکانی بۆ دەکێشێت.

- سوود لە توانای زمـان وەردەگرێـت و ئامـاژە و وێنەگـەرایی بـەکاردێنێت، بۆیە بیرکردنەوەکانیشی بە وێنـە دەردەبڕێـت. لـەجیاتی بەڕاشـکاوی قسـەکردن و درێژدادڕی نیشانە و هێماکان بەکاردێنێت[٣٣]. ئەمەش لەگەڵ ئـەو بۆچـوونە هـاوڕا دەبێــت کــە لــە شــیعردا ((وێنــەی خــوازەیی هــاودژ بــە ئــامرازێکی ئــابووری دادەنرێت))[٣٤]. کەواتە شاعیر لە تەکنیکی ئابووری ئەدەبیـدا لەسـەر دوو حاڵـەتی پێویست و هاودژ کاردەکات، ئـەوانیش کـە خوێنـەر پێویسـتی بـە وێنەگەرایییـە و دەقیش پێویستی بە کورتبڕییە.

لـە هەڵبەسـتی (کەڵەشـێر) یشـدا، شـاعیر چـەندین ڕووداوی درێـژ و ئـاڵۆزی وەکو چـۆنیەتی دروسـتبوونی پێوەنـدی کچـە عاشـقە لەگـەڵ تـەرەفی بەرانبـەر و بڵاوبوونــەوەی خەبەرەکــە لــەنێو خەڵکــدا و دانــانی پلانــی لــەناوبردنی کچــەکە و ناسنامەی پیلانگێڕەکان و جلوبـەرگیان و سـیمای دەموچـاویان و جـۆری ئـامێری سەربڕینەکە و پلەی خزمایەتییان لەگەڵ کچـەکە و پلـەو پایـەیان لـەنێو گونـددا و چەندین لایەنی دیکە کە پێویستی بە وەسـفکردن بـوون. شـاعیر هـەموویان لـەنێو وێنەیەکی ئاوێتەیی شیعریدا کورت کردووەتـەوە، ئـەم وێنـە شـیعرییەیش بووەتـە کرۆکی ئەو هەموو وردەکارییانە کە خوێنەر لە جیهانی بێ ئاگایی خۆیـدا دەزانێـت و خاڵی هاوبەشن لەنێوان ئەو و شاعیردا و پێویستییان بە گێڕانەوە نییە. ئەمـەش ئەوە دەگەیەنێت کـە شـوێنی دروسـتی شـیعر بـێ ئاگاییـە و ((سەروسـیمای بـێ ئاگـاییش ئەوەیـە کـە هـەموو شـتەکان لـەمیانی کردەوەیەکـدا بخرێتـە ڕوو نـەك

بەڕێگەی وەسفکردنەوە))[٣٥]. بەم شێوەیە ئابووریی ئەدەبی بووەتە سیمایەکی سەرەکی شیعرییەتی گێڕانەوە، بەپێچەوانەیشەوە تەنیا وەکو گێڕانەوە دەمێنێتەوە.

**دووەم ـ ئاستەکانی لادان**

لادان کەلێنی دروست کردووە و دەکرێت پێوەندییەکانی هەردوو لایەنی کەلێن لەم هەڵبەستەدا لە سێ ئاستی جودا لێکبدرێنەوە:

١– پێوەندی کەلێنی دەقەکە بەو سەربوردەیەوە کە دەگێڕرێتەوە و لە تەوەرەی بابەتێکدا بەرجەستە کراوە کە باسی کێشەیەکی کۆمەڵایەتی دەکات، ((کێشەیش لە شیعردا ئەو هەڵوێستانەی لە ئاراستەکردنیدا دەورووژێنێت گەلێك فراوانتر و گشتگیرترن لەو ئاماژانەی کە لە خۆ دەگرێت))[٣٦]، بۆیە کەلێن لە شیعرییەتی گێڕانەوەدا بۆ دوو لایەن دابەش دەکرێت: یەکەمیان، کەلێنی دەرەوەیە کە بە دیدی شاعیرەوە گێڕراوەتەوە و باس لە چەند کەسێك دەکات کە کچێکی عاشقیان لە شوێنێکی نادیاردا دەکوژن. دووەمیانیش، کەلێنی ناوەوەیە کە بە دیدی کەسایەتییەکەی نێو دەقەکەدا (کەڵەشێر) دەردەبڕێت کە مان دەگرێت و بڕیار دەدات ئیتر بەیانیان نەخوێنێت.

٢ ـ پێوەندی کەلێنی دەقەکە بە سێکوچکەی زەمەن و شوێن و ڕووداوەوە، بەم شێوەی خوارەوە:

**ئا- پێوەندی کەلێن بە زەمەنەوە**

زەمەن شەوە و لە دوا ساتەکانی ماڵئاواییدایە. هێشتا خۆر هەڵنەهاتووە کە ژیانی گوندەکە بجووڵێنێت. خەڵکەکەیش بەپێی کاتێکی دەستنیشانکراو لەخەو هەڵناستن. وا دیارە کاتەکانی ئیشوکاریان ئۆرگانیزە نەکراوە. بەپێی بانگی کەڵەشێرەکە کارنامەی ژیانی ڕۆژانەیان دەست پێدەکات... لێرەدا زەمەن هێشتا لەگەڵ وردەکارییەکانی کاتژمێر و ساڵنامە ئەلەکترۆنییەکاندا ئاشنا نەبووە، کەواتە زەمەن لە ڕابردوودا گیری خواردووە، بۆیە شاعیریش ڕووداوەکە هەروەك چیرۆکێك

دەگێڕێتــەوە، بەشــێوەیەك كــە ((زەمــەنی گێڕانــەوە لەگــەڵ بنیــاتی گێڕانــەوە بگونجێـت، ئـەویش زەمـەنی خوێندنەوەیـە))[٣٧] و زەمـەنی خوێندنـەوەیش ((لـە ساتێكی هەنووكەییدا جێگیر دەبێت، یان بە زەمەنی خوێنـەرەوە دەبەسـترێت كـە دەتوانین بڵـێین سـەر بـە زەمـەنێكی كراوەیـە و لـە سـنوورێكی دەستنیشـانكراودا ڕاناوەستێت))[٣٨] كەواتە بنیاتی گێڕانەوەیش ئەو گرێییە كە لـەمیانی بۆچـوونێك یـانیش لـە كـەلێنی گێڕانەوەییێكـدا دەخرێتــە ڕوو. كـەلێنی گێڕانـەوەیش لـە دوو لایەنەوە پێوەندی بە زەمەنەوە هەبێت: یەكەمیان، زەمەنی قۆرخكراوی نـاوەوەی ڕووداوەكەیە، كە خودی كەسایەتییەكەی نێو دەقەكەدا (كەڵەشێر) لێی بـە ئاگایـە و لە كاتێكی دەستنیشانكراوی ڕۆژانـەدا، (كـە بەیانییـەكی زووە) ئەركەكـەی تێـدا جێبــەجێ دەكـات. دووەمیــانیش، زەمــەنی دەرەوەی ڕووداوەكەیــە، كــە لایــەنی بابەتییە و ڕۆژانە مژدەی دەستپێكردنی ژیانێكی نوێ بە خەڵكەكە دەدات.

هەردوو زەمەن بەشـێوەیەكی وا چـڕ كراونەتـەوە، كـە لـە سـاتێكی خێـرادا وێنەی ڕووداوێك دەگرن و دیمەنەكەیشی لە یادگەی هەڵبەستێكدا تۆمـار دەكرێـت. بەم شێوەیە زەمەن پێـوەری خـۆی لەدەسـت داوە، چـونكە سـەرەتای مـانگرتنی كەڵەشێرەكە دیارە و بەردەوامبوونیشی بێ كۆتایی ماوەتەوە.

**ب ـ پێوەندی كەلێن بە شوێنەوە.**

شوێن گوندێكە و گوندیش نیشانەی قۆناغێكی پـەرەسەندنی كۆمەڵگەیـە كـە هێشتا لەنێوان كۆچەراتی و شارسـتانییەتدایە و خەڵكەكەیشـی بـەپێی دابونەریتـە سەرەتاییەكانیان ژیان بەڕێوە دەبـەن و بـە هـیچ یاسـایەكی ڕێكـوپێكی نووسـراو پابەند نین، بەڵكو هێز هەڵسووڕێنەری هەموو شتێكە و ئەویش لە دەست پیاودایە، تەنانەت لە ناو پیاوانیشدا، ئەوانـەی پـتر هێزیـان هەیـە هەمیشـە لـە پێشـەوەتر و دەستڕۆیشتووترن، ئەوانی دیكە بەپێی فەرمانی ئەوان كار دەكەن.. گرووپێـك لـەو زلهێزانــە كــونجێكی تاریكیــان هەڵبــژاردووە كــە كادانــە و كــادانیش شــوێنی عەمباركردنی دوا پاشەڕۆكەكانی ساقی دەغڵ و دانی مردووە و بەهەمان شێوەیش ئەم شوێنەی مردن ئامێز بووەتە شوێنی مراندنی مرۆڤێكیش.

شـوێنی دووەم، کـە لـە نێـو هەڵبەسـتەکەدا دەستنیشـان کـراوە کولانـەی مریشکانە، ئەویش ڕەمزی ژیانە و شوێنی حەوانەوەی گیانەوەرێکی بێ زیانە. ئەم دوو شوێنەیش لەبارەی ئەرکەوە سەرچاوەی ئـابوورین و لـە ڕووی ستاتیکیشـەوە پێگەیەکی گرنگیان لە مۆرفیمی گونددا هەیە.

لەم ڕووەوە دەکرێت پێوەندیی کەلێنیش بە شوێنەوە لە دوو لایەنـەوە لێـك بدرێتـەوە، یەکـەمیان ئـەو شـوێنەی لـە دیـدی کەسـایەتییەکەی کەڵەشـێرەوە دەبینرێت کە لە سنوورێکی تەسکدایە و تەنیا کولانـە و کادانێـك و ئـەو مەسـافەی لەنێوانیاندا هەیە. دووەمیانیش ئەو شـوێنە فرەوانەیـە کـە خوێنـەرانی ڕووداوەکـە دەیبینن کـە لـە چـەندین گونـد پێکهـاتووە و پێوەندییـەکانیان لـە بازنـەی ژیـانی خێڵەکیدا کۆدەبێتەوە.

**پ ـ پێوەندیی کەلێن بە ڕووداوەوە**

ڕووداو ڕەگەزێکی سەرەکیی چیرۆکە، بـەڵام لەڕێگـەی شـیعرییەتەوە دێتـە نێـو هەڵبەسـتەوە، ئـەوەی ((شـیعرییەتی هەڵبەسـت لـە شـیعرییەتی چـیرۆك جیادەکاتـەوە، ئـەو پێوەندییەیـە کـە لـەنێوان دەربـڕین بـە وێنـە و دەربـڕین بـە ڕووداودا هەیە))[٣٩] ڕووداویش ئەو کردەوەیەیە کە لەنێوان شوێن و زەمەندا گەشـە دەکات، گەشەکردنەکەیشی لەڕێگـەی لادانـی زمانـەوە دەبێـت. کـەلێنی دوالیزمـی زمانیش لـە شـیعرییەتی گێڕانـەوەدا بـەهۆی وێنەگەراییـەوە پـڕ دەکرێتـەوە، کـە دەبێت پشت بە لۆژیکێکەوە ببەسـتێت. هـەبوونی ئـەو لۆژیکـەی پاڵپشـتیش، لای هەندێك ڕەخنەگرانی کـورد ئەوەنـدە گرنگـە کـە ئەگـەر ((ئامـادەیی نـەبوو شـتێك نامێنێـت بـە نـاوی دەق و دەبێتـە وڕێنـە))[٤٠]. کەواتـە کاریگـەریی لـۆژیکیش لـە شیعرییەتی گێڕانەوەدا تەنیا لە سێبەری دەقدا هەست پێ دەکرێت، هـەروەکو لـە هەڵبەستی کەڵەشێردا هەردوو ئاستی دیار و سێبەر دەبینرێن. لە ئاسـتی یەکەمـدا کچـێکی گونـدی لـە شـوێنێکی نادیـاردا سـەردەبڕێت، کەڵەشـێرێك ڕووداوەکـە دەبینێت. تووڕە دەبێت و بڕیار دەدات مان بگرێت. ئەمەیش لە ئاوێتـەبوونی سـێ کـردەوەی جـودا هاتووەتـە کایـەوە و بـەپێی زنجیرەبەنـدی کاریگـەرییان لەیەکـدی

ڕیزبەنـد کـراون، کـە ئەڵقـەکانی لـە (عەشـقێکی سـاف، کوشـتنێکی بێبـەزەیی، مانگرتنێکی یاخیبوویی) پێکهاتوون. شاعیر هۆکاری دروستبوونی هەرسـێکیان لـە دوو ئەنجامی ڕەفتار جودا و مەبەست هاوبەشدا کۆدەکاتەوە، کە ئەوانیش خۆیـان لە بێـدەنگیی کەڵەشـێر و چەقبەسـتنی جووڵـەی مرۆڤـدا دەبیننـەوە. لـە ئاسـتی دووەمیشدا، بەپێی خوێندنەوەی جیاواز جیاوازی لە مانا و بۆچوونەکاندا هەیە.

٣ـ پێوەندیی کەلێنی دەقەکە بە ڕەهەندی ئایدیۆلۆژییەوە، کە دەربـڕین لـە دیدی شاعیر دەکـات، بـەڵام وەکـو تـەکنیکێك لـە بنیـاتی شـیعرییەتی گێڕانـەوەدا بەرجەستە نابێت، بـەڵکو هەسـت بـە کاریگەرییەکـەی لەسـەر لایەنـە نادیارەکـانی دەقدا دەکرێت، بەو پێیەی کە ((هەر دەقێك سێبەری خۆی هەیە و ئەو سێبەرەش لە کەمێك ئایـدیۆلۆژیا و کـەمێك لەخسـتنەڕووەکان و کـەمێك لـە خـود پێـك دێـت، ئەمانــەش تارمــایی و هەڵاوســان و شــوێنماوەکانن...))[٤١] کەواتــە ئایــدیۆلۆژیا تەکنیکێکــە لــە ســێبەری هەڵبەســتدا بــەکار دێــت و جــەخت لەســەر بــەها پەســەندکراوەکانی کۆمەڵگــە وەکــو خۆشەویســتی و لایــەنگری چەوســاوەکان و ڕێزگرتنی کات....و چەندین بەهای دیکە دەکات، کە بەزەقی هاتوونەتە پێشەوە و بوونەتە هۆی ئەوەی کە نـاوەڕۆکی دەقەکـە بەسـەر زمـانی شـیعریەتییەکەیدا زاڵ بــووە، بــە تایبــەتی کــە گردبوونەوەیــەکی هــزری بــۆ ڕووبەڕووبوونەوەیــەکی چاوەڕوانکراوی پێوە دیارە، چـونکە هـەوڵ نـادات لـە ڕێگـەی ئـازاردانی مرۆڤـەوە هەسـتی بەرانبـەر بورووژێنێـت، بـەڵکو بـە ڕێگـەی وەرگرتنـی هەڵوێسـتەوە هـزر دەورووژێنێـت و ((شـیعریش نـەك لایـەنی کـرداری شـاعیر، بـەڵکو لایـەنی هزرییـە ئایدیالیسـتەکەی دەگرێتـەوە و لـەنێو ئـەو لایەنەشـدا هەسـتە بـەرزەکان و سـۆزە ناسـکەکان نەشـونما دەکـەن))[٤٢]. ئــەم بۆچــوونەیش ئەگــەر لەســەر لایــەنی ئایدیۆلۆژیای هەڵبەستی (کەڵەشێر) هـاوجووت بکرێـت، ئـەوە مـۆرکێکی ڕیـالیزمی کۆمەڵایەتی پێ دەبەخشێت.

**تەوەری دووەم: بەها ستاتیکییەکانی شیعرییەتی گێڕانەوە**

شێوەی ڕێکخستنی بەها ستاتیکییەکانی شیعرییەتی گێڕانەوە لەم دەقـەدا، لە ئاستێکی سادەدا و بە بێ پێچ و پەنا ڕیزبەند کراون. دەقەکە لە چەند هزرێکی ڕوون و ئاشـکرا پێکهـاتووە و خراونەتـە نێـو شـێوازێك و ((بنـەمای سـتاتیکی شێوازەکانیش لە ئەدەبدا وێنە ئەندێشەییەکان و ڕامانە زهنییەکانن کە لە ڕێگەی زمانەوە دەگوێزرێنەوە))[٤٣]. هـەر حاڵـەتێکیش لـە حاڵەتـەکانی زمـان پشـت بـەو پێوەندییانـە دەبەسـتێت کـە لـە نێـوان ڕەگەزەکانیـدا هـەن، ڕەگـەزەکانیش کـە وشەکانن ((ڕیزبەندی پێوەندییەکانیان لە قسەکردندا وەکو هێڵێکی ڕاست پشت بە خەسڵەتی زەمەنی زمان دەبەستێت کە کارێکی ستەمە دوو ڕەگـەز لـە یـەك کاتـدا بگوترێن، بەڵکو ڕەگەزەکان یەك بەدوای یەکدا دێن و زنجیرەی ئاخاوتن پێکـدێنن. ئەم پێکهاتنەیەش پشت بەو درێژکردنەوەیە دەبەستێت کە پێی دەڵێن پێوەندییە سیاقییەکان))[٤٤]. لەم سۆنگەیەوە پێویستە جیاوازی لەنێوان سیاقە گۆکراوەکـان و سیاقە ناگۆکراوەکاندا بکرێت، چونکە ((سیاقە ناگۆکراوەکان ئەو ژینگەیەیـە کـە پەیامەکەی تێدا پەیدا دەبێت و ڕۆنانی بنیاتەکانی وتاری گۆکراو دروسـت دەکـات، سیاقیش لەم گۆشەنیگایەوە لە سـێ ڕەگـەز پێکـدێت کـە پێگـە و بەشـداربووان و ئامانجن))[٤٥]. لەبەر گرنگیی ئەم لایەنە بە پێویسـت زانـرا، هـەر سـێ ڕەگـەزەکان لەڕووی تیۆرییەوە دەستنیشـان بکـرێن و شـوێن و کاریگەرییـەکانیان لـەنێو ئـەم هەڵبەستەدا لێك بدرێنەوە:

١- پێگە: بە ڕەهەندی چوارەمیش ناوزەد دەکرێت. "سایت Site"[س٤٦] یشـی پێ دەگوترێت. هەرسێکیان گوزارشـت لـە یـەك شـت دەکـەن کـە ((زەمشـوێنێکی چوارچێوەکراوە و دەبێت گوتارێکی تێـدا بەرهـەم بهێنرێـت کـە لەگـەڵ شـوێنێکی دیاریکراو و ساتە زەمەنێکدا یەکدی بگرنەوە))[٤٧]. ئەمەش ئـەوە دەگەیـەنێت کـە لە پێگەی شیعریدا دەبێت هەڵوێستێکی نەخوازراو وەربگیرێت یانیش کارێك بکرێت کـە لەوانەیـە ڕووبـدات. بـەهای سـتاتیکی پێگـەیش لـە پێوەنـدیێکی ئۆرگانیکـدا لەنێوان کردەوەکاندا پێك دێت، بەو پێیـەی کـە لـە بیـاوێکی فرەوانـدا ڕوودەدەن، بیـاویش ((وەکـو شـوێن نییـە کـە سـنوورە دەستنیشـانکراوەکانی هـەبێت و لـە کۆتاییدا بەکۆتا بێت))[٤٨] کەواتە لـە پێگـەدا جێگـۆڕکێ بەشـوێن و سـاتە زەمەنـە

ئاساییەکان دەکرێت، کە لەم هەڵبەستەدا سێ دیمەنی پێکەوەبەستراوی بۆ تەرخان کراوە: دەرچوونی کەڵەشێرەکە بۆ سەر کاری ڕۆژانەی خۆی، سەربڕینی کچێکی عاشق، گەڕانەوەی کەڵەشێر بۆ ناو کولانەکە. هەر یەکێکیان لە چەندین هەنگاو پێکدێت و هەموویانیش نەخشەی یەك ڕێباز دەکێشن کە بە نیازێکی پاك دەست پێ دەکات و بە بڕیارێکی یاخیبوو بە کۆتا دێت..

٢- بەشداربووان: ئەم ڕەگەزە لە جووڵانەوەی بەشداربووان (کارەکتەرەکانی لە نێو دەقدا) پێکدێت، جووڵانەوەش چەند هەنگاوێکی یەك لەدوای یەکدا دروست دەکات، کە لە ناونیشانی هەڵبەستەکەوە دەست پێ دەکات و لە قوفڵەکەیدا بە کۆتا دێت. هەنگاوەکان پێوەندییان بە زەمەنەوە هەیە و هەر یەکێکیان ئەنجامێکیشی دەبێت، کە لەم هەڵبەستەدا بە خۆئامادەکردنێکەوە دەست پێ دەکەن و بەرەو ململانێیەکی توند مل دەنێن، بەڵام هەر زوو گرژییەکە دادەمرکێت و بە دابڕانێك کۆتایی دێت و ناگاتە ئاستی ڕووبەڕووبوونەوەی لایەنە هاودژەکان و ئەگەر بگەیشتایەتە ئاستی ڕووبەڕووبوونەوە ئەوە لە سنووری گێڕانەوە دەردەچوو و دەکەوتە نێو توخمی دیالۆگەوە.

٣- ئامانج: دەربڕین لە کارێکی پێشنیازکراو دەردەخات. مەبەستەکەیشی بە دوو شێوە دەردەکەوێت کە ((پێویستە لێرەدا جیاوازی لەنێوان ئامانجی گشتیی تێکەڵکێشکردنی ئاخاوتنەکان و ئامانجێکی پتر ورد و سنوورداری هەڵوێستی کردەوە ئاخاوتنەکانی جودا جودا بکرێت کە لەمیانی دیدارەکەدا هەیە، ئامانجە سەرەکییەکانی پرۆسەکەیشی گەیاندنی مەبەستەکەیەتی))[٤٩] کە گوزارشت لە مۆرکی ململانێیەکە دەکات و لەهەمان کاتیشدا زمانی شیعرەکەیە. لەم هەڵبەستەدا بە بەرزترین دەنگ دەست پێ دەکات، بەڵام لەنێو مەنەلۆگێکی گومان ئامێزدا کز دەبێتەوە.

لەمیانی ئەم سێ ڕەگەزەی سەرەوەدا، شاعیر توانیویەتی هەڵچوونە سۆزدارییەکانی لەڕووی شیعرییەتی گێڕانەوەیییەوە چالاك بکات، چالاکیی بەهاکانیش ((ئەو توانایەیە کە بە چەندین ڕێگەی جیاواز و ئاڵۆزەوە ئارەزووەکان و هەستەکان تێر دەکەن))[٥٠] بۆ گەیشتن بەم مەبەستەیش شاعیر پەنای بۆ هەڵچوونە ژیرییەکانی بردووە و ناواخنی دەقەکەیشی بە هزرە ناسك و ڕاستگۆیییەکانییەوە جۆش داوە.

## ئەنجام

١- شاعیر لەم هەڵبەستەدا، شیعرییەتی گێڕانەوەی وەکو ڕێچکەیەکی نوێگەری بەکارهێناوە، بۆ ئەوەی لە دوو لایەنەوە پەرە بە ئەزموونە شیعرییەکەی بدات. یەکەمیان سیمایەکی ڕەسەنایەتی پێ ببەخشێت و دووەمیشیان پێگەی شیعر بە سەردەمەکەیەوە ببەستێتەوە و لە هەستی جەماوەر نزیکی بکاتەوە.

٢- کرۆکی ئەم هەڵبەستە، لەبارەی ڕووداوێکە، کە کۆپیکردنێکی ڕاستەوخۆی واقیع نییە. پرسیارگەلێکی نالۆژیکی دروست دەکات و هەوڵی شیکردنەوەی وەڵامەکانیان نادات. ئەمەیش لە دوو لایەنەوە شیعرییەتی دەقەکەی بەهێز کردووە: یەکەمیان گێڕانەوەی ڕووداوەکە لە شێوازی لیریکی نزیک دەکاتەوە. دووەمیشیان ئەوەیە کە دەقەکەی بە کراوەیی دەهێڵێتەوە.

٣- شیعرییەتی گێڕانەوە شێوازێکی چاوی داهێنانە، کە شاعیر پرەنسیپەکانی ئابووری تێدا پێڕەو دەکات ڕامانەکانی خەستتر دەکات و بە زمانێکی ئاسان و ساکار دەردەبڕێت و لە تەمومژاویش دووری دەخاتەوە، بۆ ئەوەی وەرگر لە هەر ئاستێکی ڕۆشنبیریدا بێت بتوانێت خوێندنەوەی خۆی بۆ دەقەکە هەبێت و بەپێی ڕادەی تێگەیشتنەکەیشی چێژی لێ وەربگرێت.

٤- پێوەرەکانی هەڵسەنگاندنی شیعرییەتی گێڕانەوە لە هەڵبەستدا، بەپێی تەکنیکەکانی فۆرم و بەها جوانەکانی ناوەرۆکەکەی دەستنیشان دەکرێن. تەکنیکەکان بەپێی پێوەندی کەلێنی شیعرەکە بە زەمەن و شوێن و ڕووداوەکە هەڵدەسەنگێنرێن. هەڵسەنگاندنی بەها جوانەکانیش پشت بەم سێ لایەنە دەبەستێت: جۆری ئەو هەڵوێستەی کە لە پێگەیەکدا وەردەگیرێت، چۆنیەتی جووڵانەوەی کارەکتەرەکانی نێو دەقەکە، ئاستی ئامانجێکی پێشنیازکراو کە لە کۆتاییدا دەردەبڕێت.

٥- لەڕێگەی شیعرییەتی گێڕانەوە تەکنیکەکانی ژانری ڕۆمان دەخزێنە نێو شیعرەوە و زۆربەی جارانیش یەکێتیی بابەتی پێ دەبەخشێت و بەپێچەوانەیشەوە هەندێك لە ڕەگەزەکانی شیعر ناواخنی ڕۆمان دەکات و فۆرمەکەی بەرەو زمانێکی ئەدەبیی پاراوتر دەبات.

## پەراوێزەکان

١ شێرکۆ بێکەس، کەڵەشێر، گۆڤاری ڕامان، ژ ١٢٩ شوباتی ٢٠٠٨، ل٣.

٢ لیژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان، زاراوەی ئەدەبی — کوردی — عەرەبی — ئینگلیزی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠٦، ل٨٢–٨٣و١٤٧و١٥١.

٣ هەمان سەرچاوە ، بەشی ئینگلیزی، ل٦٦.

٤ د. موحسین ئەحمەد عومەر، فەرهەنگی ئەدەبی، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی ٢٠١٢، ل٢٤٦.

٥ بڕوانە: د. کاوە شێروانی، گێڕانەوە و زمان لە (پێنجەمین کتێب)دا، گ: ڕامان ژ١٧٨ ئاداری ٢٠١٢، هەولێر، ل٥٤. ٥

6. NTC's Dictionary of Literary Terms,P144.

٧ د. محمد صابر عبيد، مرايا التخيل الشعري، عالم الكتب الحديث، أربد ٢٠٠٩، ص٩١.

٨ د. محمد صابر عبيد، حركية التعبير الشعري، دار مجدلاوي للنشر والتوزيع، عمان ٢٠٠٥، ص٦٥.

٩ د. عبدالرحيم مراشدة، الخطاب السردي والشعر العربي، عالم الكتب الحديث، إربد ٢٠١٢، ص٧٢.

١٠ د. صلاح فضل، أساليب السرد في الرواية العربية، مركز الانماء الحضاري، حلب ٢٠٠٩، ص٣٤

١١ پەری ساڵح حەمید، گێڕانەوە لە کۆچیرۆکەکانی (ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل)دا، نامەی دکتۆرای بڵاونەکراوە، زانکۆی سەلاحەدین٢٠١١.

١٢ بۆ نموونە بڕوانە: ئەمین عەبدولقادر، شیعرییەت د ڕۆمانێن (سدقی هرۆری) دا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر ٢٠٠٨.

١٣ د. صلاح فضل، أساليب السرد في الرواية العربية، مصدر سابق، ص١٢.

١٤ د. جبور عبدالنور، المعجم الادبي، ص١٣٩.

١٥ ئەرستۆ، هونەری شیعر (شيعر ناسی)، وەرگێڕانی لە ئینگلیزی و پێشەکی و پەراوێزی: عەزیز گەردی، چاپخانەی گەنج، سلێمانی٢٠٠٤، ل١١٨.

١٦ بڕوانە: رومان ياكبسون، قضايا شعرية، ت محمد الولي و مبارك حنون، دار توبقال للنشر، الدار البيضاء ١٩٨٦، ص٣٣.

١٧ديفيد ديتشس، مناهج النقد الادبي بين النظرية والتطبيق، ت: محمد يوسف نجم، دار صادر، بيروت ١٩٦٧، ص٢٣٧.

١٨ رولان بارت، مدخل الى التحليل البنيوي للقصص، ت: منذر عياشي، مركز الانماء الحضاري، حلب ١٩٩٣، ص١٢.
١٩ د.عبدالرحيم مراشدة، الخطاب السردي والشعر العربي، ص٣٣.
٢٠د. لطيف زيتوني، معجم مصطلحات نقد الرواية، دار النهار للنشر، بيروت ٢٠٠٢، ص١٠٨.
٢١د. ميجان الرويلي و د. سعد البازغي، دليل الناقد الأدبي، ط٤، المركز الثقافي العربي، بيروت ٢٠٠٥، ص١٧٤.
٢٢ تەکسۆنۆمی یان ( پۆلێنزانی)، بەمانای زانستی پۆلێنکاری جۆرەکان دێت.
٢٣ ميخائيل باختين، الخطاب الروائي، ت: د. محمد برادة، دار رؤية للنشر والتوزيع، القاهرة ٢٠٠٩، ص٦١.
٢٤ جابر عصفور، مفهوم الشعر ـ دراسة في التراث النقدي، ط٣، دار التنوير، بيروت ١٩٨٣، ص١٥٥.
٢٥ ألاردس نيكول، علم المسرحية، ت: دريني خشبة، المطبعة النموذجية، القاهرة ١٩٥٨، ص٢٠٩.
٢٦ د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، چاپخانەی فێرکردنی باڵا، هەولێر ١٩٨٩، ل٣٤.
٢٧ رينيه ويليك و أوستن وارين، نظرية الأدب، ت: محي الدين صبحي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت ١٩٨٧، ص١٦٧.
٢٨ جان كوهين، بنية اللغة الشعرية، ت: محمد الولي ومحمد العمري، دار تويقال للنشر، الدار البيضاء ١٩٨٦، ص٧٤.
٢٩ د. عبدالملك مرتاض، في نظرية الرواية ـ بحث في تقنيات السرد، مطابع الرسالة، الكويت ١٩٩٨، ص١٨٠.
٣٠ ئەیوب ئەنوەر سماقەیی، بنەماکانی زانستی ئابووری، چ٢، چاپخانەی شەهاب، هەولێر ٢٠٠٩، ل٧.
٣١ د. محمد التونجي، المعجم المفصل في الأدب، ج١، دار الكتب العلمية، بيروت ١٩٩٩، ص١٢١.
٣٢ حنا عبود، فصول في علم الاقتصاد الادبي، منشورات اتحاد الكتاب العرب، دمشق ١٩٩٧، ص٩١.
٣٣ د. لطيف زيتوني، مصدر سابق، ص٢٦.
٣٤ جاكوب كورك، اللغة في الادب الحديث ـ الحداثة والتجريب، ت: ليون يوسف دار المأمون للترجمة والنشر، بغداد١٩٨٩، ل٢٣.

٣٥ جون ستروك، البنوية ومابعدها ـ من ليفى شتراوس الى دريدا، ت: د. محمد عصفور، مطابع السياسة، الكويت ١٩٩٦، ص١٩٤.

٣٦ إ. ا. رتشاردز، مباديء النقد الادبي، ت: د. مصطفى بدوي ـ د. لويس عوض، ص٣٤٦.

٣٧ رينيه ويليك و أوستن وارين، نظرية الأدب، مصدر سابق، ص٢٢٩.

٣٨ أمين يوسف عودة، سرد المستحيل الممكن، المجلة العربية للعلوم الانسانية، جامعة الكويت، ع٩٣ س ٢٤ شتاء٢٠٠٦، ص١٦٤.

٣٩ د. صلاح فضل، أساليب السرد في الرواية العربية، مصدر سابق، ص١٣٥.

٤٠ ئارام سديق، ستاتيكای گێڕانەوە، چاپخانەی یاد، سلێمانی ٢٠٠٩، ل٦٥.

٤١ رولان بارت، لذة النص، ت: منذر عياشي، مركز الإنماء الحضاري، حلب ١٩٩٢، ص٦٤.

٤٢ د. محمد غنيمي هلال، النقد الادبي الحديث، دار العودة، بيروت ١٩٩٧، ص٣٨٦.

٤٣ د. يوسف أبو العدوس، البلاغة والاسلوبية، الاهلية للنشر والتوزيع، عمان ١٩٩٩، ص١٦٤.

٤٤ د. صلاح فضل، نظرية البنائية في النقد الادبي، مطبعة الامانة، القاهرة ١٩٧٨، ص٣٠.

الطاهر بو مزبر، التواصل اللساني والشعرية – مقاربة تحليلية لنظرية رومان جاكبسون، الدار العربية للعلوم، الجزائر٢٠٠٧، ص٣٠. ٤٥.

٤٦ لەنێو فەرهەنگە زمانییەكانیشدا (سایت Site) بە مانای شوێنێكی ئاوەدان دێت كە هەڵوێستێكی تێدا وەرگیرابێت. یانیش گوزارشت لە شوێنی كۆكردنەوەی زانیارییەكان دەكات كە لە تۆڕێكی هاوبەشدا بەكاربهێنرێن. بڕوانە: Advanced Dictionary, A. S. (Oxford Hornby, P.1204).

٤٧ الطاهر بو مزبر، التواصل اللساني والشعرية، مصدر سابق، ص٣٠–٣١.

٤٨ د. عبدالملك مرتاض، في نظرية الرواية ـ بحث في تقنيات السرد، مصدر سابق، ص١٤٦.

٤٩ الطاهر بو مزبر، التواصل اللساني والشعرية، مصدر سابق، ص٣١.

٥٠ إ. ا. رتشاردز، مباديء النقد الادبي، ت: د. مصطفى بدوي ـ د. لويس عوض، مصدر سابق، ص٨٩.

## سەرچاوەکان

**کتێب:**

**بە زمانی کوردی:**

(١) ئارام سدیق، ستاتیکای گێڕانەوە، چاپخانەی یاد، سلێمانی٢٠٠٩.

(٢) ئـەیوب ئـەنوەر سماقـەیی، بنـەماکانی زانسـتی ئـابووری، چ٢، چـاپخانەی شـەهاب، هەولێر ٢٠٠٩.

(٣) ئەرسـتۆ، هونـەری شـیعر (شـیعر ناسـی)، وەرگێڕانـی لـە ئینگلیـزی و پێشـەکی و پەراوێزی: عەزیز گەردی، چاپخانەی گەنج، سلێمانی٢٠٠٤.

(٤) ئـەمین عەبـدولقادر، شـیعرییەت د ڕۆمـانێن (سـدقی هـرۆری) دا، چـاپخانەی حـاجی هاشم، هەولێر ٢٠٠٨.

(٥) د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، چـاپخانەی فێرکردنـی بـاڵا، هەولێر ١٩٨٩.

**بە زمانی عەرەبی:**

(٦) إ. ا. رتشاردز، مبادیء النقد الادبـي، ت: د. مصـطفى بـدوي و د. لـويس عـوض، المؤسسة المصرية للتأليف والترجمة والطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦١.

(٧) ألاردس نيكول، علـم المسـرحية، ت: دريـني خشـبة، المطبعـة النموذجيـة، القـاهرة ١٩٥٨.

(٨) جابر عصفور، مفهـوم الشـعر ـ دراسـة في الـتراث النقـدي، ط٣، دار التنـوير، بـيروت ١٩٨٣.

(٩) جاكوب كـورك، اللغـة في الادب الحـديث ـ الحداثـة والتجريـب، ت: ليـون يوسـف، دار المأمون للترجمة والنشر، بغداد١٩٨٩.

(١٠) جان كوهين، بنيـة اللغـة الشـعرية، ت: محمـد الـولي و محمـد العمـري، دار تويقـال للنشر، الدار البيضاء ١٩٨٦.

(١١) جون ستروك، البنوية ومابعدها ـ من ليفى شتراوس الى دريدا، ت: د. محمد عصفور، مطابع السياسة، الكويت ١٩٩٦.

(١٢) حنا عبود، فصول في علم الاقتصاد الادبي، منشورات اتحاد الكتـاب العـرب، دمشـق ١٩٩٧.

(١٣) ديفيد ديتشس، مناهج النقد الادبي بين النظرية والتطبيق، ت: محمد يوسف نجم، دار صادر، بيروت ١٩٦٧.
(١٤) رولان بارت، لذة النص، ت: منذر عياشي، مركز الإنماء الحضاري، حلب ١٩٩٢.
(١٥) رولان بارت، مدخل الى التحليل البنيوي للقصص، ت: منذر عياشى، مركز الانماء الحضاري، حلب ١٩٩٣.
(١٦) رومان ياكبسون، قضايا شعرية، ت: محمد الولي و مبارك حنون، دار تويقال للنشر، الدار البيضاء ١٩٨٦.
(١٧) رينيه ويليك و أوستن وارين، نظرية الأدب، ت: محي الدين صبحي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت ١٩٨٧.
(١٨) د. صلاح فضل، أساليب السرد في الرواية العربية، مركز الانماء الحضاري، حلب ٢٠٠٩.
(١٩) د. صلاح فضل، نظرية البنائية في النقد الادبي، مطبعة الامانة، القاهرة ١٩٧٨.
(٢٠) الطاهر بو مزبر، التواصل اللساني والشعرية - مقارنة تحليلية لنظرية رومان جاكبسون، الدار العربية للعلوم - ناشرون، الجزائر ٢٠٠٧.
(٢١) د. عبدالرحيم مراشدة، الخطاب السردي والشعر العربي، عالم الكتب الحديث، إربد ٢٠١٢.
(٢٢) د. عبدالملك مرتاض، في نظرية الرواية - بحث في تقنيات السرد، مطابع الرسالة، الكويت ١٩٩٨.
(٢٣) د. محمد صابر عبيد، مرايا التخيل الشعري، عالم الكتب الحديث، أربد ٢٠٠٦.
(٢٤) د. محمد صابر عبيد، حركية التعبير الشعري، دار مجدلاوي للنشر والتوزيع، عمان ٢٠٠٥.
(٢٥) د. محمد غنيمي هلال، النقد الأدبي الحديث، دار العودة، بيروت ١٩٩٧.
(٢٦) ميخائيل باختين، الخطاب الروائي، ت: د. محمد برادة، دار رؤية للنشر والتوزيع، القاهرة ٢٠٠٩.
(٢٧) د. يوسف أبو العدوس، البلاغة والاسلوبية، الاهلية للنشر والتوزيع، عمان ١٩٩٩.

**ئینسکلۆپیدیا و فەرهەنگەکان:**

**بە زمانی کوردی:**

(٢٨) لیژنــەی ئــەدەب لــە کــۆڕی زانیــاری کوردســتان، زاراوەی ئــەدەبی – کــوردی – عەرەبی – ئینگلیزی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠٦.

(٢٩) د. موحسین ئەحمەد عومەر، فەرهــەنگی ئــەدەبی، چـاپخانەی حەمـدی، سـلێمانی ٢٠١٢.

**بە زمانی عەرەبی:**

(٣٠) د. جبور عبدالنور، المعجم الادبي، دار العلم للملايين، بيروت ١٩٧٩.

(٣١) د. لطيف زيتوني، معجم مصطلحات نقد الرواية، دار النهار للنشر، بيروت ٢٠٠٢.

(٣٢) د. محمد التونجي، المعجم المفصل في الأدب، ج١، دار الكتب العلمية، بيروت ١٩٩٩.

(٣٣) د. ميجـان الرويلـي و د. سـعد البـازعي، دليـل الناقـد الادبـي، ط٤، المركـز الثقـافي العربي، بيروت ٢٠٠٥.

(٣٤) د. ناصر الحاني، المصطلح في الأدب الغربي، بيروت ١٩٦٨.

**بە زمانی ئینگلیزی:**

(35) NTC's Dictionary of Literary Terms.

(36) A Dictionary of Literary Terms, J.A.Cuddon.

(37) Oxford Dictionary Advanced, A. S. Hornby.

**نامە زانکۆییەکان:**

(٣٨) پەری ساڵح حەمید، گێڕانەوە لە کۆچیرۆکەکانی (ئەحمەد محەمـەد ئیسـماعیل)دا، نامەی دکتۆرای بڵاونەکراوە، کۆلێژی زمان – زانکۆی سەلاحەدین ٢٠١١.

**گۆڤارەکان:**

**بە زمانی کوردی:**

(٣٩) د. کاوە شێروانی، گێڕانـەوە و زمـان لـە (پێنجـەمین کتێـب) دا، گ: ڕامـان ژ ١٧٨ ئاداری ٢٠١٢، هەولێر.

(٤٠) شێرکۆ بێکەس، کەڵەشێر، گۆڤاری ڕامان، ژ ١٢٩، هەولێر- شوباتی ٢٠٠٨.

**بە زمانی عەرەبی:**

(٤١) أمين يوسف عودة، سرد المستحيل الممكن، المجلة العربية للعلوم الانسانية، مجلـس النشر العلمي - جامعة الكويت، العدد٩٣ السنة ٢٤ شتاء ٢٠٠٦.

## ملخص البحث

يتناول هذا البحث البنية الفنية لشعرية السرد التي تتواجد في كثير من النصوص الأدبية الكُردية، وخاصة في الشعر والرواية، لكنه لم يحظ بإهتمام كاف من قبل الباحثين الكُرد. بالرغم من أنها بدت مصطلحاً نقدياً له موقعه ونهجه في الأدب الحديث. حاول الباحث معالجة هذا الموضوع من خلال تعريف هذا المصطلح وتشخيص سماته وتقنياته وقيمه الجمالية أثناء تطبيقها على قصيدة (الديك) للشاعر شيركو بيكس.

يتكون البحث من مقدمة و قسمين: يشمل القسم الاول على محورين. يتطرق الاول على تعريف شعرية السرد وتحليل مفهومها وميزاتها في الادب. ويركز المحور الثاني على السمات الثلاث الاساسية للقصيدة الحرة التي تبنى على شعرية السرد وتستند على الوزن والقافية والايقاع. أما القسم الثاني فيشمل أيضاً على محورين. الاول منه يهتم بتقنيات شعرية السرد والثاني يركز على ما فيها من القيم الجمالية. وفي النهاية تم عرض أهم النتائج التي توصل اليها البحث.

# Abstract

This study is about the technical structure of narrative poetics which is found in many Kurdish literature texts, especially in poetry and novel which has not received much attention from Kurdish researchers. The researcher tries to solve this subject by defining this term and specifying its properties, techniques and aesthetic values then applying it to the poem (The Rooster) by SherkoBekas.

The research is composed of an introduction and two sections:

The first section consists of two parts: The first part deals with definition of narrative poetics, analyzing its concept and features in literature. The second part deals with the three basic characteristics of the free poems that is built on narrative poetics by depending on the rhythm and rhyme andintonation.

The second section deals with two parts: the first part cares about the techniques of the narrative poetics and the second part cares about valuable aesthetic that can be found in these poems. Finally the researcher lists the results drawn from the study.

# تەكنیكی پاشخراو لە داستان و رۆماندا

## بە نموونەی داستانی ( مەم و زین ) و

## رۆمانی ( شاری مۆسیقارە سپییەكان )

**د. سەنگەر قادر شێخ محەمەد حاجی**

پەیمانگای تەكنیكی پزیشكی هەولێر

### پێشەكی

زۆرن ئەو تەكنیكانەی بەشداری لە دەقە چیرۆكئامێزەكان دەكەن و نووسەر هەر كاتێك پێویستی پێیان بێ كەڵكیان لێ وەردەگرێ. هونەری پاشخراو یەكێكە لە هونەرە كۆنەكان كە لە سەرەتادا لەداستان بەكارهاتووە و دواتر گوازراوەتەوە ناو رۆمان و لەوێشدا كۆمەڵێك گۆڕانكاری تێیدا روویانداوە.

ئەم لێكۆڵینەوەیە دابەشی سەر دوو تەوەری سەرەكی كراوە. لە تەوەری یەكەمدا بە سێ ناونیشانی جودا باسمان لە لایەنی تیۆری هونەری پاشخراو كردووە و دواتر هونەری پاشخراومان لە هەر یەك لە داستان و رۆمان خستۆتە روو و پاشان ئەو جیاوازییانەمان باس كردووە كە لەنێوان هونەری پاشخراو لەداستان و رۆماندا هەیە.

تەوەری دووەمی ئەم لێكۆڵینەوەیە تایبەت كراوە بە لایەنی پراكتیكی هونەری پاشخراو و داستانی (مەم و زین) ی (ئەحمەدی خانی) و رۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەكان) ی (بەختیار عەلی) مان بە نموونە وەرگرتووە و جۆرەكانی هونەری پاشخراومان لەسەریان پراكتیزە كردووە. لەوێدا بەو ئەنجامە گەیشتووین كە بەكارهێنانی هونەری پاشخراو لە داستانی مەم و زین تەنیا بە مەبەستی زانیاری بەخشینە، كەچی لە رۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەكان) سەرەڕای زانیاری بەخشین بەخوێنەر بۆ تامەزرۆكردنی خوێنەر و راكێشانی بەرەو

خوێندنەوەی تەواوی ڕۆمانەکە و ڕازاندنەوەی بەرهەمەکەیە، لەوانەش گرنگتر بۆ خستنەڕووی ڕۆمانەکە وەکو ڕۆمانێکی هاوچەرخ.

- **لایەنی تیۆری هونەری پاشخراو**

پاشخراو هونەرێکە پەیوەندییێکی ڕاستەوخۆی بە کاتەوە هەیە، لە دەمکاتەکانیشدا پاشخراو ((پەیوەندییێکی ڕاستەوخۆی بە ڕابردووەوە هەیە))[1]، بەڵام ئەمە واتای ئەوە نییە کە پاشخراو هیچ پەیوەندییێکی بە کاتەکانی دیکەی ناو دەق نییە. پاشخراو پەیوەندی بەکاتی ئێستاشەوە هەیە، وەك ئەوەی ئەگەر کاتی ڕابردوو نەبێ حیکایەتخوان پێویستی بە خاڵێك هەیە کە لێیەوە بگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو و ئەو خاڵەش کاتی ئێستایە و خوێنەر بەبێ بوونی کاتی ئێستا و هەستکردن بەو کاتە، هەست بەو پچڕان و گەڕانەوە بۆ دواوە ناکا لەڕێی پاشخراوەوە.

(فاتیح عەبدولسەلام) بەمجۆرە پێناسەی پاشخراو دەکا (پاشخراو ئەو پچڕانەیە کە لەکاتی بەدوایەکداهاتنی زنجیرەیێك کاتی لۆجیکی ڕوو دەدا))[2]. لەم پێناسەیەدا دوو لایەن ڕوون کراونەتەوە، یەکێکیان ئەوەیە کە پاشخراو پچڕاندنە، واتە ڕاگرتنی کاتی گێڕانەوە لەڕێی پاشخراوەوە ڕوودەدا و کاتی ئێستای گێڕانەوە ڕادەگرێ. هی دووەمینیشیان ئەوەیە دەبێتە دەستپێك بۆ دەستپێکردنی کاتێکی دیکەی گێڕانەوە کە کاتی ڕابردووە و لە ئەنجامدا بەهۆی وەستاندنی کاتێك و دەستپێکردنی گێڕانەوەی ڕووداوێك کە لەکاتێکی جودا ڕوویداوە، جیاوازی دەخاتە ناو کاتەکانی گێڕانەوە. لەم سۆنگەیەشەوە (دکتۆر مۆریس ئەبو نازر) پێناسەی پاشخراو دەکا و دەڵێ: ((پاشخراو بە ڕووێك لە ڕووەکانی جیاوازیی کات دادەنرێ لە ڕێی پێکهێنانی چەند پاژێکی بچووك کە لەچاو پاژە گەورەکەی چیرۆکدا بە ناوەنجی دادەنرێ))[3]. دەقی چیرۆك چ لەڕووی ڕووداوەوە و چ لەڕووی کاتی ڕوودانی ئەو ڕووداوانەوە لەچەند یەکەیێکی بچووك پێکدێ کە لە بەدوایەکداهاتنی ئەو ڕووداوانە و کاتەکانیان کاتی گەورەی دەقی چیرۆکئامێز دروست دەبێ کە لەشێوەی زنجیرەدایە و هەریەکێك لە پاژە بچووکەکان ئەوەی دیکەی پاش خۆی و پێش خۆی بەیەکەوە دەبەستێتەوە. زۆرجار شاعیر یان

چیرۆکنووس یان رۆماننووس بۆ هەر مەبەستێك بێ یەكێك لەو پاژە بچووكانە ناخاتە ناو زنجیرەكەوە و لەكاتە پاژییەكانی دیكەی دایدەبڕێ. كاتێكیش وا هەست دەكا كە باسكردنی ئەو پاژە پێویستە كاتی ئێستای گێڕانەوە رادەگرێ و ئەو پاژەی كە پێشتر نەیگێڕابووەوە ئێستا دەیگێڕێتەوە. بەم جۆرە نووسەر لە دوو شوێنەوە زنجیرەی كاتی گێڕانەوە دەپچڕێنێت، لە جاری یەكەم كە بووە بەربەست لەوەی پاژە كاتییەكە كە لەگەڵ ئەوانەی لە پێش و دوایەوە دێن، بێت ، و لەجاری دووەمیشدا وەكو ناوبڕێكی لێ دێ لەنێوان دوو پاژدا كە ئەوان بەشێوەیێكی ئاسایی بەدوای یەكدا دەهاتن. ئەمەش پشتگیری پتری ئەو باوەڕەمان دەكا كە پاشخراو تەنیا پەیوەندی بە رابردووەوە نییە، بەڵكو پەیوەندی بە كاتی ئێستای ناو دەقیشەوە هەیە.

ئەو رێگایانەی لەناو دەقدا نووسەر بۆ دروستكردن و سوودوەرگرتن لە پاشخراو پەنایان بۆ دەبا زۆرن و شاعیر یان رۆماننووس بۆی هەیە هەر كامێكیان بكا بە بەهانە بۆئەوەی لەرێگەیانەوە بگەڕێتەوە بۆ رابردوو. هەندێك جار دەتوانێ ((بە بیانووی یادگاری یان دانپێدانان))[٤] بگەڕێتەوە بۆ رابردوو، هەندێك جاری دیكەش دەتوانێ لە رێی گەڕانەوەی ئاسایی بگەڕێتەوە كە حیكایەتخوان ئەو رووداوانە دەگێڕێتەوە كە لە رابردوو روویانداوە. هەروەها لە رێی پشتبەستن بە خودی پاڵەوان یان كارەكتەر نووسەر دەتوانێ ئەم كارە بكا، بەوەی لەرێی زەینی ئەوان و بیرهاتنەوەی شتێك كە لەرابردوو بەسەریان هاتووە بگەڕێتەوە بۆ رابردوو و بۆ ئەمەش پەنا بۆ هونەری شەپۆلی هۆش دەبا. بەهەمان شێوە دەتوانێ (سوود لە هونەری مۆنۆلۆگیش ببینێ تا لەرێیەوە بگەڕێتەوە بۆ رابردوو)[٥]. ئەمانە هەموویان هۆكارن بۆ قەناعەت پێكردنی نووسەر بە خوێنەر بۆئەوەی لەكاتی گێڕانەوە و پچڕاندنی كاتی گێڕانەوەی ئاسایی خوێنەر كارەكە بە ئاسایی وەربگرێ، چونكە دەبێ ئەوە بزانین خوێنەر چاوەڕوانی ئەوە دەكا كاتەكانی ژیان چۆن بەدوای یەكدا دێن، لەناو دەقیشدا بەهەمان شێوە بەدوایەكدا بێن. كاتێك نووسەریش بڕیاری تێكشكاندنی زنجیرەی كاتی رووداوەكان دەدا، دەبێ هێندە كارامە بێ لە ئەنجامدانی ئەو كارە خوێنەر رازی بكا بەوەی ئەنجامی داوە.

پاشــخراو لــەناو دەقــدا ئــەركی جیــاواز دەبینــێ، یــەكێك لــەو ئەركانــە ((گرێدانەوەی ئێستایە بە رابردوو))[٦] و خوێنەر بە زەمەنێك ئاشنا دەكا كە پێشتر لەناو دەقەكەدا هەستی پێ نەكردووە. هەروەها ((پاشخراو هۆكارێكە بۆ درككـردن بە هەڵوێستەكان و پڕكردنەوەی ئـەو بۆشـاییەی لـە چـیرۆكەكەدا روویـداوە، یـان گەڕانــەوە بـۆ رووداوێـك كـە پێشـتر ورووژێنـدراوە و لێـرەدا تەواوكەرەكـەی بـیر دەخرێتەوە، یان بۆ گۆڕینی دەلالەتی هەندێك رووداو كە پێشتر باسیان كراوە))[٧]. ئەو بۆشاییەی لە چیرۆكدا دروست دەبێ بەتایبەتی لە بواری بەخشـینی زانیـاریی تەواو بە خوێنەر لەو رێیەوە دروست دەبێ كـە حیكایـەتخوان هـەموو رووداوەكـان بەشـێوەی زنجـیرە بـەدوای یەكـدا ناهێنێـت و نایانگێڕێتــەوە، جـا لەكاتێكـدا خوێنەریش پێویستی بەو زانیارییانە هەیە بۆ ئەوەی كۆمـەڵێك هەڵوێسـتی لا روون ببنەوە كە دەبنە هۆی چەند رووداوێك و حیكایـەتخوان ناچـار دەبـێ ئـەو زانیارییانە لە شوێنێكی دیكەدا بەخوێنەر ببەخشێ.

ئەو ئەركانەی هونەری پاشخراو لەناو دەقدا ئـەنجامیان دەدا جیـاوازن، بـەڵام دیاركردنی جۆرەكانی هونەری پاشخراو پەیوەست نییـە بـە جیـاوازیی ئەركـەكانی ئەو هونەرە، بەڵكو بەستراوەتەوە بەو مەودایەی كە حیكایەتخوان دەگەڕێتەوە بـۆ دواوە بەمەبەسـتی هێنانــەوەی ئـەو پارچـەیەی كـە پێشـتر بـە هـەر هۆیێـك بـێ بواردوویەتی و دەیەوێ ئێستا بیگەڕێنێتەوە. جۆرەكانی هونەری پاشخراو بە سـێ جۆر دیار دەكا كە بریتین لە:

١- پاشخراوی دەرەكی.

٢- پاشخراوی ناوەكی.

٣- پاشخراوی تێكەڵ.[٨]

(پاشخراوی دەرەكی) لەم جـۆرە پاشـخراوەدا نووسـەر ئـەو رووداوانـەمان بـۆ دەگێڕێتەوە و باسی ئەو دیاردانـەمان بـۆ دەكـا كـە دەكەونـە دەرەوەی سـنووری كـاتی گێڕانــەوەی دەقەكــە. لــە رووی چــەندێتی گەڕانەوەكەشــدا هــیچ كاتێــك دیارنەكراوە و هۆنەر یان رۆماننووس دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ چـەند رۆژێـك بـەر لـە دەســتپێكردنی كــاتی رووداوەكــانی نــاو دەق و دەشــتوانێ چــەند ســەدەیێك بگەڕێتەوە، بەمەرجێك ئەو رووداوە كاریگەری هەبێ لەسـەر روونتركردنـەوەی ئـەو

رووداو و زانیارییانەی لە ناو دەقەکەدا پێویستن تا سەرەنجام خوێنەر بە ئاسانی لێیان تێ بگا.

(پاشخراوی ناوەکی) ئەم جۆرەی پاشخراو کاتێك بەکاردێ کە خوێنەر بەرەو رووی چەند رووداو یان چەند فیکرەییێکی نوێ دەبێتەوە و هیچیان لەبارەوە نازانێ و لەوە تێناگا چۆن روویانداوە و ئەنجامەکان بۆ وا کەوتوونەتەوە، هۆنەر یان رۆمانووس دەگەڕێتەوە بۆ دواوە و لەوێوە دەست بەگێڕانەوەی ئەو بەشەی رووداوەکان دەکا کە دەکەونە سنووری کاتی دەستپێکی رووداوەکانی ناو دەقە چیرۆکئامێزەکە و دەیەوێ ئەو بەشە تەواو نەکراوە لەو رووداوانە بۆ خوێنەرەکەی بگێڕێتەوە کە پێشتر بەشێکی بۆ گێڕابووەوە.

جۆری سێیەم (پاشخراوی تێکەڵ) ە، ئەم جۆرەی پاشخراو تێکەڵەییێکە لە پاشخراوی دەرەکی و پاشخراوی ناوەکی. ئەم جۆرەی پاشخراو بە گێڕانەوەی رووداوی چیرۆکێك دەست پێ دەکا کە کاتەکەی دەکەوێتە پێش دەستپێکی رووداوەکانی ناو دەقەکە و ئەو رووداوە درێژ دەکاتەوە تا دەیگەیێنێتەوە رووداوێکی ناو دەقەکە و لەگەڵی تێکەڵ دەکاتەوە و بێگومان لەو کارەشدا پشت بە تەکنیکێکی دیکەی گێڕانەوە دەبەستێ کە کورتبڕی و کورتکردنەوەیە تا خوێنەر بێزار نەبێ و بەردەوام بێ لە خوێندنەوەی دەقەکە.*

- **لایەنی تیۆریی هونەری پاشخراو لە داستاندا**

گوتمان پاشخراو پەیوەندییێکی راستەوخۆی بە کاتی گێڕانەوەوە هەیە، بەتایبەتی بە کاتی رابردوو، ئەوەشمان لا روونە کە کاتی داستان کاتی رابردووە و رابردووەکەشی رابردووێکی دوورە نەوەك نزیك، بۆیە کاتێك شاعیر پەنا دەباتە بەر بەکارهێنانی ئەو هونەرە بەتایبەت لەکاتی سوودوەرگرتن لە جۆری (پاشخراوی دەرەکی) پێویستی بە بڕینی مەودایێکی زۆرە بۆ دواوە تا بتوانێ لەوێوە ئەو رووداو و زانیارییانە بێنێتەوە ناو کاتی ئێستای داستان، چونکە دەبێ ئەوە بزانین رووداوەکانی داستان هەرچەندە کۆن و دێرین بن بەهۆی کاتی گێڕانەوەی ناو داستان دەبنە کاتی ئێستا لەناو دەقدا و مەبەستیش لەکاتی ئێستای داستان ئەو کاتە رابردووەیە کە هەموو دەقێکی داستانی پێ دەهۆنرێتەوە.

هونەری پاشخراو هونەرێكی كۆنە ((تایبەتمەندییێكی گێڕانەوە و گێڕانەوەی كلاسیكییە))[٩] و (هۆمیرۆس و فرجیل لە بەرهەمەكانیاندا بەكاریانهێناوە)[١٠]. لە داستاندا زۆربەی كات رووداوەكان بەدوای یەكدا دێن و زنجیرەی كاتی گێڕانەوەی داستانەكە تێكدەشكێنرێ و شاعیر دەیەوێ لەڕێگەی گێڕانەوەی یەك بەدوای یەكی پاژەكانی رووداوی داستان زیاتر واقیعییەت بۆ داستانەكەی لای خوێنەر دەستەبەر بكا، بەڵام هەندێك كات ناچار دەبێ ئەو بەدواییەكدا هاتنە زەمەنییە پشتگوێ بخا و زەمەنی ئێستا رابگرێ و رووەو بیرخستنەوەی رابردوو بگەڕێتەوە.

یەكێك لەو بەربەستانەی دێنە بەردەم شاعیر و دەبنە هۆی ئەوەی نەتوانێ بەردەوامی بە گێڕانەوە یەك بەدوای یەك و نەپچڕاوەكەی بدا، بوونی (یەكێتی كات)ە كە لەسەر شاعیر پێویستە پابەندی یەكێتی كات بێ و لێی لانەدا. بەربەستێكی دیكەی بەردەم شاعیر بوونی (یەكێتی رووداو) ە كە كاریگەری زۆر زیاترە لەسەر گەڕانەوە بۆ رابردوو و بەكارهێنانی تەكنیكی پاشخراو لەناو داستاندا. لەداستاندا دەبێ شاعیر تەنیا تاكە رووداوێك وەربگرێ و زۆرجاریش داستاننووس تاكە رووداوێكیش بەتەواوی وەرناگرێ، بەڵكو رووداوەكە لەو شوێنە وەردەگرێ كە خۆی هەست دەكا پێویستە، بۆ نموونە (هۆمیرۆس) لە (ئەلیادە) ئەم كارەی كردووە ((هەرچەندە جەنگی (تەڕوادە) سەرەتا و كۆتایی هەیە، بەڵام ئەم نەیویستووە سەراپای جەنگەكە بخاتە ناو داستانەكەیەوە))[١١]. شەڕی نێوان گریك و تەڕوادە دە ساڵ دەخایێنێ، بەڵام (هۆمیرۆس) تەنیا چەند هەفتەییێكی كۆتایی وەردەگرێ و بۆمانی دەگێڕێتەوە، بۆیە مەحاڵە ئەو توانای ئەوەی هەبێ تەنیا پشت بەو چەند زانیارییەی لەبارەی ئەو چەند هەفتەیە هەیەتی ببەستێ و رووداو و زانیاری و بەسەرهاتەكانی دە ساڵی رابردوو پشتگوێ بخا، چونكە هەمیشە پرسیاری ئەوە لای خوێنەر دروست دەبێ، ئایا هۆكاری ئەو شەڕە چی بووە؟ لە سەرەتادا كێ دەستی بە شەڕەكە كردووە، ئایا ئەو پاڵەوانانەی كۆتایی جەنگەكە هەمان ئەو پاڵەوانانەن كە لە سەرەتادا دەستیان بە شەڕ كردووە، ئەوانە پاڵەوانی نوێن و ئەوانەی پێشووتر كوژراون؟

لەكاتی خوێندنەوەی داستانی (ئیلیادە) یان هەر داستانێكی دیكە دەیان پرسیاری لەجۆری ئەوانەی سەرەوە بە مێشكی خوێنەردا دێن و ئەو بەدوای

وەدەستهێنانی زانیاری دەگەڕێ لەسەریان و دەیەوێ ئەو بۆشاییانەی لە مێشکیدا هەیە بەو زانیارییانە پڕیان بکاتەوە و لەو ڕێیەشەوە لەگەڵ خۆی شاعیریش ناچار بکا تا ئەویش لەداستانەکەیدا و لە ڕێی هونەری پاشخراو و بیرهاتنەوەی شتەکان ئەو بۆشاییانەی ناو دەقەکە پڕ بکاتەوە کە بەهۆی کەمیی زانیارییەوە کەوتوونەتە ناو داستانەکە.

- **لایەنی تیۆریی هونەری پاشخراو لە ڕۆماندا**

کاتی حیکایەت یان کاتی ڕووداو لە ڕۆماندا بەزۆری کاتی ڕابردووە، چونکە ((چیرۆك بۆئەوەی بگێڕدرێتەوە پێویستە لەکاتێك لە کاتەکان تەواو بووبێ))[١٢] و ئینجا حیکایەتخوان دێ و بۆ ئێمەی دەگێڕێتەوە.

ئەو ڕابردووەی لە ڕۆماندا هەیە سنووری بۆ دیار نەکراوە ئاخۆ ڕابردووەکە نزیکە یان دوور و ڕۆماننووس بۆی هەیە ڕووداوێك هەڵبژێرێ مێژوویێکی یەکجار دێرینی هەبێ و لە سەرەتاکانی ژیانی مرۆڤایەتی ڕوویدابێ و لەهەمان کاتیشدا بۆی هەیە باسی ڕووداوێك بکا کە کاتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵێك یان چەند ساڵێك پێش کاتی گێڕانەوەی ڕووداوی دەق. ئەمەش وا دەکا نەتوانین بڕیاری ئەوە بدەین ئاخۆ لەکاتی بەکارهێنانی هونەری پاشخراو، بەتایبەتی لەکاتی سوودوەرگرتن لە پاشخراوی دەرەکی، ڕۆماننووس پێویستە چەند بگەڕێتەوە دواوە و ئەو مەودایەی بۆ دواوە دەیبڕێ چەندە. ئەمە لە ڕۆماندا دیاریکردنێکی ڕێژەیی هەیە و پەیوەستە بەو مەودایەی کە لەنێوان کاتی حیکایەت و کاتی گێڕانەوەدا هەیە. بە جۆرێك ئەگەر ئەو مەودایە زۆربێ، ئەوا لەسەر ڕۆماننووس پێویستە زۆر بگەڕێتەوە و ئەگەر ماوەی نێوان ئەو دوو کاتەش کەم بێ، ئەوا مەودای گەڕانەوەکەش کەم دەبێ.

لە ڕۆماندا لەبەر ئەوەی نە یەکێتی کات هەیە و نە ڕۆماننووسیش پەیوەستە بەوەی بۆ نزیککردنەوەی بەرهەمەکەی لە واقیع پەنا بۆ گێڕانەوەی زنجیرەیی ڕووداوەکان و بەدوای یەکداهێنانی کاتی ڕووداوەکان ببا وەك چۆن لە واقیع هەیە، ڕۆماننووس لە هەر شوێنێك هەست بکا پێویستی بە تێکشکاندنی کاتی ڕووداوەکان هەیە، ئەو کارە ئەنجام دەدا و لە ڕۆماندا ((هیچ بەدوای یەکداهاتنێکی

کات، خاڵی نییە لە تەکنیکی پاشخراو))[13] و لەم جۆرە یان لەم قۆناغەی رۆماندا هونەری پاشخراو تەنیا لەکاتی پێویستبوون ئەنجام نادرێ، بەڵکو بووە بە تەکنیك و رۆماننووس بۆ بە هونەریکردن و رازاندنەوە و پێشاندانی توانای خۆی ئەو هونەرە بەکاردێنێ.

لە رۆماندا یەکێتی رووداویش نییە، تا رۆماننووس ناچار بکرێ تاکە رووداوێك یان بەشێکی رووداوێك هەڵبژێرێ و دواتر پێویستی بەوە هەبێ بۆ بەخشینی زانیاریی زیاتر پەنا بباتە بەر هونەری پاشخراو، بەڵکو رۆماننووس ئازادە لەوەی چەند رووداو هەڵدەبژێرێ و لەکوێوە دەست بە گێڕانەوەی رووداوەکان دەکا و بۆ پێدانی زانیاریش بە خوێنەر بەهۆی پاشخراوەوە پەنا دەباتە بەر هونەر و تەکنیکەکانی دیکەی ناو رۆمان. بۆ نموونە بۆ گەڕانەوە بۆ رابردوو رۆماننووس دەتوانێ سوود لە هونەری مۆنۆلۆگ وەربگرێ کە پەیوەندیی راستەوخۆی بە کارەکتەرەوە هەیە و حیکایەتخوان یان رۆماننووس دەتوانێ لەڕێی هۆش و هزری ئەو و بیرهێنانەوەی رووداوێك کە لە رابردوودا بەسەر کارەکتەرێکدا هاتووە، بگەڕێتەوە بۆ رابردوو .

جگە لە هونەری مۆنۆلۆگ رۆماننووس دەتوانێ سوود لە تەکنیکی شەپۆلی هۆشیش وەربگرێ کە تەکنیکێکە پەیوەستە بە هزری کارەکتەر یان حیکایەتخوان، حیکایەتخوان یان کارەکتەر لەڕێی بیرهاتنەوەوە هەموو ئەو رووداوانە دەگێڕێتەوە کە لە رابردوودا روویانداوە و ئەو لە زەینی خۆیدا یەك بەدوای یەك یان بە پچڕپچڕی دەیانگێڕێتەوە.

- **بەراوردی لایەنی تیۆریی هونەری پاشخراو لە داستان و رۆماندا**

هونەری پاشخراو هونەرێکی کۆنە و لە سەرەتادا لە داستانە گریکییەکاندا بەکارهاتووە و دواتر رۆماننووسە تەقلیدییەکان کەڵکیان لێ وەرگرتووە و پاشان گوازراوەتەوە ناو رۆمانی نوێ. بەو هۆیەی رووداوەکانی داستان زۆر کۆنن، شاعیر لەکاتی بەکارهێنانی هونەری پاشخراودا ئەو مەودایەی کە پێویستە بەرەو دواوە و بەرەو رابردوو بگەڕێتەوە یەکجار زۆرە، کەچی لە رۆماندا ئەو ماوەیە دەوەستێتە سەر فراوانیی مەودای نێوان کاتی حیکایەت و کاتی گێڕانەوە، بەجۆرێك ئەگەر ئەو

مەودایە زۆربێ، ئەوا رۆماننووس لەسەری پێویستە بەناو رابردوودا شۆڕبێتەوە و ئەگەر جیاوازیی نێوان ئەو دوو کاتەش زۆر نەبوو، ئەوا رۆماننووس زۆر ناچێتەوە ناو ناخی مێژوو و پێویستی بە گەڕانەوەی زۆر نابێ بەرەو دواوە.

لە داستاندا شاعیر ئارەزووی ئەوە دەکا کاتی گێڕانەوەی داستانەکەی کاتێکی زنجیرەیی بێ و پچڕان و جیاوازبوونی کاتی تێدا نەبێ، بەڵام بوونی یەکەی کات و یەکەی رووداو لەداستاندا بەربەستن لەبەردەم ئەوەی شاعیر بتوانێ سەد لەسەد ئەو ئامانجەی بپێکێ و بەناچاری و بۆ بەخشینی زانیاریی زیاتر بەخوێنەر کاتی زنجیرەیی داستانەکەی دەپچڕێنێ و جیاوازی دەخاتە ناو کاتی گێڕانەوەوە. هەرچی رۆمانە، ئەوا توخمی دیکە هەن رۆماننووس سوودیان لێ دەبینێ بۆ زیاتر پێشاندانی واقیعییەتی رۆمانەکەی و رۆماننووس وەك تەکنیکێك و بۆ پێشاندانی دەستەڵاتی خۆی لەگێڕانەوە و شکاندنی لاساییکردنەوەی کۆن لە نووسیندا و زیاتر رازاندنەوەی بەرهەمەکەی سوود لەو تەکنیکە دەبینێ.

تایبەتمەندییێکی دیکەی هونەری پاشخراو لە رۆماندا ئەوەیە دەتوانرێ بۆ دروستکردنی سوود لە تەکنیکی شەپۆلی هۆش وەربگیرێ، بەڵام لە داستاندا ئەو تەکنیکە نییە و وەبەرچاو ناکەوێ.

- **لایەنی پراکتیکیی هونەری پاشخراو لە داستانی (مەم و زین) دا:**

کاتی حیکایەتی داستانی (مەم و زین) کەڤنارە، بۆیە کاتێك (خانی) دەیەوێ سوود لە هونەری پاشخراو ببینێ و بەکاری بێنێ، بەتایبەتی لەکاتی بەکارهێنانی (پاشخراوی دەرەکی)، ماوەییێکی زۆر بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە.

دەستپێکی چیرۆکی داستانی (مەم و زین) بە رووداوێك دەست پێ دەکا کە تێیدا هەردوو پاڵەوانی سەرەکیی داستانەکە (مەم) و (زین) یەکدی تێدا دەبینن، ئەو رووداوە لە رۆژی نەورۆزدا روودەدا، بۆیە (خانی) بەرلەوەی دەست بە گێڕانەوەی ئەو رووداوە و چۆنیەتیی بەیەکگەیشتنی (مەم) و (زین) بکا، بۆ خوێنەری شی دەکاتەوە کە نەورۆز لە کوردەواریدا چۆن بووە و دەڵێ:

**کو عادەتێ پێشی یێ زەمانان**
**ئەڤ بوو ل هەمی جە و مەکانان**

**وەقتێ وەکو شەهسوارێ خاوەر**
**تەحویل دکر ب ماهێ ئازەر**
**یەعنی کو دهاتە بورجێ سەر سال**
**قەت کەس نە دما د مەسکەن و مال**
**(بالجملە) دچوونە دەر ژ مالان**
**حەتتا دگەهیشتە پیر و کالان**
**ڕۆژا کو دبیتە عیدێ نەورۆز**
**تەعظیم دبوو دەما دل ئەفرۆز**

(خانی) دەستپێکی داستانی (مەم و زین) بە باسکردنی ڕووداوی جەژنی نەورۆز دەست پێ دەکا کە تێیدا هەر یەك لە (مەم) و (زین) خۆیان گۆڕیوە و لەو ڕۆژەدا یەکدی دەبینن. ئەو بۆ ئەوەی هەموو جۆرە ناڕوونی و لێڵییێك لای خوێنەر بڕەوێنێتەوە دێ و باسی چۆنیەتی ڕووداوەکانی ڕۆژی نەورۆزمان بۆ دەکا، تا خوێنەر هەر لەسەرەتاوە نەڵێ، ئەرێ چۆن دەبێ لە کۆمەڵگەیێکی داخراوی وەکو کۆمەڵگەی کوردیدا کچ و کوڕ ئاوا تێکەڵ بن؟!

سەرەڕای ئەوەش، کاتێك (خانی) بەخوێنەرانی دەڵێ (زین) و (ستی) و (مەم) و (تاژدین) خۆیان گۆڕیوە (تنکر) و لە نەورۆزدا یەکتریان بینیوە، خوێنەر چەند پرسیارێکی لا دروست دەبن، خەڵکی لەو ڕۆژەدا چی دەکەن، ئایا پێشتر لەکۆمەڵگەی کوردەواریدا کچ و کوڕ بۆیان هەبووە بەیەکەوە دەربچن و ئاهەنگ سازبکەن؟

(خانی) توانیویەتی لەڕێی ئەو (پاشخراوە دەرەکییە) دا وەڵامی تەواوی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە هەر خوێنەرێك لەکاتی خوێندنەوەی داستانەکە لەبارەی نەورۆز و چۆنیەتی ئاهەنگگێڕانی خەڵکی لای دروست دەبن.

لەم پاشخراوە دەرەکییەدا (خانی) زانیاری لەبارەی نەورۆز و ئاهەنگگێڕان لە نەورۆزدا بە خوێنەر دەدا، زانیارییەکەش بریتییە لەوەی کچ و کوڕی کورد لەزەمانی زوودا بەیەکەوە چوونەتە دەرەوە و نەورۆزیان بەیەکەوە پیرۆز کردووە. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کورد لە سەردەمی زوودا تا ڕادەیێکی باش ڕێزی لە

ئافرەت گرتووە و هۆکاری بۆ یەك نەبوونی (مەم) و (زین) یش پەیوەندی بەو ڕێزگرتنەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بەو کردارەوە هەیە کە (مەم) دەینوێنێ، لەو کاتەی کە هەموو خەڵك دەچنە راو ئەو بە بیانووی نەخۆشی ناچێتە دەرەوە و دواتریش (زین) دەبینێ و (بەکر)یش ئەو هەلە دەقۆزێتەوە و (مەم) لەبەرچاوی پاشا رەش دەکا و سەرەنجام قایل نابێ (زین) ی پێ بدا.

تایبەتمەندییێکی پاشخراوی دەرەکی لە (مەم و زین) ئەوەیە (خانی) بۆ بەخشینی زانیاری لەبارەی شتەکان گەڕاوەتەوە بۆ سەرەتای دروستبوونی زەوی و ئاسمان و مرۆڤ. ئەو بەر لەوەی (بەکر) وەکو پاڵەوانێکی نەرێنی بە ئێمە بناسێنێ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرەتایەی کە خودا تێیدا چاکە و خراپەی دروست کردووە:

**((گاڤا ژ عەدەم خودێ کر ئیجاد**
**ئەو کەون و مەکان ژ نووڤە بنیاد**
**مەجمووعێ موکەووناتێ عالەم**
**حەتتا ڤە خەلاصە نەوعێ ئادەم**
**ئەشیا ب حەسەب صفات و ئەفعال**
**ئینانە وجودێ موختەلەف حال**
**مەوجود کرن ب هەڤ موعەییەن**
**ئەضداد کرن ب ضد موبەییەن))** ل١٦٧

داستانی (مەم و زین) سەرەڕای لەخۆگرتنی بابەتی چیرۆکی خۆشەویستیی دوو دڵدار، لایەنی عیرفان و تەسەوفیش لەخۆ دەگرێ و ئەو لایەنەش هەر لە دێڕی یەکەمی داستانەکەوە تا دوایین دێڕی ئەو داستانە ئامادەیی هەیە، بۆیە هەر بابەتێك کە هۆنەر بۆی گەڕابێتەوە دواوە و خزمەتی پتر روونکردنەوەی ئەو لایەنە عیرفانی و تەسەوفییانە بکا، ئەوا بێگومان دەبنە (پاشخراو)، چونکە کاریگەریی راستەوخۆیان لەسەر روونکردنەوە و رەوتی گێڕانەوەی رووداوەکان هەیە.

(خانی) لە ڕێی ئەم پاشخراوەوە مێژووی دژایەتیکردنی نێوان چاك و خراپمان بۆ باس دەکا و پێمان دەڵێ کە خودا لە سەرەتای دروستکردنی گەردوون و لەگەڵ

دروستکردنی مرۆڤدا چاکی و خراپیشی دروست کردوون. هۆکاری دروستکردنی چاکی و خراپیش دەگێڕێتەوە بۆ:

**((لەورا کو نەبت ئەگەر تەخالوف**

**تەمییز مەحالە هەم تەعاروف ))** ل١٦٨

(خانی) لەم پاشخراوەدا زەمینە بۆ ئەوە ساز دەکا بەخوێنەر بڵێ: مرۆڤ نە لەو داستانە و نە لە هیچ شتێکی دیکەی پەیوەندیدار بە مرۆڤ نابێ چاوەڕوانی ئەوە بێ تەنیا چاکی و باشی ببینێ، بەڵکو هەر کاتێك (مەم) و (زین) ێك هەبن کە لای ئەو نوێنەری چاکەن، ئەوا (بەکر) ێك کە نوێنەرایەتی خراپە دەکا ئامادەیە.

هەروەها (خانی) لە داستانی (مەم و زین) دا و لەو شوێنانەی تەکنیکی (مۆنۆلۆگ) ی تێدا بەکارهێناون، ئەو دەرفەتەی قۆستۆتەوە و هەوڵیداوە تەکنیکی پاشخراوی دەرەکیش بەکاربێنێ، ئەو دەڵێ:

**((گەه جەنگ دکر دگەل دلێ ژار**

**کای خائینێ شەرمسار و غەددار**

**کان قەول و قەرار و عەهد و پەیوەند**

**پەیمان و قەسەم یەمین و سۆگەند**

**تە دگۆ کو دگەل تە صادقم ئەز**

**تە دگۆ ب تە را موافقم ئەز**

**تە دگۆ کو خودان تەحەممولم ئەز**

**حەیفا کو زیادە بێ وەفایی**

**وەیلا کو نە قابلێ جەفایی ))** ل١٩٩

لەم مۆنۆلۆگەدا (مەم) قسە بۆ دڵی خۆی دەکا و ئەوەی بیردەخاتەوە کە ئەو پێشتر بڕیاری داوە لەگەڵی بێ و بە هەموو ئەو شتانە قایل بێ کە ئەو پێیان قایلە و بەرگەی هەموو ئەو نەهامەتی و ناخۆشییانەش دەگرێ کە لەڕێی عەشقەوە دێنە ڕێی، چونکە ڕێگەی عەشق ڕێگەیێکی ئاسان و سادە نییە، بەڵکو پڕە لە تەنگ و چەڵەمە و ناخۆشی و تۆش بەرگەی ئەو ناخۆشییانەت نەگرت و ئەو سوێندانەی بۆت خواردبووم و ئەو پەیمانانەی پێت دابووم هەموویانت شکاند.

(پاشخراوی ناوەکی) کە گەڕانەوەیە بۆ دواوە، بەڵام مەودای گەڕانەوە زۆر نییە و لە سنووری زەمەنی رووداوی سەرەکی ناچێتە دەرەوە و پەیوەندی بە هەندێك رووداوەوە هەیە کە دەکەونە پاش زەمەنی دەستپێکردنی رووداوە سەرەکییەکە. لە (مەم و زین)دا ئەم جۆرەی پاشخراو دەبینرێ. (خانی) دەڵێ:

**(( رۆژا وەکو بوویی عیدێ تەحویل**

**ئەو ژی گەڕیانە جامە تەبدیل**

**چاوا خەملینە ئەڤ کەچانی**

**ئەو ژی گەڕیانە جل کوڕانی**

**ئەو بوون کو مە گۆ د رووژێ نەورۆز**

**مسلێ مەه و مهرێ عالەم ئەفرووز ))** ل١٠٤

(خانی) لە دەستپێکی داستانەکە و لە رۆژی نەورۆزدا باسی پۆشینی جلکی کوڕانە دەکا لەلایەن (ستی) و (زین)، لێرەدا لە ڕێی زەینی هەردوو پاڵەوانی داستان (مەم) و (تاژدین) دەگەڕێتەوە بۆ دواوە. ئەو جارێکی دیکە لە ڕێی زەینی (حەیزەبوون) ی دایەنی (زین) و (ستی) دەگەڕێتەوە بۆ دواوە و هەمان رووداومان بۆ دەگێڕێتەوە:

**(( رۆژا وەکو بوویە عید و سەرسال**

**ئەو ژی ب تەریقێ تەبعێ ئەتفال**

**رابوونەڤە هەردوو چوونە گەشتێ**

**غولان غەلەتاندبوون ل دەشتێ ))** ل١١٧

لەم پاشخراوەدا (خانی) جیاوازییێکی زۆری کردووە لەنێوان زەینی (حەیزەبوون) لەگەڵ زەینی (مەم) و (تاژدین) کە هەمان رووداو بەشێوەیێکی تر دەگێڕنەوە. (مەم) و (تاژدین) باس لە جوانی و رازاوەیی (زین) و (ستی) دەکەن، بەڵام دایەن کە خۆی فالگرەوەیە نە باس لە جوانی و نە باسی خۆشەویستی ئەو دوو کچە ناکا بۆ پیری فالگرەوە، بەڵکو باس لە فریودانی (زین) و (ستی) دەکا لەلایەن تارمایی و دێوەزمە و لەمەچێتران کە ئەم جۆرە شتانە بەتەواوی لەگەڵ بیرکردنەوەی (حەیزەبوون) دەگونجێن.

جۆری (پاشخراوی تێکەڵ) ئەو جۆرەیە کە تێیدا کاتی پاشخراوەکە کە رابردووە دەگەیێنرێتەوە کاتی ئێستای گێڕانەوە. لە (مەم و زین) دا خانی سوودی لەم جۆرە پاشخراوە وەرگرتووە و بەکاری هێناوە. ئەو دەڵێ:

**(( ئیرۆ مە بهیست کو خەلق دگەل میر**

**تێکدا ب تەبایی چوونە نێچیر**

**صەبرا مە نەهات دناڤ نڤینان**

**رابوومە دگەل ئەڤان برینان**

**ناچار بدەرکەتم ژ خانی**

**نا گاه مە خوە دی ل ڤی مەکانی ))** ل٢٣٠

(میر) تەواوی خەڵکی شاری بۆتانی بانگ کردووە بۆئەوەی لەگەڵیدا و بە کۆمەڵ بچن بۆ راو و فەرمانیشی دەرکردووە کە هیچ کەسێك نابێ لە ماڵ بمێنێتەوە، بەڵام (مەم) لەماڵ ماوەتەوە و نەك هەر ئەوەندەش، بەڵکو چووەتە ناو باخەکەی پاشا. جا بۆ ئەوەی (میر) هەست بەو خۆشەویستییە نەکا کە لەنێوان ئەو و زیندا هەیە، لە رێی پاشخراوەوە چیرۆکی بێزاریی خۆی لەناو پێخەف بۆ میر دەگێڕێتەوە. ئەو کاتەی (مەم) دەیگێڕێتەوە کاتی رابردووی ناو دەقە و واز لە گێڕانەوەی رووداوەکە ناهێنێ تا دەیگەیێنێتە ئەو کاتەی کە لەگەڵ (میر) گفتوگۆ دەکا.

لە نموونەیێکی دیکەدا کاتێك (حەیزەبوون) ی دایەنی (زین) و (ستی) پێیان دەڵێ لە رۆژی نەورۆز بۆ ئەوەندە زوو لە سەیران و دەرودەشت گەڕاونەتەوە، ئەوانیش لە رێی هونەری پاشخراوەوە هۆکاری زوو گەڕانەوەیان بۆ ماڵ دەخەنە روو. (خانی) لەسەر زاری ئەوان دەڵێ:

**((گۆ ئەی هەوەسێ دل و هناڤان**

**هەریەك ژ وە روهنیا دو چاڤان...**

**بێژن کو موقەددمە چ رەنگە**

**ئەڤ حیرەتە یا خیالە بەنگە...**

**وان گۆتنە دایەنێ نهانی:**

**ئەم صوبحێ کو چوونە دەر ژ خانی**

**هەرچی ل مە بوو دو چار پەیدا**

**حازر گەڕیا جونوون و شەیدا**

**ئاخر کو ژ حەددی چوویە دەر جەور**
**جەورێ ل مە عاقبەت نەما دەور**
**ئەم ژی گەڕین مەلوول و مەغبوون**
**هاتینەڤە ئەم خەفیف و مەجنوون))** ل١٠٩

(زین) و (ستی) بەیانی لە ماڵ دەچنە دەرێ و هەموو ئەو شتانەی لەو ڕۆژەدا تـا دەگەنــەوە مـاڵ لـەڕێی هونــەری پاشــخراو بـۆ (حــەیزەبوون) دەگێڕنــەوە و تێکـەڵبوونی کـاتی لـەنێوان کـاتی بـەیانی و چـوونە دەرەوە و کـاتی ئێسـتا کـە گەڕاونەتەوە بۆ ماڵ دروست دەکـەن، بۆیـە پاشـخراوەکە دەبـێ بـە پاشـخراوێکی تێکەڵ.

- **لایەنی پراکتیکی هونەری پاشخراو لە ڕۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەکان) دا:**

لـە ڕۆمـانی (شـاری مۆسـیقارە سـپییەکان) دا گرنگـی و بایـەخ بـە کـاتی گێڕانەوەی زنجیرەیی نەدراوە کە وای لەکاتی ڕۆمانەکە کردووە پچڕانی تێدابێ و بەردەوامیی نـەبێ لـە بـەدوای یەکدا هـاتنی ڕووداوەکـان. یـەکێك لـەو هونەرانـەی بووەتە هـۆی تێکشـکاندنی کـات لـەم ڕۆمانـەدا هونـەری پاشـخراوە و ڕۆمـاننووس سـوودێکی زۆری لێ وەرگرتــووە بـۆ بەخشـینی کۆمــەڵێك زانیـاری بەخوێنــەر، بەتایبەتی لەبارەی کارەکتەرەکانەوە. (سامیری بابلی) یەکێکە لەو کارەکتەرانـەی دوای چـوونی (جـەلادەتی کـۆتر) بـۆ شـاری (تـەپ و تـۆزە زەردەکـان)، ئـەویش دەچـێتە ئـەو شـوێنە و بـۆ ماوەیێـك لـە ژوورەکـەی (جـەلادەت) دەمێنێتــەوە. ڕۆمـاننووس بـۆ ئـەوەی زانیاریمـان لـەبارەی (سـامیری بـابلی) و چـۆنیەتی ژیـانی بداتێ، لەو شەوانەی (سامیر) لە ژووری (جەلادەت) دەخەوێ لە ڕێـی بـەکارهێنانی پاشخراو (سامیر) دەگێڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵی و لـەوێوە باسـی گـەورەبوونی خۆی بۆ (جەلادەت) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ((من دایکی خۆمم نەبینیوە، لەبەرئەوە زۆربـەی ژیـانم لـەناو بـاغی خورمـا و مێـرگ و بێسـتانە بێکۆتاییـەکانی پرتەقاڵـدا بردۆتە سەر. گـرنگترین شـت کـە لـە منداڵیمـەوە تـا ئێسـتا لەگەڵمـدا دەژی بـۆنی گەلای پرتەقاڵە... من کوڕی بێستاندارێکی گەورە بووم...ئەو کات مـن نەمـدەزانی کورد چییە، وەك منداڵەکانی تر ئەو گۆرانییەم دەگوتەوە کە باس لـە سـەربازێکی قارەمانی عەرەب دەکا کە لە شیمال کچی کورد دەهێنێ، تا لێرە زگیان بە منداڵی

چاو ڕەشی عەرەب پڕ بکات... ئەو کات کە منداڵ بووم لەگەڵ یانزە براکەی دیکەمدا لە باغەکانی زوهەیری بابلیدا دەژیام...)) ل١٦٨-١٦٩

ئەم پاشخراوە پاشخراوێکی دەرەکییە و باس لە سەردەمی منداڵیی (نەقیب سامیری بابلی) دەکا و ڕۆماننووس لە ڕێی زەینی ئەو کارەکتەرە دەمانگەڕێنێتەوە دواوە. ئێمە لەو پاشخراوە دەرەکییەدا ئاشنای کۆمەڵێك زانیاری دەبین لەبارەی (سامیری بابلی) کە منداڵێکی بێ دایکی بەسەر بردووە و هەر لە منداڵییەوە بەجۆرێك لە جۆرەکان بەرەڵای ناو باغی پرتەقاڵ کراوە و فێری ئەوە کراوە لەدژی نەتەوەیێکی دیکە گۆرانی بڵێ، ئەو لە بنچینەدا نازانێ ئەو خەڵکە چین و بۆ دەبێ کچەکانیان بڕفێنن. هەموو ئەو زانیارییانە زەمینەسازین بۆئەوەی کە خوێنەر دەبینێ (سامیر) چ دژە مرۆڤێك و چ لەناوبەر و زۆردارێکە، پێشتر ئەوەیان لێی چاوەڕوان کردبێ.

(عەلی شەرەفیار) لەبارەی (ئیسحاقی لێوزێڕین) دەڵێ: (ژیاننامەیێکی سەیری هەبوو، مۆسیقای لە هەموو پەیمانگا بەرزەکانی خۆرهەڵاتدا خوێندبوو، ئەوەی لە قوتابخانە بەرزەکان فێر نەبووبوو، بەهەوڵی خۆی لەسەر دەستی مامۆستا ناودارەکانی ئەو زەمانەدا فێر بووبوو، ئێران و توورانی لە دوو مۆسیقارە گەورەکان تەی کردبوو... ماوەیێکی درێژی ژیانی لەویادا بردبووە سەر، بووبوو بە بازرگانی قوماش، بووبوو بە جەڵەبچی و دواتریش بەڵێندەری دروستکردنی بینا. سامانی گەورەی پێکەوە نابوو... لەگەڵ هەموو بەردێکدا کە خستبوویە سەر یەك هەستی کردبوو درۆ لەگەڵ خۆیدا دەکات، بەڵام هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە بوو کچەکەی گەورە بێ و خۆش بژی... کە هێدی هێدی بۆی دەرکەوت کچەکەی لە یارانی مۆسیقا نییە، ژیانی بوو بە جەهەنەم..) ل٢٩

ئیسحاقی لێو زێڕین کەسێکە بەتەمەن داچووە و کاتێك ڕۆماننووس بە ئێمەی دەناسێنێ ئەو کاتەیە کە بەدوای دوو منداڵدا دەگەڕێ، بۆئەوەی فێری مۆسیقایان بکا. (شەرەفیار) کۆمەڵێك زانیاریی بەکەڵك بە خوێنەر دەبەخشێ لەڕێی ئەم پاشخراوە دەرەکییەوە، لەوانە ئەگەرچی (ئیسحاق) پێشتر جگە لە مۆسیقا ژەنین کاری دیکەشی کردوون، بەڵام هەمیشە وای هەست کردووە پارە کۆکردنەوە کارێکی پووچە و جگە لە مۆسیقا هیچ شتێکی دیکە ناتوانێ ئەو بەختەوەر بکا. هەر لەبەر ئەوەشە هەوڵی داوە بەباشترین شێوە فێری مۆسیقا بێ. هەروەها ئەو کچێکی هەبووە هەموو ئاواتی ئەوەبووە ئەو کچەی ببێتە مۆسیقا ژەن و وەکو ئەو

خولیای ببێتە مۆسیقا، کەچی کچەکەی وا دەرناچێ. هەموو ئەو زانیارییانە ئەو کەلێنانە پڕ دەکەنەوە کە لە مێشکی خوێنەر بەرانبەر بە کەسێتی (ئیسحاقی لێوزێڕین) دروست دەبن.

شوێن لە ڕۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەکان) گرنگییەکی زۆری هەیە، بۆیە ڕۆماننووس بەهەموو شێوەیێك هەوڵدەدا بە باشترین شێوە زانیاری لەبارەی شوێنەکانەوە بگەیێنێتە خوێنەر. خوێنەر لە کاتێکدا دەزانێ کە شارێك هەیە بەناوی (شاری تەپ و تۆزە زەردەکان) کە (جەلادەتی کۆتر) لەو چاڵانەی بۆ ئەنفالکراوان لەناوەڕاستی بیابان هەڵکەندراون و کوردەکانی تێدا زیندەبەچاڵ دەکەن ڕزگار بووە و لە شارێك بە ئاگا دێتەوە کە کەوتووەتە ناوەڕاستی بیابان و جگە لە مۆسیقاژەن و دکتۆرێك سەرتاپای سەرنشینانی ئەو شارە ئافرەتن، بۆیە خوێنەر پرسیار دەکا، ئایا بوونی شارێکی لەم جۆرە لەناوەڕاستی بیاباندا کارێکی کردەنییە و دەکرێ شتی وا بوونی هەبێ؟ ڕۆماننووس بە پێدانی ئەو زانیارییانەی لەڕێی ئەم پاشخراوە دەرەکییە پێمان گەیشتوون، وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە.

دوای ئەوەی (جەلادەتی کۆتر) دەچێتە شاری سۆزانییەکان و نە خۆی و نە ئێمەش هیچ لەبارەی دروستبوونی ئەو شارە نازانین، (موسای بابەك) بەسەرهاتی دروستبوونی ئەو شارە بۆ ئەو دەگێڕێتەوە و ئەویش بۆ ئێمەی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (باسی دروستبوونی ئەم شارەی بۆ کردم، شارێك کە لە دێر زەمانەوە ریشەی هەبووە، بەڵام لە هیچ سەردەم و ڕۆژگارێکدا وەك ئەمڕۆ گەورە نەبووە، بە درێژی لەسەر ئەو سێ خوشکە قسەی کرد کە بناغەی ئەو شارەیان داناوە، سێ خوشك کە لە خێڵە کۆچەرییەکانی ناو بیابان جیادەبنەوە و لەویادا دەوار هەڵدەدەن...سێ خوشك کە هێدی هێدی کیژانی تەنیا و تەرە لە خێڵ و خێزان لە هەموو لایێکەوە ڕوویان تێدەکەن...) ل٨٥

لە ڕۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەکان)دا سوود لە جۆری پاشخراوی ناوەکیش وەرگیراوە و نووسەر بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێست و پێدانی زانیاریی زیاتر تەنیا ئەو مەودایە لەکات دەگەڕێتەوە بۆ دواوە کە دەکەوێتە سنووری کاتی گێڕانەوەی ڕۆمانەکە. (جەلادەتی کۆتر) دەڵێ: ((چەند ساڵێك لەمەوبەر کە هێشتا منداڵ بووم، زۆر منداڵ بووم لەگەڵ تیپی مۆسیقای شارەکەمدا سەفەرم کرد بۆ شارێکی تر، شارێکی زۆر دوور لە شاری خۆمان بۆ ڤیستیڤاڵێکی مۆسیقیی

چکۆلە... پاسەکەمان وەرگەڕا... هەموویان مردن من نەبێت... کەوتینە ڕێگا بەرەو شارێکی دیکە. نازانم چەند ڕۆیشتین، گەلێك شار و خاك و زەریاچەمان بڕی، کە نزیك کەوتینەوە، لەسەر بورجێکی بەرزەوە، مۆسیقارێك کە بە گیتارێکەوە پاسەوانێتی ئەو دەڤەرانەی دەکرد، هاواری کرد، بەخێربێن بۆ شاری ئێمە، بەخێربێن بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان)) ل١٩٢.

لەم پاشخراوە ناوەکییەدا دوو بابەتی گرنگ باس کراون، یەکێکیان ئەوەیە (جەلادەت) هەر زۆر منداڵ بووە و خەریکی مۆسیقاژەنین بووە، ئەوەی دیکەشیان کە زۆر لەوەی پێشوو گرنگترە، (جەلادەت) لە منداڵییەوە جارێکیان لە سنوورەکانی مەرگ نزیك بۆتەوە و خەریك بووە بمرێ، بەڵام نەمردووە و هەر ئەو کاتەش شاری مۆسیقارە سپییەکانی بینیوە. (جەلادەتی کۆتر) بەر لەوەی بە یەکجاریماڵئاوایی بکا و جگە لەو جارەی باسمان کرد دوو جاری دیکەش لە سنووری مەرگ نزیك بووەتەوە، بەڵام نەمردووە. یەکێکیان ئەو کاتەیە کە لە بیابان و لەکارەساتی ئەنفال و لەو چاڵانەی بۆ ئەنفالکراوەکان هەڵکەندرابوون ڕزگاری دەبێ. ئەوەی دیکەشیان ئەو کاتەیە کە دەگەڕێتەوە کوردستان و لەسەر نەخشەی ئەنفالەکان دەسووتێنرێ، بەڵام نزیکبوونەوەی جاری یەکەمین لە مەرگ لە هەموو جارەکانی دیکە گرنگترە، چونکە ئەوەی یەکەمین دەستپێکە بۆ قەناعەت هێنان بەخوێنەر بەوەی (جەلادەت) دەتوانێ لەنێوان مەرگ و ژیاندا هاتوچۆ بکا.

ڕۆماننووس بەسەرهاتی بەدیلگرتن و ڕاپێچکردنی (جەلادەتی کۆتر) لە لاپەڕە (شێست و پێنج) ی ڕۆمانەکە بە ئێمە دەڵێ، کەچی تا لاپەڕە (نەوەد و یەك) هیچ زانیارییێکمان لەبارەی چۆنیەتی ڕاگواستن و ڕزگاربوونی جەلادەت پێ ناڵێ. لەلاپەڕەی نەوەد و یەکدا کاتێك برینەکانی (جەلادەت) کەمێك سارێژ دەبن و هۆشی دێتەوە سەرخۆی، ڕووداوەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ((دڵنیابووم ئەو ڕۆژەی لەگەڵ ئیسحاقی لێو زێڕین و سەرهەنگ قاسم گیراین، ئێمەیان لە زیلێکدا بەرەو باشوور هێنا... دڵنیابووم لەگەڵ کۆمەڵێك زیندانیی تردا کۆیان کردینەوە... لە زیلەکەدا دەنگێك پێی گوتم ((مۆسیقامان بۆ لێدە، مۆسیقا)) لەبیرمە من فلووتم لێدا... لە نیوە شەوێکی تاریکدا ئێمەیان دابەزاند... دەنگی تەقەکانم لەبیرە)) ل٩٠-٩١

باسکردنی مۆسیقا ژەنین لەلایەن (جەلادەت) لەم پاشخراوەدا بیرهاتنەوەییێکی گرنگە و خزمەت بەو رووداوانە دەکا کە لەدوای ئەم پاشخراوە دێن. کاتێك (سامیری بابلی) دەمرێ، ئەو فلووتەی جەلادەتی هەر لا ماوە کە لە بیاباندا ئەوی بەهۆی ئەو فلووتەوە رزگارکردووە.

لە ڕۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەکان) دا جۆری (پاشخراوی تێکەڵ) یش بەکارهاتووە کە رۆماننووس یان حیکایەتخوان یان کارەکتەر کە دەگەڕێتەوە بۆ دواوە و باسی رابردوو دەکا، لە گێڕانەوە ناوەستێ تا کاتی رابردووەکە دەگەیێنێتە کاتی ئێستای دەق. (عەلی شەرەفیار) دەڵێ: ((چوار کەس بوون، چوار قۆڵی بە دەنگێکی کۆڕاڵی گۆرانییێکی دێرینیان دەگوتەوە ((ئەرێ بە تویێ عارەقچن وا رۆیی و بەجێی هێشتم))... جەلادەت ئەو رۆژەی لەبیر بوو کە بەدەم گۆرانی مامڵێ وە خۆیان کرد بە پرتەقاڵی سپیدا. چوار زەردەخەنەی غەمگینیان هەبوو، چوار نیگا کە پێ دەچوو لە چوار چەشن بۆیەی جیاواز هەڵکێشرابی، ئەو کات پڕ جووڵە و بزۆك و زیندووتر بوون، وەلێ ئێستا وەك ئەوە بوو لەناو ئاشێکی گەورەی بارووتەوە هاتبن بۆنی جەنگیان لێ دەهات) ل٣٠٣

(عەلی شەرەفیار) لە رێی (جەلادەت)ەوە باسی چوار سەربازی کوردمان بۆ دەکا کە لەجەنگ گەڕاونەتەوە و یەکێکیان بریندارە. حیکایەتخوان لێرەدا رەوتی گێڕانەوە دەوەستێنێ و دەگەڕێتەوە بۆ ئەو رۆژەی کە ئەو چوار سەربازە هاتنە شاری تەپوتۆزەکان و چوون بۆ تیاتری (پرتەقاڵی سپی) و لەوێدا (جەلادەت) لەسەر سەحنە مۆسیقای دەژەند. (شەرەفیار) ئەو رووداوە تەواو دەکا تا دەگاتەوە بەردەم عەیادەکەی (دکتۆر موسای بابەك) کە چوار سەربازەکە بۆ تیمارکردن هاتبوون هەمووی دەگێڕێتەوە و هەردوو کاتەکان تێکەڵ دەکا. رۆماننووس لەم پاشخراوەدا توانیویەتی هاوبەشییێکی جوان و هونەرییانە لەنێوان هەردوو رووداو دروست بکا، بەوەی وا لە (جەلادەت) بکا لەگەڵ بیستنی ئەو گۆرانییەی سەربازەکان دەیڵێن (جەلادەت) ئەو رۆژەی بیر بکەوێتەوە کە ئەم سەربازانە هاتنە ئەو شارە و هەمان گۆرانییان دەگوت.

## ئەنجام

١– لە هەردوو بەرهەمەکەدا هەموو جۆرەکانی پاشخراو (دەرەکی، ناوەکی، تێکەڵ) دەبینرێن و (خانی) و (بەختیار عەلی) سوودیان لەو هونەرە وەرگرتووە.

٢– (مەم و زین) داستانێکی کۆنە و کاتێکیش شاعیر دەیەوێ لە ڕێی پاشخراوی دەرەکییەوە بگەڕێتەوە بۆ رابردوو، ئەوا پێویستە مەودایێکی دوور بەرەو دوا بگەڕێتەوە، بەڵام لە رۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەکان) گەڕانەوە بەهۆی پاشخراوی دەرەکی و ئەو مەودایەی رۆماننووس یان حیکایەتخوان رووەو دواوە دەیبڕێ ماوەییێکی زۆر نییە.

٣– لە داستانی (مەم و زین)دا بایەخ بە گێڕانەوەی زنجیرەیی و بەردەوامیی کات دراوە و شاعیر ئارەزووی ئەوەی کردووە کە ئەو بەدوای یەکداهاتنە بەردەوام بێ، بەڵام بەهۆی پێویستی زۆرجار کاتی گێڕانەوەی ئاسایی وەستاندووە و لە ڕێی هونەری پاشخراوەوە گەڕاوەتەوە دواوە. هەرچی رۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەکان) ە گرنگی بە بەدوایەکداهاتنی کات نەداوە و لەوێدا وەکو تەکنیکێك مامەڵە لەگەڵ ئەم هونەرەدا کراوە و رۆماننووس نەیویستووە رۆمانەکەی بەشێوەییێکی تەقلیدی بگێڕێتەوە.

٤– لە داستانی (مەم و زین)دا بەکارهێنانی ئەم هونەرە تەنیا بە مەبەستی زانیاری بەخشینە، کەچی لە رۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەکان) سەرەڕای زانیاری بەخشین بە خوێنەر بۆ تامەزرۆکردنی خوێنەر و راکێشانی بەرەو خوێندنەوەی تەواوی رۆمانەکە و رازاندنەوەی بەرهەمەکە، لەوانەش گرنگتر بۆ خستنەڕووی رۆمانەکە وەکو رۆمانێکی هاوچەرخ.

## پەراوێزەکان

١- د. نەجم خالید نەجمەددین ئەڵوەنی، بینای کات لە سێ نموونەی رۆمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٣ ز، ل٩٥.
٢- فاتح عبدالسلام، الحوار القصصي تقنياته وعلاقاته السردية، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، الطبعة الاولى، بيروت - ١٩٩٩ ، ص١٣٥.
٣- د. موريس ابو ناضر، الالسنية والنقد الادبي في النظرية والممارسة، دار النهار للنشر، بيروت - ١٦٧٩، ص٩٣.
٤- عربعلى رضايى، واژگان توصيفى ادبيات، انتشارات امير كبير، چاپ بيست و چهارم، تهران-١٣٨١، ل١١٨.
٥- شجاع مسلم دغيم العاني، البناء الفني في الرواية العربية في العراق، رسالة دكتوراه، كلية الاداب- جامعة بغداد، ١٩٨٧ز، ص٦٠.
٦- محەمەد نوری ئەحمەد، بونیاد، زمانگەری لە خوێندنەوەی رۆماندا بە نموونەی ژانی گەلی ئیبراهیم ئەحمەد، ناوەندی چاپەمەنی و راگەیاندنی خاك، كوردستان- سلێمانی،٢٠٠٤، ل٣٥.
٧- محمد عزام، شعرية الخطاب السردي، www.awu-dam.org
8- Genette,G., Narrative Discourse, published by: Blackwell, OxFord-1980,p49.

- بۆ شیکردنەوەی هەرسێ جۆری پاشخراو سوودم لە هەردوو کتێبی:

(Genette,G. , Narrative Discourse, published by: Blackwell, OxFord-1980.) و (Strachan,A., Time in Ntuli's short stories, south Africa,1990) وەرگرتووە.

٩- محمد عزام، شعرية الخطاب السردي، www.awu-dam.org
١٠- أ.أ. مندلاو، الزمن والرواية، بكر عباس، دار صادر، بيروت-لبنان، الطبعة الاولى، ١٩٩٧، ص٦٧.
١١- ئەرەستۆ، هونەری شیعر (شیعرناسی)، وەرگێڕانی لە ئینگلیزی و پێشەکی و پەراوێزی: عەزیز گەردی، سلێمانی، ٢٠٠٤- ل٨٩.
١٢- محمد عزام، شعرية الخطاب السردي، www.awu-dam.org
١٣- د. عبدالرحمن مبروك، بناء الزمن في الرواية المعاصرة، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٩٨، ص٢٧.

## سەرچاوەکان


- **سەرچاوە بە زمانی کوردی**

١- ئەرەستۆ، هونەری شیعر (شیعرناسی)، وەرگێڕانی لە ئینگلیزی و پێشەکی و پەراوێزی: عەزیز گەردی، سلێمانی، ٢٠٠٤- ل٨٩.

٢- محەمەد نوری ئەحمەد، بونیاد، زمانگەری لە خوێندنەوەی رۆماندا بە نموونەی ژانی گەلی ئیبراهیم ئەحمەد، ناوەندی چاپەمەنی و راگەیاندنی خاك، کوردستان- سلێمانی،٢٠٠٤.

٣ - نەجم خالید نەجمەددین ئەلۆەنی (د.)، بینای کات لە سێ نموونەی رۆمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین، ٢٠٠٣ ز.

- **سەرچاوە بە زمانی عەرەبی**

١ - أ.أ. مندلاو، الزمن والرواية، بكر عباس، دار صادر، بيروت-لبنان، الطبعة الاولى، ١٩٩٧.

٢- سيزا احمد قاسم (د.)، بناء الرواية، الهيئة المصرية العامة للكتاب، مطابع "هيئة "مصرية" عامة للكتاب، مصر ٢٠٠٥.

٣- شجاع مسلم دغيم العاني، البناء الفني في الرواية العربية في العراق، رسالة دكتوراه، كلية الاداب- جامعة بغداد، ١٩٨٧.

٤- فاتح عبدالسلام، الحوار القصصي تقنياته وعلاقاته السردية، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، الطبعة الاولى، بيروت ١٩٩٩.

٥- د. موريس ابو ناضر، الالسنية والنقد الادبي في النظرية والممارسة، دار النهار للنشر، بيروت ١٩٧٩.

٦- عزام، شعرية الخطاب السردي، www.awu-dam.org

٧- عبدالرحمن مبروك بناء الزمن في الرواية المعاصرة، اتحاد الهيئة العامة للكتاب، ١٩٩٨.

- **سەرچاوە بە زمانی فارسی**

١- عربعلی رضایی، واژگان توصیفی ادبیات، انتشارات امیر کبیر، چاپ بیست و چهارم، تهران-١٣٨١.

- **سەرچاوە بە زمانی ئینگلیزی**

1- Genette,G., Narrative Discourse, published by: Blackwell, OxFord-1980.

2- Strachan,A., Time in Ntuli's short stories, south Africa,1990.

## الملخص

يشترك عدد كبير من التقنيات في بنية النص الروائي ويقوم الكاتب باستخدامها في الوقت المناسب. وتعد تقنية الاسترجاع احدى هذه التقنيات، حيث جرى استخدامها في بداية الامر في الملاحم وبعد ذالك استخدمت بصورة واسعة في الرواية مع تغيرات مهمة.

تتضمن هذا البحث المعنون (تقنية الاسترجاع في ملحمة (مەم و زين) و رواية (شاری مۆسیقاره سپییەکان) محورين رئيسيين، اشتمل المحور الاول على ثلاث عناوين مختلفة تتحدث عن البعد النظري للاسترجاع وعن هذه التقنية في الملحمة والرواية، فضلا عن الفرق بين تقنية الفلاش باك في كلا الجنسين. من ناحية اخرى خصص القسم الثاني من هذا البحث للجانب التطبيقي حيث انواع تقنية الاسترجاع في ملحمة (مەم و زين) و رواية (شاری مۆسیقاره سپییەکان).

وقد توصل هذا البحث الى نتيجة مفادها ان استخدام تقنية الاسترجاع في الملحمة هو مجرد لغرض اعطاء معلومات للقارئ عن الشخصيات الملحمية، اما في الرواية فقد كان الغرض منها اضافة الى اعطاء المعلومات هو منح صفة جمالية للرواية. فضلا عن جانب اكثر اهمية هو تقديم الرواية كرواية معاصرة.

## Abstract

There are many techniques that are involved in narrative and the writer uses them any time he/she thinks that it's necessary. Flashback is one of techniques that has been used in Epic since early times, then used with some changes in Novel.

This research is under the title “Technique of Flashback in Epic and Novel: ‘Mam u Zin’ and ‘Shari Mosiqare sipyekan’ as examples”. It is divided into two basic parts. In the first part which includes three different sections, we have dealt with the technique of flashback in epic and fiction. Then we have compared the technique of flashback in epic and novel.

We have devoted the second part in this research to applying different parts of flashback to (Mam u Zin) and (Shari Mosiqare Sipyekan). Here we have reached a point that the epic writers used Flashback just for providing the readers with information, while in novel, besides giving information, the novelist used it for aesthetic reasons. In addition, another important aim of using flashback is to offer a novel as modern novel.

# مێژوونووسانی کورد لە بارەی خێڵی کوردییەوە

**( لە شەرەفخانی بەدلیسییەوە- سەدەی شازدە، تا میرزا عەلی ئەکبەڕ کوردستانی- سەدەی نۆزدە )**

نووسینی کوردناسی ناوداری ڕووس:

**پرۆفیسۆر ی. ئی. ڤاسیلییەڤا**

وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە:

**د. ڕەشاد میران**

لەم باسەدا بۆچوونی شەش مێژوونووسی کورد نمایش کراون کە بەرهەمەکانیان بە زمانی فارسی نووسیوە. هەریەك لەم نووسەرانە ڕوانینی تایبەتیی خۆی هەیە سەبارەت بە خێڵی کوردی کە لایەنی ڕەچەڵەك، پایەی کۆمەڵایەتی و تەنانەت جێگەی نشیمەنی (شار یان لادێ) تیایدا ڕەنگیان داوەتەوە.

چەمکە کلیلەکان : خێڵ، کۆمەڵەی خێڵەتی، دەسنووس، مێژوونووس، سەرچاوەی یەکەمین، میرنشینی.

هەڵسەنگاندنەوەی دەور و بایەخی خێڵ لە چارەنووسی مێژوویی کورددا کارێکی سەختە. بنیادی خێڵەتی هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ مێژووی زانراوی کورداندا بووە. ئەو بنیادە ڕەنگە ڕاستەوخۆ سەرلەبەری کۆمەڵگای کوردی نەگرتبێتەوە، بەڵام کاریگەری لەسەر هەر هەموو سۆسیۆمی ((کۆمۆنەی)) کوردی بەگشتی هەبووە لە سەرانسەری ئاستەکانی ژیاریدا: ژیانی ئابووری، دەزگاکانی دەسەڵات، کۆمەڵی فیکر و ئایدیا باوەکان. لە هەر قۆناغێکی خەباتی سیاسیی ڕابردوودا لەپێناو دەسەڵات، ئەو خەباتە لە کوردستان هەمیشە بارگاوی بووە بە ئایدیۆلۆگیای خێڵەتی. وەکو پاڵپشت بۆ دەسەڵاتی هەر خێزان و بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوا خێڵێك یان یەکێتییەکی خێڵەتیی بەهێز وەستابوو.

خێڵــی کــوردی هــیچ هێمایــەکی کۆمــەڵگای بێچــین لــەخۆ نــاگرێ، تــا بەشێوەیەکی ترادیسۆنی (تقلیدی) وەکو دەزگایەکی کۆمەڵایـەتیی پـێش مێـژوو تەماشا بکرێ. خێڵی کوردی – زیندووە، بزێوە، بنیادێکی کۆمەڵایەتی– سیاسی و ئابوورییــە کــە دامــەزراوە لەســەر بیرۆکــەی خزمایــەتی و هاوکــاریی خێڵــەتی و ئەوپەڕی توانای هەیە بۆ مانـەوە و بـەردەوامبوون. ئینتیمـا بـۆ خێـڵ سەرچـاوەی گرتبوو لە خۆبردنەوەیەکی ئاساییانە بۆ بندەستی ئاپۆرەی خێڵەتی.

لە ئەدەبیاتی کوردناسیدا، ڕۆڵی مێژوویی خێڵی کوردی تەنیا لـە کۆتـایی سەدەی ڕابردووەوە هەڵسەنگاندنێکی هاوشانی خۆیی بەدەست هێنا. پێش ئەمـە نزیکـەی هـەردەم نیگەتیڤانـە سـەیری خێـڵ دەکـرا، چـونکە بیرۆکـەی هاوکـاریی خێڵـەتی هەمیشـە تەگەرەیـەك بـووە لەبـەردەم پرۆسـەکانی یـەکگرتنی ئێتنیکـی (Ethnoconsulidation– و) لـە کوردسـتاندا. کلیلـی هـەڵێنانی مەتـەڵی دیـاردەی خێڵی کوردی لە سروشتی دیالێکتیکانەی ئەم بنیادە کۆمەڵایەتییەدایـە کـە تیایـدا دوو توانای وزەداری بەهێز یەکیان گرتووە : پـەرتبوون و یـەکبوون. ئەگەرچـی یەکبوونەکەی زاڵترە کە گوزارشت لە هاوکاریی خێڵەتی دەکات.

توانای کامڵبوون و خۆپاراسـتنی خێـڵ مانـەوە و بـەردەوامبوون و قـودرەتی لەبن نەهاتووی خۆنوێکردنەوەی زامین کردبوو. لە ڕۆژگارەکـانی ناسـەقامگیری لـە کوردسـتان، لـە سـەردەمەکانی شـەڕ و کاولکاریـدا، کـە مێـژووی وڵاتـی کـوردان بەمەوە زۆر دەوڵەمەندە، خێڵ لەسەر چیاکان تاکە بنیادێك بوو بتـوانێ لـە ناوچـە دوورەدەسـتەکانیدا کـۆنترۆڵی ڕەوشـەکە بکـات. خێـڵ بـۆ کـوردان وەکـو حەشارگەیەکی ئابووری، سیاسی و ئایدیۆلۆگی بوو. ئـەمان زەحمـەت بیانتوانیایـە خۆیان وەکو کۆمەڵەیەکی ئێتنیکی بپارێزن، ئەگەر لە ساتە سـەختەکانی مێـژووی خۆیاندا پەنایان نەبردایە بۆ شاخ کە لەوێ پاڵپشتیان خێڵ و کۆچەرەکان بوون.

لە خێڵدا ئێمە بنیادێکی کۆمەڵایەتی– سیاسیی ئاسـتی نزمـی پێشـکەوتنی کۆمەڵایەتی نابینین، بەڵکو ئاستێکی تـری ئـاڵۆزتر، یـانیش ڕاسـتتر نـەبوونی هـیچ ئاڵۆزییـەك دەبیـنین. لـەم ڕوانگەیـەوە، خێـڵ هـەرگیز ئـەوە نییـە کـە هەمیشـە "ئاسەوارەکانی " هەیکەلی بنەماڵەیی و خێڵەتی پاراستبێ، بەلکۆ هەندێك ئاڵۆزترە لەمـە، بۆیـەش مـۆدێلێکی سـتڕوکتوری کۆمەڵایـەتی– سیاسـیی بزێـوە و توانـای

ژیانی بەردەوامی هەیە. هەر ئەمەشە وایکردووە خێڵ توانای مانەوەی هەبێ، لە کاتێکدا ستروکتوری تری کۆمەڵایەتی– سیاسیی ئاڵۆزتر لە کوردستان – ئیمارەت میرنشین – ڕووخا و لە ئارادا نەما.

## شەرەفخانی بەدلیسی ١٥٤٣– ٤/ ١٦٠٣

لە کتێبی مێژوونووسی گەورەی کوردی سەدەی شازدەم شەرەفخانی بەدلیسی "شەرەفنامە" دا خێڵەکانی کوردستان جێگەیەکی شیاویان گرتووە. وشەکانی دەسپێکی ئەم مێژوونووسە دەربارەی نەژاد و نەریتی خێڵە کوردییەکانن. ئاشکرایە شەرەفخان ئێتنۆسی کوردی بەدەر لەو بنیادە نەناسیوە.

خێڵەکان گوزارشتیان لە هێز و توانای جەنگیی میللەتی کورد دەکرد و "لەناو فەرمانڕەوایانی کوردستاندا، ئەوانەی عەشیرەت[1] و خێڵەکانیان زۆر و بەهێز بوون، وەکو (فەرمانڕەوایانی) هەکاری، سۆران، بابان و ئەردەڵان[2]، فەرمانڕەوایانی خاوەن قەڵا و جێگە بوون و ناوی ئەو قەڵا و شوێنانەیان هەڵگرتووە..." (شەرەفنامە، ١٩٦٧، ل٨٧).

چواردە بەشی "شەرەفنامە " تەرخان کراون بۆ کۆمەڵەی خێڵی وەکو : کەلهوڕ، برادۆست، دومبلی، موکری، مەحموودی، سولەیمانی، سوەیدی، زراکی، میرداسی، پازوکی، زەنگەنە، شێخ مەنسوور، زەرزا، ئەستوونی. شەرەفخانی بەدلیسی لە سەرەتای کارەکەیدا ویستبووی بەشی نۆیەمی بەرگی دووەمی بەرهەمەکەی دەربارەی خێڵی داسنیی یەزیدیی ئەوپەڕگر بێت[3] *، بەڵام لە هەموو دەستنووسە ناسراوەکاندا ئەم بەشە نییە، ڕەنگە هەر لە بنەڕەتدا نەنووسرابێت.

خێڵە بەهێزەکانی تری کوردستان کە لە " شەرەفنامەدا" باسیان کراوە، نەکەوتوونەتە نێو پێڕستی دەستنووسەکەوە. لە پێڕستدا جێگەی سەرەکیی دراوە بە بنەماڵە و خێزانە هەرە بەناوبانگەکانی کوردستان، ئەوانەی پشتیان بەستبوو بە خێڵە کوردییە بەهێز و گەورەکان. بۆیە نەبوونیان لەناو پێڕستەکەدا مانای پەردەپۆشکردنیان نییە، بەڵکو ئەم خێڵانە نزیکەی لە هەموو لاپەڕەکانی کتێبەکەدا ئامادەگییان هەیە. کتێبەکەی شەرەفخان بەبایەخترین زانیاریی

دەربارەی خێڵەکان لەخۆ گرتووە. یەکەمین ئەوەی باس کراوە کۆمەڵەی خێڵەتیی گەورە بوهتییە کە ماوەیەکی دوور و درێژ خێڵەکانی لە ناوچەی مێژوویی جزیرە، یان ئیمارەتی بۆهتـان (کوردییەکـەی– بۆتـان) لـە کوردسـتانی ناوەڕاسـتدا یـەکی خستبوون. بەلای شەرەفخانەوە لە دەستنووسەکەیدا باشتر بووە ناوی ئەم ناوچە مێژووییە بەناوی خێڵەکە بکات– ویلایەتی بۆهتی. بـۆ نووسـەری "شـەرەفنامە" ناوی بنەماڵەی فەرمانڕەوا، ناوی ئەو خێڵەی پشـتگیریی کـردووە، هـەروەها نـاوی ناوچە و ڕووبەرەکانی ژێر دەسەلآتی – هەموویان یەك بووە – بنەماڵەی بـۆهتی، عەشیرەتی بۆهتی، ویلایەتی بۆهتی.

ویلایـەتی بـۆهتی، نـاوی ڕووبـەرەکانی ژێـر دەسـەلآتی بنەماڵـەی مـیر، لـە بەرامبەر خێڵی بۆهتی و بنەماڵەی بۆهتی بە پلە دوو دێت، کـە وادیـارە هـەموویان نزیکەی لە یەك کاتدا دروست بووین. هەروەکو لـە هـەموو شـوێنێکی کوردسـتاندا، هێزی خێڵەتی یان کۆمەڵەی خێڵەتی ڕێگای بۆ بنەماڵە خـۆش کـردووە سـەرکەوێ بەرەو دەسـەلآتی سیاسـی. لەلایـەکی تریشـەوە، بیرۆکـەی چەسـپاندنی سیاسـیی بنەماڵەی بۆهتی بوو توانی کۆمەڵێك خێـڵ و تایفـە لـەژێر بـاڵی خۆیـدا یـەکبخات و ئیتر بەناوی خێڵی بۆهتی ناسران.

خێڵی بۆهتی– یەکێکە لەو چەند خێڵە کەمانەی کە ئامادەگی و چالاکییان لە ژیانی سیاسیی ناوچەکە لە سەرچاوەکانی ڕۆژگاری خەلیفایەتیدا تۆمـارکراون. قـەلآی گـەورە لـە بەشـی بـاکووری شـاری جزیـرەدا، کـە فـەرمانڕەوایانی بـۆهتی کۆنترۆڵیـان کردبـوو، بەڵگـەی ماوەیـەکی درێـژی حوکمڕانییـان. بـە گـەواهی مێژوونووسی عەرەبی سـەدەی چـواردەم شـەهاب ئـەددین ئـەل–عومـەری، خێڵـی بۆهتی ململانێی کردووە لەگەڵ کۆمەڵەی خێڵەتیی گەورەی تری کـوردی بـەناوی – حومەیـدی (The Encyclopaedia of Islam.New Edition.Leiden-London1981,Vol.V,p.456)– ئینسایکلۆپیدیای ئیسلام، چاپی نـوێ، لەیـەن– لەندەن، ١٩٨١، بەرگی ٥، ل ٤٥٦))

دەبێ سەرنجی ئەوەش بـدەین کـە لـە کتێبەکـەی شـەرەفخانی بەدلیسـیدا هەندێ جار قسـە لەسـەر عەشـیرەت (خێـڵ)ی بۆهتییـە و هەنـدێ جـاریش لەسـەر عەشیرەتەکانی بۆهتی (شـەرەفنامە، ١٩٦٧ لاپـەڕەکانی ١٧٥،١٧٧، ١٨١، ١٨٣–

١٨٥، ١٩١، ١٩٥، ١٩٧، ١٩٧، ٢٠٠). ئەمــە نــە هەڵــە و نــە تێکەڵکردنیشــە. بـۆ نووســەری "شــەرەفنامە" خێڵــی بــۆهتی (وەکــو چــۆن خێڵــە گــەورەکانی تــری کوردستانیش) لە هەمان کاتدا کۆمەڵەی خێڵەتی و یەکەی پتـەو بـوو، هـەروەهاش بریتی بوو لە کۆی هـەموو خێڵـەکان کـە هەریەکـەیان لـەو یەکێتییـەدا تاکایـەتیی خۆیی لەدەست نەدابوو. بۆهتانییەکان زێتر وەکو کۆمەڵەی خێڵەتی وێنا دەکرێن، بــەڵام شــەرەفخان " لــەناو خێڵــەکانی سەرانســەری کوردســتان" خێڵــی بــۆهتی هەڵبژاردووە نەك خێڵەکانی بۆهتی.

ئەم مێژوونووسە بە ئەوپەڕی شانازییەوە باسی بۆهتییەکان دەکات. ئەوان جـوامێر و جـەنگاوەر و سوارچـاك بـوون، خواسـتی زۆریـان هـەبوو لەسـەر چـەکی گرانبـەها، کەرەسـتە و کەلوپـەلی جـەنگ، ئەسـپی عـارەبی، شمشـێری میسـری و خەنجەری دیمەشقی– ئەمانەیان بەلاوە شتی زۆر بەنرخ بوون. لە ڕۆژانی تەنگانەدا ئەمانە بێ دوودڵی بە یەکڕیز بەرامبەر بە دوژمن توند دەوەستان. ئەمەش ئـەوانی جیا دەکـردەوە، بەقسـەی نووسـەری شـەرەفنامە، لـە "خـەڵکی وەکـو ئـەوان لـە هەموو کوردستاندا" (شەرەفنامە، ١٩٦٧، ل١٧٥–١٧٦). دەبێ ئەوەش بڵێین کـە بەزاندنی خێڵـە کوردییـەکانی تـر لـەڕووی ئازایـەتی و جوامێرییـەوە هـەروا ئاسـان نەبوو، چونکە، بە قسەی شـەرەفخان، هـەموو کـورد جـەنگاوەری لێهـاتوو بـوون، بەتایبەتیش کوردی خێڵەتی.

خێڵی بۆهتیی ئازا بنەماڵەیەکی هەرە گەورەی بە ژیان بەخشی، یـەکێك لـە خانــەوادە هــەرە بــەهێزەکانی کوردســتان کــە تەجســیدی شــێوازی کــوردیی نەجیبزادەیی و دەسەڵاتی میرایەتی دەکرد و دواتر بەناوی یـەکێك لـە ئەنـدامانی ناسرا – خانەوادەی بەدرخانییان.

شەرەفخان دەگێڕێتەوە کە چۆن بنەماڵـەی مـیران بـە پشـتیوانیی خێڵـەکانی بۆهتی سەنگی سیاسی و شکۆمەندیی بەدەست هێنا. کەچی بنەماڵەی فـەرمانڕەوا بەڕادەی سـەرکەوتنی بـۆ بەرزاییـەکانی دەسـەڵاتی سیاسـی و زێـدەبوونی هێـز و شکۆمەندی، وەکو بڵێی، دووردەکەوتـەوە لـە کۆمەڵـەی خێڵـەکانی بـۆهتی و ئـیتر لەمــەودوا بانگاشــەی جیــاوازیی بنەچــە و ڕەچــەڵەکی خــۆیی دەکــرد، تەنانــەت بانگاشەی جیـاوازیی ئێتنیکـیش(٤). ڕەگـەکانی داری ڕەچـەڵەك درێـژ دەبنـەوە تـا

دەگەن بە ناوی جەنگاوەری عارەب خالید کوڕی وەلید، خۆشەویستی موحەممەد پێغەمبەر : ناوی خانەوادەیی گەیشت بە سنوورەکانی پیرۆزیی.

هەروەك دەتوانین لە گێڕانەوەکانی شەرەفخانی بەدلیسی تێبگەین، خێڵی بۆهتی وەك پاڵپشت بۆ بنەماڵەی میر هەر مایەوە و لە مەترسییە دەرەکییەکان دەیپاراست. ئەم خێڵە هەمیشە بەبێ ترس بەرەنگاری ئەو فشارە دەرەکییانە دەبۆوە کە دووچاری دەسەڵاتی سیاسیی میرنشینی دەبوونەوە. بنەماڵەی میرانی بۆتان و کۆمەڵەی خێڵانی بۆهتی ڕەوشی کۆمەڵایەتی– سیاسیی میرنشینییان دادەڕشت. بنەماڵەی میران، کە لە سەرووی هەموو بنیادە کۆمەڵایەتییەکانی میرنشینیدا بوو، فەرمانڕەوایی دەکرد و خێڵیش پاڵپشتی بوو. پەیوەندییەکانی نێوانیشیان — ئەو بناغەیە بوو کە ژیانی کۆمەڵایەتی– سیاسیی کۆنکرێت لەسەری دادەمەزرا.

وەکو لە گێڕانەوەکانی شەرەفخانی بەدلیسیدا دەبینین، خێڵی بۆهتی لە ئاژاوە ناوخۆیییەکانیشەوە دوور نەبووە، لە زۆرانبازیی لەسەر دەسەڵات لەنێوان لق و پۆپە جۆراوجۆرەکانی خانەوادەی فەرمانڕەوادا، بگرە هەندێ جار ئاگرەکەشی خۆش کردووە. میراتگری بۆ تەختی میرایەتی دەبوایە ویست و ئیرادەی کۆمەڵەی خێڵەتیی لەگەڵدا بێ. بەڵام دڵسۆزی بۆ بنەماڵەی میر و بیرۆکەی نەگۆڕیی خانەوادە مەسەلەیەکی چەسپاو بوو.

خانەوادەی فەرمانڕەوای بۆتان و خێڵی بۆهتی لە ماوەی مێژووی خۆیاندا چەندین قۆناغی هەرە سەختیان بەسەربردووە، یەکێك لەو قۆناغانە ئەوە بوو کاتێك مێژووی نیو سەدەیان کەوتە ژێر تەم و تومانەوە. ئەوەش ئەو کاتە بوو کە هێرشی میر تەیموور قەڵای جزیر و ناوچەکانی بۆهتیی تەخت و وێران کرد. بەڵام چاوە تیژەکانی شەرەفخانی بەدلیسی توانییان لەناو ئەو تومانەدا ناوی دوو لە فەرمانڕەوایانی بۆتان بەدی بکەن. کاتێك حەسەن بەگی ئاق قۆینلۆ (١٤٥٣– ١٤٧٨) دەسەڵاتی گرتە دەست، خێڵی بۆتان بە دەنگێکی بەرز خۆیی نواند و توند بەرەنگاری بووەوە، ئەنجامەکەشی بە داگیرکردنی بۆتان لەلایەن تورکمانە ئاق قۆینلۆکانەوە تەواو بوو. بۆتان و جزیرە بۆ ماوەی ٣٠ ساڵان کەوتنە ژێر

دەسـەلاتی ئـاق قۆینلـۆ و، وەکـو شـەرەفخان نووسـیویەتی، "لـە بـێ ئومێـدی و نادڵنیاییدا بوون "[٥] (شەرەفنامە– ١٩٦٧، ل ١٨٤).

وەکـــو نووســـەری "شـــەرەفنامە" دەگێڕێتـــەوە، بەشـــی هـــەرە زۆری نەجیبزادەی خێڵی بۆتان لەناوچـوون و فـەرمانڕەوای بنەماڵـەی دەسـەلاتدار، مـیر خۆی، دەسگیر کرا و بە کۆت و زنجیرەوە خرایە زیندان. خێڵی بۆتان دابەش بـوو. میر شەرەف کە سەرکردایەتیی بۆتانیانی گرتە دەست "کاتێـك خـۆری دەسـەلاتی ئاق قۆینلۆ بەرەو ئاوابوون دەچوو" دەستی کـرد بـە یەکخسـتنەوەی بۆتانییـان و "هـەموو ئـەو بۆتییانـەی لـە ژیانـدا مـابوون " لـەژێر ئـالای خۆیـدا کۆکردنـەوە (شەرەفنامە، ١٩٦٧، ل١٨٣، ١٨٤). سەرنجەکانی دوایی مێژوونووس ئەوەمان بـۆ ڕوون دەکاتەوە کە هێرشە زۆرداریيەکانی ئاق قۆینلۆ نە تـەنیا دژی نـەجیبزادەی خێڵ و بنەماڵەی فەرمانڕەوا، بەڵکو دژی هەموو کۆمەڵەی خێڵەتیی بۆتانی بوون.

میر شەرەف، بە پشتیوانیی هێزی سەرلەنوێی عەشیرەتی بۆهتی، "ویلایـەتی میراتگری" ی ئازاد کرد و لە کۆتایی سـەدەی پـازدەدا بـوو بـە دەسـەلاتدارییەکی سەربەخۆ. بەڵام مام و براکانی فریا نەکەوتن لە زیندانی تورکمانـان ڕزگاریـان بـێ، کاتێك دوژمنێکی ترسناکی تر بەناوی سەفەوی کە تـازە بـەهێز دەبـوو لەبـەردەم بۆهتان و بنەماڵەی فەرمانڕەوا و خێڵی بۆهتی پەیا بوو.

شا ئیسماعیلی سەفەوی (١٥٠١– ١٥٢٤) ئاق قۆینلۆ تورکمانەکانی قاو دا و ناوچە کوردییەکانی دیاربەکر، مووسـڵ و سـنجاری گـرت، لەشکریشـی بـۆ جزیـرە نارد. چەندین شەڕ و پێکدادان لە نێوان قزڵباش و خێڵی بۆهتی ڕوویان دا و هەموو جارێك، وەکو شەرەفخان نووسیویەتی، میر شـەرەف و بۆتییـەکان سـەرکەوتوون. لە یەکێك لـەو شـەڕانەدا ١٠٧٨ قزڵبـاش کـوژران و زۆریشـیان بـەدیل گـیران. دوای شکەستی سێیەمین لەشکرکێشیی سەرکردە ناودارەکانی شـا ئیسـماعیل بـۆ سـەر ڕووبەرەکانی میر شەرەف، ئیتر تا مردنی ئەمەی دوایی چیتر ڕوویان لـەم ناوچـانە نەکرد. هەموو ژیانی ئەم فەرمانڕەوایە لە خـەبات یـان خۆئامـادەکردن بـۆ خـەبات لەپێناو بۆتان بەسەرچوو.

شا عەلی بەگ، جێگرەوەی میر شـەرەف، وەکـو نووسـەری "شـەرەفنامە" دەڵێ، یەکێك بوو لەو دوازدە میرانەی کوردستان کە چوون بۆلای شا ئیسـماعیل.

هەر هەموویان ملکەچییان بۆ خزمەتی شا ڕاگەیاند، کەچی بە فەرمانی شا خۆیان بە دەسبەسەری دیتەوە و موڵکەکانیان دران بە نێردراوانی شا. شا عەلی بەگ کە ڕزگای بوو لە دەستبەسەری چوو بەگژ قزڵباشان و نێردراوی شای دەرکرد و لەگەڵ فەرمانڕەوای بەدلیس و باپیرەی نووسەری "شەرەفنامە"دا یەکێتیی برایانەی پێکهێنا. لێرە بەدواوە عەلی بەگ لە سیاسەتیدا ڕوو لە سوڵتانی تورکی دەکات.

برای میری بۆهتان بەردەوام دەستی دەخستە نێو کاروباری ناوخۆی میرنشینیی بەدلیسییەوە، بەتایبەتیش کاتێك ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتی میراتگری دەبوو. لە ئەنجامی ئەو باڵادەستییەی بۆتانییان چەندین شەڕی نێوان خێڵەکانی بۆتانی و ڕۆژکی ڕوویان دا. لە دەسخستنە ناو کاری میراتگیریی تەختی میرایەتییەوە لە بەدلیس، خێڵی بۆهتی هەمیشە لایەنگریی ئەو لایەنەی بنەماڵەی فەرمانڕەوای کردووە کە خێڵی ڕۆژکی دژی بووە — خێڵەکان، بێگومان، ڕەچاوی بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەکرد لەو مەسەلەیەدا، واتە لە پێوەندییاندا لەگەڵ بنەماڵەی فەرمانڕەوا لە بەدلیس و جزیرەدا. بەڵام شەرەفخان شانازیی بە خێڵی بۆهتییەوە دەکرد، ئەو خێڵەی ناوەکەی، بەقسەی ئەم مێژوونووسە، لای کوردان ماناکانی جوامێری و جەنگاوەری بەرجەستە دەکردن (شەرەفنامە، ١٩٦٧، ل١٧٥).

لە کۆتایی سەدەی شازدە، لەکاتی نووسینی "شەرەفنامە" دا، شەرەفخان ڕەوشی میر شەرەف، کە هاوسەردەمی خۆی بوو، بە "گەوهەری حوکمڕانانی جزیرە " ناو دەبات و حوکمڕانییەکەی بە سەربەخۆ وەسف دەکات (شەرەفنامە ١٩٦٧، ل ٢٠١–٢٠٢) و ماڵ و گەنجینەکانی میری جزیرە، بە قسەی شەرەفخان، هیچ یەکێك لە فەرمانڕەوایانی کوردستان نەیانبووە.

شەرەفخانی بەدلیسی زۆر بە گەرمی، ئەوەش ئاساییە، وەسفی خێڵی ڕۆژکی دەکات– ئەو خێڵەی پشتیوان و پارێزەر و دامەزرێنەری بنەماڵەی میرانی بەدلیس بووە، نووسەری "شەرەفنامە"خۆشی سەربە ئەو خێڵە بووە. ئەو خشتەیەی کە دامەزرانی یەکێتیی خێڵەتیی ڕۆژکیی پێ دروست بووە لە خێڵ و

پاشماوە خێڵەتییەکانەوە بۆ گرتن و داگیرکردنی بەدلیس و ناوچەکانی، وادیارە، نموونەیەکی کلاسیکیی دروستبوونی کۆمەڵە خێڵەتییەکان بووە.

داگیرکردنی بەدلیس و ناوچەکانی بە ئەوپەڕی تونـدو تیـژی بـووە ؛ خێڵەکانی کوردان، بەشێکیان ناوچەیی " خێڵە کۆنەکانی ویلایەتی بەدلیس "، بەشێکیشیان بەقسەی نووسەر لە شوێنانی ترەوە هاتبوون، کۆبوونەوە و "بە ڕۆژێك "(٦) ناوچەکەیان دابەش کرد، واتە ڕێکەوتبوون کێ ببێ بە خاوەنی کوێ و هەر ئەوکاتیش سەرکردەی بالآیان هەڵبژاردووە و کۆمەڵەی خێڵەتییان پێکهێناوە.

ئەمانە بۆ داگیرکردن دوانەکەوتن. تاکتیکی داگیرکردنەکە ئەوەندە بەوردی داڕێژرابوو کە پلانەکە بەزوویی جێبەجێ بوو و ڕۆژکییەکان لە بەدلیس جێگیر بوون. یەکێتیی جەنگی– ستراتیجیی خێڵەکان گەشەی کرد بەرەو یەکێتیی خێڵەتی. سەرەتا ئەمانە یەکیان گرت لە دژی ئەوانەی دەستیان بەسەر ویلایەتی بەدلیسدا گرتبوو، دوایش دژی ئەوانەی کە بۆخۆیانیان دەویست – پیت و بەرەکەت و ڕەوشی گیۆستراتیجیی ناوچەکە، هەمیشە، خواستی زۆریان لەسەر بوو.

لەناو کۆمەڵەی خێڵەتیی ڕۆژکیدا هەر زوو ناکۆکی سەریان هەڵدا : "لەناو خێڵی ڕۆژکی هەموویان بەگژ یەکدا چوون و کەس ملی بۆ کەسی تر دانەنواند" (شەرەفنامە ١٩٦٧، ل٤٠٤). ئەوەی کە بەسەرکردەی خێڵ دایاننابوو مرد و میراتگرێکی لەپاش بەجی نەما، زیاد لەوەش ئەو سەربە یەکێك لە خێڵەکانی کۆمەڵە بوو. لە حاڵەتی واشدا، وەکو دەتوانین لە دەقەکانی "شەرەفنامە"وە تێبگەین، باشترین کاندید بۆ پۆستی سەرکردەی کۆمەڵەی خێڵەتی، ئەو کەسە بووە کە سەربە هیچ خێڵێك نەبێ و لە هەموویان بەیەك ڕادە دووربێ. جا سەرانی عەشیرەتی ڕۆژکی چوون، بۆ ئەو مەبەستە، خانەوادەی فەرمانڕەوایان دامەزراند. یەکێك لەو دوو برایەیان کاندید کرد بۆ فەرمانڕەوایی کە بە بنەچە دەچوونەوە سەر بنەماڵەی ساسانی– وەکو چۆن لەو ئەفسانەیەی شەرەفخانی بەدلیسی هێناویەتیەوە گوتراوە، لە ئەنجامدا یەکێك لەو دوو برایە بوو بە فەرمانڕەوا لە بەدلیس و ئەویتریش– لە خازۆ (هازۆ ؟ و.).

هەرچۆنێك بێت ڕاستی و دروستیی مەسەلەی ئەو دوو برایە و پێوەندییان بە ساسانییەکانەوە، کە بەو ڕازاوەیییەوە لە "شەرەفنامە"دا هۆنراوەتەوە، گرنگ لەو حاڵەتەدا ئەوەیە کە عەشیرەتی ڕۆژکی خانەوادەی فەرمانڕەوای دامەزراند و لە بەدلیس چەسپاندی و سەروەرییەکەی پاراستووە. بۆ دارشتنی ئەفسانەیەك ڕاستیی ڕووداوەکان ئەوەندە گرنگ نییە و نووسەریش، وەکو دەردەکەوێ، باش لەمە گەیشتووە. ئەفسانە کە دروست بوو "کاری دەکرد" بۆ سەروەریی خانەوادە و بەرز ڕاگرتنی ناوەکەی. خانەوادەکە لە سەرووی بنیادی خێڵەتی و دووریی وەکویەکی لە هەموو بەشەکانییەوە فەرمانڕەوایی دەکرد و دانی پێدانرابوو، خێڵی ڕۆژکیش ماسوولکەی ئاسنین و سەرپەرشتکارە خەمخۆرەکەی بوو.

عەشیرەتی ڕۆژکی پشتیوانی خانەوادەی میر بوو و شەرەفخانی بەدلیسیش سەربەو خانەوادەیە بوو. لە کۆتایی سەدەی شازدە، لە سەردەمی نووسینی "شەرەفنامە" دا، عەشیرەت (٢٥) خێڵی لەخۆ گرتبوو. بیست لەمانە دوو باڵی خێڵەتییان پێکهێنابوو : بڵباس و کەڤالیس و پێنجەکەی تریش "وەکو خێڵە دێرینەکانی ویلایەتی بەدلیس" بەجیا و تەنیا مانەوە. لەوە دەچێ کە سستێمی دووباڵی، یەکەی خێڵەتی، ئەوانەش کە بەتەنیا بوون و تەنانەت وەکویەکبوونی ژمارەکانیان باشترین توانایان ڕەخساندبوو بۆ کارکردنە سەر بوارەکانی ژیانی خێڵەتی، ڕێکخستنەکانی و ڕێگرتن لە پێکدادانی خێڵەتی.

کێبڕکێی دوو باڵی سەرەکیی عەشیرەتی ڕۆژکی زۆر بەڕوونی دیاربوو. ئەمانە هەرگیز هەموو جارێك بە یەکرێزی خۆیان نەدەنواند. بەهێزترین ئەو کێبڕکێیانەش ئەوە بوو کە دەرفەتی کارکردن ڕەخسا لەسەر گۆڕینی بنیادەکانی دەسەڵاتی میرنشینی. هەردوو باڵی عەشیرەتی ڕۆژکی هەوڵیان دەدا دەستیان هەبێ لە مەسەلەی تەختی میراتگریدا. شەرەفخانی بەدلیسی نموونەیەکی جوانی ئەمەی هێناوەتەوە.

ساڵی ١٤٩٣/٩٤، دوای مردنی میری بەدلیس، بە دەستوبردی باڵی کەڤالیس میر ئیبراهیم دەسەڵاتی گرتە دەست و "کارە گرنگەکان کەوتنە دەست نەجیبزادەکانی خێڵی کەڤالیس" (شەرەفنامە١٩٦٧، ل٤٣٩،٤٤٠). سەرانی خێڵی

لقی بلّباس ناڕەزاییيان دەربڕی. شێخ ئـەمیر بلّباسـی سـەرکردەی بـالأی بلّباسـان بڕیارێکی دەرکرد کە کاریگەریی یەکجار گەورەی هـەبوو لەسـەر چارەنووسـی مـیر شەرەف باپیری نووسەری "شەرەفنامە". شێخ ئەمیر بلّباسی و عەشیرەتەکەی لە دژی خێڵی کەڤالیس "بۆ خزمەت" چوونە پاڵ میر شەرەف کـە جێگـری مـیر بـوو لە مووش. بە تەقەلأی ئەوان میر شەرەف لەسەر تـەختی بـەدلیس دامـەزرا. کـاتێ میری نوێ، مـیر شـەرەف، گەیشـتە بـەدلیس، شـێخ ئـەمیر بلّباسـی هەلّوێسـتێکی سەرنجڕاکێشی نواند– ئەم بەدەستی خۆی میر ئیبراهیمی لەسەر تەخت دابەزاند و دەستی میر شەرەفی گرت بۆ سەر تەختی دەسـەلأت و ڕایگەیانـد کـە "ئێسـتاکە هەرکەسە و جێگەی شایستەی خۆیی گرت" (شەرەفنامە١٩٦٧، ل٤٤٠–٤٤٤).

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم جۆرە ڕەوشە زۆر دەگمـەن ڕووی دەدا. عەشـیرەتی ڕۆژکی بە هەموو لقەکانییەوە زێـتر داکـۆکیی لـە خانـەوادەی مـیر دەکـرد و وەکـو پارێزەری ئۆجاغ خۆی دەنواند. میرانی بەدلیس و خێڵی ڕۆژکی بەبێ یەکدی هێـز و شـکۆی خۆیانیـان لەدەسـت دەدا. ئەگـەر بەشـێوەیەکی کـاتیش خانـەوادە دەسـەلأتی لەدەستدا بوایـە، ئـەوا هـەر زوو لـەناو کۆمەڵـەی خێڵەتیـدا ئـاژاوە و جیابوونەوە ڕوویاندەدا. بۆیە سەرپەرشتکاریی خانەوادەی میران گەرەنتییەك بـوو بۆ سەقامگیریی کۆمەڵەی خێڵەتی، بۆ دڵسۆزی، لەخۆبووردن و خۆبەختکردنیان.

ناوی بنەماڵەی مـیر بـۆ عەشـیرەتی ڕۆژکـی هێزێکـی ڕاکێشـەری موگنـاتیکی هەبوو، ئەو ناوە بەتەنیا دەیتوانی عەشیرەت یـەکبخات و بـۆ خـەبات هـانی بـدات. عەشیرەتی ڕۆژکی لەپێناو ناوی خانەوادە و دامەزراندنی لەسەر تـەختی بـەدلیس، تەنانەت کاتێك لە ئەوپەڕی پەرشوبلأویشدا بوو، هێزی نایە بەرخۆ و هـەڵیکوتا بـۆ ناو جەنگ. هەروەکو شـەرەفخانی بەدلیسـی بەنموونـەی مێـژووی بـاپیرانی خـۆی نیشانیداوە، خواست و تەقـەلأی خێـڵ بـۆ دامەزرانـدنی دەسـەلأتی بنەماڵـەی مـیر هەنـدێ جـار تەنانـەت پـێش ئامـادەگیی بنەماڵەکـە دەکـەوت — لایـەنی دەسپێشخەریی خێڵ بووە.

لە "شـەرەفنامە"دا دەکرێ نموونـەی ڕوونـی ئـەوە بدۆزینـەوە کـە چـۆن عەشیرەتی ڕۆژکی بنەماڵەی میرانی بەدلیسـیان گەڕاندۆتـەوە بـۆ سـەر دەسـەلأت، تەنانەت ئـەو کاتانـەش کـە لـەوە دەچـوو لـە ڕووی سیاسـییەوە بنەماڵەکە ئـیتر

تیاچـووە. ڕەوشـێکی لـەم جـۆرە لـە سـەدەی پـازدەم سـەری هەڵـدا، کاتێـك میرنشـینیی بـەدلیس، هـەروەکو میرنشـینیی بۆتـانیش، کەوتنـە ژێـر چـەپۆکی سـوڵتانەکانی ئـاق قۆینلـۆ. (پـەزی سـپی) لـە بـەدلیس و لـە جزیـرەدا نێردراوانـی سوڵتانەکانی پەزی سپی خاوەن ماڵ بوون.

شەرەفخانی بەدلیسـی ڕاشـکاوانە و زۆر جـوان وەسـفی ئـەوە دەکـات کـە چۆن عەشیرەتی ڕۆژکی سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی بنەماڵـەی مـیری لـە بـەدلیس کرد بە ئەرکی سەرشانی خۆی. ڕۆژکییە خەمخۆرەکان نەوەکانی بنەماڵەی میریـان دەهێنـا، یـەك لـەدوای یـەك، تەنانـەت تەمـەن بچـووکەکانیش، هەنـدێ جـار بـەبێ ڕەزامەنـدیی دایکانیشـیان. بـۆ ئەمـەش ئەمانـە هـەموو شـتێکیان دەگرتەبـەر : ڕازیکردن، پاڕانـەوە، هێنانـەوەی قسـەی خواوەنـد کـە، گوایـە، لـە خـەونا پێیـان گوتراوە. ناوی بنەماڵـەی مـیر بـۆ ڕۆژکییـان وەکـو ئاڵایـەك وابـوو، بـۆ ئـەو نـاوە هەمیشـە دەجـەنگان و لـە شـەڕەکاندا گیانیـان لەدەسـت دەدا. لـە شـەڕەکاندا هـەروەها نوێنـەرانی بنەماڵـەش دەکـوژران– لـە شـەڕێکدا بـاپیرە گـەورەی شەرەفخانی بەدلیسی تیاچـوو، کـە ئـەویش هـەر ڕۆژکـی لەسـەر تـەختی بـەدلیس دایانمەزراندبوو. لە کۆتاییدا، لـە سـاڵانی ٩٠ی سـەدەی پـازدەم لـە ئـەنجامی ئـەو هەوڵ و تەقەلایانەی ڕۆژکییان دەسەڵاتی بنەماڵەی میرانی بەدلیس دامەزرایەوە.

لـە سـەدەی شـازدەدا، بۆتـان و بۆتییـەکان، بنەماڵـەی میرانـی بـەدلیس و عەشیرەتی ڕۆژکی تازە شەڕ و پێکدادانیان لەگەڵ سوڵتانەکانی ئاق قۆینلۆ لەکۆڵ ببوونەوە، کەچی هەر زوو کەوتنـە بـەر زەبـری بـەهێزی ناکۆکییـەکانی ئێرانـی– تورکییەوە.

دوو ئیمپراتۆریای زلهێز لە پێکدادانی بـێ کۆتاییـدا بـوون : عوسمـانی کـە لەمێژ بـوو هێـز و شـکۆی خـۆی بەدەسـت هێنـابوو، سـەفەویش کـە تـازە سـەری هەڵـدابوو و بۆمـب ئاسـا هـەردوو ئایـدیاکانی دەروێشـیی ئیسـلامی و هاوکـاریی خێڵەتیی یەکخستبوون. شەڕ و پێکدادانەکان هەموو ڕووبەر و جیهانی کوردانیـان کردبوو بە دوو بەشەوە. فەرمانڕەوایانی کورد ناچار ئەوبەر و ئەوبـەریان دەکـرد، ئاڕاستەی سیاسیی خۆیان هەندێ جار (١٨٠) پلە دەگۆڕی.

ڕەوشی جیۆستراتیژیی لەڕادەبەدەر گرنگیی ولاتی کوردان، سولتانی عوسمانی و شای سەفەوییانی ناچار کردبوو کە بە وردی چاودێریی میرنشین و خێڵە کوردییەکان بکەن. بایەخێکی تایبەتییان بە میرنشینیی بەدلیس و خێڵی ڕۆژکی داوە، ئەوەش لە ئەزموونی ژیانی شەرەفخانی بەدلیسی خۆی و باوك و باپیرییەوە دیارە (بڕوانە: ڤاسیلییەڤا، ٢٠٠٥).

مێژووی خێڵی ڕۆژکی، وەکو لە "شەرەفنامە" دا نووسراوە، ڕێگەمان دەدات هاوکاریی خێڵەتی بە دیاردەیەکی کۆمەلایەتیی دابنێین. لەخۆبووردوویی و دلسۆزیی عاجباتیانەی عەشیرەتی ڕۆژکی لە ئایدیۆلۆگیای هاوکاریی خێڵەتییەوە هاتبوو. عەشرەتی ڕۆژکی، هەرچەندە پێکهاتەیەکی گێنێتیکی نەبوو، بەلام بەند بوو بە سیلەی خوێنەوە — ئەو خوێنە ڕژاوەی لە مەیدانەکانی جەنگدا لەپێناو بەرژەوەندی و سەروەری و شەرەفی خێڵ و بەناوی بنەماڵەی فەرمانڕەوای میرانی بەدلیسەوە. بە گەڕانەوە بۆ وەسفی ڕۆژکی لە دەسنووسی شەرەفخانی بەدلیسیدا، دەتوانین سەرنج بدەین کە بیرۆکەی هاوکاریی خێڵەتی زال بوو، نەك بیرۆکەی خزمایەتی — نە خزمایەتیی ڕاستەقینە و نە هەڵبەستراو. یەکبوون لەپێناو یەکێتیدا و یەکێتی بەمەبەستی یەکبوون بەرقەرار بوو.

باوانی شەرەفخانی بەدلیسی، بەلای کەمەوە، سێ جاران سەربەخۆیی خۆیانیان ڕاگەیاندووە و نووسەری "شەرەفنامە" خۆی پارە (درهەم)ی بینیوە ناوی فەرمانڕەوایانی بەدلیسیی لەسەر بووە.

شانازیی هەرە گەورەی شەرەفخان لە پارەی "شەمسەدینی" دا بوو کە لە فەرمانڕەوایی میر شەمسەدین لە سککە درابوو لە سەدەی VX— "لە ڕۆژگارەکانی تاریکایی کە تورکمانەکان دایانهێنابوو ". ئەم پارانە لە شارەکانی کوردستاندا ناسرابوون، خانەوادە نەجیبزادەکان پاراستبوویان وەك "زامینکەری بەختەوەری بۆ سەرانسەری ولاتی کوردان "(شەرەفنامە، ١٩٦٧، ل٤٢٢)، ئەمانە ماگنێتیزمی سیمبۆل و هێزی تەلیسماوییان هەبوو. لێرەشدا ناکرێ ئەم قسانەی نووسەری "شەرەفنامە "نەهێنینەوە کە پڕن لە شانازی بە بنەماڵەکەی و بە عەشیرەتی ڕۆژکی "ئەگەر دەسەلاتدارە بەهێزەکان ئارەزووی گرتنی کوردستان بکەن،

بێگومـان، ئـەوا پـێش هـەموو شـتێك كاريـان لەگـەڵ فـەرمانڕەواياني بـەدليس و عەشیرەتی ڕۆژكيدا دەبێ" (شەرەفنامە، ١٩٦٧،ل٤٠٥).

بـەلای شـەرەفخانی بەدلیسـییەوە كۆمەڵـەی خێڵـەتیی ڕۆژكـی شـكۆ و دڵسـۆزی، هێـز و گـەورەیی بەرجەسـتە دەكـرد بـۆ هـەموو ولاَتـی كـوردان. لـە دەسنووسەكەی شـەرەفخانی بەدلیسـیدا گـەلێ چـیرۆكی سـەرنجڕاكێش دەربـارەی خێڵـە كوردییـەكان هـەن. وەكـو نموونـە چارەنووسـی خێڵـی ماڵكیشـی (هـەر ئەویشە– چەمیشگەزەك) دێنینەوە.

ئەم خێڵە هاوشان لەگەڵ بنەماڵەی میرانـی فـەرمانڕەوادا ژيـاوە بـە هـەموو سەركەوتن و دابەزین، لەسێدارەدان و لێشاوەكانی ڕاگواستنیانەوە. تەنانەت نـاوی كۆمەڵەی خێڵەتییەكەش گۆڕانی بەسەرداهات– مەتەڵەكەش هەڵهات و سەلمێنرا.

چەمیشگەزەك– كۆمەڵەی خێڵەتیی كوردی بەناوی نشـیمەنەكەیەوە كـراوە – ناوچـەی چەمیشـگەزەك (دەرسـیم، تونجـەلیی تـوركی) كـە بـە چـیای سـەخت دەوردراوە. لـــە ســـەردەمی ئێســـتادا بـــە يـــەكێك لـــە كـــەمترین دانیشـــتوان و دوورەدەستترین بەشەكانی كوردستان دادەنرێت (Bruinessen,1992, p150).

لە فەرمانڕەوایەتیی میرانی چەمیشـگەزەكدا، كـە چـەندین سـەدە درێـژەی كێشا، میرنشینییەكەیان، بە گەواهی شـەرەفخانی بەدلیسـی، ڕووبـەرێكی فراوانـی گرتبووەوە، بە (١٦) ناوچە و (٣٢) قەلاَ حسێب دەكـرا و یـەكجاریش بـەهێز بـوو. وەكو دەتوانین لە دەقەكانی "شـەرەفنامە" دا تێبگـەین، ئـەم میرنشـینییە لەبـەر چاوانی دنیای دەرەوەدا سیمبۆلی شـكۆمەندی و سـەروەریی كوردسـتان بـوو. بـە قسەكانی شەرەفخانی بەدلیسی، میرنشـینی لـە كوردسـتاندا ڕووبـەرێكی ئەوەنـدە بـەرفراوانی گرتبـوو، كـە "نـەجیبزادە، خـەڵكی ئاسـایی و بەتایبـەتیش خاقانـە مەزنـەكان لـە ڕێنمـایی و فەرمانـەكانی (خۆیـان)دا ولاَتەكـەیان بـە كوردسـتان ناودەبەن و هەموو جـارێكیش كاتێك لـە كوردەواریـدا نـاوی كوردسـتان دەهێـنن، مەبەستیان چەمیشگەزەكە (شەرەفنامە، ١٩٦٧ل ٢٢١).

لەگـەڵ ئەوەشـدا، نـاوی عەشـیرەتی چەمیشـگەزەك لـە لاپـەڕەكانی "شەرەفنامە" لـەو بەشـەدا نییـە كـە بـۆ فـەرمانڕەوایانی چەمیشـگەزەك تـەرخان كراوە، بەڵكو لە میانەی وەسـفی خێڵـی دومبـولی، لـە بەشـی سـێیەم "دەربـارەی

میرانــی کــوردی ئێــران "دا هــاتووە. لــە بەشــی " دەربــارەی فــەرمانڕەوایانی چەمیشگەزەك "دا باس لە عەشیرەتی مالکیشی دەکرێ. بـەگوێرەی شـەڕەفخانی بەدلیســی، کۆمەڵــەی خێڵــەتیی میرنشــینی چەمیشــگەزەك بــەناوی مــالکیش، دامەزرێنەری ئەفسانەیی خێڵەکە، ناونراوە[٧].

بەهـەمان شـێوەی کۆمەڵـەی خێڵـەتیی ڕۆژکـی کـە لـە سـەدەی دەیەمـدا بەمەبەستی داگیرکردنی بـەدلیس دروست بـوو، عەشـیرەتی مـالکیش دامـەزرا بـۆ داگیرکردنی ئەو ناوچانەی کە دواتر بوون بە ڕووبەری میرنشینیی چەمیشگەزەك.

ئەو کۆمەڵە یەکجار گەورەیەی مالکیش کـۆی کردبـووەوە بـوو بـە بناغـەی عەشیرەتی مالکیشی. بە گەواهی شەڕەفخانی بەدلیسی، ئـەم یـەکێتیی خێڵەتییـە لە سێ بەش پێکهاتبوو :" ئەمانە لە هەموو کوردستاندا بە ژمارەزۆریی عەشیرەت و خێڵـەکانیان، لایـەنگر و یاریـدەدەرانیان ناویـان دەرکردبـوو. نزیکـەی (١٠٠٠) لـە خێزانەکانیان لە کۆشکی شای ئێران کاریان دەکرد" (شەڕەفنامە ١٩٦٧، ل٢٢١).

نـەوەکانی مـالکیش، وەکـو لـە شـەڕەفنامەدا هـاتووە، ڕۆژگـارە هـەرە سەختەکانی جەنگیزخان، مـیر تـەیمووری گورگـان، شـاڕوخ مـیرزا، قـەرە یوسـف قەرەقۆینلو– یان بەسەربردووە. ئەزموونی ڕاستەقینە، بۆ بنەماڵەی فـەرمانڕەوای چەمیشگەزەك و هەروەهاش بۆ کۆمەڵەی خێڵـەتیی مالکیشـی، ئـەو کاتـە دەسـتی پێکرد کە ئۆزون حەسەن ئاق قۆینلو دەسەڵاتی گرتە دەست. سـوڵتانی تورکمـانی کە دەیویست بنەماڵەی فەرمانڕەوای میرانی چەمیشگەزەك "تێك بشکێنێ و لەناو بات" لەشکرکێشییەکی کرد و لە ئەنجامدا چەمیشگەزەك کەوتە دەست نێردەکەی ئــۆزون حەســەنەوە. بــەڵام مــیری چەمیشــگەزەك شــێخ حەســەنەوە، وەکــو شەڕەفخانی بەدلیسی دەگێڕێتەوە، توانی "ئەم ئاپۆرەیە لـە ویلایـەتی میراتگریـی خۆی" دەربکات (شەڕەفنامە١٩٦٧، ل٢٢٢) و موڵکەکانی بگەڕێنێتەوە.

دوای ئاوابوونی خۆری ئاق قۆینلو، لە سەرەتای سەدەی شازدەدا بە تـاو و گوڕمـەوە سـەفەوییەکان هاتنـە سـەر شـانۆی سیاسـی لـە ئێـران. لـە سـەرەتای ڕێگاکەیاندا وزەی سیاسییان بە ڕادەیەك بوو کە ساڵی (١٥١٢) سـنووری بـاکووری ڕۆژئـاوای ئیمپراتۆریـای سـەفەوی بـە ئورفـە، چەمیشـگەزەك و ئەرزەڕوومـدا تێدەپــەڕی (Bruinessen,1992, p139). بــۆ داگیرکردنــی چەمیشــگەزەك

قزڵباشەکان میر نوور عەلی خەلیفەیان ڕەوانە کرد. ئەو کاتە لە چەمیشگەزەك حاجی ڕۆستەم بەگ، نەوەی شێخ حەسەن، فەرمانڕەوایەتیی دەکرد و لەخۆوە هەر (١٦) ناوچە و (٣٢) قەڵاکەی میرنشینیی چەمیشگەزەکی، کە بۆ ماوەیەك لە ئارادا نەما، پێشکەش بە قزڵباشان کرد. حاجی ڕۆستەم بەگ خۆشی، بە گێڕانەوەکەی شەرەفخانی بەدلیسی، چوو بۆ ئێران و بوو بە کەسێکی نزیکی شا ئیسماعیلی یەکەم و لەبری چەمیشگەزەك فەرمانڕەوایی ناوچەیەکی عیراقی عەجەمی پێدرا.

کۆمەڵەی خێڵەتیی مالکیشی کەوتەبەر جەور و فشارێکی بەهێزی تابیعەکەی شا ئیسماعیل و بەشێکی زۆری مالکیشییەکان (تیایاندا نەجیبزادە، "کوڕانی میرەکان ") لە سێدارەدران. چارەنووسی حاجی ڕۆستەم بەگیش دڵخۆشکەر نەبوو، ئەو ساڵی (١٥١٤) لە شەڕی چاڵدیران بەشداری کرد و کاتێك ئیسماعیلی یەکەم لە شەڕ ڕایکرد، چوو "چۆکی دادا بۆ سوڵتان" و بە فەرمانی سوڵتان ئەم و چوار لە نەجیبزادەی مالکیشی لە سێدارەدران.

دواجار کە ناوی خێڵی مالکیشی دێت لە کتێبەکەی شەرەفخانی بەدلیسیدا، ئەوەیە کاتێك پیر حوسێن بەگ، کوڕی حاجی ڕۆستەم بەگی لەسێدارەدراو، بە یاوەریی (٤٠) نەجیبزادەی خێڵەتی، سەردانی "بابی عالی"ی سوڵتان سەلیمی یەکەم دەکەن. سوڵتان چەمیشگەزەکی (کە دەبوایە لە قزڵباشان وەرگیرێتەوە!) دایەوە بە پیر حوسێن بەگی دۆڕاو و بێوەی.

لە "شەرەفنامە" دا چیتر ناوی کۆمەڵەی خێڵەتیی مالکیشی نایێت. لەسەر لاپەڕەکانیدا ناوی خێڵی چەمیشگەزەك پەیا دەبێ (شەرەفنامە،١٩٦٧، ل ٣٢٦، ٣٦٩، ٣٧٠، ٣٧٨)، ئەویش لە هەلومەرجی تابلێی لەناکاو و تەنانەت ئەفسووناویشدا. بەگوێرەی "شەرەفنامە"، خێڵی چەمیشگەزەك هەر لەکۆنەوە(!) لە چۆخور–سەعادە ژیاوە — کە ئەمە ناوی ئەرمێنیای قەفقاس یا ناوچەی ئێریڤان بوو (پیترۆشێڤسکی ١٩٤٩، ل١٠١). دواتر زانیاریی سەرسوڕهێنتریش هاتووە : لە فەرمانڕەوایەتیی شا سوڵتان موحەمەد خودابەندە (١٥٧٨– ١٥٨٧)دا نەزار بەگ دومبولی و هەندێ لە میرانی قزلباش (!) لە خێڵەکانی ڕوملو، ئەلباوت، چەمیشگەزەك و سەعادلو چوون بەرەو "بابی عالیی

عوسمانی" (شەرەفنامە، ١٩٦٧، ل٣٦٢). پرسیار دەربارەی بۆچ لای شەرەفخانی بەدلیسی ناوی سەرانی خێڵی کوردیی چەمیشگەزەك بە میرانی قزلباش ناونراون، هەوڵدەدەین لە خوارەوە وەڵامی بدەینەوە.

شەرەفخانی بەدلیسی خێڵی چەمیشگەزەکی لەناو لیستی کۆمەڵە خێڵەتییە کوردییەکانی ئێران داناوە (شەرەفنامە١٩٦٧، ل٣٦٩). لەمەشدا دەڵێ کە لەو (١٨) خێڵانەی ژماردوونی تەنیا چواریان "میر و نەجیبزادەی خۆیان هەبووە کە بە یاساکانی میراتگری فەرمانڕەواییان کردووە"(هەمان سەرچاوە، ل٣٧٠). شەرەفخانی بەدلیسی باسی بیروباوەڕی ئایینیی خێڵەکانی چەمیشگەزەك و پازوکی دەکات، ئەوانەی "ڕەفتار و کردەوەکانیان بەجۆرێکن کە ناکرێ پێیان بڵێین موسڵمان " (هەمان سەرچاوە، ل٣٧٨). شەرەفخان ئەو قسەیەی بە رێکەوت نەگوتووە. لە باسەکەی دەربارەی پازوکی بەم وشانە دەست پێدەکات: "زۆربەی خێڵ و عەشیرەتەکانیان پەیڕەوی ئایینەکەیان ناکەن نە لە چاکەکاری و نە لە شکاندنی قەدەغەکراوە هەرە توندەکاندا "(شەرەفنامە١٩٦٧، ل٣٧٥).

زانیارییەکان دەربارەی کۆمەڵەی خێڵەتیی چەمیشگەزەك کە نووسەری "شەرەفنامە" ڕایاندەگەینێ بەجۆرێکن کە هەموو سەرنجەکانی (لە دەرەوەی دەقی ئەو بەشەی لەسەر فەرمانڕەوایانی چەمیشگەزەکە) پێویستییان بە ڕوونکردنەوە و شیکاری هەیە. لە بیروباوەڕی ئایینییەوە دەست پێدەکەین کە شەرەفخانی بەدلیسی نکۆڵی دەکات لە موسڵمانبوونی خێڵی چەمیشگەزەك.

ڕاستییەکەی، لە بەشی باکووری ڕۆژئاوای کوردستاندا ئایینزایەك بڵاو بووەوە کە زۆرجار پەیڕەوکەرانی بە تایفەی شیعەی ئەوپەڕگر ناوزەد دەکرێن. بەلای فارسە شیعەکانەوە بە عەلی ئیلاهی "ئەوانەی عەلی بە خودا دەزانن" ناسراون (پیتروشێڤسکی ١٩٦٦، ل٣٠٧) و م. ڤان براونسن بە عەلەوی ناویان دەبات. بە گەواهی ڤان براونسن، ڕاژەی پەیڕەوکەرانی عەلەویزم لە ناوچە جیاوازەکانی باکووری ڕۆژئاوای کوردستان وەکو یەك نییە. لە دەرسیم (چەمیشگەزەك) پەیڕەوکەرانی ئەوەندە توندڕەو ژیاون کە بەڕای نووسەر ڕێك لەگەڵ قسەکانی شەرەفخان دێنەوە و بەحاڵ دەکرێ بە موسڵمان لەقەڵەم بدرێن (براونسن ١٩٩٢، ل١٠٩،٢٣، ٢٦٨؛ شەرەفنامە١٩٦٧، ل٣٧٨).

بە گەواهی ڤ. پ. نیکیتین، کوردەکانی لە چیاکانی دەرسیم دەژین ئایینێک پەیڕەو دەکەن کە نزیکە لە یەزیدیزم و پێیان دەڵێن توجیک Toujiks یانیش قزڵباش (Nikitine,1956.p.235).

ئی. پ. پیتروشێڤسکی ناوی (قزڵباش) بەکاردەبا بۆ هەموو پەیڕەوکەرانی ئەم ئایینە لە تورکیا– ئەمانە ئەم ناوەیان بەسەردا بڕا لەبەر بەشداریکردن و پشتگیریی بەهێزیان بۆ بزووتنەوەی قزڵباشی لە سەدەکانی پازدە و شازدەدا دژ بە دەوڵەتانی سوننی– ئاق قۆینلو و ئیمپراتۆریای عوسمانی.

سەرنجەکانی ئی.پ. پیتروشێڤسکی یارمەتیدەرن بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو پرسیارانەی سەر هەڵدەدەن. بۆچی لە "شەرەفنامە"دا ناوی سەرۆکی چەمیشگەزەك لەگەڵ ناوی میرانی قزڵباشاندا هاتووە. لەژێر کاریگەریی ناکۆکییە توندوتیژەکانی عوسمانی–سەفەویدا کوردی عەلی ئیلاهیی چەمیشگەزەك (دەرسیم) لەگەڵ قزڵباشان، کە پاڵپشتی بنەماڵەی سەفەوی بوون و لەژێر ئالای شیعیزم دەجەنگان، یەکیان گرتەوە.

بەپێی زانیارییەکانی ئی. پ. پیتروشێڤسکی سیاسەتی بنەماڵەی فەرمانڕەوای چەمیشگەزەك بنەما و تایبەتمەندیی لۆژیکیی خۆیی هەبوو، بەتایبەتیش ڕادەستکردنی ناوچەی شاخاویی چەمیشگەزەك بەبێ شەڕ بۆ میرێکی قزڵباش، کە شا لە سەرەتای سەدەی شازدە ناردبووی بۆ داگیرکردنی. دەسەڵاتداریی ئیمپراتۆریای عوسمانی ڕەوایانە ئەم هەنگاوەی بە سۆزداری بۆ سەفەوییەکان لەقەڵەم دا. هەر لەسەر ئەوەش سوڵتان سەلیمی یەکەم ساڵی (١٥١٤) لەگەڵ گەیشتنی بۆ "دەرباری ئەو " لەسێدارەی دا، نەك لەسەر ڕووداوی کۆن وەك شەرەفخانی بەلیسی دەڵێ (شەرەفنامە،١٩٦٧، ٢٢٣).

ئەمانەن زانیارییەکان لەسەر خێڵی چەمیشگەزەك کە لە "شەرەفنامە"دا، سەرچاوەی بنەڕەتیی بۆ مێژووی کوردستان، هاتوون. بە گرێدان و بەراوردکردنی ئەو زانیارییە کەمەی سەرچاوەکە دەربارەی خێڵی چەمیشگەزەك لەگەڵ مێژووی بنەماڵەی فەرمانڕەوای میرانی چەمیشگەزەکدا و هەروەها لەگەڵ ئەوەی لەسەر عەشرەتی ماڵکیشی گوتراوە، هەوڵدەدەین نەخشەڕێگەی مێژوویی کۆمەڵەی خێڵەتیی چەمیشگەزەك بدۆزینەوە.

ڤ.. ف. مینۆرسکی لە ڕاستیدا هەردوو کۆمەڵەی خێڵەتیی چەمیشـگەزەك و ماڵکیشـی بـە یـەك دەزانـێ و  لـەم بارەیـەوە بـۆ ئـەم پرسـیارێك لـەئارادا نییـە: چەمیشــگەزەك، "خێڵێکــی گەورەیــە.. لەبــەر فشــارەکانی ئــاق قۆینلــۆ، خــۆی خسـتبووە ژێـر بـاڵی قـەرەقۆینلۆوە" (E1²,1981, Vol.V,fasc.85-86,p.457). شـەڕەفخانی بەدلیسـی لـە گێڕانـەوەی ڕووداوەکـانی سـەبارەت بـە سـوڵتانەکانی قـەرەقۆینلۆ و ئـاق قۆینلـۆوە تـا ناوەڕاسـتی سـەدەی پـازدەم، نـاوی کۆمەڵـەی خێڵەتیی چەمیشگەزەك دەهێنێ : ماڵکیشی، بەڵام لە دەرەوە ئەمـە نـاوێکی تـری هەبوو– چەمیشگەزەك، هاوکات لەگەڵ ناوی نشیمەنەکەیدا.

ئەو بەشانەی عەشرەت کە گواستیانەوە بۆ ئێران بـەناوی (چەمیشـگەزەك) ناسران و ئەوەش تاکە گواسـتنەوەی بەشـەکانی ئـەم عەشـرەتە نـەبوو. بەشـێکی باشـی ئـەو کۆمەڵـەی خێڵەتییـە چەمیشـگەزەکیان بەجێهێشـت و بەگـەڵ حـاجی ڕۆستەم بەگ کەوتن بۆ ئێران دوای ئـەوەی قزڵباشـەکان هەنـدێ قـەڵا و ناوچـەیان پێ بەخشی. ئەوانەیش کە لە چەمیشـگەزەك مانـەوە کەوتنەبـەر  سـتەم و سـزای لەسێدارەدان لەلایەن نێـردەی قزڵباشـانەوە. بەقسـەی نووسـەری "شـەڕەفنامە"، "گەورە و بچووکی عەشیرەت" دەنگی خۆیان گەیانـدە ئاسمـان و ڕایانگەیانـد کـە گوێڕایەڵ نـەبن و بەپەلـە بـەدوای حـاجی ڕۆسـتەم بـەگ خۆیـان گەیانـدە عێراقـی عەجەم و ئیسفەهان.

ئەم کۆمەڵەی خێڵەتییە کە سەرکردەکەی لەدەست دابوو ستەم و زۆرداریی دەچێشــت، هــەر دەبوایــە ڕووبــەڕووی هەڵوەشــانەوە بێتــەوە. دوای ئەمــە گواستنەوەی بەشەکانی تری خێڵەکە بۆ ئێران ڕووی دا. پاش شەڕی چاڵدیران کـە تیایدا سـوپای شـا تێکشـکا، حـاجی ڕۆسـتەم بـەگ، کـە وەکـو سـەرۆکی یـەکێتی (کۆنفیدراسـیا)ی خێڵـەتیی چەمیشـگەزەك مـابووەوە، ئاڕاسـتەی سیاسـیی خـۆی ڕادیکاڵانـە گـۆڕی و، وەکـو پێشـتر ئامـاژەی بـۆ کـرا، بـە ملکەچـی گەیشـتە  لای ســوڵتان ســەلیم و لــەوێ لەگــەڵ نوێنــەرانی نــەجیبزادەی خێــڵ یەکســەر لەسـێدارەدران. پـیر حوسـێن بـەگ، کـوڕی ڕۆسـتەم بـەگ، تـوانی میرنشـینیی چەمیشــگەزەك بەدەســت بێنێتــەوە و لــە فەرمانڕەوایەتیــدا، بــەگوێرەی "شەڕەفنامە"، دەسەڵاتی تەواوی هەبووە. بەڵام میرنشـینیی چەمیشـگەزەك، کـە

جاران بەهێز و شکۆدار بوو و ناوەکەی لەگەڵ ناوی کوردستاندا دەهات، لە کۆتایی سەدەی شازدەم و لە ئەنجامی بەخشینی مەرجدارانەی زەوی بە کوڕ و نەوەکانی پیر حوسێن بەگ بە فەرمانێکی سوڵتانی، دووچاری لێکترازانێکی پلانرێژ بووەوە. چەمیشگەزەك دابەش کرا بۆ دوو سنجاق و چوارده زەعامەت و تیمار(؟ و.)، هاوکاتیش مەرجێکی گرنگ لێرەدا خۆی نواند: وەچەکانی پیر حوسێن بەگ لەمەودوا نابێ بیر و خواستیان بۆ زێتر لەمە "نازناو و پۆستی تر لەسەر زەوییەکانی دەوڵەتیی پارێزراو لەلایەن خواوە"بچێت (شەرەفنامە، ١٩٦٧، ل٢٢٦). دەبێ ئەوەشی بخەینە سەر کە قەڵای چەمیشگەزەك و ناوچە و گوندەکانیشی کە "شایانی خاوەندارییەتیی سوڵتانن" بوون بە موڵکی موقەدەس. بنەماڵەی میر دابەش بوو بەسەر گرووپەی دژبەیەك لەسەر زەعامەتەکان. ئەو کۆمەڵەی خێڵەتییەی کە لەمێژ نەبوو میرنشینێکی بەهێزی پێکهێنابوو دوچاری پرۆسەیەکی لەم جۆرە بووەوە ؛ ئەمە هەر دەبوایە لێك بترازێ و بەشی هەرە زۆریشی کەوتنە دەرەوەی سنوورەکانی دەرسیم (چەمیشگەزەك).

یەکێك لەو بەشە جیابووەوانەی ئەم خێڵە چوو لە لوڕستان (ناوچەی پشتکۆه) گیرسایەوە و لە کتێبی شێخ محەمەد مەردوخدا ناوی بە مالکیشی (مەلەکشاه) هاتووە (تاریخی مەردوخ، ١٩٤٤، بەرگی ١، ل ١١٣). دوو بەشی تری جیابووەوە لەم کۆمەڵە خێڵەتییە کە چەمیشگەزەکیان بەجێهێشت، لە ناوچەی ئێریڤان (چوهور– سەعد) و لە ئەگداش، کە دەکەونە ویلایەتی شێروان، نیشتەجێ بوون. هەردووکیان لە کتێبی ی. پ. پیتروشێڤسکیدا بە چەمیشگەزەك ناویان هاتووە (پیتروشێڤسکی، ١٩٤٩، ل١٣٩– ١٤١).

لە سەرەتاکانی حوکمڕانیی شا عەباسی یەکەمدا عەشرەتی چەمیشگەزەك سەرلەنوێ لەدایك بووەوە– بە فەرمانێکی شاهانە بەشە جیابووەوەکانی کۆمەڵەی خێڵەتی، تێکەڵ بە "کوردی ڕەچەڵەکی جیاواز "، لەناو کۆنفیدراسیایەکی خێڵەتیدا بەناوی چەمیشگەزەك ڕێکخران و ڕەوانەی خوراسان کران بۆ پاراستنی سنوور لە تورکمانەکان.

خێڵی چەمیشگەزەك لە خوراسان جێگیر بوو، بەڵام ئەو ئەرکەی پێی سپێردرابوو، پاراستنی ئاسایشی ناوچەکە، هەموو جارێك جێبەجێ نەدەبوو. ساڵی

١٧٢٧ خێڵــی چەمیشــگەزەك ڕازی نــەبوو بەشــداریی نــادر ئەفشــار بكــات لــە تــەمێكردنی توركمانــان. زیــاد لــەوەش، "بــە فــەرمانی ســەرۆكی چەمیشــگەزەك محەمەد حوسێن خان"نەیویست خێڵی قەرەچۆرلو ملكەچ بكات و هێرشیان كردە سەر هێزەكانی ئیبراهیم خان كە سەركردەیەكی نادرشا بوو. كاتێك ئەمـەی دوایـی هێرشــی كــردەوە ســەریان دووچــاری تێكشــكانێكی شــەرمەزارانە بــووەوە. لــە دەسنووسی "نادری جیهانگیر "دا نووسراوە: هێزەكـانی سـوپا هـەزار كەسـیان لێ كوژران. ئەمە وای كرد نادر خۆی بێـت و هێـرش بكاتـە سـەر كـوردان ؛ ئـەمانیش بەرهەڵستكارییان كرد " لە قەلاً و حەشارگەكانیان دەركەوتن و ئاگری شەڕەكەیان خـۆش كـرد" و دانەمركانـەوە تـا بەشـی زۆریـان لێ كـوژران. خێڵـە كوردییـەكان ناچاركران خزمەت بكەن و ملكەچبن. بارمتەی ئەو ملكەچبوونەشیان نـەجیبزادەی خێڵەتی بوون كە گواسترانەوە بۆ شاری مەشهەد. بە گوێرەی زانیارییەكانی ڤ. ف. مینورسكی هەردوو خێڵی چەمیشگەزەك و قەرەچۆرلو لـە مەشـهەد جـێگیر كـران (EI2,1981,Vol.V,fasc.85-86,p461).

بەقسەی م. ڤان براونسن، كۆنفیدراسیای خێڵەتیی چەمیشگەزەك بوو بـە دوو بەشەوە، هەریەكێكیشیان عێل–خـانی خـۆیی هـەبوو. هـەردوو بـەش كـە نووسـەر هەریەكـەیان بـە كۆنفیدراسـیا ناودەبـا (Bruinessen,1992,p.134) سـەقامگیریی خۆیان پاراست تا پێش سەدەی بیستەم. ئەم دابەشبوونە، لەوانەیە، پێوەندیی بە ڕووداوەكانی سەدەی هەژدەم و سەردەمی نادر ئەفشارەوە هەبووبێ.

بەم جۆرە، كۆمەڵەی خێڵەتیی چەمیشگەزەك كـە ڕیشـاڵیان لـە دەرسـیمی شــاخاویی دوورەدەســت بــوو، چارەنووســی مێــژوویییان كەوتــە خوراســان– ئاقارەكـانی ڕۆژهـەلاتی جیهـانی ئێرانـی. دەرسـیم، كـە خێڵـی چەمیشـگەزەك بـە بنەچە لەوێوە بوو، توانای جەنگیی خۆی تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم پاراسـت. بە گوێرەی زانیارییـەكانی ڤ. پ. نیكیـتین، دەرسـیمییەكان لـەو كاتانـەدا (٣٠) تـا (٤٠) هەزار چەكداریان هەبووە (Nikitine,1956, p235).

***

تاقــە گلەیییــەك شــەڕەفخانی بەدلیســی لــە خێڵــە كوردییــەكانی كردبێــت– ئەوەیە كە گوێڕایەڵی و ملكەچبوونیان بۆ یەكدی نییـە و یـەك نـین. "هـەر خێڵێـك

لەپێناو سەربەخۆییدا یاخی دەبوو. ئەوان کـە جێنشـینی تۆپکـەی چـیاکان بـوون هـەر بـە سروشـت سـەرفراز بـوون. ئـەگینا لەبـەر چـی بـۆ خـاتری خـودا ئەمانـە یەکڕاییيان نییە... کوردەکان یەك حوکمڕانیی دانپیانراویان نییە"– بەم گوتـە پـڕ لە داخە کۆتایی بە مێژووەکەی دێنێ (شەرەفنامە، ١٩٦٧، ل٨٥).

شەرەفخان سەرلەبەری کتێبە بەهادارەکەی بـۆ بیرۆکـەی یـەکبوونی کـورد تـەرخان کـردووە. ئـەم هـەموو کوردەکـانی لـە بنمیچـی مـاڵی کـوردان کـۆ کردوونەتەوە، کە دەکرێ کتێبەکەی بەمە ناوزەد بکەین ؛ مەبەستیشی لە کـوردان خێڵە لێکدابڕاو و ئاخێوەرانی دیالێکتی جۆراوجۆر و هەندێکیشیان سەربە باوەڕی ئایینی وەکو یەزیدی کە لە ڕوانگەی موسڵمانی ڕاسـتڕەوەوە ڕەت دەکرێتـەوە – هەموو ئەوانە دەگرێتەوە (شەرەفنامە، ١٩٦٧، ل ١٧٥، ٣٢٧).

### عەبدوڕەزاق– بەگ دومبولی ١٧٦٢/٦٣– ١٨٢٧/ ٢٨

دومبولی – نـاوی خێڵێکـی کـوردیی بەناوبانگـە. نـاو و ڕەچـەڵەکی ئـەم خێڵـە پەیوەندیی بە ناوچەی دیاربەکرەوە هەیە– لەوێ قەڵایەك هەیە بەناوی ئـەم خێڵـە کە سەرەتا لێی ژیاوە. دواتر (هـەروەکو شـەرەفخانی بەدلیسـی ئامـاژەی پێـداوە) دومبولییەکان لە ناوچەی جزیرە یان ویلایەتی بۆهتی (بۆهتان) نیشتەجێ بـوون و کوردەکان هەندێ جار بەمانە دەڵێن <u>دومبولی–ی – بۆهـت</u> (شـەرەفنامە، ١٩٦٧، ل٣٥٧). لـە کۆتـایی سـەدەی شـازدەم، سـەردەمی شـەرەفخان، دومبـولی بـەرەو ڕۆژهـەڵات گواسـتیانەوە. بنەماڵـە تورکمانییـەکانی قـەرە قۆینلـو و ئـاق قۆینلـو پێویستییان بە هێزە جەنگییەکانی ئەمان بوو، لە بری ئەمەش ناوچەی سەڵماس– یـان پێـدرا کـە دەکەوێتـە بـاکووری ڕۆژئـاوای خـوی لـە ئازەربایجـانی ئێرانیـدا (کوردستانی ئێران). لە سەردەمی ئۆزون حەسەن ئـاق قۆینلـو (١٤٥٣– ١٤٧٨)دا دومبولییـەکان ڕووبـەرەکانی کـوردانی هـەکارییان پێـدرا بـۆ "پاراسـتن و داکـۆکی لێکـردن و بـەڕێوەبردن "یـان، بەمـەش هـەموو ناوچـەکانی هـەکاری کەوتنـە ژێـر کۆنترۆڵی تەواوی دومبولییەکانەوە.

زێدەبوونی هێز و وزەی جەنگیی کۆمەڵەی خێڵەتیی دومبولی، هۆکـار بـوو بـۆ سەرکەوتنی بنەماڵەی سـەرکردایەتیی خێـڵ بـەرەو تۆپکـەی ئـۆلیمپی(پاریگـەی)

سیاسی، کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی شا توهماسب (١٥٢٤– ١٥٧٦) ناوی نرا بە " فەرمانڕەوایی خوی و دومبولی ".

شا لە ترسی بەهێزبوونی دومبولییان لە کوردستان (پیتروشێڤسکی، ١٩٤٩، ل١٠٥) قڕکردنی بەکۆمەڵی ئەم خێڵەی ئەنجام دا. ڕزگاربووان لەم قڕکردنە خۆیان لای عوسمانییان حەشاردا و بە " سەخاوەتی بێسنووری دەسەڵاتی هەرە بەرز " لاوێندرانەوە. شا توهماسبیش لە لایەن خۆیەوە لێبووردنی دەرکرد بۆ ئەو دومبولییانەی زیندوو مابوونەوە.

چارەنووسی دواتری خێڵی دومبولی لەسەر سنوورەکانی دوو ئیمپراتۆریای دوژمنی یەکتر ئاسان نەبوو، بەڵام لە ماوەی سالآنی ١٧٤٧– ١٨٢٨دا پیتروشێڤسکی، کە ناوی ناوە قۆناغی میرنشینە نیمچە سەربەخۆکانی ئازەربایجان و ئەرمێنیای قەفقاز، شازدە میرنشینیی ژماردوون و تیایاندا ناوی میرنشینیی خۆی و دومبولی هاتووە. لە هەموو ئەو میرنشینییانەدا فەرمانڕەوایی بۆماوەیی بوو لەلایەن حەکیمانی سەرکردایەتیی خێڵە کۆچەرییەکانەوە (پیتروشێڤسکی، ١٩٤٩، ل ٨٦).

لەناو خانەوادەی حاکیمەکانی خۆی و دومبولی تەنیا "میری گەورە" و فەرمانڕەوا دەرنەکەوتن. لە خانەوادەی سەرکردە خێڵەتییەکانی دومبولیدا، کە لە ئەدەبیاتەکان بە کۆچەری لەقەڵەم دراون[٩]، سەرکردەی جەنگی و جەنگاوەری ناوداریش هەڵکەوتن. مێژوونووس و شاعیری کورد عەبدوڕەزاق– بەگ دومبولی، کە نووسەری بیست دانە بەرهەم بوو، لەم خانەوادەیە بوو. کتێبەکەی (مەئاسیری سوڵتانییە) لەسەر دوو یەکەمین فەرمانڕەوایانی بنەماڵەی قاجارەکان، ناوبانگێکی زۆری بەرکەوت.

لەمێژ نییە لە ماتینەدەرانی* ئێریڤاندا دەسنووسێکی کەموێنەی عەبدوڕەزاق– بەگ دومبولی دۆزرایەوە بە ناوی "تاریخی دەنابیلە"، جارێ بەچاپ نەگەیشتووە. لەم دەسنووسەدا بەتایبەتی ڕووداوی سەدەکانی حەڤدە و هەژدە ڕاشکاوانە تۆمارکراون. ئەوەی نائاسایی و پڕبەهایە، ئەم دەسنووسە تەرخان نەکراوە تەنیا بۆ خانەوادەی فەرمانڕەوا، بەڵکو بۆ سەرلەبەری کۆمەڵەی خێڵەتی نووسراوە.

نەجەف قولی- خان، باوکی نووسەر، یەکێك بوو لە سەرکردە جەنگییە بالآکانی نادرشای ئەفشار و بەشداری کردووە لە هەموو جەنگ و شەڕەکانیدا و کراوە بە بەگلەربەگی تەبریز (پاپازیان، ١٩٧٥، ل٢١٢ ؛ بامداد، ١٩٦٦، بەرگ٢، ل٢٦٤).

ماوەی ژیانی عەبدوڕەزاق-بەگ دومبولی پێچی جۆراوجۆری لەخۆ گرتبوو. کەریم خانی زەند ١٧٥٠- ١٧٧٩ عەبدوڕەزاقی لە تەمەنی منداڵییەوە وەکو بارمتە لەبری دڵسۆزیی باوکی لای خۆیی دانا و ئەمەش ١٤ ساڵی خایاند. ساڵی ٨٥/١٧٨٤ ئاغا محەمەد- خان قاجار بارمتەکانی ئازاد کردن. عەبدوڕەزاق- بەگ چوو بۆ تەبرێز و لەوێ خەریکی شیعر و مێژوو بوو. لە ئەنجامدا کەوتە بەر دڵی جێگرەوەی تەختی ئێرانی عەباس- میرزا (١٧٨٣- ١٨٣٣) و بوو بە ئەندامی کابینەکەی ئەو.

عەبدوڕەزاق- بەگ دومبولی تاقە مێژوونووسێك نەبوو لە خێڵی دومبولی. ئا. د. پاپازیان لە ماتینەدەرانی ئێریڤاندا بەرهەمێکی تریشی دۆزییەوە - "ئیشارات ئەل- مەزاهیب" بە قەڵەمی ڕۆستەم- خان ئیبن ئەحمەد- خان دومبولی. ئەم کتێبە ساڵی ١٨٤٩/ ٥٠ (١٢٦٦ه) لە خوی نووسراوە (پاپازیان، ١٩٧٥، ل٢١٤). ئەم دەسنووسەی ڕۆستەم- خان لق و دابەشبوونەکانی خێڵی دومبولیی لەخۆگرتووە هەر لەقۆناغە زووەکانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە تاکو سەردەمانی خۆی.

### مەلا مەحموودی بایەزیدی (١٧٩٧- ؟)

زۆر لە مێژوونووسانی کوردی دواتر هەوڵیانداوە بەردەوامیی بدەن بە "شەڕەفنامە"، کاری گەورەمێژوونووسی کوردی کۆتایی سەدەی شازدەم شەڕەفخانی بەدلیسی، بەڵام هەموو ئەو هەوڵانەی لامانەوە ئاشکران هەریەکە بەشێك یان لایەنێکی "شەڕەفنامە"ی گرتووە و کاری لەسەر کردووە. تاکەکەسێك، دوای شەڕەفخان، ویستبێتی دەربارەی چارەنووسی مێژوویی کوردستان بەگشتی بنووسێت نەك ناوچەیەك، بنەماڵە یان خێڵێك بەتەنیا، مەلا مەحموودی خەڵکی شاری بایەزید بوو کە یارمەتییەکی پڕبەهای دا بە کۆنسوڵی

ڕووسـی ئـا. د. ژابـا لـە کۆکردنـەوە و دیراسـەکردنی دەسنووسـە کوردییـەکان (بڕوانە: موسائیلیان، ١٩٩١).

مـەلا مـەحموود سـاڵی ١٧٩٧ لـەدایك بـووە، پـاش وەرگرتنـی زانسـتی پێویست و پـاش گـۆڕینی دوا فـەرمانڕەوای کـورد لـە بایەزیـد بـەرەو ئـەرزڕووم سەفەری کرد. چاوپێکەوتنە چارەنووسسازەکەی لەگەڵ ئا. د. ژابـا سـاڵی ١٨٥٦ لە ئەرزڕووم ڕوویدا ؛ تا ئەو کاتەش مەلا مەحموود چەندین بەسـەرهاتی بینیبـوو : سەرکردایەتیی جەنگی ویستی بەکاری بـەرێ لـە وتووێـژەکانی لەگـەڵ فـەرمانڕەوا کوردە ڕاپەڕیوەکەی جزیـرەدا. ئەمـە بەسەرچـوو و تـورك لێـی ڕازی بـوون، بـەڵام دوای ئـەوە فـەرمانڕەوای هـەکاری نـوروڵلا –بـەگ ڕاپـەڕی و مـەلا مـەحموودی ناوبژیکەر هەڵوێستی نیگەتیڤی نواند و ئەمەش بووە مایەی بەندکردنی، ئەگەرچـی بۆ ماوەیەکی کورت.

کاتێك ئا.د. ژابا گەیشتە ئەرزڕووم، مەلا مەحموود لـە ڕەوشـێکی هەژاریـدا بوو و دەیویست، وەکو ئا. د. ژابـا نووسـیویەتی، بـەرەو کوردسـتان کـۆچ بکـات. پێشنیازی ئەم کە ببێ بە فەرمانبەری و هاوکاریی بکات لـە دیراسـەکردنی زمـانی کوردیدا پلانەکەی مەلا مەحموودی گۆڕی و لەو کاتەوە هاوکاریی چـەندین سـاڵەی پڕبەرهەمی هەردووکیان دەستی پێکرد. لـە کارەکـانی مـەلا مـەحموود دەربـارەی مێژووی کورد دەبێ، پێش هەموویان، ئاماژە بدەین بە وەرگێڕانی بەرگی یەکـەمی "شەڕەفنامە" لە فارسییەوە بۆ زمانی کوردی (مەلا مەحموود بایەزیـدی، ١٩٨٦) و هەروەها، ئامادەکردنی دەسنووسێك بە هەزاران لاپەڕە بە ناونیشـانی "کیتـابی تـەواریخی جەدیـدی کوردسـتان"– لەسـەر داوای ئـا. د. ژابـا کـە لـەبری ئەمـە خـەڵاتێکی گـەورەی کـرد– ئـەم کتێبـە بـە تاقـە دانەیـەك سـاڵی ٥٨/١٨٥٧ نووسراوە.

ئەم دەسنووسەی مەلا مەحموود بووە جێگەی بایەخێکی زۆری ئا. د. ژابا و ئارەزووی بۆ وەرگێڕانی لە ٣٠ی ئـاداری سـاڵی ١٨٦٧ دا نامەیـەکی ئاڕاسـتەی ئەکادیمیای زانستیی پیترسبورگ کـرد و تیایـدا وەرگێڕانـی بـۆ زمـانی فەڕەنسـی پێشـەکیی مـەلا مـەحموود بـۆ دەسنووسـەکە، لەلایـەن خۆیـەوە، خسـتە بـەردەم زانایانی ڕۆژهەڵاتناس. لە ئەرشیڤی ئەکادیمیای زانستیی ڕووسیا توانیمـان ڕای پ.

ئی. لێرخ لەسەر وەرگێڕانەکە بدۆزینەوە کە ئاڕاستەی بەشی مێژوو و فیلۆلۆگیای کردووە لە ئەکادیمیای زانستیی ئیمپراتۆری.

ڕایەکەی یەکێك لە گەورەترین کوردناس و ئێرانیستانی ئەو ڕۆژگارە تابڵێی پڕ تەحەفوز بوو. بەهەر حاڵ، چارەنووسی دواتری دەسنووسەکەی مەلا مەحموود لێمانەوە دیار نییە. لەناو دەسنووسە کوردییەکانی (ئا.د. ژابا)دا، کە لە کتێبخانەی فەرمیی (م. ئی. ساڵتیکۆڤ – شیدرین) پارێزراون، ئەم دەسنووسەی مەلا مەحموود نییە. لە نامەکانی ئا.د. ژابا ی ساڵی ١٨٦٧ و دواتریشدا هیچ ئاماژەیەکیان بۆ ئەم دەسنووسە نییە. لە هەموو ئەو کارە مێژووییە زۆرانەی مەلا مەحموود لە ئەرشیڤی ئەکادیمیای زانستیی ڕووسیادا تەنیا وەرگێڕانی پێشەکییەکەی مەلا مەحموود بۆ زمانی فەڕەنسی پارێزراوە کە بەدەستی خۆی، واتە ئا.د. ژابا، لە ٥٠ لاپەڕە بە قەبارەی ٢١,٥ × ١٧ نووسیویەتی (ئەرشیڤی ئەکادیمیای زانستیی ڕووسیا، f2, op.1-(1865)No.20). ئەوەش زانراوە کە (وەکو ئا.د. ژابا لە نامەیەکیدا لە ١٣/ ٧/١٨٦٧ بۆ ب. ئا. دۆرن ئاماژەی پێداوە) دەسنووسەکە جگە لە پێشەکی هەروەها پێڕستی ناوەرۆك و لیستێك بە ناوی فەرمانڕەوا، میر و ئاغا دەسەڵاتدارەکانی ساڵی ١٢٠٠/ ١٧٨٥– ٨٦ ی لەخۆگرتبوو– پێڕستەکەش بایەخێکی تایبەتیی هەیە کە ناوەرۆکی بەرهەمەکە دەخاتەڕوو.

بەم جۆرە، تاقە شتێك لەبەر دەستمان بێت وشەی دەسپێکی مەلا مەحمووده کە خوێنەر دەباتە نێو کتێبەکەی و کێشە پەیوەندیدارەکانییەوە. کێشەکان زۆرن، جیهانی کوردی فرەلایەن و فرەڕەنگە، پڕ ناکۆکی و هاودژییە کە ڕوونکردنەوەیان لە یەکەم بینیندا کارێکی ئاسان نییە. هەموو ئەوانەش لەناو گرێیەکی عاسێدا گیریان خواردووە : کۆچەری، نیشتەجێیی، جیاوازیی ئایینی، پەیوەندیی زۆر لەگەڵ کۆمەڵەی ئێتنیکی تر ؛ جێپەنجەکانی پەرتوبڵاویی سیاسی و دابەشبوونی کوردستانیش بەسەر هەموو ئەوانەوەیە.

مەلا مەحموود، لە پێشەکییەکەیدا کۆمەڵێ زانیاریی دەربڕیون؛ تیایدا دەتوانین هەندێ زانیاریی کۆنکرێت لەبارەی خێڵەکان و نشیمەنیانەوە وەرگرین[١٠]، هەروەها ڕەوشی زمانیی کوردستان لەڕوانگەی خۆیەوە.

مەلا مەحموود میللەتی خۆیی خۆشدەوێ، شانازیی دەکات بە مێژووە دێرین و پڕ سەروەرییەکەیەوە، بە چاونەترسی و جەنگاوەریی کوردانەوە و ئامادەگییان بۆ بەهاناوەچوون و قوربانیدانیان، بە هەڵوێستیانەوە بەرامبەر بە ئافرەتان– وڵاتی کوردان توند بەستنەوەی ئافرەت بەماڵەوەی تیا نییە. بەڵام ئەوەی چاوەڕوانە مەلا مەحموود لەم پێشەکییەیدا تەنیا بە ئێتنۆسی خۆیدا هەڵگوتبێ، بەهەڵەدا چووە. نووسەر خۆی لە لایەنە نیگەتیڤەکانی واقیعی کوردانیش نادزێتەوە. لە هێنانەوەی کردەوە نیگەتیڤەکاندا، ئەگەر بەوردی لێی بڕوانین، دەبینین ئەنجامدەرانیان لای مەلا مەحموود کوردی کۆچەرن، خێڵە ڕەوەندەکانن. کوردە نیشتەجێکان، بەجیاوازیی لەگەڵ برا ڕەوەندەکانیان — "ئەمانە خەڵکی ڕێکوپێکن، لێهاتوو و موڵکداری دڵپاکن" (ڤاسیلیەڤا، ١٩٩١، بەش ٣، ل ٥٦، ٥٧، ٥٩–٦٢، ٧٢، ٨٠، ٨٤، ٨٦–٨٩، ٩٤، ٩٦، ٩٨، ٩٩).

بۆچوونەکانی مەلا مەحموود ئەو سنوورە گرنگ و زەقانەیان دەرخستوون کە جیهانی کوردییان دابەش کردووە بۆ کۆچەر و نیشتەجێ. لە ژیانی واقیعیی ناوچەکاندا نە شوانکاریی کۆچەری و نە جووتیاریی نیشتەجێی دوورەپەرێز و فۆڕمی چالاکیی ئابووریی چەقبەستووی کوردان نەبوون. سیمای تایبەتیی ناوچەکانی کوردستان لە هاوپەیوەند و پشت بەیەك بەستنی کۆچەری و نیشتەجێییدایە. تەگەرەی ڕێگر لەنێوان ئەمانەدا زێتر لەناو هوشیاریی مێژوونووسەکەدایە. وەکو مەلا مەحموود بە زەقی نیشانیداوە، لەڕوانگەی خەڵکی شارستانییەوە کە نووسەری "کیتابی تەواریخی جەدیدی کوردستان" یەکێکە لەوان، کۆمەڵەکانی کۆچەری و نیشتەجێ هاودژی یەکدیی بوون. ئەم گرووپە کۆمەڵایەتییانە پێکەوە بنیادێکی یەکگرتوویان پێکهێناوە و بەهیچ شێوەیەك چەقبەستوو و بێبزاوت نەبوون. لە نێوانیاندا، وەکو م. ڤان براونسن دەڵێ، هەمیشە جووڵە و توندی و ئاڕاستەکردن هەبووە کە لە ئان و ساتی خۆیدا ڕەوشی سیاسی و ئابوورییان دیاری کردووە (Bruinessen,1978, p.144).

پێشەکییەکەی مەلا مەحموود زانیاریی بایەخداری لەخۆگرتووە سەبارەت بە مانای ناوەکانی یەکێتییە بنەماڵەیی و خێڵەتییەکان. لەگەڵ ئەوەی وا دێتە بەرچاو کە ئەم ناوانە جێگیر و دیاریکراو نین، بەڵام بە گەڕانەوە بۆ دەقی

"شەرەفنامە"ی شەرەفخانی بەدلیسی، بۆنموونـە، دەردەکـەوێت جـۆرە یاسـایەك هەیــە لــە بــەکارهێنانی چــەمکەکانی "تایفــە"، "عەشــیرەت" و "قەبیلــە" (ڤاســیلییەڤا، ١٩٦٩) کــە مــەلا مــەحموودیش کتومــت پــەیڕەویی دەکــات (ڤاســـیلییەڤا، ١٩٩١، بەشـــی ٣، ل٦٩، ٧٠، ٧٥، ٧٩). ئـــەو ڕاســـتییەش سەرنجراکێشە کە مەلا مەحموود هەمیشە چەمکی "تایفە"ی بە مانـای "ئۆجـاغ"، "لانەی بنەماڵە" وەرگرتووە کە هەموو "عەشـیرەت" و "قەبیلـە"کان لـە ئەمـەوە پەیابووین. بەڵام بە نەخشەکێشانێکی سیمانتیکیی وردی هەرسێ ئـەم چـەمکانەی لە پێشەکیی مەلا مەحموود، هـەروەها لـە "شەرەفنامە"شـدا، هـاتوون– زۆرجـار بەرەو نادیـاریی دەچـن و مانـای "خێـڵ" دەدەن، جیـا لـە چـەندایەتی یـان هـەر تایبەتمەندییەکی تر.

پێشەکییەکەی کتێبی مێـژووی نـوێی کوردسـتان ڕێگامـان دەدات ئاشـنای تێڕوانینی سیاسیی مەلا مەحموود بـین، هـەروەها هەڵسـەنگاندنەکانی بـۆ ڕەوشـی سیاسـی، سەرچـاوەکانی ئـەم ڕەوشـە و واقیـع و داهـاتووی لـە کوردسـتاندا. وێناکردنی ناوچەکانی خێڵە کوردییەکان، لەلایـەن نووسـەرەوە، بـە دیوارێـك " لـە گۆشت و لە خـوێن"– کتومـت پێکاویـەتی (ڤاسـیلییەڤا، ١٩٩١، بەشـی ٣، ل٥٩). ئـەم خێڵانــە بـەڕیز دامـەزرێنرابوون "چەشـنی سـەنگەری سـەر ئـەرز هـەر لـە گورجسـتانەوە تـا بەغـدا، بەسـرا و شـارەزوور ". وەکـو دەردەکـەوێ، ناوچـە چیاییەکانی کوردستان هەمیشە ئەرکی سـنووری سروشـتیی نێـوان مەملەکـەتانی دوژمنی یەکدییان بەجێ گەیاندووە و بـەردەوام ڕۆڵـی مەیـدانێکی گـەرمی شـەڕیان بینیوە.

مەلا مەحموود، هەروەکو شەرەفخانی بەدلیسی، بە نیگەرانییەوە لـەبارەی پــەرتوبڵاویی خێڵــە کوردییەکانــەوە، دوژمنــداریی نێوانیــان و شــەڕی نــاوخۆیی نووسیوە، بەڵام ئەم کوردەکان بە یەك میللەت دادەنێ کـە داب و نـەریتی تایبـەت بەخۆی و یەك زمانی هەیە (ڤاسیلییەڤا، ١٩٩١، بەشی ٣، ل٥٩، ٦٢). بـەلای مـەلا مـەحموودەوە، بەشـێکی ئێتنۆسـی کـورد سـەربە بـاوەڕی ئێـزدی بـێ، نابێتـە نیشانەیەکی جیاکەرەوەی نەتەوەیی و ئێزدییەکان، کە زۆرجـاران بـە پەرسـتیاری شــەیتان نــاوزەد دەکــرێن، بــە قســەی نووســەر، جگــە لــە ئایینەکــەیان، هــیچ

جیاوازییەکیان لەگەڵ کورداندا نییە. ئەگەر ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە نووسەر نازناوی "مەلا"ی هەڵگرتووە و، کەواتە، سەربە توێژاڵی پارێزەری ئیسلامە، ئەوا ئەو بۆچوونەی دوایی نووسەری کتێبی مێژووی نوێی کوردستان یەکجار سەرنجڕاکێشە.

مەلا مەحموود کە توانی خۆی لە قاوغی ئایینی ڕزگار بکات، کەوتە داوی ناوچەگەرییەوە و خۆیی بە ناوچەکەی خۆیەوە سنووردار کرد– لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە، لە پێشەکییەکەیدا، دژەتێزی "ئێمە– بێگانە" بەرامبەر بە هیچ بەشێك لە ئێتنۆسی کوردی نادۆزینەوە. بەڵام، بەقسەی مەلا مەحموود، خێڵەکانی موکری، بابان، بڵباس و زرزا یەکجار جیاوازن لە خەڵکی کوردستانی باکوور. هەروەها نووسەر زۆر نیگەتیڤانە باسی کوردی هەکاری، بۆتانی و بادینانی دەکات (ڤاسیلییەڤا، ١٩٩١، بەشی ٣،ل ٧٢، ٩٨، ٩٩) بە بەراورد لەگەڵ براکانیان لە باکوور کە، بەڕای ئەو، سیفەتەکانیان ڕێك پێچەوانەی ئەمانن. بەم جۆرە، دژەتێزی "ئێمە– ئەوان" لێرەدا هەیە، بەڵام بەبێ ئەوەی هیچ بۆیەیەکی ئێتنیکیی پێوەبێ، هەروەکو لای خوسرەو ئیبن محەمەد کە لە دەسنووسەکەیدا تەنیا کوردی ئەردەڵانی بە خەڵکی کوردستان داناون (خوسرەو ئیبن محەمەد، ١٩٨٤، ل٢٣). وادیارە مەلا مەحموود زانیاریی پێویستی لا نییە دەربارەی واقیعی ژیانی کۆمەڵایەتی لە ناوچەکانی کوردستان، ئەوانەی دوور لەخۆی، ئەوەش وای کردووە هەندێ جار بۆچوونی خەیاڵئامێز دەربڕێ — بۆ نموونە، بەلای مەلا مەحموودەوە، لە ئێران بە خێڵە کۆچەرەکانیان گوتووە گۆران (ڤاسیلییەڤا، ١٩٩١، بەشی ٣، ل٦٩).

لەگەڵ ئەوەی مەلا مەحموود بۆچوونەکانی خۆیی سەبارەت بە واقیعی کوردان بە ناوچەگەرێتی سنووردار کردووە، کەچی یەکەمین مێژوونووسی کوردستان بووە مەسەلەی دەوڵەتی کوردیی وروژاندووە. ئەگەر لای شەرەفخانی بەدلیسی بیرۆکەی یەکێتیی کوردان لۆژیکانە لە بەرهەمەکەیەوە دەتکێ و، ئەگەر، لای ئەحمەدی خانیی شاعیر ئەم بیرۆکەیە لە تێڕامانی پڕحەسرەتی بۆ چارەنووسی میللەتی کورد و خەونەکانی دەربارەی یەکبوونییەوە دەڕژێ، ئەوا مەلا مەحموود باوەڕی خۆی دەردەبڕێ سەبارەت بە توانای یەکێتی و دامەزراندنی

دەوڵەتی خۆی. بە ڕای ئەو، لە کوردستاندا بۆ دامەزراندنی دەوڵەت "خەڵك و دانیشتووانی پێویست هەن"، مەرجە تەنیا یەکبوونیان "بەشێوەی میللەتانی تر" (ڤاسیلییەڤا، ١٩٩١، بەشی ٣، ل ٨٩، ٩٠).

ئەم گوتانەی مەلا مەحموود، ڕێگەمان دەدەن گریمانی ئەوە بکەین کە ئەگەرچی لەلایەن تورکانەوە بەشداریی پێکراوە لە گفتوگۆکان لەگەڵ میرانی کوردی ڕاپەڕیودا، بەڵام ئەم بەتەواوی لای ئەمانەی دوایی گرتووە و ئەمەش بووە بە مایەی لێتووڕەبوون و سزادانی.

لە کۆتاییدا دەڵێین، ئەگەر ئەم وشانەی لاپەڕەکانی پێشەکیی مەلا مەحموود ئەو هەموو زانیارییانەیان لەخۆگرتبێ، بێگومان دەبێ سەرجەمی دەسنووسەکە چ زانیارییەکی مێژوویی بەهاداری تیا هەبێ لەسەر کورد و خێڵە کوردییەکان ؟ بۆیە هیواخوازین ئەم بەرهەمە مێژووییە بدۆزرێتەوە. کورد پێویستیەتی بەوردی دیراسەی دەسنووسەکانی خۆیی، تاکەکەسی و خانەوادەیی، بکات.

### قوتابخانەی ئەردەڵانیی مێژوونووسانی کورد

(کۆتایی سەدەی هەژدە — سەدەی نۆزدە)

ناوی نووسەر، مێژوونووس و شاعیرانی کورد یەك لەدوای یەك ئەوا دەهێنرێنەوە یاد. ژمارەی ئێمڕۆکەی ناوی مێژوونووسانی لە ئەردەڵان، ناوچەی خواروەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ژیاون و بەرهەمەکانیان لەوێ داهێناون، ڕێگەمان دەدات قسە لەسەر قوتابخانەیەکی تەواوی مێژوونووسانی ناوچەیی بکەین. جارێش فاکتی بێ پێشینە بۆ کوردستان ئەوەیە کە کۆمەڵێك لە دەسنووسی ناوچەیی هەن دەربارەی حوکمڕانیی بنەماڵەی بەنی ئەردەڵان (ڤاسیلییەڤا، ١٩٩١، ل٥)، ئەوەش دەرفەتێکی دانسقەی ڕەخساند بۆ سەرنجدان لە مێژووی ڕابردووی خوارووی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کە هەندێك لە نووسەران ناویاننناوە لانەی کولتووری کوردی.

**محەمەد شەریف قازی**

(سەدەی هەژدە– سەرەتای سەدەی نۆزدە)

بەرهەمەکەی محەمەد شەریف قازی کۆنترین دەسنووسی ئەردەڵانییە کە ئێمە بیزانین، ساڵی ١٢١٥/ ١٨٠٠– ٠١ تەواو بووە و تاقە دەسنووسێکە لە کتێبخانەکانی جیهاندا نمایش کرابێ و هێشتاش چاوەڕێی بەچاپگەیاندن بێت. ژانری دەسنووسەکە "مێژووی گشتی" یە و تەنیا بەشی یازدە بۆ ئەردەڵان تەرخان کراوە و، ئەو بەشە، وەکو (ئیٚ. براون) دانەری کەتەلۆگی دەسنووسەکانی کتێبخانەی زانکۆی کامبریدج، ڕەوایانە دەڵێ بەهادارترین بەشی دەسنووسەکەیە (Browne, 1932, p.104). ئەم بەشە نزیکەی ١/٥ی کتێبی " زوبدەت ئەلتەواریخی سەنەندەجی " پێکدێنێ.

محەمەد شەریف قازی خۆی نەیویستووە بەتایبەتی لەسەر خێڵەکان بوەستێ، بابەتی ئەو "مێژووی گشتی" یە کە هەریەك لە خێڵەکانی ناوچەکە بەتوانای خۆی بەشداریی تیادا کردووە. لە دەسنووسەکەیدا توانرا زانیاریی دەربارەی خێڵی گۆران وەدەسبێ کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدەم. بەگوێرەی زانیارییەکانی محەمەد شەریف قازی، میری ئەردەڵانی– کەلب ؛ عەلی خان، سەیفی خان سوڵتانی گۆرانی کرد بە فەرمانڕەوای جوانڕۆ و خێڵی جاف. سەبارەت بە چارەنووسی خێڵی گۆران و پەیوەندییەکانی لەگەڵ بنەماڵەی میرانی بەنی ئەردەڵاندا لە سەدەی دوازدەوە تاکو سەدەی حەڤدەم — دەسنووسێکی ئەردەڵانی نییە شتێکمان پێ بڵێ.

محەمەد شەریف قازی هەروەها زانیاریی بایەخداری هێناوەتەوە لەسەر خێڵی کەڵهوڕ. زانیارییەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدە، سەبارەت بەوەی میری ئەردەڵانی موریدوەیسی کرا بە سوڵتانی کەڵهوڕ و "خاوەن و دەسەڵاتداری پەڵەنگان".

ئەم زانیارییانە دەربارەی خێڵەکانی گۆران و کەڵهوڕ بایەخی خۆیان هەیە، چونکە بەشی هەرە زۆری هەردوو خێڵەکە لە سەدەکانی حەڤدە– نۆزدە ڕاگوێزرابوون بۆ کرمانشا. دەسنووسەکە زانیاریی گەلێ بایەخداری لەخۆ گرتوون دەربارەی خێڵە کوردییەکان.

بەرهەمەکەی محەمەد شەریف قازی ڕۆچووە بۆ سەرچاوەکانی مێژووی ناوچەیی و بنەماڵەیی ئەردەلان. ئەو بەشەی تایبەت کراوە بە میرانی ئەردەلان، دەتوانین بڵێین، یەکەمین تۆماری مێژووی ناوچەکەیە کە لای ئێمە زانرابێ.

**خوسرەو ئیبن محەمەد بەنی ئەردەلان، تەخەللوسی- جەوهەری**

(لە ساڵانی ٧٠- ٨٠ کانی سەدەی هەژدە لەدایك بووە)

خوسرەو ئیبن محەمەد لە ساڵانی ١٢٤٨-١٢٥٠/ ١٨٣٣-١٨٣٥ دەسنووسەکەی خۆی نووسیوە (بڕوانە: تاریخی ئەردەلان، ماهی سەفەر ٣٥٣٦ ؛ خوسرەو ئیبن محەمەد بەنی ئەردەلان، ١٩٨٤) لە کاتی دەسپێکی کزبوونی دەسەڵاتی بنەماڵەی فەرمانڕەوا و زیادەبوونی هەژموونی حکومەتی ئێراندا. نووسەر لە لقێکی لابەلای خانەوادەی بەنی ئەردەلان و لەباری هەژاریدا بوو. "هەموو شتێك بەخشرابوو بە بێگانە- لە لاپەڕەیەکی دەسنووس نووسراوە- (بەوەی کە) بە فارسی دەدوان ". ئەمەش بووە هۆی ئەوەی "میر کەمترین ئاستی بژێوی بۆ خزمانی نزیك و زۆربەی خێزانەکانی بەنی ئەردەلان دابین بکات " و ئەمانی "ڕەوانەی دۆڵی هەژاری و بەدبەختی کرد " (خوسرەو ئیبن محەمەد بەنی ئەردەلان، ١٩٨٤، ل١٠٣٦، ١٠٧٦).

جا لێرەدایە ئاراستەی فیکریی دەسنووس- بەهێزکردنی ڕەوشی خانەوادەی بەنی ئەردەلان، نیشاندانی دێرینیی بنەچەکەی، دەسکەوت و سەروەری و شکۆی. نووسەر ویستوویەتی هەستی نیشتمانپەروەری لای خەڵکی ئەردەلان و ئارەزوویان بۆ بەرپەرچدانەوەی "بێگانان" بورووژێنێ.

خوسرەو ئیبن محەمەد وشە بە وشە زانیارییەکانی شەرەفخانی بەدلیسی دووبارە دەکاتەوە سەبارەت بە ڕووبەری کوردستان، بەڵام لە دەقی دەسنووسەکەشیدا تەنیا ڕووبەری میرنشینیی ئەردەلان بە کوردستان ناودەبا. لە کتێبەکەدا تەنیا دووجار ناوی ئەردەلان هاتووە (خوسرەو ئیبن محەمەد بەنی ئەردەلان، ١٩٨٤، ل١٠٠a). لە کاتی گێڕانەوەی شەڕە زۆرەکانی فەرمانڕەوایانی ئەردەلانی لەگەڵ بابان، جاف، زەنگنە و خێڵە کوردییەکانی دی خوسرەو ئیبن محەمەد لە دەسنووسەکەدا تەنیا "سوارچاکە" ئەردەڵانییەکان بە کورد ناودەبا.

بابانی، هەورامانی، زەنگنە، موکری و ئەوانیدی نووسەر تاقە جارێکیش بەکورد ناوی نەهێناون. بابانەکان– نەیارانی فەرمانڕەوایانی ئەردەلانی، لە یەکێك لە لاپەڕەکانی دەسنووسدا تەنانەت بە "بێگانە" ش ناویان هاتووە (خوسرەو ئیبن محەمەد بەنی ئەردەلان، ١٩٨٤، ل٥٣٦).

بەم جۆرە، دیارە، خوسرەو ئیبن محەمەد پێش هەموو شتێك ئەردەلانییانی بە کوردی ڕاستەقینە داناون و کوردستانیش – میرنشینیی ئەردەلان. ئەم بارە بیر و ڕای سیاسی و مێژوویی ئەو ڕەنگدەداتەوە کە بە چوارچێوەی ناوچەکەی خۆیەوە سنووردار کراوە. ئاستی ئەم سنوورداریەش دەردەکەوێ بەتایبەتی لە بەراوردکردنی بۆچوونەکانی خوسرەو ئیبن محەمەد لەگەڵ بیروباوەڕی شەڕەفخانی بەدلیسیدا کە ڕوانینەکانی بۆ چارەنووسی هەموو میللەتی کورد و، وەکو دیارە، خەونی بە دەوڵەتێکی کوردیی یەکگرتوو بە سەرکردایەتیی دەسەلاتدارێکی بەهێز دەبینی (شەڕەفنامە، ١٩٦٧، ل٢٩).

خوسرەو ئیبن محەمەد، هەروەکو شەڕەفخانی بەدلیسی، کوردی بە سەر چوار بەشی سەرەکی دابەش کردووە کە بە دابونەریت و تایبەتمەندیی زمانەکانیان لێك جیادەبنەوە. بەلام خوسرەو ئیبن محەمەد، جیا لە نووسەری "شەڕەفنامە"، خێڵی بەنی ئەردەلان بە پلەی یەکەم دادەنێ لە بەرامبەر جێگەی یەکەمی خێڵی کەلهوڕ لای شەڕەفخانی بەدلیسی – خێڵی کەلهوڕ و بەنی ئەردەلان چەندین جار ڕێکەوتووە لە مەیدانی جەنگدا بەرامبەر بەیەك بووەستن. ئەم جۆرە بەرزکردنەوەی بەنی ئەردەلان بۆ ڕیزی یەکەم لەنێو خێڵە کوردییە سەرەکییەکان پاساوەکەی هەمان هەوڵەکەیەتی بۆ بەرزکردنەوە و شکۆدارکردنی بنەماڵە و خێڵەکەی خۆی.

بەلام کە، وەکو شەڕەفخانی بەدلیسی، دێتە سەر باوەڕی ئایینیی خێڵەکانی ویلایەتی کوردستان، خوسرەو ئیبن محەمەد نەفرەت و قسەی خراپ ئاڕاستەی کوردانی ئێزدیی دەکات و بە پەیڕەوکەرانی شەیتان ناویان دەبات. ئەم توندییەی خوسرەو ئیبن محەمەد ڕێك پێچەوانەی هێمنی و میانڕەویی شەڕەفخانی بەدلیسییە. بەگوێرەی نووسەری "شەڕەفنامە" هەموو تاوانێکی ئێزدیان لەوەدایە نوێژ ناکەن و ڕۆژوو ناگرن، ئەویش چونکە بەهەڵە وایان داناوە

کە شێخ عادی ئەم ئەرکانە لەجیاتیی ئەوان جێبەجێ دەکات و " لە ڕۆژی حەشردا بەبێ لێپرسینەوە دەچن بۆ بەهەشت " (شەرەفنامە، ١٩٦٧،ل٨٣-٨٤).

ئەو کۆمەڵە خێڵەتییانەی دەکرێ لە دەسنووسەکەی خوسرەو ئیبن محەمەد زانیارییان لەبارەوە هەڵێنجین، بەگشتی پێنج گەورەترین خێڵەکانن : جاف، بلْباس، هەورامی، کەلهوڕ، گۆران. یەکەمین ناوهێنانی خێڵی جاف لە دەسنووسەکانی ئەردەلانی لە کتێبی خوسرەو ئیبن محەمەددا بوو (خوسرەو ئیبن محەمەد، ١٩٨٤، ل١٢٤)، ئەویش سەبارەت بە دانانی یەکێك لە سەرکردەکانی ئەم خێڵە لە پۆستی فەرمانڕەوایەتیی جاف و جوانڕۆ، " بۆئەوەی سەری لاساریی بەرز نەکەنەوە و ملکەچ و گوێڕایەڵی شا سافی بن ". ئەردەلانییەکان، دیارە، نەگوێڕایەڵی و نەملکەچبوونیان لەمانە دەس نەکەوت، بەڵکو دوژمنداریییان بە ڕاگواستنی چەند بەشێکی خێڵی جاف بۆ ڕۆژئاوا کۆتایی هات.

ڕا و بۆچوونەکان دەربارەی کات و هۆیەکانی ڕاگواستنی جافەکان یەك ناگرنەوە (ڤاسیلییەڤا، ١٩٩١، ل١٦٣-١٦٥). کەچی دەرکەوت کە دەقی دەسنووسی خوسرەو ئیبن محەمەد وەڵامی ڕاستەقینەی هەردوو پرسیاری لەخۆ گرتوون. لە دەقەکەدا باسی شا سافیی I کراوە، ئەویش لە ماوەی ساڵانی ١٦٢٩- ١٦٤٢ فەرمانڕەوایی کردووە. هەر لەو ماوەیەدا بوو کە خێڵی جاف ئازایانە ڕاپەڕینی ئەنجام داوە و(هەندێکیان) بەرەو ڕۆژئاوا ئاوارە بوون.

ملکەچ نەبوونی خێڵی هەورامیش بۆ میرانی ئەردەلانی کەمتر نەبوو و ئەمانە چەندین جار هەوڵیان داوە سوڵتانەکانی هەورامی گوێڕایەڵتر بکەن- بەقسەی خوسرەو ئیبن محەمەد ئەمانە "بە ئیرادەی خۆیان کارەسات دادێنن". هەر بەقسەکانی ئەم، ئەمانە هەمیشە " سەری لاسارییان بەرز کردبووەوە" و "ڕێگای دوژمنایەتییان " هەڵبژارد و " دەرگای ملکەچبوون و ئاشتییان داخست" (خوسرەو ئیبن محەمەد بەنی ئەردەلان، ١٩٨٤، ل ١٠٤٦).

لێرەشدا، ئەوە دێنینەوە یاد خۆمان کە هەر سوڵتانەکانی هەورامی بوون، ئەوانەی نووسەری دەسنووس ئەوەندە لێیان ناڕەحەتە، ساڵی ٦٨/١٨٦٧ بەتوندی بەرهەڵستکاریی میری قاجاریی فەرهاد میرزا- یان کرد کاتێك ئەمە، دوای ڕووخانی بنەماڵەی میری کوردی، بوو بە پارێزگاری ئەردەلان.

یەکێتیی خێڵەکانی هەورامی کە لە ناوچەکانی سەرسنووری میرنشینیی ئەردەڵان بوون، مەیلی سەرهەڵدانیان لە جافەکان کەمتر نەبوو. لە دەسنووسی خوسرەو ئیبن محەمەددا وەسفی شەڕی سوپای میر کراوە لەگەڵ هەورامییە ڕاپەڕیوەکان لە سەرەتای ساڵانی ۳۰ی سەدەی نۆزدە. شەڕەکە، کاتێك "قارەمانانی سوپای [11] والی هێرشیان کردە سەر هەورامانییان و لەگەڵیان کەوتنە شەڕێکی دەستەویەخەی پڕ کوشتار "، دیسان "چاکەی بێسنووری " بەرامبەر بە هەورامانییانی بەدوادا هات و بە دوا قسەکانی مێژوونووس– "ئێستاکە محەمەد سوڵتان هەورامی، کە لە باشیدا لە پێشەوەی هەمووانندا بوو، لە سایەی ڕەحمەتی ئەو (میری ئەردەڵانی) دایە " (خوسرەو ئیبن محەمەد بەنی ئەردەڵان، ۱۹۸٤، ل۱۸۳).

لەگەڵ ئەو هەموو لاسارییەی خێڵی هەورامیشدا، لەوە دەچێ، بە ئارەزووەوە لەناو هێزەکانی میردا خزمەتیان کردبێ – تیرهاوێژانی هەورامی شەڕەفی پاراستنی کۆشکی میریان پێ سپێردرا لە سەنەندج ( Rich, 1836, vol.1, p.202).

لە ئەنجامدا دەڵێین، خوسرەو ئیبن محەمەد کە ڕووداوەکان وەسف دەکا و گازاندەی لاساری و ملکەچنەبوون لە هەورامییان دەکات، کە دێتە سەر باسی سەرکردەی هەورامانییان– محەمەد سوڵتان هەورامی ئەوەی " لە باشیدا لە پێشەوەی هەمووواندا بوو "، وشەی پڕ لە شانازیی بەکاردێنێ.

بنەماڵەی میرانی بەنی ئەردەڵان لەگەڵ خێڵێکی بەهێزی تریش مامەڵەیان کردووە، ئەوەش بەتایبەتی لە مەیدانی جەنگدا بووە. ئەمانەش بڵباسەکان بوون. لە ڕابردووی دووردا ڕێگای کۆچبەرییان تا ناوچەکانی باکووری ئازەربایجانی گرتەوە. هەرچەندە شوێنی نشیمەنی سەرەکییان دەکەوتە باشووری دەریاچەی ورمێ، نێوان شنۆ و سابلاغ، و ناوچە باکوورییەکانی بابان، بەلام زۆرجار لە ئەردەڵان پەیا دەبوون و هێرشی تاڵانکارییان ئەنجام دەدا و کەمترین ڕێزیان بۆ دەسەڵاتداری ناوچەکە نەبوو.

لە خوێندنەوەی دەسنووسە ئەردەڵانییەکان سەبارەت بە شەڕەکان لەگەڵ بڵباساندا، هەست دەکرێ کە ئەمە پێشبڕکێی هەمیشەیی زیرەکی و هێز بووە.

هـەر هـەموو فـەرمانڕەوایان لـە بنەماڵـەی بـەنی ئـەردەلان، ئـەزموونکردنی خێڵـی بڵباس بە ڕێگای هێزەوە، واتە هێرشکردنە سەریان، نزیکەی، بە ئەرکی سەرشـانی خۆیانیـــان زانیـــوە. بڵباســـەکان نـــاتۆرەی هـــەرە خراپیـــان پێـــدراوە لەلایـــەن مێژوونووســـانی ئەردەلانییـــەوە، بەتایبـــەتیش خوســـرەو ئـــیبن محەمـــەد کـــە بەخۆشییەوە پێیان دەڵێ ئاپۆرەی خراپەکاری یان خوانەناسانی بێ ئابڕوو.

خێڵـی بڵبـاس خـۆی وەکـو ئۆرگـانێکی کۆمەڵایـەتی- سیاسـیی ئۆتۆنـۆم دەنوانـد و بەتـەواوی لـە دەرەوەی سسـتێمی یاسـا بالاکانـەوە بـوو. بڵباسـەکان سەربە ئێران یان تورکیا نەبوون، هەروەها ملکەچی ئەردەلان و بابـانیش نـەبوون، بە سەرتاسەری هێڵە سنوورییەکاندا ڕەوەندییان دەکرد. ئەمانە لەبـەر ملنـەدانیان شـایانی هەڵوێسـتێکی تـر و " پێداهـەلگوتن"ی شـێوەی تـری خوسـرەو ئـیبن محەمەد نەبوون.

بەلام کۆمەڵەی خێڵەتیی بڵباس، کە خوسرەو ئیبن محەمەد بـە "ئـاپۆرەی ڕێگران" ناویان دەبا، جێبـەجێکردنی یاسـا خێڵەتییـەکانیان بـە پـیرۆز دەزانـی — حەشاردان و پاراسـتنی کەسـانی داواکـراو، پێشکەشـکردنی خـوێن و یارمـەتی بـە لێقـەوماوان. خـەڵکی لاسـار و نـاڕازیی لـە دەسـەلات هـەموویان حەشـارگە و پشتگیریی جەنگییان لای بڵباسان دەسکەوت. فـەرمانڕەوای بانـە کـە لـە سـالانی ٩٠ـەکانی سەدەی هـەژدەم سـەرکردایەتیی ڕاپـەڕینێکی کـرد و ناوچـەکانی بانـە، هـەورامان و مـەریوانی گرتـەوە لای بڵباسـان خـۆی حەشـاردا (مـاه شـەڕەفخانم کوردستانی، ١٩٠٠، ل١٤٥). بڵباسەکان ساڵی ٠٢/١٨٠١ حەسەن عـەلی خـانی لادراو لە پۆستەکەی گرتیانە خۆ و یارمەتیی جەنگییان دا (ماه شەڕەفخانم کوردسـتانی، ١٩٠٠، ل١٥٠). دەکرێ لیسـتی حەشـاردراو و یارمەتیـدراوان بـەردەوامبێ. لەگـەڵ ڕووەوە دەکرێ خێڵی بڵباس بە کلاسیکی دابنرێ ؛ ئەم نەتەنیا ئەوەی بـە ئـەرکی پیرۆزی کۆمەڵەی خێڵەتیی دەزانـرا جێبـەجێی دەکـردن - داکۆکیکردن لەوانـەی داوای یارمـەتییان دەکـرد، بـەڵکو بنچـینەیەکی پتەویشـی هـەبوو " ئۆجـاغ"- بنەماڵەی سەرکردە فەرمانڕەواکانی خێڵ بەناوی ئۆجاغی کاخدری.

**ماه شەرەفخانم کوردستانی (١٨٠٥- ١٨٤٧)**

دەسنووسەکەی ماه شەرەفخانم کوردستانی لەنێو مێژوونووسیی ئەردەڵانیدا جێگەیەکی تایبەتی هەیە. ئەگەر خوسرەو ئیبن محەمەد، کە جووتێك دە ساڵیی جیای دەکەنەوە لە ماه شەرەفخانم، بایەخێکی نەداوە بە یەکگرتنەوەی وشەکانی نووسەرانی تر لەگەڵ زانیارییەکانی خۆیدا، ئەوا ماه شەرەفخانم هەوڵی داوە بەپێی توانا زانیارییەکان پشتڕاست کاتەوە. ئەم یەکسەر پەنا دەباتە بەر ڕوانینێکی ڕەخنەگرانە بۆ سەرچاوەکەی و، هەرچەندە لە کتێبەکەیدا گومانەکانی لەسەر زانیارییەکان هەمیشە بە تۆنێکی قورسەوە دەربڕیون، هەڵوێستی ئەم مێژوونووسە ئاشکرا دیارە کە هاودژی باوەڕی سادەیە بە هەموو ئەوەی نووسراوە، وەکو چۆن ئەوانەی پێش خۆی ئەمەیان کردووە.

ماه شەرەفخانم زانیاریی بەنرخی هێناونەتەوە دەربارەی زنجیرەی ڕەچەڵەکی خانەوادە سەرکردەکانی کوردستان. نۆ بەشی یەکەمی کتێبەکەی زانیارییەکی گرنگی نوێی لەبارەی مێژووی کۆنی خانەوادەی بەنی ئەردەڵانەوە لەخۆ نەگرتووە. بەشەکانی دواتر کە پشتبەست بە سەرچاوە یەکەمەکان نووسراون، پڕن لە زانیاریی نوێ و بەبایەخ. بەرهەمەکەی ماه شەرەفخانم بۆ سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی مێژووی ڕۆژگاری تەماویی فەرمانڕەوایەتیی دوا میرەکانی بەنی ئەردەڵان گرنگترین و، بۆ ئەم مەبەستە، تاقانەیە. ئەم کتێبە نووسراوە لەلایەن ژنێکەوە کە بەهرەمەند، زیرەك و هەستیارە، ژنی میرێکی ئەردەڵانییە، گەواهیدەر و بەشداربووی ڕاستەوخۆی گەلێ لە ڕووداوەکانی لەسەری نووسیون و نەهامەتییەکانی ئەو ڕۆژگارە هەناسە دەداتەوە.

کۆمەڵەی خێڵەتییەکان و سەرکردەکانیان، بەتایبەتیش هەورامییەکان، دەوری چالاکیان بینیوە لەو ڕووداوانەی وەسف کراون. یەکێك لەوانە، حەسەن سوڵتان هەورامی، کە ماه شەرەفخانم لە چیاکانی هەورامان، لە بارودۆخێکی تابڵێی ناخۆش، توانی گفتوگۆی لەگەڵدا بکات و ڕایەکی لەسەر بنیاد بنێ زۆر جیاواز لەو وەسفەی خوسرەو ئیبن محەمەد لە کتێبەکەیدا بۆ هەورامانییانی کردووە.

ســاڵی ١٨٣٤ مــیری ئــەردەڵان خوســرەو خــان ناكــام [١٢]، مێــردی مــاه شــەرەفخانم، لــە تەمــەنی ٣٠ ســاڵیدا مـرد. ئـاژاوە هــەموو میرنشـینیی گرتــەوە و ئەمــەش كۆتــایی هــات بــە دانـانی، لەلایــەن شـاوە، فەرمانڕەوایــەكی بێگانــە بـۆ ئەردەڵان– خوسرەو خان گورجی كە بە دڕندەیی ناسرابوو.

نەجیبزادەكانی ئــەردەڵان بڕیاریـان دا بارگــەیان تێكنـێن، بــەرەو سـلێمانی بڕۆن و حەشارگەیەك لای میری بابان وەدەسخەن. مـاه شــەرەفخانم یــەكێك بـوو لەو هەزاران كەسە هەڵاتووە. ئەمان بە چیاكان، بە هەورامانـدا چـوون و سـەختیی خەیاڵبــەدەریان پەڕانـد، پێشـوازیی جۆراوجۆریشـیان لێ كـرا. لێرەشـدا بـوو كـە، لەحاڵەتی ئەوپەڕی نائومێدیدا، چـاوی كـەوت بـە حەسـەن سـوڵتان هــەورامی كـە میوانپــەروەریی نوانـد و "بەشـێوەیەكی شایسـتە نــەریتی خێڵایــەتیی كـوردانی بــەجێهێنا" (مـاه شــەرەفخانم كوردسـتانی، ١٩٩٠، ل ١٨٠– ١٨٢). بـەم جـۆرە، بەلای ماه شەرەفخانمەوە هەورامانی و سـەرۆكەكەیان پـارێزەرانی دابـی خێڵـەتیی كوردی بوون، نەك "ئـاپۆرەی خراپـەكاری " وەك خوسـرەو ئـیبن محەمـەد پێیـان دەڵـێ و دواتـریش مـیرزا عــەلی ئەكبــەر كوردسـتانی بــە هــەمان شـێوە هێرشـیان دەكاتەسەر.

دەبــێ ئــەوەش بڵـێین كــە تــەنیا چـوار سـاڵ دوای ئەمــە، كاتێـك مــاه شەرەفخانم لە ژیاندا نەمابوو، لە كۆتایی ساڵی ١٨٥١دا حەسەن سوڵتان هەورامی دیسان ڕاپەڕینی بەرپا كرد و میری ئەردەڵانی ئەمانەڵڵای دووەم ملكەچی فەرمانی شا بوو و بەگەڵ هێزەكانی دەوڵـەت كـەوت بـۆ كپكردنـەوەی. بـەم جـۆرە بـوون هەورامانییــەكان كــە ئــەردەڵانی و شـاكانی ئێرانــی چــەندین ســەدە شــەڕیان بـوو لەگەڵیاندا.

### میرزا عەلی– ئەكبەر كوردستانی

مــیرزا عــەلی– ئەكبــەر، جیــاواز لــە قەڵــەم بەدەســتانی پــێش خــۆی، فەرمانبەرێك بوو لە ئیدارەی پارێزگاری قاجاری ؛ چونكە ساڵی ١٨٦٨ میرنشینیی ئەردەڵان ئیتر كرا بە پارێزگایـەكی ئێرانـی و یـەكێك لـە نوێنـەرانی بنەماڵـەی شـا بــەڕێوەی بــردووە. نووســەری "حەدیقــەی ناســرییە "[١٣] وەكــو فەرمانبــەرێك

هەڵوێستی سیاسیی فەرمیی دەسەڵاتی دەربڕیوە، خۆشی لەمەدا هاوڕا بووە، بەرامبەر بە خێڵەکان.

هەر خێڵێکی گەورە و بەهێز هەمیشە ئارەزووی ملکەچکردنی دادەهێنا لای هەر دەسەڵاتدارێکی ئێران و ئیمپراتۆریای عوسمانی – ئەو دوو دەوڵەتەی کە لە سەدەی شازدەوە خاکی کوردستانیان لەنێوان خۆ دابەش کردبوو. ئەو خێڵانەی ملیان بۆ دەسەڵات نەدەدا، دەبوون بە سەرچاوەیەکی لەبن نەهاتووی مەترسییەکان. ژمارەی خێڵی بەهێزی جاف لە ساڵانی ٢٠ی سەدەی نۆزدەدا چەندین هەزار خێوەت بوو. لەکاتی پێویستدا ئەم خێڵە، بەقسەی ك. ریچ (Rich,1836,Vol.1,p.112,281)، دەیتوانی دوو هەزار سوار و چوار هەزار تیرهاوێژ چەکدار بکات کە بە باشترین جەنگاوەرانی سوپای کوردی دادەنران.

نە میرەکانی بەنی ئەردەڵان، نە پارێزگاری قاجاری و نە سوڵتانەکانی عوسمانی نەیانتوانی کاریگەریی ڕاستەقینەیان هەبێ لەسەر خێڵ. جافی ڕەوەند هەموو ساڵەکە لەناو ڕەشماڵەکانیاندا دەژیان– هاوین لە ئەردەڵان، لەسەر چیای حاجی ئەحمەد لە دەوروبەری پێنجوین، سەقز و مەریوان ؛ پایز و زستانیش لە دۆڵەکانی شارەزوور لەناو ڕووبەری ئیمپراتۆریای عوسمانیدا. لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا جاف قەدەغە کرابوون "پێ بخەنە سەر خاکی" کوردستانی ئەردەڵان، هەرچەندە فەرمانڕەوایانی ئەردەڵان دەستوبردی توندیان گرتەبەر، بەڵام قەدەغەکە پەیڕەو نەکرا.

خێڵی گەورەی جاف، وەکو هەموو کۆمەڵەیەکی خێڵەتیی کۆچەر و نیمچە کۆچەر، ڕێگای کۆچی وەرزیی سەدان ساڵەی خۆی هەبوو. جافەکان ئەم ڕێگایە "عێل– راه"یان بە موڵکی خۆیان دەزانی کە تێیدا جێگەکانی نشیمەنی وەرزییان دیارکرابوو. لە کوردستاندا مافی وەستان لە جێگایەکدا مافی لەوەڕاندنی ماڵاتیشی لەگەڵدا بوو و ئەو مافەش پارێزراو بوو– جا یا پێیدرابوو، یانیش دەستی بەسەردا گیرابوو. ژیانی جافەکان سەدان ساڵ بوو بەم شێوەیە بەڕێوە دەچوو. بنیادی خێڵەتی و کۆچەری وەکو سستێمێکی لەڕادەبەدەر گرنگی کۆمەڵگا دادەنرا. کۆچەرەکان پەیوەندییەکانیان لەگەڵ جووتیاراندا هەرگیز بەو شێوەیە نەبوون کە هەندێ نووسەر بۆی دەچن. لە پشت ململانێی سوننەتیی

نێوان کۆچەر و جووتیاراندا هەوڵدان بۆ هاوکاریی یەکدی و پێکەوە ژیان دەبینرێ کە بەڕای م. ب. ڕۆوتۆن (Rowton,1973,p.249)، ئەمە سیمایەکی هەموو ئاسیای ڕۆژئاوایە.

خێڵەکان کە بۆ کۆچ بەڕێ دەکەوتن، ڕێك دەکەوتن لەگەڵ جووتیاران بۆ دابینکردنی پێداویستیی کۆچباری و سووتەمەنی و، هەروەها، ئالوگۆڕکردنی بەرهەم و کەلوپەلی یەکدی لەنێوانیاندا هەبوو. گێڕانەوەکەی گ. دروڤیل کە ڕەوشی کوردستانی لە سەدەی نۆزدەم دەردەبڕی، جێگەی سەرنجە : "خەڵکی گوندەکان تەنانەت زۆریش خۆشحاڵ دەبوون کاتێك کۆچەرەکان لە کێڵگەکانی ئەوان لایاندەدا، گا و مەڕەکانیان پێ دەفرۆشتن هەرزانتر لە بازاڕ " (دروڤیل، ١٨٢٦، بەشی ٢، ل١٧٨).

بۆیە کاتێك میرزا عەلی– ئەکبەر کوردستانی بە جافەکان دەڵێ– دڵ پڕلەقین، خێڵێکی ڕەوانەناس، "ڕەعیەتە قوڕبەسەرەکانی کوردستان... لەترسی هێرشی دڕندانە... هەمیشە لە ئاوارەیی و شەرمەزاریدا بوون " (میرزا عەلی– ئەکبەر کوردستانی، MS ئنستیتووتی دەسنووسە ڕۆژهەڵاتییەکانی ئەکادیمیای زانستی ڕووسیا. ل٢٠٤) – بێ بنچینەیە و هەرگیز شایستە نییە.

ئەم وەسفکردنە نابەجێیە، بۆ یەکێك لە گەورەترین و ناودارترین کۆمەڵەی خێڵەتیی کوردستانی خوارووی ڕۆژهەڵات، ڕێکەوت نییە و مەبەستەکەشی زانراوە، ئەگەرچی هەرگیز ڕەوا نییە. کتێبەکەی میرزا عەلی– ئەکبەر کوردستانی پێشکەش کراوە بە شای ئێران و چاوەڕوانیی دەسخۆشی لێ دەکرا.

هەتا میرەکانی بەنی ئەردەڵان حوکمیان دەکرد، لەگەڵ هەموو ئاڵۆزییەکان و ملکەچ نەبوونی جافەکانیش، ڕەوشەکە لە چوارچێوەی نۆرمدا دەمایەوە. جاف و ئەردەڵانی شەڕیان بوو، بنەماڵە فەرمانڕەواکان بە هاوسەرگیری پەیمانیان دەبەست، دیسانیش بەشەڕ دەهاتنەوە. بە فەرمانی شا هێرش دەکرانە سەر جافەکان، سەرۆکی خێڵی جافیش دەستەوسان نەدەوەستا و ئەمیش جارجارە ناوچەکانی دەهەژاند (خوسرەو ئیبن محەمەد بەنی ئەردەڵان، ١٩٨٤، ل١٧٣).

بەڵام هەموو جارێکیش چارەسەر دەدۆزرایەوە و خێڵ ژیانی ئاسایی خۆیی دەژیا، لە زۆزان و گەرمیانیدا بەردەوام دەبوو.

دوای کۆتاییهاتنی فەرمانڕەوایەتیی بنەماڵەی بەنی ئەردەلان ساڵی ١٨٦٧، حکومەتی ئێران یەك بەیەك ڕووبەڕووی خێڵە کوردییەکان بووەوە. هێزەکانی سوپای ئێرانی ڕەوانەی ناوچە سنوورییەکانی ئێرانی– تورکی کران بۆ گرتنی ڕێگای کۆچی جافەکان. ڕیتمی ژیانی ئابووریی خێڵەکان تێکچوو، ماڵاتیان لەدەس چوو و زیانی ماددیی زۆریان بەرکەوت. سستێمی ئابووریی سەدان ساڵەیان هەڵوەشایەوە.

نووسەری "حەدیقەی ناسرییە" جێبەجێکردنی فەرمانی شا سەبارەت بە "لەناوبردنی خێڵی جاف " لەلایەن پارێزگاری ئەردەلانەوە– فەرهاد میرزا، وەکو یەکێك لە خزمەتەکانی پارێزگار بۆ ئەردەلانییان هەڵدەسەنگێنێ. فەرهاد میرزا، بێگومان، نەیتوانی جافەکان لەناوبەرێ [١٤]، بەڵام ئەم ڕێك ئەم ئەرکەی پێ سپێردرابوو. " تاوانکاری" ی جافەکانیش تەنیا لەوەدابوو کە ساڵی دوو جار سنووری ئێرانی– تورکییان دەبڕی کە لە هەردوو بەرەکەیدا کورد دەژیان– ئەمان بە ڕووبەری مێژوویی کوردستاندا دەگەڕان.

لە هەڵسەنگاندنی بۆچوونەکانی نووسەر بەرامبەر بە خێڵە کوردییەکانی هەورامی و جافدا، دەبێ ئەو هەلومەرجە گرنگە، کە لەسەرەوە ئاماژەی بۆ کرا، لەبەرچاو بگیرێ. میرزا عەلی– ئەکبەر لای پارێزگاری قاجاری خزمەتی فەرمیی دەکرد و نەیدەتوانی ڕەوشی سیاسیی فەرمی و هەڵوێستی بنەماڵەی شا پشتگوێ بخات. بەڵام بۆ هەبوونی ئەم جۆرە وەسفکاری و پاساوانە، نابێ سەرنجی ئەو بارە نەدەین کە بەلای نووسەری ئەم دێڕانەوە زۆر گرنگە بۆ هەڵسەنگاندنی ڕوانینە ڕاستەقینەکانی ئەم مێژوونووسە.

میرزا عەلی– ئەکبەر بە ڕێزێکی زۆرەوە دەڕوانێتە یاساکانی خێڵەتی "قانوونی عەشیرەت "و بە" کۆڵەگەی دێرین و هەمیشەیی قسە لێ نەکراو بۆ کورد" دادەنێ. لە پڕۆسەی نووسینی کتێبەکەیدا ئەم گلەیی لەو فەرمانڕەوا ئەردەلانییانە کردووە کە "قانوونی عەشیرەت"یان بەزاندووە و ئەوانەی پەیڕەویان کردووە ستایشی کردوون. پارێزگاری کوردستان شیهاب ئەلمولك کە

بەرامبــەر بــە خــەڵکی کوردســتان پــەیڕەوی یاسـای خێڵــەتیی کـردووە ستایشــی نووسەری بەرکەوتووە.

مــیرزا عــەلی – ئەکبــەر لــە کتێبەکەیــدا تــەنیا گلــەیی یــان ستایشـــی سەرکردەکانی نەکردووە. ئەم " قانوونی عەشیرەتە" ساڵی ١٨٨٤ یاریدەی میرزا عەلی– ئەکبەر خۆی دا ناوبژیوانی پێکدادانی نێوان دوو خێڵی ئەردەڵانی، تیلاکـی و قاڵباغی، بکات. ئەوکاتە نووسەر لە کوردستانی موکریان بـوو و لای سـەیفەدین موکری پۆستی گەورە سکرتێری (مونشـی– باشـی) وەرگرتبـوو، بـە تێلگرامێکـی وارسی تەختی شاهانە بانگهێشتی ئەردەڵان کرا، ئـەمیش بـەوردی لـە لایەنـەکانی کۆنفلیکتەکــەیی (کێشــە، بەریەککــەوتن) کۆڵییــەوە و بــە دابونــەریتی خێڵــەتی چارەسەری کرد.

بنچینەی تەواوی ئەوەمان هەیە بڵێین، مـیرزا عـەلی– ئەکبـەر کوردسـتانی هەڵوێستی نیگەتیڤانەی بەرامبەر بە خێڵ، وەکو خێڵ، نەبوو و هێرشەکانیشی بۆ سـەر جـاف و هـەورامییان پاسـاوی خـۆی هەیـە – ئـەویش پۆسـتە فەرمییەکـەی لەکاتی نووسینی ئەم کتێبەدا.

## پەراوێزەکانی نووسەر و وەرگێڕ

١ – ئەم چەمکە لە کوردستاندا وەکو باوە مانای "خێڵ" دەدات.

٢– خێڵ و بنەماڵەی فەرمانڕەوا بە بەنی ئەردەڵان (کوڕانی ئەردەڵان) ناوزەد دەکران.

٣– بە ڕای ڕەشاد میران، ئێتنۆنیمی "داسنی" وەکو سینۆنیم بەکارهاتووە بۆ کۆنفسیۆنیمی "یەزیدی" بڕوانە: (ڕەشاد میران، ٢٠٠٣، ل٦٥)

* نووسەر، ناوی یەزیدی بەکارهێناوە، لەکاتێکدا ئێمە "ئێزدی" بە ڕاست دەزانین– ئەمە ڕای ئێزدییەکانیشە. وەرگێڕ

٤– ڕاشکاوانەتر دەربارەی بانگەشەی زۆرێك لە بنەماڵە کوردییەکان بۆ بنەچە و نەژادی بێگانەیی خۆیان، بڕوانە :

Vasileava E.U.- Versi "Inorodnovo" proiskhojdenya znatnikh kurdiskikh family kak sotsialni finomen/ PPiPUKHV. XXIV. CH.1. M., 1991

٥– قسەکانی ئەم مێژوونووسە تژین لە پەژارە، ئەمە هەمان چارەنووسی خێڵی ڕۆژکی و میرنشینیی بەدلیس بوو کە شەڕەفخان خۆی سەر بەو بنەماڵە فەرمانڕەوایە بوو – دواتر ئاماژەیان بۆ دەکەین.

6–ترادیسیای ناوچەکە بەم جۆرە ئێتیمۆلۆگیای ناوی کۆمەڵەی خێڵەتیی ڕۆژکی پاراستووە– تەرجەمەی دەقاودەقی ناوەکە : یەك ڕۆژ.

٧– بە بۆچوونی نووسەری "شەڕەفنامە" ناوەکەی مەلیك شا بووە، بە تێپەڕبوونی کات بووە بە مالکیش.

٨ – نووسەر (عیراقی فارسی) نووسیوە ! / وەرگێڕ

٩ - لەبارەی قسەلۆکە (نوکتە) کانی لەسەر دومبولییەکانەوە، تەنانەت شەڕەفخانی بەدلیسیش خۆی پێ نەگیراوە (شەڕەفنامە، ١٩٦٧، ل ٣٥٨– ٣٥٩)

** ماتینەدەران موزەخانە (گەنجینە)یەکە تایبەت بە دەسنووسە مێژووییەکان لە ئێریڤان – وەرگێڕ

١٠– بڕوانە: ڤاسیلییەڤا ی. ئی. ؛ کتێب دەربارەی مێژووی کوردستان، کە هێشتا نەدۆزراوەتەوە (ئاسەواری نووسراو و کێشەکانی مێژوو و کولتووری میللەتانی ڕۆژهەلات. ژ. ٢٤، بەشی ٣، ١٩٩١، ل٦٧،٦٤– ٧٢، ٧٥، ٧٦ مۆسکۆ– لینینگراد) – بەزمانی ڕووسی. لێرە بەدواوە بۆ پشتبەستن بەم سەرچاوەیە، سوود لە ئاماژەکانی ئا. د. ژابا بۆ لاپەڕەکان وەردەگرین.

١١– نازناوی فەرمانڕەوای ئەردەڵانە

١٢– ناکام – " ئەوەی خۆشیی لە ژیان نەبینیوە "، " جوانەمەرگ "

١٣- دەقی ئەم دەسنووسە لەلایەن نووسەری ئەم دێرانەوە ئامادەکراوە بۆ چاپ، لە فارسییەوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی ڕووسی، پێشەکی و پەراوێزی بۆ داناوە، لەلایەن ئەنجومەنی زانایانی ئینستیتووتی دەسنووسە ڕۆژهەڵاتەوە ڕاسپاردە کراوە بۆ بەچاپگەیاندن - بەڵام هێشتا دەرنەچووە. (ئەم کتێبە ساڵی ٢٠١٢ لە سانت پیترسبورگ بەچاپ گەیشتووە - چاپێکی قەشەنگ و شایستە بە ٣٥٦ لاپەڕە. نووسەری بەڕێز خاتوو ڤاسیلییەڤا بە سوپاسەوە دانەیەکی لە ڕێکەوتی ٥/ ١٢/ ٢٠١٢ پێشکەش کردووم. / وەرگێڕ)

١٤- لە دەقی دەسنووسەکەدا دەخوێنینەوە : " ئەو بەچکە شایە نەجیبزادەیە، بە فەرمانی شای تاج بەسەرەوە، بەجۆرێك هەوڵی دا کۆتاییان پێ بێنێ کە لە لاپەڕەکانی (مێژووی) کوردستان (نە) ناو و (نە) ئاسەواریان نەمێنێ. بڕوانە : میرزا عەلی-ئەکبەر کوردستانی. MS ئینستیتووتی دەسنووسە ڕۆژهەڵاتییەکان، ئەکادیمیای زانستیی ڕووسیا، ل٢٠٣

*(ئەم باسە لەم سەرچاوەیە بڵاو کراوەتەوە : گۆڤاری - " ئاسەوارە نووسراوەکانی ڕۆژهەڵات "، مۆسکۆ، ژمارە ٢ (١٣)، ٢٠١١.)

## لیستی کورتکراوەکان

ППиПИКНВ — Письменные памятники и проблемы истории культуры народов Востока. Л.–М.
$EI^2$ — The Encyclopaedia of Islam. New edition. Leiden–London

## لیستی سەرچاوەکان


Архив РАН, ф. 2, оп. 1–(1865), № 20.

*Бамдад М.* Тарих-и рҗджал-и Иран корун-и 12–13–14, та'лиф-и Махди Бамдад. Тихран, 1966.

*Васильева Е.И.* Термины «таифе», «аширатъ», «кабиле» в сочинении Шараф-хана Бидлиси «Шараф-наме» // ППиПИКНВ. V. Л., 1969.

*Васильева Е.И.* Юго-Восточный Курдистан в XVIII — начале XIX в. Очерки истории эмиратов Арделан и Бабан. М., 1991.

*Васильева Е.И.* Версии «инородного» происхождения знатных курдских фамилий как социальный феномен // ППиПИКНВ. XXIV. Ч. 1. М., 1991.

*Васильева Е.И.* Книга по истории Курдистана, которая остается ненайденной // ППиПИКНВ. XXIV. Ч. III. М., 1991.

*Васильева Е.И.* Шараф-хан Бидлиси. Эпоха. Жизнь. Бессмертие. СПб., 2005.

*Друвиль Г.* Путешествие в Персию в 1812 и 1813 гг. / Пер. с франц. Ч. II. М., 1826.

*Мах Шараф-ханум Курдистани.* Хроника дома Ардалан (Та'рих-и Ардалан) / Пер. с. перс., введ. и примеч. Е.И. Васильевой. М., 1990.

*Мела Махмуд Байазиди.* Таварих-и кадим-и Курдистан (Древняя история Курдистана) Т. I / Перевод «Шараф-наме» Шараф-хана Бидлиси с персидского языка на курдский (курманджи). Изд. текста, предисл., указ. и оглавление К.К. Курдоева и Ж.С. Мусаэлян. М., 1986.

*Мирза Али-Акбар Курдистани.* Хадике-йи Насирийе. MS Института восточных рукописей РАН.

*Мусаэлян Ж.С.* А.Д. Жаба и курдоведение // ППиПИКНВ. XXIV. Ч. III. М., 1991.

*Мухаммад Шариф Кази.* Зубдат ат-таварих-и Санандаджи. MS библиотеки Кембриджского университета.

*Папазян А.Д.* Новые источники по истории курдского народа // Страны и народы Ближнего и Среднего Востока. Т. VI. Курдоведение. Ереван, 1975.

*Петрушевский И.П.* Очерки по истории феодальных отношений в Азербайджане и Армении в XV — начале XIX в. Л., 1949.

*Петрушевский И.П.* Ислам в Иране в XII–XV веках. Л., 1966.

*Рашад Сабри Рашид (Рашад Миран).* Этноконфессиональная ситуация в современном Курдистане. М.–СПб., 2003.

Тарих-и Ардалан. Та'лиф-и Хусрав ибн Мухаммад ибн Манчихр Ардалан машхур ба Мусанниф. Тихран, мах-и сафар 3536.

Тарих-и Мардух. Та'лиф-и Мухаммад Мардух Курдистани. Джилд-и I–II. [Б.м.], 1944.

*Хусрав ибн Мухаммад Бани Ардалан.* Хроника (История княжеского дома Бани Ардалан). Факсимиле рук., пер. с перс., введ. и примеч. Е.И. Васильевой. М., 1984.

*Шараф-хан ибн Шамсаддин Бидлиси.* Шараф-наме / Пер., предисл., примеч. и прил. Е.И. Васильевой. Т. I. М.. 1967.

*Шараф-хан ибн Шамсаддин Бидлиси.* Шараф-наме / Пер. с перс. предисл., примеч. и прил. Е.И. Васильевой. Т. II. М., 1976.

*Bruinessen M. van.* Agha, Shaikh and State. On the Social and Political Organization of Kurdistan. Utrecht, 1978 (repr. New Jersey, 1992).

[*Browne E.G.*] A Descriptive Catalogue of the Oriental MSS, Belonging to the Late E.G. Browne by E.G. Browne / Complited and Edited by R.A. Nicholson. Cambridge, 1932.

*Mardukh Abdollah.* Contribution à l'étude de l'Histoire des Kurdes sous la dynastie Ardalān du XVI[e] siècle au XIX[e] siècle. Thèse de doctorat. P., 1988.

*Minorsky V.* Kurds, Kurdistan. III. History // $EI^2$. Vol. V. 1981, fasc. 85–86. P. 447–464.

*Nikitine B.* Les Kurdes. Étude sociologique et historique. P., 1956.

[*Rich Cl.J.*] Narrative of a Residence in Koordistan and on the Site of Ancient Nineveh… by… Cl.J. Rich. Vol. 1–2. L., 1836.

*Rowton M.B.* Autonomy and Nomadism in Western Asia // Orientalia. 1973. Vol. 42. Fasc. 1–2.

## ملخص البحث

**المؤرخون الكورد عن القبائل الكوردية**

جرى في هذا البحث عرض وجهات نظر ست من المؤرخين الكورد، الـذين كتبـوا مؤلفاتهم باللغة الفارسية خلال القرون ١٦–١٩. بطبيعة الحال كـان لكـل مـنهم رأيـه الخاص عن القبيلة الكوردية. وقـد بـني هـذا الـرأي علـى أسـاس أصـولهم، إنتمـائهم الأجتماعي ومناطق سكناهم (في القرية أم المدينة).



## Abstract

**Kurdish Historiographers on kurdish Tribes**

The 16th-19th centuries are represnted by chronicles of Kurdish Historiographers who wrote their works in Persian. Naturally, each auther had his own view of the kurdish tribes determined by the Historiographer's descent, social status and also by the place he lived in - depending on whether he was a villager or a town-dweller.

**لە چالاکییەکانی لێژنەی دەستنووس و بەڵگەنامە:**

# کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە عوسمانییەکاندا

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:
**د. نەجاتی عەبدوڵڵا**

**ئەڵقەی یەکەم**

**لە بریتی پێشەکی**

ئەرشیفخانەی عوسمانی لە تورکیا، کە سەر بە ئەنجومەنی وەزیرانە و دەکەوێتە گەڕەکی سوڵتان ئەحمەد لە شاری ئەستەموول، یەکێکە لە سێیەمین دەوڵەمەندترین ئەرشیفخانەکانی جیهان. ئەم ئەرشیفخانەیە، کە لە ڕووی ژمارەی بەڵگەنامە و دەستنووسی مێژوویی بەسەریەکەوە بەڵگەنامەی تایبەت بە (٣٩) وڵاتی جیهانی تێدایە، بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٨٤٧دا، لە لایەن سەدری ئەعزەم، مستەفا ڕەشید پاشا، بە ناوی **"خەزێنەی کاغەزەکان"** دامەزراوە و ساڵی ١٨٥٠ کراوەتەوە، بەڵگەنامەکانیشی لە سەرەتای ساڵی ١٢٩٩ی زایینی دەگرێتەوە تاوەکو هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریای عوسمانی لە ساڵی ١٩٢٤دا، سەرجەمی بەڵگەنامەکانیش بە سەد و پەنجا ملیۆن تا دووسەد و پەنجا ملیۆن بەڵگەنامە دەخەمڵێندرێن. ئەم ئەرشیفخانە دەوڵەمەندەیە، کە تاوەکو ئێستا هەر کەمێك لە چارەگێك زیاتری پۆلێن کراون، بەداخەوە تا ئێستا بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد کەمترین سوودی لێ وەرگیراوە. ئەکادیمیای کوردی، لە ڕوانگەی درککردن بە دەوڵەمەندیی ئەم ئەرشیفخانەیە لە حوزەیرانی ساڵی ٢٠١١دا، شاندێکی لێژنەی دەستنووس و بەڵگەنامەکان، کە پێکهاتبوون لە بەڕێزان: د.عەبدولفەتتاح بۆتانی، سەرۆکی لێژنە و ئەندامێتی تەحسین دۆسکی، بۆ تورکیا ڕەوانە کرد. شاندەکە توانی کۆمەڵێکی زۆر کتێبی نایابی مێژوویی و

سەرچاوەگەلی دەوڵەمەند لەگەڵ خۆیدا بۆ کتێبخانەی ئەکادیمیای کوردی بکڕێ، جگە لەوە کۆمەڵێکی زۆر بەڵگەنامەی مێژوویی عوسمانی تایبەت بە کورد و کوردستانی لە ئەرشیفی عوسمانی وەگیرخست، هەر لەوێشدا بەڵگەنامەکان لە لایەن وەرگێڕی پسپۆر و تایبەتمەندی ئەم بوارە وەرگێڕراونەتە سەر زمانی عەرەبی. لێژنەی دەستنووس و بەڵگەنامەکان ، بۆ ئەوەی ئەم بەڵگەنامانە بکەونە بەردەست هەموو لایەك، بڕیاری داوە تەواوی ئەو بەڵگەنامانە، بە تێبینی و پەراوێزی پێویستەوە بکاتە کوردی و بە ئەڵقە لەسەر لاپەڕەکانی **"گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی"** بڵاویان بکاتەوە. بۆ ئەم کارەش ئێمە ڕاسپێردراوین تا تاوتوێی ئەم ئەرکە بکەین، ئەڵقەی ئەمجارەمان تایبەتە بە پێوەندییەکانی نێوان هەردوو گەلی کورد و ئەرمەن.

## بەشی یەکەم:
## پێوەندییەکانی کورد و ئەرمەن

**بەڵگەنامەی ژمارە: ١**

چاکسازییەکانی بابیعالی لە مێژووی (٥)ی تەمموزدا، کە ماددەی شێست و یەکەمین لە پەیماننامەی بەرلین[1] ، لەمەڕ ئەو ویلایەتانەی ئەرمەنەکانی تێدا دەژین، ئاماژەی پێکردوون، نە لە واتا و نە لە گۆکردن لەگەڵ ماددەی ناوبراو یەکناگرنەوە. ئەو نوێنەرانەش کە بابیعالی بۆ شوێنی نیشتەجێبوونی ئەرمەنەکانی ناردبوون نەگەیشتوونەتە ئەنجامێکی باش، هەروا بێتەوە بابیعالی بە پێچەوانەی ماددەی ناوبراو هیچ زانیارییێکی بە وڵاتە ئیمزاکارەکانی پەیماننامەکە نەداوە. ئەوەشی پەیوەندیدارە بە کاروباری دادوەری هیچ چاکسازییەکی تێدا نەکراوە، هەروەك ئەوەی زانیارییە ڕاست و دروستەکان دەریدەخەن، ئازادیی دادگەکان لە پێشوو خراپتر بووە. بابیعالی لە یادداشتنامەکەی خۆیدا ئەوەی ڕوونکردۆتەوە، کە بۆ چاکسازیکردن لە ژاندرمە و پۆلیسدا چەند ڕاپۆرتێك لە ئەفسەرە بێگانەکان وەردەگرێ، بەڵام وڵاتانی ئیمزاکار هیچ زانیارییێکیان لەم بارەیەوە بەدەست نەگەیشتووە، هەروەها دەوڵەتی عەلیە ناتوانێ پێچەوانەی ئەمە داوا بکات. لەبەر ئەمەیە وەڵامی بابیعالی بە نیسبەت ئەو یادداشتنامەیەی دەوڵەتە ئیمزاکارەکان لە یانزەی حوزەیران پێشکەشیان کردووە نابێتە چارەسەر، وڵاتانی ئیمزاکاریش ناچارن ئەوە ڕوون بکەنەوە کە بابیعالی بەڵێنەکانی خۆی بەپێی پەیماننامەکەی بەرلین بەجێ نەهێناوە. بابیعالی ئەوەندەی نکوڵیکردنی لەو تاوانانەی کە لە شوێنە ئەرمەننشینەکان ڕوویانداوە و دەست بەسەردانەگرتنی ڕەوشە بەرچاوەکەی ئەویێ قسەی گوێ لێ بووە، بەردەوامبوونی ئەم ڕەوشەش دەبێتە هۆی نەمان و لەناوچوونی کریستیانەکان. یادداشتنامەکەی بابیعالی هیچ هەنگاوهەڵگرتنێکی لێوە شین نەبوو، تا ڕادەیەك بۆ ستەمکارییەکانی چەرکەس و کوردەکان دابنێت. ئێمە گومانمان لەوەیە، کە سیستمی باو ڕادەیەك بۆ ئەو ڕەوشە داخبارە دانانێ، بەڵکو کارەکە پێویستی بە هەنگاوهەڵگرتنی توندتر هەیە. چونکە ئەو دانیشتوانانەی کە لە ماددەی شێست و یەکدا ناویان هاتووە لەسەر

ماڵ و ناmووس و ژیانیان ڕوو بە مەترسی بوونەتەوە. ئەحکامەکانی ماددەی شێست و یەك بابیعالییان پابەند کردووە تا بە بێ دواکەوتن لەو ناوچەی ئەرمەننشینە چاکسازی بکات. ئیمزاکارانی ئەم پەیماننامەیە بە هەموو داخێکەوە دەبینن بابیعالی لە یادداشتنامەکەی مێژووی (٥)ی تەممووزیدا باس لەو چاکسازییانە ناکات کە لە پێویستییەکانی ناوخۆیین. هەتا ئەگەر وڵاتانی ئیمزاکار بە چاوی ڕازیبوون بڕوانن ئەوانەی بە تەمان لە تەواوی مەمالیکی مەحرووسەدا بیانکەن، بەڵام ئەوان لە پێشنیازەکانی بابیعالیدا ئەو تایبەتییانەیان نەبینی، کە پەیماننامەی بەرلین بەتایبەتی دەستنیشانی کردوون. لەبەر ئەوەی ئەو توخمەی لە ویلایەتەکانی ئاماژەبۆکراو نیشتەجێن لە توخمی کریستیانەکانن، بۆیە ئەگەر هیچ چاکسازییێکی لەم خاڵەوە سەرچاوە نەگرتبێت ئەنجامێکی باشی لێ ناکەوێتەوە. کارێکی دیکەی شایانی گرینگی و بایەخ پێدان ئەوەیە بابیعالی سوورە لە سەر بەڕێوەبردنی ئەرمەن و کوردەکان لەناو یەك سیستەمدا. بەڵام هەق وایە ئەوەندەی دەکرێ بەڕێوەبردنی ئەو دوو توخمە لە یەك جوایەز بن. چونکە ناشێ یەکسانیی وەکو یەك لە نێوان نیشتەجێیەکان[2] و هۆزە کۆچەرییەکان[3] ببێت. بۆیە دەبێ مشووری ئەوە بخورێت لە کاتی دابەشکردنی ناحیە و کارگێڕیی حکوومەتدا هەر توخمێك بە جیا کۆبکرێنەوە و یەکبخرێن، وەکو یەکخستنی ئەرمەنەکان یان یەکخستنی ئەرمەنەکان لەگەڵ تورکان و هەڵاوێرکردنی کوردەکان. پێویستە دەسترۆیشتوویی ئەو کوردانەی کە بە شێوەیەکی تایبەتی لە چیاکاندا لەسەر ستەمکاری ڕاهاتوون، نەخرێنە ناو حیساباتی ئامار، ئەگەرنا حیسابی ئەرمەن لە ناحیەکان لەگەڵ ئەو (کوردە ستەمکارانە، وەرگێڕ) دەبێت.

هەتا ئەگەر واش دەرکەوت، کە لە ناحیەکاندا باری مەزهەبیی لەبەرچاو دەگیرێت، ئەوا بابیعالی لە یادداشتنامەکەیدا ئەم سۆزەی نەداوە و هەر بەوەندە دەستبەردار بووە، کە ڕایبگەیەنێت لە ناحیەکاندا فەرمانبەرەکان بەپێی مەزهەبەکانیان دادەمەزرێن. ئەمەی وەکو ڕۆژ ئاشکرایە، کە ناو نەهێنانیان لە بەکارهێنانیان لە کاری گەورەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە پێویستییە ناوخۆییەکان، کە لە ماددەی شێست و یەکدا باس کراون، بە هەند وەرنەگیراون.

جـا ئەگـەر بابیعـالی ئـەوەی بەدیارخسـت، کـە کەسـانی خـاوەن توانـای کریسـتیانی دامەزرانـدوون و لـە دواڕۆژیـش دایاندەمـەزرێنێ، بـەڵام یـەك تاقـە ئەرمەنیشی لەو ناوچانە دانەمەزراندووە، کە ئەرمەنییەکانی تێدا نیشتەجێن. هەتا ئەگەر بابیعالی والییەکان لە کریستیانەکان دامەزرێنێ ئەوا ئەمە هیچ سوودێکی بۆ سـکاڵاکردنی ئەرمەنـەکان نابێـت. بۆیـە دەوڵـەتی عالیـە لـە سـەریەتی بـەپێی بەڵێنەکانی لـە بـەرلین لـە چوارچێوەیەکی بەرفراوانـدا پـەنا بـۆ هەنگاوهـەڵگرتنی پێویست ببات. ئەو چاکسازییانەی کە بابیعالی خستوونیەتە ڕوو بەس نـین. مـادام بەڕێوەبـــەرانی ناحیـــەکان لـــە لایـــەن قائیمقامەکانـــەوە دادەمـــەزرێن ئـــەوا ناوەندگەرایەتی (المرکزیة) لە توندترین شێوەیدا پیادە دەکرێت، بە شێوەیەك کە بابیعـالی ئـەوە نـادرکێنێ ژمـارەی ئـەو فەرمانبەرانـە چـەندە کـە قائیمقامییـەت دایاندەمـەزرێنێ و ئەوانـە لـە چ لایەنێکـەوە بـەرز دەکرێنـەوە و دەخرێنـەڕوو. ئەفسـەرگەلی ناحیـە و قەزایـەکان وێنەکـەی دیـاریکراوە. ژاندرمـەی ویلایـەت لـە ڕەوشێکدا نییە، کە لەگـەڵ ئەحکامـەکانی مـاددەی شێسـت و یـەکی پەیماننامـەی بەرلیندا بگـونجێ. هەڵبـژاردنی زەپتییـە[4] و ئەفسـەران و تاکـەکان لـە ناحیـەکان بـــەپێی ژمـــارەی دانیشـــتوان شـــایانی ســـوپاس و پێزانینـــە. بنـــەوانی دادگـــە گواســـتراوەکانیش کـــە لـــە یادداشـــتنامەکەی بابیعالیـــدا هـــاتووە، کـــە دەبوایـــە ئەرمەنەکانیش بە شێوەیێکی پێویست تێیدابوونایە، کەچی دەبیـنین نیشـانەگەلی سەرسوڕمانی بەسەرەوەیە. جا ئایا ئەو حاکمانەی کـە بڕیـار وایـە بـە شـێوەیێکی کاتیی دابمەزرێن یان بەدرێژایی ژیان لەو پایەیانەدا دەمێننەوە، ئایـا ئەرکـەکانیان بەپێی شەریعەت یان بەپێی سیستمێکی دیکە پیادە دەکەن؟ چۆن حوکم بەسـەر کـــوردە وەحشـــییەکان دەدەن؟. ئـــەوەی لێـــرەدا ئاشـــکرایە، کـــە کـــوردە جـەنگاوەرەکان ناخرێنـە ناویـەوە، پێویستیشـە کـاری بێگـاری، کـە کوردەکـان خســـتوویانەتە ســـەر ملـــی ئەرمەنـــەکان، هەڵبوەشـــێنرێتەوە، پێویستیشـــە نەستوورییەکانیش سوود لەو چاکسازییانە، کە بۆ ئەرمەنەکان جێبـەجێ دەکـرێن، وەربگرن. ئەو بڕەیەش، کە بۆ دامەزراندن بۆ مەعاریف و سوودی گشـتی ئامـاژەی پێکراوە وەك پێویست بەرچاو نییە، بەڵام پیادەکردنی بەپێی سیستمی ڕۆمەیلی و ئەو داهاتانەی کە لە ئارادایە نـاکرێ بـۆ هـەموو پێویسـتییەکان دیـاری بکـرێ. لـە

یاداشـتنامەکەی بابیعالیـدا باسـی ڕاگەیانـدنی ڕێسـاگەلی نامەرکـەزێتی نـەکراوە سەبارەت بەو خەڵکانە، کە مەزهەبیان لەگەڵ مەزهەبی ناوەنـد جیـاوازە. ناشـکرێ هـیچ چاکسـازییەك پیـادە بکرێ تـا مـاوەی حـوکمڕانیی والییـەکان دەستنیشـان نەکرێت. جا هەرچەندە لە یادداشتنامەکەی بابیعالیدا باسی ئامادەسازیی ڕەوشـی والییەکان دیاربێت ئەوا ڕاگەیاندنە دروستەکان و دەستنیشان نەکردنی دەسـەڵاتی والییـەکان، پێویسـت دەکـات هـەتا دەسـت لـە سـادەترین کاروبـاری ویلایەتـەکان وەرنـەدرێت وەك ئـەوەی ئێسـتا بـاوە. لەبەرئـەوەی ئـەو هەنگاوهەڵگرتنانـەی دەوڵەتی عالییە ئاماژەی پێداوە، لـەو ویلایەتانـەی کـە ئەرمەنـەکانی تێدا دەژیـن بـەس نـین، بۆیـە وا پێویسـت دەکـات بـەرزترین و فـراوانترین پلـەی یەکسـانی بگرنەبەر، هێز و پۆلیسیش بۆ پاراستنی ئەرمەن، لە دەست چـەرکەس و کـوردان، دابمـەزرێنرێت. دەبـێ مـاوەی ئـەرکی والییـەکان و دەسـەڵاتەکانیان بـەرفراوانتر بکرێت، تا بەم ڕێگەیەوە ئەحکامەکانی ماددەی شێست و یـەك جێبـەجێ دەبێـت. نابێـت دەوڵەتـە ئیمزاکارەکـان ئـەو ژمارەیـەی موسـڵمان و کریسـتیانەکان، کـە دەوڵەتی عوسمـانی بـە مەبەسـتی کەمکردنـەوەی گرینگیـی بابەتەکە بەرچـاویان دەخات، بە دروست وەربگرن. دەفتەری نفوس، کـە پاتریـارکی ئەرمـەن ئامـادەی کردووە زۆر لەو دەفتەر نفوسە دوورە کە دەوڵەتی عالیـە دیـاری کـردووە، کەوایـە ئەو بنەوایانە چـین کـە بابیعـالی لـەکاتی تۆمـارکردنی نفوسـدا ڕەچـاوی کـردوون؟ کارەکـە پێویسـتی بەوەیـە کـە دەوڵەتـە ئیمزاکارەکـان دەسـتبەجێ لێژنەیـەك بـۆ زانـینی ژمـارەی ڕاسـتەقینەی دانیشـتوانە موسـڵمانەکان و کریسـتیانەکان، لـە ویلایەتەکانی ئاماژە بۆکراو، پێکەوە بنێن. بابیعـالی لەسـەریەتی دوای ڕاییکردنـی ئاماری دانیشتوان، ڕاستیی لێژنە بێ لایەنەکە قەبووڵ بکات. بە پشتبەستن بەوەی لەپێشـدا وتـرا، پێویسـتە سـنووری ویلایەتـەکانیش ڕاسـت بکرێتـەوە و بابیعـالی هەنگاوگەلی خێرا بنێ، ئەمەش بە بێ ئەوەی چـاوەڕوانی ئەنجامـدانی سـەرژمێریی دانیشـتوان بکـات، هـەروەها دەبـێ بـە بـێ دواکـەوتن هـەنگاوی بەپەلـە بـنێ بـۆ پاراستنی مـاڵ و نامووسـی ئەرمەنـەکان لـە دەسـتدرێژیی کوردەکـان... هـەروەها پێویستیش دەکات، بۆ چاککردنی ڕەوشی هێزەکانی ژاندرمەیی و بـەرفراوانکردنی ڕێگەپێـدان و قەڵـەمڕۆیی بەرپرسـیارەتی والییـەکان لـە ویلایەتەکانـدا، هـەنگاوی

پێویست بنرێت. دەبێ ڕەچاوی ئەوەش بکرێت، کە لە کۆتایی ئەم ڕاپۆرتەدا، یەکەمین کارێك کە بکرێت بریتی بێت لە کارڕاییکردنی بابەتی ئەو چاکسازییە، کە لەسەر ئاستی ناوخۆیی وادەی بۆدانراوە و لەسەر ئاستی نێودەوڵەتییش لە لایەن ئەو دەوڵەتانەوە کە ئیمزایان کردووە، بخرێتە ژێر چاوەدێری و گەرەنتی وەرگرتن لەو ناوچانەی کە زۆرینەی دانیشتوانی ئەرمەنن و بەستنی پێوەندییێکی چاك لەگەڵیاندا.

**سەرچاوە:** YMTV, 4 /92-2

**بەڵگەنامەی ژمارە: ٢**

**بۆ نووسینگەی سەرۆکایەتی ئەلمابەینی[5] هەمایۆنی شکۆمەند**

**میهرەبانی گەورەم**

ئەو ستەم و دەستدرێژییانەی چەند تالآنچییەکی قەومی کورد بەرانبەر کەسانی میللەتی ئەرمەن دەیکەن، کە لە وڵاتی ئەرمینیادا لەنێوان مەمالیکی مەحرووسەی پایەبەرزی مەولانا سولتاندا دەژین، ئەو ستەمکێشانەش لە سۆنگەی چەند فەرمانبەرێکی ناشایستە و گەندەڵکار دەیچێژن، هەروەها چەندێك لە نووسەرانی ڕۆژنامەکان مانایەکی دیکەی نادروستیان داوەتە پێش ستەمکێشانی ئەرمەنەکان و بڵاوکردنەوەی برێك وتارگەلی دژ بە ئەرمەن بە دەربڕینی ناشایستە. لەناو ئەو ڕۆژنامانەدا، ڕۆژنامەی (*ترجمان حەقیقەت*)[6]ە، وتارێکی لە مانگی ئایاری ڕابووردوودا بڵاوکردۆتەوە، تێیدا بانگاشەی ئەوە دەکات، گوایە ستەمکێشانی ئەرمەنەکان نیازی شاراوەی لە پشت بێت و ئەوان بە مەبەست و بەرەوپێدانی داخوازییەکانیان هاوار لەدەست کورد دەکەن، بابەتەکە خۆی لەخۆیدا لە چەند ڕووداوێکی تاکەکەسیی زیاتر نییە، کە ئەوانە ڕووداوگەلی تاکە کەسین و بە مەبەستی مەترسی نانەوە لێرە و لەوێ دەست بە بڵاوکردنەوەیان دەکەن. بەمە بە تێڕوانین لە بەچاوی سووك سەیرکردنیان، وەسپێکی ساختەکاری ئەرمەنی دراوەتە پاڵ سکاڵای میللەتی ئەرمەن، بەم شێوەیە وێنەیەکی نادروست لەبارەی میللەتی ئەرمەن بە تایەفەی کوردەکان و موسڵمانە نەزانەکان دراوە. من لە کاتی

خۆیدا داوایەکم بۆ مەقامی عالی نەزارەتی عەدلیەی جەلیلە بەرز کردەوە بۆ داواکردنی ئەوەی مامەڵەیەکی قانوونی لەبەرامبەر خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی ناوبراو بگیرێتەبەر، هیوای زۆرم خواست بەوەی بەلای کەمییەوە ئیدارەی مەتبوعاتی شکۆمەند نووسراوێکی ئاگادارکردنەوەی بۆ بنێرێ، بەڵام هیچ هەنگاوێك دژ بەم ڕۆژنامەیە نەگیرایە بەر، بۆیە کارەکە لەم ئاستەدا نەوەستا و ڕۆژنامەی دیکەی تورکی بە تایبەتیش ڕۆژنامەی عوسمانلی بە شێوەیەکی نزیك لە هەموو ژمارەیەکدا کەوتە دروستکردنی درۆ و دەلەسەی دیکە، دوای ئەوەی ئەم ڕۆژنامەیە بەرەو ڕووی هیچ لێپرسینەوەییێك نەبۆوە و دەستیان کرد بەوەی میللەتی ئەرمەن و سەرۆکە ڕۆحانییەکانیان و کەسایەتییەکانیان بە پیسترین وەسپ و ناتۆرە ناو ببەن و تۆمەتبارکردنی میللەتی ئەرمەن لە لادان لە دڵسۆزی و گوێڕایەڵی و شاردنەوەی نیازی ڕاستەقینەیان و بە سکاڵا هەڵبەستن لە ستەمێك کە هەر لە بنەواندا بوونی نییە و هەوڵدانیان بۆ وەدیارخستنی ژمارەیان لە ئەرمینیا بە زیاتر لە ژمارەی موسڵمانەکان، ئەوانە بەگوێرەی ئەوەی لە پێشدا وترا دەبنە سۆنگەی ڕق و دڵڕەشی لە دواڕۆژدا. بە هۆی ئەم ڕەوشەوە ڕاپۆرتی دیکەم بۆ سەرۆکایەتی وەزیران (سەدارەتی ئەعزەم) و وەزارەتی ناوخۆ و دەرەوە و دادنووسی. بەڵام گرینگی و ترسناکیی ڕەوشەکە ناچاری کردم پەنا بۆ عەدالەت و سۆزی پایەبەرزی مەولانای خاوەنی تاج و ئاستانەی بەرزی مەولانا سوڵتان بەرم. جورئەتم لە ناخی خۆمدا بینی بۆ پێشکەشکردنی ئەم سکاڵانامەیەم. چاونووقاندنی ئیدارەی مەتبوعاتی شکۆمەند لەوەی ڕۆژنامە تورکییەکان دەیکەن و سینگفراوانی لەبەرامبەر ئەم ڕۆژنامەیە، کە باسمانکرد بە ئامانجی وروژاندنی ڕق و کینە لە دەروونی موسڵمانەکان بەرامبەر بە ئەرمەن، بە هەمان شێوە ئەرمەنەکان هان دەدات بۆ ئەوەی کاری هاوشێوە بکەن بەرانبەر بە هاووڵاتییە موسڵمانەکانیان، کە ئەمە جێگەی داخێکی زۆرە. هەروەها ئەم ڕۆژنامەیە بەردەوامە لە بڵاوکردنەوەی بابەتگەلێك، کە دەشێ ببنە سۆنگەی بە یەکدادانی لایەنگیرانی پایەبەرزی مەولانا سوڵتان لەگەڵ یەکتری و لە جیاتی کارکردن بۆ بەهێزکردنی هەستکردن بە خۆشەویستی و پشتگیری و زیاترکردنی هەستی بە هاونیشتمانیبوون و سەقامگیری، کار بۆ چاندنی تۆوی ناکۆکی و دووبەرەکی

دەکات. جا ئەگەر ئێوە لەوانەن کە باوەڕتان بە سوودی زۆری ڕۆژنامەوانی هەیە و لە داخوازیارانی ئەوەن ئازادیی زیاتر بەم ڕۆژنامەیە ببەخشرێ، هیچ سزایەك بۆ هیچ نووسەر و بە هیچ ڕۆژنامەیەك نەدرێ بە بێ دادگە، ئەوا ناشێ لەبەرامبەر ئەو ڕۆژنامانە بێ دەنگ بین، کە وتارگەلێك بڵاودەکەنەوە دوژمنکاری لە نێوان موسڵمانەکان و هاووڵاتییە ئەرمەنییەکان دەورووژێنن، بەمەش وەزیفەکەیان، کە دەبێ لە بنەواندا بۆ خزمەتی دەوڵەت و نەتەوە بێت، بە خراپ بەکاردەهێنن. جا ئەگەر ئەم ڕۆژنامە ناوبراوانە ئەو برووسکەنامە و ڕاپۆرتانە، کە لە لایەن هەندێك والی و داواکاری گشتی بڵاو دەکرێنەوە وەکو بەڵگە و دەستاوێژی ناڕاستبوونی نیازی ئەرمەنەکان دابنێن، ئەوا خراپیی ئیدارەی فەرمانبەرەکان لە ناوچەکان و بە تایبەت لە ئەرمینیا و ستەمکاری و دەستدرێژیی پێچەوانەی ویستی عالی، ڕاستیان لەو لێکۆڵینەوانە، کە لە لایەن بابیعالی لە پێشوو و دواتردا کراون بەدیارخراوە، ئەوە سەرباری ئەوەی ڕەوشی برسێتی و نەداری، کە هاووڵاتییە تورکەکان و کریستیانە تازەگەرەکان و گوێڕایەڵەکانی ناوچەکان بەدەستییەوە دەناڵێنن، دووپاتەی خراپیی کارگێڕی و ستەمکاری دەکەنەوە و زۆربەی زانیاریی ناو ئەو ڕاپۆرتانەی کە دەگەنە والییەکان و ئەوانیش بۆ بابیعالی بەرز دەکەنەوە لە هەڵبەستنی فەرمانبەرە بێ توانا و ناشایستەکانن و لەژێر کاریگەریی هەندێك دەستڕۆیشتوو و دەسەڵاتکار و ئاغاوەتەکان نووسراون. بەو پێیەی کە بیروباوەڕی دادپەروەرانەی پایەبەرزی مەولانا سوڵتان بە ڕاستی و دروستی ئامانجی وەدیهاتنی ئەو چاکسازییە بەڵێن پێدراوانەیە، کەوایە ئاشکرایە و دڵنیایە کەوا ئەو زانیارییانە هیچ نرخێکیان لە لای حکوومەتی سەنییەدا نابێت. هەوڵدانەکانی فەرمانبەرە ناوخۆییەکان بە ڕستێك لێکدانەوە بۆ داپۆشینی ئەو ڕەوشە نەویستراوە یان سووککردنی شتێکی نوێ نییە، بەڵکو وەسیلەیەکی پەیڕەوکراوە لە کاتێکی زووەوە و پێشتریش پاتریارکی ئێمە چەندین جار سکاڵای لەدەست ئەوە کردووە. ئەم ڕووداوەی دوایی ئەوەی سەلماند، کە نەتەوە و نیشتمان زۆر زەرەرمەند بوون لە سۆنگەی هەڵسوکەوتی ئەو فەمانبەرە گەندەڵکار و نەخوێندەوارانە، کە نوقمی ناو ناز و نیعمەتی دەوڵەت بوون و هەرگیز ئەوەیان نەزانیوە مانایەك بۆ بە پێشخستنی بەرژەوەندییە ڕەوایەکانی خەڵك بەپێش

بەرژەوەندییە ناڕەواکانی کەسیی خۆیان بدەن و هەرگیز نەیانزانیوە کە ئەرکیان بریتییە لە کار و کۆشش بۆ پاراستنی سەر و ماڵ و موڵك و ئاسایشی خەڵك. من لەگەڵ بەرچاوخستن و دەربڕینی ڕای خۆم لە سۆنگەی گوێڕایەڵی و وەفاداری خۆم بۆ سوڵتانی مەزنمان، بە پێویستی دەزانم بەم بۆنەیەوە لەوەی پێشکێشی دەکەم، بۆ بەرچاوخستن و ڕوونکردنەوەی ئەوەی پێوەندی بە مەسەلەی ئەرمەنەوە هەیە بە شێوەیەکی کورت بێسوود نەبێت، بەو شێوەیەی کە بە نووسین و بە زار بۆ مەقاماتی عولیام بەرز کردۆتەوە یەکەمیان و دوایینیان ئەوەیە، کە میللەتی ئەرمەن دڵسۆز و وەفادارە، خۆیشی لە پەنای باڵی سەڵتەنەی سەنییەدا دەبینێتەوە و هەست بە فەخر و شانازی دەکات لەوەتای پێنجسەد ساڵەوە لە ڕاستگۆیی و گوێڕایەڵی و کرنۆش بۆ عەرشی عوسمانی، بەقەد تاڵە موویێك لەم ڕەفتارە لای نەداوە. ئەوەی دڵنیایە ئەوەیە، کە میللەتی ئەرمەن لە سۆنگەی جوامێری و بەرژەوەندییان لەوەی وەفادارێتییان بێ خەوش و ڕاستگۆیانە بمێنێتەوە و گەرد نەگرێ ، ئەوە زیاد دەکەم کەوا تاکەکانی میللەتی ئەرمەن دەیانەوێ لەژێر عەدالەتی مەولانا سوڵتان بە ئەمن و ئاسایش بگەن و بڕێکی پێویست لەو باجەی کە لە سەریانە بیدەن بۆ ئاتاجەکانی وڵاتەکەیان و لە کاروباری پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان خەرج بکرێ تا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ سوودی لێوە ببینن. لە حاڵێکدا سەرژمێریی دانیشتوانی تورك و کورد لە ئەرمینیا بە جیا بکرێت، ئەوا ئەرمەنەکان زۆرینەی دانیشتوان پێکدەهێنن و مافی ئەوەیان دەبێ لە کاروباری وڵات بەشدار بن. بۆیە لە ڕێگەی منەوە پەنایان بۆ بابی عەدالەت هێناوە بۆ دامەزراندنی کەسە بە تواناکانیان بۆ خزمەتی نیشتمان تا پشکی خۆیان هەبێت لە مافە مەدەنییەکان و ئازادیی کەسی و کار بۆ پاراستنی میللەت و مەزهەب و نیشتمانی خۆیان بکەن. لە کاتی دانیشتنی پیرۆزی پایەبەرزی مەولانا سوڵتان دەبینین هەموو کۆشش و بایەخی خۆی بۆ چاکسازییەکان خەرج کردووە و بە تایبەتیش خەتی هەمایۆنی کە بە بۆنەی دەرچوونی قانوونی بنەڕەتی (دەستوور) بڵاوکرایەوە شێوەی ئیدارەی ئێستای حکوومەت دووپاتی دەکاتەوە، حکوومەت لەسەریەتی ڕێسای ڕاست و دروست بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری حوکمڕانی دابنێت. ویستی ئەرمەن بریتییە لە بینینی دامەزراندنی

بەڕێوەبەرایەتییەکی دروست و ڕێکوپێك لە نیشتمانەکەیاندا. هیچ شتێك نییە لەمەدا کە لە هیچ کارێکدا سەرپێچی لە دادپەروەری و شارستانی بکات، ئەوەی ماوە ئەوەیە، کە بڵێم پێکەوەنانی ئیدارەیەکی ئاوەها لە ئەرمینیا لە قازانجی مافە پیرۆزەکانی پایەبەرزی مەولانا سوڵتانە لە وڵاتی ناوبراودا، هەروەك دەبێتە وەسیلەکیش بۆ خۆشی و شادی خستنە ناو دڵی ئەو ئەرمەنییانە، کە لە وڵاتانی بێگانانددا دەژین. بەڵام ڕۆژنامەی ناوبراو لەوە تێنەگەیشتووە، کە داخوازییەکانی ئەرمەن لە بەرژەوەندی دەوڵەتی عالیەی عوسمانیدایە. بۆیە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە لێکدانەوەی پێچەوانەی ڕاستی لە لایەك و لە لایەکی دیکەوە بە دەربڕینی زبر و زەق سووکایەتی بە ئەرمەنەکان بکات. بەم بۆنەیەوە لە خۆم ڕادەبینم داوا بکەم ئاگادارکردنەوەیەکی توند بۆ ڕۆژنامەی ناوبراو ڕەوانە بکرێ، فەرمان و ئیرادە بۆ پایەبەرزی ئەو کەسەیە کە فەرمانی لەبەردەستە.

**٣ ی شەوالی ١٢٩٧– ٢٧ ی ئاغستۆسی ١٢٩٦ (٨ ی ئەیلوولی ١٨٨٠).**

**داواکار**

**سەرچاوە:** YMTV, 4 /92-1 (a)

### بەڵگەنامەی ژمارە: ٣

ئەو ڕاپۆرتە، کە لە بەحری پاشا–ی والی ویلایەتی وان گەیشتووە بۆ مەنزووری عالی بەرز کرایەوە، هەندێك بیروڕا و هەواڵپرسینی پێوەند بە مەسەلەی ئەرمەن بەخۆوە دەگرێت، ئاسایش و سەقامگیریی وڵات دەشێوێنێ، لەبەر ئەوەیە جێگەی بایەخی حکوومەتی سەنییەیە، هەروەها هەندێك سەرنجیشی لە بارەی فەوجەکانی سوارەی حەمیدییە تێدایە. ئەوە لە ئاگاداربوونی پایەبەرز خاوەن مەقامی خەلافەتە بۆ ئەوەی ئاگاداری لەسەر هەبێت، ئەوەش کە لە هەمووان گرینگترە سەرنجی بدرێتێ لەم مەسەلەیە ئەو بازاڕەیە، کە داب وایە هەموو ساڵێك لە مانگی تەمووز لە کڵێسای زەنگدار (جاکلی کلێسە)ی ویلایەتی مووش دەگیرێ، ئەو ئەرمەنانەی لەوێ ئامادە دەبن، لە ئێران و ڕووسیا و وڵاتە بیانییەکانی ترەوە دێن، ئەوە جگە لە هەزاران کەسانی خراپەکار لە ئەرمەنە نیشتەجێبووەکانی وڵاتی مەحرووسەی سوڵتان، لەوێدا ئەو بڕیارانە دەردەچن کە

پێوەندن بەو کارە فەسادانەی لە ماوەی ساڵدا پلانی بۆ دادەنێن، داواش لە لێژنەکان دەکرێ بڕی پارەی پێویست بۆ کاری ئەوەها دابین بکەن. هەروەها لەم گردبوونەوەیەدا ژمارەیەك ئەربابی تاوان و ئەسحابگەلی پێشوو، دوای ئەوەی ناو و جلوبەرگی خۆیان دەگۆڕن، لەبارەی کاری خراپەکارییەوە ڕاوێژ دەکەن. بۆیە کڵێسای ناوبراو لەژێر چاوەدێری و چاوتێبڕینی بەردەوامدایە. بۆیە وای دەبینین، کە بەڵگەی حیکمەتی حکوومییە، کە لێژنەیەکی تایبەت ڕەوانە بکات بۆ گرتنەبەری تەواوی هەنگاوهەڵگرتنی ئینزیباتیی پێویست لە تەواوی ماوەی بازاڕ و کارکردن بۆ ئەوەی بە ڕێگەیەکی حەکیمانە و ژیرانە ئەربابی خراپەکار، کە بە جلگۆڕاوی هاتوون دەستگیریان بکەن.

ئەوەیشی پێوەندی بە سوارە حەمیدییەکانەوە هەیە، ئەوا پێشتر ڕوونمان کردۆتەوە و پێویستی بە مەفرەزەیەکی عەسکەرییەوەیە، کە توخمەکانی لە سوارەی نیزامی بن بۆ فێرکردن و ڕاهێنانی کەسەکانی تا ئەوەی پێویستە لە گوێڕایەڵی و ملدان و نیزام وەگیر بێت و سوود و چاکەخوازی ببێ، بایەخ و گرینگی پێدانی لای پایەبەرزی خاوەن مەقامی خەلافەت، بۆ ئەنجامدانی کاری پێویست هەروەك زانیمان بە دەرچوونی ئیرادەی سەنییەوە بەندە. بۆیە پێویست ناکات ڕای نیوەچڵیی خۆم لەم بارەیەوە دەربڕم، بەڵام پێویست دەکات و بەرژەوەندی وایە ڕێگری لەوە بکرێت کە ڕەوشەکان نەبنە کێشە و کوشت و کوشتاری لە نێوان ئەفراد و عەشایرەکان لێ نەکەوێتەوە. ئاشکرایە ئەمە دەوەستێتە سەر مکومکردنی موڵکییەی کۆمەڵێك لە ئەفسەر و ئەفرادی عەشایەر بۆ ئەو خانووانەی تێیاندا نیشتەجێ دەبن و ئەو زەوییانەی کە بە سەنەدی ڕەسمی دەیکێڵن. چونکە سەرۆك عەشیرەتەکان ئەم حاڵەتە، واتە نەبوونی سەنەدات، دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی هەرکاتێك ئەوەی بیانەوێ لە ئاوایی دەریان بکەن، ئەمەش ئەوانە ناچار دەکات خان و مانی خۆیان بەجێبهێڵن و پەنا بۆ ناو خاکی ئێران یان بۆ ناو عەشایرەکانی عوسمانی بەرن. زۆرینەی ئەو کوردانەی کە لەسەر کۆچەری و کۆچباری دەژین ئەوانەن، لە ویلایەتەکانی بایەزید، مووش و گەنجەی سەر بە ویلایەتەکانی: ئەرزەڕۆم، بتلیس و ناوەندی لیوای واندا دەژین. جا ئەگەر مەئموورێکی تایبەت لە لایەن نەزارەتی دەفتەری خاقانییەوە بۆ ئەوێ بنێردرێ و لێژنەیەك بە

سـەرۆکایەتی خـۆیی و ئەندامـەکانی لـە مـەئموورانی دەفتـەری خاقـانی نـاوخۆ و ئەنـدامانی ئەنجومـەنی ئیـدارە، لـە لایـەنی عەسکەریشـەوە بـۆ کـارڕاییکردنی چاوپێداخشاندنەوە بۆ تاپۆ لە هـەر ویلایەتێکدا، دابەشـکردنی زەویـی زیـادەش، دوای چاوپێداخشاندنەوە، بەسەر ئەوانە کە خانوو یان زەوییان نییـە، بەمـەش لـە ڕێگەی بەخشینی قەواڵەی خاقانی ڕازاوە بە تـوغرای سـوڵتانی نیشـتەجێ دەبـن و مـافی تەسـەڕوف پێکردنیـان بـە زەوییەکانـەوە دابـین دەبـێ. ئـەوەی شـایانی بەیانکردن و ڕوونکردنەوەیە ئەوەیە ئەگەر والیی ناوبراو فەرمووی بە خۆی سـەفەر بۆ ئـەوێ بکـات بـۆ چـاودێریی پیـادەکردنی هەنگاوهـەڵگرتنی داواکراوەکـان، ئـەوا بێگومـان ئـەمن و ئاسـایش و ئینزیبـاتی داواکـراو لـە سـوارەکانی حەمیدییـە بـە شێوەیەکی داواکراو لە لای مەقامی عالی بەدی دێ. لەبەر ئەوەش پێویسـت دەبـێ یاریدەدەرێك بۆ والی دابنرێ تاوەکو بەرژەوەندییەکانی ویلایەت، لە کاتی گەڕان و سووڕانی والیی ناوبراو بۆ پشکنین، پەکی نەکەوێ، غالیب پاشایش کـە یـەکێك لـە مـیر و دیدەبانـەکانی وانـە و پێشـتریش وەکیلـی موتەسـەڕیف بـووە و ناوبـانگ و نفووزێکی بەرفراوانی هەیە، بۆیە ڕەزامەندی لەسەر پێکەوەنانی لێژنەکانی نـاوبراو و دامەزراندنی غالیب پاشا، وەکو یاریـدەدەری والـی، بەسـتراوەتەوە بـە ئـیرادەی پایەبەرزی مەولانا سوڵتان و بڕیاریش بۆ پایەبەرزی وەلی ئەمرە.

**٢١ ی شـەعبانی سـاڵی ١٣١٢ و ٥ ی شـوباتی سـاڵی ١٣١٠ ( ١٧ ی شـوباتی ١٨٩٥)**

**یاوەری میهرەبان**

**دەروێش**

**سەرچاوە:** YMTV, 115 /28-1

**بەڵگەنامەی ژمارە: ٤**

ویلایەتی وان

(خامەی نامەکاری)

"تایبەت"

**بۆ مەقامی شکۆمەند یاوەری بەڕێزی دەوڵەت، موشیر دەروێش پاشا**

**بەرچاوخراوی داواکاری تایبەتیتان**

ئەوا بۆ شەش ساڵ دەچێ[7] مەسەلەی ئەرمەن، کە هەندێك خاوەنی وەهم و خەیاڵ دایانهێناوە، شێوەیەکی ترسناکی بەخۆیەوە گرتووە، ئێستاش وا دیارە مەترسییەکەی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبێت، ئەمە وەك ئەوەی ڕۆژنامەکان لە ڕێگەی چەند وتارگەلێکی شۆڕشگێڕانە، ئاماژە بۆ ئەم بزاڤانە دەکەن، لەم بوارەدا بەڕێوەن. ویلایەتی وان، کە من ئەمڕۆ شانازی بەوەوە دەکەم والی ئەو ویلایەتەم و ئەرك و پەیامی خۆم بەجێدەگەیەنم، بە شێوەیەك کە مایەی ڕەزامەندیی عالی پایەبەرز صاحیبی مەقامی خەلافە بێت. ئەو ویلایەتەیە کە ژمارەیەکی زۆر ئەرمەنی تێدا نیشتەجێیە، لەبەرئەوە دەبینم ئەرکی منە، ئەم ڕاپۆرتە لەبارەی مەسەلەی ئەرمەن بخەمە بەرچاو، کە بریتییە لە پوختە و بەرهەمی بەدواداچوون و لیکۆڵینەوەگەلێك، من بە شێوەیەکی قووڵ و فراوان لە سەرەتای مەئمووریيەتی خۆمەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆ ئەنجامم داوە.

چونکە چاونووقاندن لەوەی کە لە گۆڕەپانەکە ڕوودەدات، یان بە بێ بایەخ ڕوانین یان نەگەڕان بە شوێن چارەسەرێك بۆ ئەوەی لە کاتی خۆیدا، بەرلەوەی کارەکان ئاڵۆز بـبن، کۆتایی بەم کێشەیە بهێنێ، بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ گوێڕایەڵی و وەفا یەکناگرێتەوە. بۆیە من دەستپێشخەری دەکەم بۆ بەرچاوخستن و دەربڕینی ڕای نیوەچڵی خۆم، کە لە بارەی بابەتەکەوە بە بیری پێنەگەیشتووی مندا هاتووە:

بە شێوەیەك من، لەو تۆژینەوە و لێکۆڵینەوانانەی کە لەئارادان، تێدەگەم بە هیچ شێوەیەك ناکرێ هەر دەبێ بڵێین، ویستی سەربەخۆیی لای ئەرمەن تەنها وەهم و خەیاڵێکە و بە شێوەیەکی گشتی بیرو زەینی داگیر کردوون، بەڵام لەگەڵ

ئەوەشدا زۆر لە تەرەفدارانی پیاوەکانیان تێدەگەن و ئەوە دەزانن کەوا گەیشتن ڕاستەوخۆ بۆ ئەم ئامانجە لە خۆیانەوە لەبەرامبەر هێزی لەشکاننەهاتووی پایەبەرز مەولانا صاحیبی تاج، خودا شەوکەت و جەلالی شانی بۆ ئاخیری زەمان درێژ بکاتەوە زۆر لە ڕاستی و وەدیهاتنەوە دوورە، بۆیە بیرۆکەی یاخیبوون هێشتا شێوەیەکی تەواوی بەخۆیەوە نەگرتووە، بەڵام خودا نەکات ئەگەر قەناعەتی تەواو لای ئەرمەن دروست بوو یان دەرفەتی ئیمکانیەتی گەیشتن بەو ئامانجە، کە بۆی دەڕوانن هاتە پێشەوە، ئەوا بێ گومان سڵ ناکەنەوە لەوەی بە شێوەیەکی گشتی هەموو شێوە خراپەکارییەك ئەنجام بدەن.

جا ئەگەر ئەمە ڕاستییەکە بێت، ئەوا ئەو بەرژەوەندییانەی کە سەرە فەسادەکان دەیانەوێ وەدی بهێنن لە ڕێگەی ڕازیکردن و فریودانی چەندێك لە گەنجەکان بەوەی فیدایین و پاڵ پێوەنانیان بۆ تاوانکاری تەنها وەهم و خەیاڵێکە و خۆیان بە تەنیا ناتوانن وەدی بهێنن، ئەو ئارمانجەش کە بۆی دەڕوانن ئەوەیە ئەوروپا بەچاوی ستەمەلێکراو لە لایەن حکوومەتی عوسمانییەوە بۆیان بڕوانێ، کە ئەوان لەبەر ئەوە لە حکوومەت یاخی دەبن چونکە بەرگەی ئەم ستەمە ناگرن. بۆیە ئەو کریستیانە ستەمەلێکراوانە پێویستییان بە کۆمەك و هاریکاری هەیە، ئەوان بەشوێن پارێزەوانێکدا دەگەڕێن کە بیانپارێزێ. ئەوەی دارودەستەی شەڕخواز، بە شەو و بە ڕۆژ، لای ئەوان بەدوایدا دەگەڕێ ئەویش تەنها وەدیهاتنی ئەو ئامانجەیە. چاپەمەنییەکانی هەندێك لە وڵاتانی وەك: ئینگلستان و ئەمریکا و فرانسا و یۆنان و ڕۆمانیا تۆمەتی ناڕەوا ئاڕاستەی ئیدارەی دادپەروەرانەی سوڵتانی سەنییە دەکەن و لەوە ڕاهاتوون زێدەڕۆیی و درۆودەلەسە لەبارەی مەسەلەی ئەرمەن بڵاو بکەنەوە، ئامانجیشیان لەوەدا ڕاکێشانی سەرنجی بێگانەکانە بۆ لای ئەرمەن، بە شێوەیەك بەپێی لێکۆڵینەوەکانیش دەرکەوتووە، کە نووسەرە بێگانەکان، ئەوانەی لەبارەی مەسەلەی ئەرمەنی دەنووسن، بڕە پارەیەکی زۆر لەو ڕێکخراوە فەسادییانە وەردەگرن، کە پێوەندییان بەم مەسەلەیەوە هەیە.

بۆیە من نووسیارانی ئەم ڕۆژنامانە، کە شایانی ئەوەن بەوەی بە کۆمەڵێك درۆزن و بانگخوازانی درۆودەلەسە بناسێنم بۆ دوو بەش پۆلینم کردوون:

بەشی یەکەم: ئەوانەن کە لە مەمالیکی سولّتانییەوە، بە ئامانجی خوێندن، سەفەری وڵاتە بێگانەکانیان کردووە و لەوێ بوونەتە سەرنووسیاری ڕۆژنامە، هەروەها ئەو ئەرمەنە عوسمانییانە، کە تاوانی سیاسی و کەسییان، لە کاتێك لە کاتەکان، ئەنجام داوە و پاشان بۆ ڕزگاربوون لەو سزایەی کە بەرەو ڕوویان بۆتەوە بۆ وڵاتە بێگانەکان هەڵاتوون، لەوانە مێگەردیچ پورتوکالیان ئەلتۆقادی[8]، کە لە مارسیلیا ڕۆژنامەی (ئەرمینیا) دەردەکات.

بەشەکەی دیکە: ئەوانەن کە لە بنچینەدا بێگانەن و فریوی لیرەی زێڕینی ڕێکخراوی (هنجاق)[9]یان خواردووە، مەڵبەندەکەی ئەوانە لە شاری ئەتینیایە و پاشان بە مەبەستی بەردەستخستنی کۆمەگی زیاتری ئینگلیز بارەگاکەی گواسترایەوە بۆ لەندەن. بەمە هیچ گومانێك یان دوودڵییەك لەوەدا نامێنێتەوە، کە مەسەلەی ئەرمەن کاری خەیاڵ و درۆودەلەسەکارییە.

ئەوەی لای مەقامی بەرزتان شاراوە نییە، ئەو شوێنانەی ئەرمەن مەبەستیانە، لەناو خاکی مەمالیکی سولّتانی، یاری تێدا بکەن بریتین لە: ویلایەتەکانی ئەرزەڕۆم و وان و بتلیس و دیاربەکر و سیواس و ئەدەنە، هەروەك چەند شوێنێکی دیکە لە دەرەوەی سنوور بوونەتە کانگەی فەساد، ئەوانیش "دێر دیریك"ە لەناو سنووری ئێران و بە دوورایی دوو سەعات و نیو لە سنووری (وان) و "دێر کەنیسەی سێیانە" لە نزیك شاری ڕەوانی ڕووسیا و شاری تفلیس.

بێجگە لەوانە چەند شارۆچکەیەك لە ئێران هەن، وەك: "ئورمیە" و "خۆی" و "سەلماس" و "هەفتەوان" و "کۆنەشار" و تەبرێز" و "سنە" و "دیلمان" بەشی زۆری ئەو ئەرمەنییانەش کە لەو ناوچانە دەژین بریتین لە "فیدابییەکان"، کە لە ڕووی قانوونییەوە کاری قەدەغەکراویان کردووە و پاشان هەڵاتوون بۆ ئەم شوێنانە، بەڵام پێشتر لە لایەن سەرۆکی خراپەکارەکان (قریمیان) کە لە "کەنێسەی سێیانە" دایە خولیان بینیوە و پاش ئەوە بەو ناوچانەدا بڵاوبوونەتەوە بۆ ئەوەی هەر کاتێك دەرفەتیان بۆ هاتە پێشەوە بتوانن دەستدرێژی بکەنە سەر سنووری عوسمانی.

لە مووشیش دێرێك هەیە بە "کەنیسەی زەنگدار" دەناسرێ، ئەرمەنەکان پێیان وایە یەکێ لە فریشتەکان لەناو ئەم دێرەدا نێژراوە. هەواڵمان لەبارەی ئەم

دێرەوە بۆ هاتووە بایەخێکی زۆر بە مەسەلەی ئەرمەن دەدات، تەنانەت هەزاران ئەرمەن لە مانگی تەممووزی هەموو ساڵێك، بۆ بینینی ئەو بازاڕەی کە تێیدا دەکرێتەوە، ڕوو لەم دێرەیە دەکەن. لەم دێرەیە کۆدەبنەوە و بڕیار دەردەکەن، لە ماوەی ساڵێکدا چی بکەن، پارەی پێویستیش کۆدەکەنەوە و دەیدەن بە سەرۆکی ڕێکخراوەکە و ئەندامەکانی بۆ جێبەجێکردنی ئەم بڕیارانە.

بەپێی ئەوەی لە پێشەوەدا گوترا، لەکاتی خرانەژێر چاوەدێری دێری ناوبراو و سووسەکردنی بەردەوام، بە تایبەتی لە کاتی کۆبوونەوەکان و بەستنی بازاڕ، دەرکەوت کە چۆن ئەربابگەلی تاوان و شەڕانخواز لە ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە، بە جلگۆڕاوی و ناوی هەمەجۆر، ئامادەی ئەم کۆبوونەوانە دەبن. دوای ئەوە دەتوانرێ دەستگیر بکرێن و ڕێگەنەدرێن بەشداری کۆبوونەوەی لەم جۆرە بکەن.

هەروەها کەسێك نییە ئینکاری لە پێکەوەنانی سوارەی حەمیدییە[10] بکات بە فەرمانی حەزرەتی مەولانای خاوەن تاج، لە هۆزە کوردییەکان لە ویلایەتەکانی ئەرزەڕۆم، بتلیس، وان و دیاربەکر لەوەی سوودی مەزنی هەیە بۆ زیادەکردنی توانست و بەرزکردنەوەی هێزەکانی دەوڵەت. وەك ئەرکی حەتمی لە لایەنی ئایینی و نیشتمانی هەوڵی کۆششکردن بۆ وەدیهێنانی ئاسایش و دیسپلینی ئەم سوارانە، هەروەها وەك ئەرکی خۆم پێویستی بوون بۆ ڕێفۆرمگەلێك کە لە کاتی ئێستا و دواڕۆژدا پێویستیەتی ڕابگەیەنم. چونکە ئەگەر کاری چاکسازی و ئەوەی کە بڕێك لەم سوارانە پێویستیانە دواکەوتن یان تەگەرەیان خرایە بەردەم، ئەوا ئەو هەنگاوهەڵگرتنانە، کە دوای ئەوە دەگیرێنەبەر، بە ئاسانی ئەو ئەنجامانە بە دەستەوە نادەن کە دەخوازرێن. نەزانی لای بڕێك لە عەشایرە کوردەکان و میرەکانیان پاڵیان پێوەدەنێ بڕێك کار بکەن و ئەو ئامۆژگارییانەی کە لەم بوارەدا دەدرێن و بەیانکردنی ئەوەی کە ئەم هەڵسوکەوتانە سەر بە ئەنجامگەلی خراپ دەکات و ڕەزامەندیی عالی پێویستی بە پەیڕەوکردنی ڕێگەی ڕاست بە ئەنجامی خوازراو نەگەیشت، بۆیە دەبینرێ ماوە ماوە کاری کوشتن و بڕین و تاڵان و بڕۆیی ماڵ و دارایی و دەستدرێژی و کارگەلی دیکە ڕوودەدەن.

برێـك لـە سـەرۆك و مـیری عەشـایرە کوردییـەکان کـە لەبـەر چـاو و دیـدەی کەسانگەلی بەدنیەتی ئەوروپا چاویان بڕیوەتە وڵاتی ئێمە و ئەم کردە ڕەتکراوانـە دەکەن، پرسی تالۆری[11] کە کۆتایی هات (لەگـەڵ ئـەوەش کـە شـەرەف سـیفەتی عەسکەرییان هەڵگرتبوو) دەقۆزنـەوە و وای دەبیـنن کـە ئـەم سـوارە حەمیدییانـە لەگەڵ بەرژەوەندی تایبەتییان ناگونجێ و بەمە زۆر دڵۆدەلەسە، کـە بـە خەیاڵـدا نایەن، هەڵدەبەستن بەو ئامانجەی لەبەر دیدەی حەزرەتی مەولانا سولتانی بخەن، بۆیە تەمبێکردنی ئەوانە لە چوارچێوەی ڕێساکاندا دەبێتە سۆنگەی زۆر چاکبوون. چونکە کوردەکان بە کۆششێکی کەم دەشێ چاك ببن، ئەو کێماسییەی کە هەیانـە وادیارە لە سۆنگەی نەزانی و ئەو تەنیاییە کە لەگەڵیاندایە، بەشـێوەیەك دەتـوانم بڵـێم وەلابردنـی ئـەم کێماسـییە لایـان، کـە بـە زرنگـی و زیرەکیـی خۆڕسـکییەوە ناسراون، پێویسـتی بـە کـار و کۆششـێکی کـەم هەیـە. کـارێکی دیکـە، کـە دەبـێ تێبینی بکرێ ئەوەیە زۆرینەی ئەفسەر و ئەفسەرە بچووکەکان، بەدەر لـە سـەرۆك و هـۆز و میرەکانیـان، خانوویـان نییـە و نـەبوونی شـوێنێك کـە داڵـدەیان بـدات لـەو سەرچاوانەی خراپین کە پەنای بۆ دەبەن. ئەم ڕەوشە لـە بـێ بایـەخی حکوومـەت سەرچاوە دەگرێ، کە پێشتر بایـەخی بـە نیشـتەجێکردنیان نـەداوە و ئـەوەی کـە مامەڵاتی تاپۆیان لەسەر دەوەستێ.

ئەگەر پێوەندیی نێوان ئەفسەر، یان ژمارەیەك لـە ئەفسـەران لـە سـوارەکانی حەمیدییە، لەگەڵ سەرۆکەکانیان، لە هەر ویلایەتێك لە ویلایەتەکان تێکچـوو، ئـەوا برێك پێویسـتی سـووکەڵە لەگـەڵ خۆیانـدا هەڵـدەگرن و ئەوەنـدەی ئـەو چـارەو و ماڵاتانەی هەیانە هەڵیدەگرن و دەیبەنە دەرەوەی ئەو گوندەی لێـی نیشـتەجێن و لەگـەڵ ئـەو کەتیبەیـەی کـە سـەربەوانە بـەرەو ئێـران دەڕۆن، لەوێـدا لەبەرامبـەر پێدانی مەڕێك یان دوو سەرمەڕ بۆ سـەرۆکی ئـەم هـۆزە دەمێننـەوە. ئـەم ڕەوشـە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی تۆمارکراوەکان لە کەتیبەکان، ئـەوە وێـڕای نـەتوانینی ئامادەکردنی ئـەو ژمـارە داواکـراوەی سـوارە کـە سـەرۆکی هـۆز لـە کۆبوونـەوەدا وادەی دابوو. جا ئەگەر زانیمان پرسی نیشتەجێبوون بووەتە هۆیەك لە هۆیـەکانی ناکۆکی و دەستدرێژی لەناو عەشیرەتەکان، ئەمەش لـە سـۆنگەی ڕق هەڵسـاندن و ئەو دنەدانـەی کـە لـە کۆچـکردن بـۆ عەشـیرەتێکی دیکـە پیـادەی دەکـەن، لـەوە

تێدەگەین دابیننەکردنی شوێنی نیشتەجێبوون بۆ ئەوانە تا چ ڕادەیەك خراپ و مەترسیدارە.

لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێ نکوڵی لەوە بکرێ هەندێك لە سەرۆك عەشیرەتەکان هۆی ئەم کۆچپێکردنەن، چونکە ئەو خانووانە، کە ئەفسەر و تاکەکانی عەشیرەت، تێیدا نیشتەجێن، ئەو زەوییانەش کە دەیانکێڵن و دەیانچێنن بە تاپۆ موڵکی ئەوان نییە، جا هەر کاتێك سەرۆکی عەشیرەت پێی گوتن یاڵڵا بڕۆن ! تۆ بۆت نییە لە ئاواییەکەم نیشتەجێ بیت ! ئەوا هیچ سەنەدێکی بەدەستەوە نییە بۆ سەلماندنی مافی خۆی و هیچ دەلیڤەیەکی دیکە نادۆزێتەوە جگە لەوەیماڵەکەی بەجێبهێڵێ، ئەوسا یان پەنا دەباتە بەر ئێران یان پەنا بۆلای هۆزەکانی دیکەی عوسمانی دەبات.

خولاسەی کەلام ئەوەیە، ئەو پشێوی و ناڕێکییەی لە برێك عەشایەردا دەیبینین، بە پلەی یەکەم لە سۆنگەی بێ شوێنی و نیشتەجێبوونەوە هاتووە، بە ڕای منیش چارەسەری بە دابینکردنی خان و مان بۆ ئەوانەی نییانە، پارچە زەوییەکیشیان پێبدرێت و موڵکدارێتییەکەیان لە تاپۆ تۆمار بکرێ، پیادەکردنی ئەمەش بەندە بە ڕای مەقامی عالیتان.

ئەوەش کە لای مەقامی عالیتان زانراوە ئەوەیە، پیشەی سەربازی بنەوانی پاراستنی مەمالیك و نیشتمانە، بنەوانی پیشەی سەربازیش بریتییە لە گوێڕایەڵی و دیسپلین، لەسەر ئەمە پێویستە کۆشش بکرێ بۆ سەقامگیرکردنی چەمکی گوێڕایەڵی و دیسپلین و شوێنکەوتنی فەرمان و دوورکەوتنەوەی نەهی لێکراوەکان، ئەوە سەرباری خوو و ڕەوشت و پەروەردەی سەربازی لای تاکەکانی ئەم عەشیرەتانە.

ڕاستییەکەیشی هەموو ئامیر و ئەفسەرانی سوپای نیزامی لە هەر کەتیبەیەك، بە سیفەتی سەرکردە، کە بە تەواوی، هەموو سیفەت و خاسیەتگەلی وشەی عەسکەرییان تێدایە، هەروەها بایی ئەوەندە زانیاریشیان هەیە وایان لێ دەکات بتوانن مەشقی سەربازی بە عەشایرەکان بکەن و فێریان بکەن. ئەمەش کارێکە هەمووان دەیزانن، بەڵام تۆ بڵێی لەمەدا ئامیر و ئەفسەر و تاکەکانی عەشایەر لای تاکەکانی عەسکەرە نیزامییەکان نەبینیبێ و هیچ شتێك لە نیزام و گوێڕایەڵی داواکراو فێرنەبووبن.

من پـێم وایـە چـاکتر وایـە کـە هـەر کەتیبەیـەك، لـە مەفرەزەیـەکی بیسـت کەسی، لە سـوارەی نیزامـی لـەژێر دەسـتی سـەرۆك کەتیبەیـەك بێـت لـە سـوپای نیزامی، تاکەکان ڕابهێنێ و عەسکەرییان فێربکات. ئەوەش جێگـەی دڵنیاییـە کـە هەموویان لە ماوەیـەکی کورتـدا ئـاداب و پـەروەردەی عەسـکەریی سـەرۆکەکانیان وەردەگرن و دوای ئـەوە دوور دەکەونـەوە لـەوەی هـیچ کـار یـان هەڵسـوکەوتێکی پێچەوانەی ڕەزامەنـدی عـالی بکەنـەوە، ئەفسـەرە بچـووکەکان و تاکـەکان واتـەی گوێڕایەڵی و ملکەچبوون فێردەبن و لەسایەی ئەمەوە حەزی ئەوەیان تێـدا دەڕوێ فێری خوێندن و پەروەردە بن کە هەموو عەسکەرێك لەسەریەتی بیزانێ.

لەگەڵ ئەوەشدا سوود و چاکەیەك، کە ئـەم هەنگاوهەڵگرتنـە پێشـنیازکراوانە دەیانبێ، لەم ئاستەدا ناوەستێ، بـەڵکو ئـەم هەنگاوهەڵگرتنانـە ڕادەیـەك بـۆ ئـەو قسـەو قسـەڵۆکانە دادەنـێ کـە لـە لایـەن هەنـدێ لـە عەشـایرەوە دەردەچـێ و ئێرانییەکانیش گـەورەی دەکـەن، بێگانـەکانیش عادەتـەن بـە زۆر زیادەڕۆییـیـەوە بڵاوی دەکەنەوە. لە خوداوەندی مەزن دەپاڕێمەوە کە خواستی مەولانا، سـێبەری خوداوەنـد لەسـەر زەوی لـە پێکـەوەنانی ئـەم سـوارانە سـوودی مـەزنی ببێـت و هۆکاری هێز بێت، هاوواتەیەکی ئەو سازانە خوداوەندییە بێـت کـە بەسـەر مـەولانا سوڵتانی بەخشیویە.

ڕاسـتی لەوەدایـە کـە لـە ئـیرادەی سـەنییەی حـەزرەتی ئـەمیری مـوئمینین دەردەچێ، من بە پاڵنەری کۆیلەیی و دڵسۆزی بوونم جورئـەتم لەخۆمـدا بینییـەوە بـۆ پێشکێشـکردنی ئـەم ڕاپۆرتـە، کـە تـەنها چـەند زانیـارییێکن و فـەرمانیش بـۆ حەزرەتی وەلی ئەمر و ئیحسانە.

**٣ی شەعبانی ١٣١٢ و ١٧ ی کانوونی یەکەمی سـاڵی ١٣١٠ ( ٣٠ ی کـانوونی دووەمی ١٨٩٥)**

**والی وان**
**کۆلۆنێل بەحری پاشا**

**(ماویەتی)**

**سەرچاوە:** YMTV, 115 /28-2

**پەراوێزەکان:**

[(1)] کـۆنگرەی بـەرلین، کـە لـە (١٣) ی حـوزەیرانی ١٨٧٨ دەسـتی پێکـردووە و لـە (١٣)ی تـەمووزی هـەمان سـاڵ کۆتـایی هـاتووە، بەمەبەسـتی پێداچـوونەوە و ڕاسـتکردنەوەی پەیماننامـەی سـان سـتیفانۆ بەسـترا. لـەم کۆنگرەیـە، وێـڕای ڕاسـتکردنەوە و چـاککردنی پەیماننامەی سان ستیفانۆ، لە هەمووی گرینگتر بـۆ ئیمپراتۆریـای عوسمـانی ئـەوەبوو کـە سەربەخۆیی ئیمپراتۆریای عوسمـانی ناسـێنرا. یـەکێك لـە ئەنجامـەکانی کـۆنگرەی بـەرلین گۆڕینی جوگرافیای سیاسیی باڵکان بوو بـۆ دەوڵـەتی بچـووك بچـووك، کـە هـیچ کامێکیـان نەدەبوو لـە سـنوورێکی بـۆدانراو زیـاتر بچـنە دەرەوە و بـە هـەزاران داوی دیپلۆمـاتی بـە زلهێزە ئەوروپییەکانەوە شەتەك درابوون. هەرچی تایبەت بوو بە مەسەلەی ئەرمـەن ئـەوە لەو پەیماننامەیەدا بوو، کە پرسی ئەرمەن لە چوارچێوەی پرسی ڕۆژهەڵاتدا بە نێودەوڵەتی کرا، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەم پەیماننامەیە بوو بـە هـۆی تێکدانی ڕەوشـی ئەرمـەن لـە ڕیزی سیستمی میللەتـدا. برگـەی ٦١ی پەیماننامەکـە، کـە ئەرمەنـەکان هیوایـەکی زۆریـان لەسەر هەڵچنیبوو، تاقە برگـەی پەیماننامـەی بـەرلین بـوو، کـە جێبـەجێ نـەکرا و بـوو بـە سۆنگەی تێکچوونی پێوەندییەکانی کورد و ئەرمەن ـ وەرگێڕ.

[(2)] مەبەستی لە نیشتەجێیەکان، ئەرمەنەکانن ـ وەرگێڕ.

[(3)] مەبەستی لە کۆچەرییەکان، کوردەکانن ـ وەرگێڕ.

[(4)] زەپتییە : کەسانێکی چەکدار بوون کە ئەرکیان پارێزگـاریکردنی ڕێکوپێکیی سـوپا بـوو لـە کاتی پێشوەچوونیدا، بۆ پاراستنی ریزەکـان و ڕانـەکردنی سـەربازەکان لـە کـاتی جەنگـدا (فەرهەنگی زاراوە مێژووییەکان، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژ١٩ ، ٢٠١١، ل: ١٠).

[(5)] ئەلمابەین: وشەیەکی عەرەبییە و بەو شوێنە دەگوترا، کە سەرای سـوڵتانی لـە ژوورەکـانی دەست و پێوەندەکان و ئەوانەی لـە خزمەتیـدابوون جـودا دەکـردەوە، (فەرهـەنگی زاراوە مێژووییەکان، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژ٢٠، ٢٠١٢، ل: ٤٥٨).

[(6)] یەکێك لە گرینگترین ڕۆژنامەکانی دەورانـی سـوڵتان عەبدولحەمیـدی دووەم بـوو. لـە لایـەن ڕۆمانووسی ناسراو ئەحمەد ئەفەندی میدحەت، ژمارە یەکی لـە ٢٦ ی حـوزەیرانی ١٨٧٨ لـە ئەسـتەموول بڵاوکرایـەوە، ڕۆژنامەیـەکی ئینسـکلۆپیدیایی بـوو و دوا ژمـارەی لـە ١١ ی شوباتی ساڵی ١٩٢١ بڵاوکرایەوە. ئەحمەد ئەفەندی میدحـەت تـاوەکو مردنـی سـاڵی ١٩١٣ هەر سەرنووسەری ڕۆژنامەکە بووە– (وەرگێڕ).

[(7)] مێژووی یەکەمین یاخیبوونی چەکداریی ئەرمەن، لە ئیمپراتۆریـای عوسمـانی، دەگەڕێتـەوە بۆ ٢٠ ی حوزەیرانی ١٨٩٠، کاتێـك لـە ئـەرزەڕۆم یـاخیبوون ڕوویـدا. بـەگوێرەی گێڕانـەوە عوسمانییەکان، دەزگای هەواڵگری عوسمانی هەواڵی ئەوەی پێ گەیشتبوو، ئەرمەنەکان لە کلێسە و قوتابخانەیەکی ئەرمەنی خەریکی چەك دروسـتکردنن، دوای ئـەوەی کـە کلێسـە و

قوتابخانەکە دەپشکێنرێن، بەڵام هیچی تێدا نادۆزنەوە، ئەمە ئەرمەنەکان دەورووژێنێ و تووڕەیان دەکات و دووکانەکانیان دادەخەن و خۆیان دەخەنە ناو کلێسەکە و تەقە لە سوپای حکومەت دەکەن و دوو سەربازی عوسمانی دەکوژن، لە تۆڵەی ئەمەدا موسڵمانەکان شەڕ دەکەن و هەشت ئەرمەنی دەکوژن و دوو موسڵمانیش دەکوژرێن، هەر لەم پێکدادانەدا چل و پێنج موسڵمان و شێست ئەرمەنی بریندار دەبن. ئا لێرەوە، لە نێوان جوولانەوەی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی ئەرمەن و سیاسەتی پان-ئیسلامیزمی سوڵتان عەبدولحەمید، مێژووی قەتڵوعامکردنی ئەرمەن دەستپێدەکات، لە ساڵانی ١٨٩٤-١٨٩٦ شەپۆلی ئەو قەتڵوعامە هەزاران ژن، مندال، پیرەمێرد و خەڵکی بێتاوانی ئەرمەنی لەناوبرد، ساڵی ١٩١٥یش قەتڵوعامەکە گەیشتە چڵەپۆپە و شێوەیەکی سیتماتیکی قەتڵوعامکردنی دەوڵەتی بەخۆیەوە گرت - (وەرگێڕ).

[8] مێگەردیچ پورتوکالیان (١٨٤٨-١٩٢١) لە کۆنستانتینۆپل لە دایك بووە، لە وان بەڕێوەبەری ناوەندی بووە و دواتر هەڵوەدای فرانسا بووە و لە مارسیلیا ڕۆژنامەی (ئەرمینیا) ی بڵاوکردۆتەوە - (وەرگێڕ).

[9] ڕێکخراوی (هەنجاق) Hentchak یەکێك لە کۆنترین پارتی سیاسیی ئەرمەنییە، حزبێکی سیاسی و سۆسیال دیموکراتی خاوەنی بزووتنەوەی چەپخواز بوو، لە لایەن کۆمەڵێك لە قوتابیانی ئەرمەن، لە ساڵی ١٨٨٧دا لە ژنێڤ، بۆ داکۆکیکردن لە مافەکانی ئەرمەن، دامەزرا - (وەرگێڕ).

[10] دوای تێکشکانی شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری ١٨٧٩-١٨٨١، سوڵتان عەبدولحەمید بە تەواوی سیاسەتی کوردیی خۆی گۆڕی و بڕیاریدا هۆزە کوردییەکان بە ناوی سوارەی حەمیدییە لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە هەم بۆ ئیحتیواکردنی بزووتنەوەی کورد، هەم بۆ قازانجی سەڵتەنەت و هەم بۆ لێدانی بزووتنەوەی ئەرمەنەکان. ئەوە لەم ڕوانگەیەوە بوو، کە ساڵی ١٨٩١ سوارەی حەمیدییە وەکو هێزێکی غەیرە نیزامی، بۆ پاراستنی سنوور و لێدانی بزووتنەوەی ئەرمەن و تەگەرەخستنە بەردەم یەکڕیزی و هاوخەباتی کورد و ئەرمەن دروست بوو - (وەرگێڕ).

[11] تالۆری: چیایەکی زۆر سەختە لەنێوان ساسۆن و موتەسەریفیەی جوینج. بزووتنەوەیەکی چەکداریی ئەرمەنی لەم ناوچەیە لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٨٩٣دا بوو بە سۆنگەی شەڕ و پێکدادانێکی زۆر لە نێوان ئەرمەنەکان و سوپای عوسمانی، کە کوشت و کوشتارێکی زۆری لێکەوتەوە - (وەرگێڕ).

## بەڵگەنامەی ژمارە (١) لاپەڕە:١ (عەرەبی)

إصلاحات الباب العالي بتاريخ 5 تموز التي أشارت إليها المادة الحادية والستون من معاهدة برلين فيما يتعلق بالولايات التي يسكنها الأرمن لا تتوافق مع المادة المذكورة لا في المعنى ولا في اللفظ. فالمندوبون الذين أرسلهم الباب العالي إلى الأماكن التي يسكنها الأرمن لم يتوصلوا إلى نتيجة حسنة، كما أن الباب العالي خلافا للمادة المذكورة لم يعط الدول الموقعة أية معلومات. لم تجر أية إصلاحات فيما يتعلق بالإدارة العدلية، كما تفيد المعلومات الصحيحة بأن حرية المحاكم باتت أسوأ من السابق. لقد أوضح الباب العالي في مذكرتها تلك أنه سيأخذ بعض التقارير من الضباط الأجانب لإصلاح الدرك والشرطة، لكن الدول الموقعة لم تحصل على أية معلومات حول ذلك كما لا تستطيع الدولة العلية ادعاء عكس ذلك. وعليه فإن جواب الباب العالي لا يشكل حلا بالنسبة للمذكرة التي قدمتها الدول الموقعة في الحادي عشر من حزيران(يونيو) إن الدول الموقعة مضطرة لأن تبين بأن الباب العالي لم يأخذ بالاعتبار تعهداته بموجب معاهدة برلين. لقد سمع الباب العالي من الألفاظ بقدر إنكاره الجرائم التي حدثت في الأماكن التي يسكنها الأرمن وعدم السيطرة الواضح هناك. إن استمرار هذا الوضع سيكون باعثا على محو واضمحلال النصارى. إن مذكرة الباب العالي لم ينتج عنها أي تدبير يضع حدا لمظالم الشركس والأكراد. وإننا نشك في أن النظم العادية لن تضع حدا للأوضاع المؤسفة بل يحتاج الأمر إلى تدابير شديدة. لأن الأهالي الوارد ذكرهم في المادة الحادية والستين يواجهون خطرا على أموالهم وأعراضهم وحياتهم . إن أحكام المادة الحادية والستين تلزم الباب العالي على إجراء إصلاحات في الأماكن التي يسكنها الأرمن دون تأخير. إن الموقعين يرون وبكل أسف بأن الباب العالي لم يتحدث في مذكرته بتاريخ 5 تموز عن الإصلاحات التي ستكون من الحاجات المحلية . وحتى إذا نظرت الدول الموقعة على الإصلاحات المزمع القيام بها في كافة الممالك المحروسة بعين الرضا ، فإنهم لم يروا في مقترحات الباب العالي الإصلاحات الخاصة التي خصصتها وحددتها معاهدة برلين. ولما كان العنصر الذي يسكن الولايات المذكورة هو العنصر النصراني فإن أي إصلاح لا ينطلق من هذه النقطة لا يؤدي إلى نتيجة حسنة. وأمر آخر جدير بالاهتمام والعناية وهو أن الباب العالي يحرص على إدارة الأرمن والأكراد في نظام واحد. لكن المفروض هو التفريق بين إدارتهما قدر الإمكان. لأنه من غير الممكن المساواة بين المقيمين والقبائل المتنقلة. يجب الحرص خلال تقسيم النواحي وإدارة الحكومة على جمع وتوحيد كل عنصر على حدة كتوحيد الأرمن أو توحيد الأرمن مع الأتراك واستثناء الأكراد. يجب عدم إدخال نفوذ

## بەڵگەنامەی ژمارە (١) لاپەڕە:٢ (عەرەبی)

الأكراد الذين تعودوا على المظالم في الجبال بصورة خاصة في حسابات الإحصاء ، وألا يكون حساب الأرمن مع هؤلاء في النواحي.
وحتى إذا بدا أن المذهب في النواحي سيؤخذ بالاعتبار، فإن الباب العالي لم يتعهد بذلك في مذكرته. والاكتفاء بالتصريح في تعيين موظفين في النواحي حسب المذاهب .
والواضح وضوح الشمس أن عدم ذكر استخدامهم في الأعمال الكبيرة يشير إلى عدم أخذ الاحتياجات المحلية التي تنص عليها المادة الحادية والستين بالاعتبار.
وإذا كان الباب العالي بين أنه استخدم ذوي القدرة من النصارى وأنه سيستخدمهم مستقبلا فإنه لم يعين أرمنيا واحدا من الأماكن التي يسكنها الأرمن. وحتى لو عين الباب العالي ولاة من النصارى فلن يكون لذلك أي فائدة على نحو شكاوى الأرمن. لذلك فعلى الدولة العلية اللجوء إلى التدابير اللازمة على نطاق واسع بموجب تعهداتها في برلين.
فالإصلاحات التي بينها الباب العالي غير كافية. والمركزية تطبق في أشد صورها طالما يتم تعيين مدراء النواحي من قبل القائمقامين، حيث لم يصرح الباب العالي كم عدد الموظفين الذين تعينهم القائمقامية ومن قبل أي جهة يتم الرفع والعرض . وضبطية الناحية والقضاء تحددت صورتها. إن درك الولاية ليس في وضع متوافق مع أحكام المادة الحادية والستين من معاهدة برلين. وانتخاب وانتخاب الضبطية والضباط والأفراد من النواحي حسب عدد السكان سيكون جديرا بالشكر والتقدير. إن أساس المحاكم المتنقلة مبين في مذكرة الباب العالي، وكان المفروض أن يباشرها الأرمن على النحو اللازم ،حيث نجد حولها إشارات استفهام. فهل الحكام المقرر تعيينهم سيكونون في هذه المناصب شرط كونهم قيد الحياة، وهل سيمارسون مهامهم وفقا للشرع أي وفق نظام آخر؟ وكيف سينفذون الأحكام على الأكراد المتوحشين؟ . فالمعلوم هنا عدم جواز إدخال الأكراد المحاربين . ويجب إلغاء أعمال السخرة التي يفرضها الأكراد على الأرمن كما يجب أن يستفيد النسطوريون من الإصلاحات التي ستنفذ بشأن الأرمن. إن المقدار الذي أشير إلى تعيينه للمعارف والمنافع العمومية غير مفهوم على النحو المطلوب لكن تطبيقه على نظام الروميلي وكفاية وارداتها المرهونة لا يمكن تخصيصها لكل الاحتياجات. ولم يرد في مذكرة الباب العالي تصريح لقواعد اللامركزية فيما يتعلق بالأهلي الذين يختلف مذهبهم عن مذهب المركز. ولا يمكن تطبيق أي إصلاح ما لم تحدد فترة مهام الولاة. ومهما بدا في مذكرة الباب العالي جاهزية أوضاع الولاة فإن التصريحات الصحيحة وعدم تحديد صلاحية الولاة يقتضي عدم التدخل حتى في أبسط أمور الولاة على النحو القائم الآن.
ونظرا لعدم كفاية التدابير التي أشارت إليها الدولة العلية في الولايات التي يسكنها الأرمن،

## بەڵگەنامەی ژمارە (١) لاپەڕە:٣ (عەرەبی)

فإن المطلوب اتخاذ أعلى درجات المساواة وأوسعها وتشكيل البوليس وحماية الأرمن من الشركس والأكراد. ويجب توسيع مدة مهام الوالي وصلاحياته وبهذه الطريقة تنفذ أحكام المادة الحادية والستين. إن الدول الموقعة لا يمكن أن تعتبر عدد السكان المسلمين منهم والنصارى الذي يبينه الباب العالي بهدف التقليل من أهمية الموضوع صحيحاً. إن دفتر النفوس الذي أعدته بطريركية الأرمن بعيد كل البعد عن الدفتر الذي أبرزته الدولة العلية، فما هي الأسس التي اتبعها الباب العالي عندما قام بتسجيل النفوس، إن الأمر يستوجب قيام الدول الموقعة بتشكيل لجنة فورا لمعرفة العدد الحقيقي للسكان المسلمين والنصارى في الولايات المذكورة . وعلى الباب العالي أن يقبل بصحة قرار اللجنة المحايدة بعد إجرائها إحصاء السكان. وبناء على ما تقدم يجب تصحيح حدود الولايات كذلك. ويجب على الباب العالي القيام بالتدابير العاجلة دون انتظار إجراء إحصاء السكان هذا، كما يجب اتخاذ التدابير العاجلة دون أي تأخير لحماية أموال وأعراض الأرمن من اعتداءات الأكراد...

ومن الواجب اخذ التدابير المالية اللازمة لتحسين حالة قوات الدرك وتوسيع إذن ونفوذ ومسؤلية الولاة في ولاياتهم.

ولا بد الأخذ بنظر الإعتبار، في ختام هذا التقرير، إعطاء الأولوية في إجراء موضوع الإصلاحات المعهودة محليا، ودوليا من قبل الدول التي وقعت عليها وجعلها تحت الرقابة والضمان في المناطق المؤهلة بسكان الأرمن، وربط العلاقات الحسنة معهم.

## بەڵگەنامەی ژمارە (٢) لاپەڕە:١ (عەرەبی)

إلى رئاسة كتابة المابين الهمايوني الجليلة

عطوفة سيدي

الظلم والتعدي الذي يمارسه بعض البغاة من قوم الكرد تجاه أفراد ملة الأرمن المتوطنين ببلاد أرمينيا من بين الممالك المحروسة لحضرة مولانا السلطان، والتظلم من الوضع الذي أصبحوا فيه بسبب بعض الموظفين غير الأكفاء والمفسدين، وقيام بعض محرري الصحف بإعطاء معان أخرى غير صحيحة على تظلمهم ونشرهم بعض المقالات ضد الأرمن بعبارات غير لائقة، ومن ضمن هذه الصحف صحيفة ترجمان الحقيقة التي نشرت مقالا في شهر أيار الماضي ادعت فيه أن تظلم الأرمن يخفي وراءه نية مبيتة، وأنهم يشكون من الكرد للترويج لمطالبهم وأن المسألة لا تعدوا كونها حوادث فردية وشخصية، فيقومون بتهويلها ونشرها هنا وهناك. وبذلك أعطت لشكوى ملة الأرمن صفة التزوير الأرمني إمعانا في احتقارهم ، وبهذه الطريقة أعطت لطائفة الأكراد وللجهلة من المسلمين صورة غير صحيحة عن ملة الأرمن.

قمت في حينه برفع شكوى إلى المقام العالي لنظارة العدلية الجليلة بطلب إجراء المعاملة القانونية بحق صاحب امتياز الصحيفة المذكورة، معربا عن أملي القوي بأن ترسل إدارة المطبوعات البهية كتاب إنذار على أقل تقدير. ولكن لم تتخذ ضد تلك الجريدة أي إجراء، ولذلك فإن الأمر لم يقف عن هذا الحد بل وانبرت صحف تركية أخرى وخاصة صحيفة عثمانلى باختلاق أكاذيب أخرى في كل نسخة تقريبا بعد تشجعت من عدم تعرض تلك الصحيفة لأية مساءلة، وصاروا ينعتون ملة الأرمن ورؤساءهم الروحانيين ووجوههم بأقبح الأوصاف والنعوت وباتهام ملة الأرمن بالانحراف عن الاخلاص والولاء وبإخفائها نوايا الحقيقية وباختلاق الشكوى من ظلم غير موجود أصلا، ومحاولتهم إظهار عدد سكانهم في أرمينيا أكثر من عدد المسلمين ، وأنهم بناء على ما سبق سيكونون سببا في حدوث غائلة في المستقبل. وبسبب هذه الحالة قدمت تقارير أخرى إلى الصدارة ونظارات الداخلية والخارجية والعدلية . لكن أهمية وخطورة الوضع اضطرتني للالتجاء إلى عدالة ورحمة حضرة مولانا صاحب التاج والعتبة العليا مولانا السلطان، فوجدت في نفسي الجرأة لتقديم معروضي هذا. إن غض إدارة المطبوعات البهية طرفها عما تفعله الصحف التركية وتسامحها تجاه تلك

## بەڵگەنامەی ژمارە (٢) لاپەڕە:٢ (عەرەبی)

الصحيفة التي ذكرناها يهدف إلى إثارة الحقد والنفور في نفوس المسلمين تجاه الأرمن كما يحرض الأرمن ليقوموا بعمل مماثل تجاه مواطنيهم من المسلمين، وهذا يدعو للأسف الشديد. كما أن هذه الصحف تواصل نشرت المواد التي من شأنها إيقاع أتباع حضرة مولانا السلطان ببعضهم، وبدلا من العمل لتقوية الشعور بالحب والموالاة وزيادة الإحساس بالمواطنة والاستقرار، فهي تعمل على زرع بذور الشقاق والنفاق. وإذا كنت ممن يؤمنون بالمنافع العديدة للمطبوعات ومن المطالبين بإعطاء هذه الصحافة مزيدا من الحرية، وعدم إيقاع العقوبة في أي محرر بأي صحيفة دون محاكمة، فمن غير الجائز أن نسكت عن الصحف التي تنشر مقالات تثير العداء بين المسلمين ومواطنيهم الأرمن، ويسيئون بذلك استخدام وظيفتهم التي يجب أن تكون أساسا لخدمة الدولة والأمة. وإذا كانت الصحف المذكورة تعتبر البرقيات والتقارير المنشورة من قبل بعض الولاة والمدعين العموميين دليلا وبرهانا على عدم صدق شكاوى الأرمن، فإن سوء الإدارة للموظفين في المناطق وخاصة في أرمينيا ومظالمهم وتعدياتهم المغايرة للرضا العالي ثبتت صحتها من التحقيقات التي أجريت من قبل الباب العالي سابقا ولاحقا، بالإضافة إلى أن حالة الفقر والفاقة التي يعاني منها المواطنون الترك والنصارى المجدين والمطيعين بالمناطق تؤكد سوء الإدارة والظلم، كما أن أكثر المعلومات في التقارير التي يتلقاها الولاة ويرفعونها بعد ذلك إلى الباب العالي هي من اختلاق الموظفين المفتقدين للأهلية واللياقة بتأثير من بعض المتنفذين والمتغلبين والأغوات. ولما كانت الأفكار العادلة لحضرة مولانا السلطان تهدف إلى تحقيق الإصلاحات الموعودة فعلا وحقيقة ، فإنه من الواضح والمؤكد ألا تكون لمثل تلك المعلومات أية قيمة لدى الحكومة السنية. إن محاولة الموظفين المحليين بجملة تأويلات لستر الأوضاع غير المرضية أو تخفيفها لم يكن شيئا جديدا بل هي وسيلة متبعة من وقت طويل وسبق أن اشتكت منها بطريركيتنا مرات عديدة. لقد أثبتت الوقائع الأخيرة بأن الأمة والوطن تضررا كثيرا بسبب تصرفات الموظفين الفاسدين والجاهلين الذين تقلبوا في نعم الدولة ولم يعرفوا معنى لتقديم المصالح المشروعة للأهالي على مصالحهم الشخصية غير المشروعة ولم يعرفوا أبدا أن واجبهم هو العمل والسعي لحماية أموال وممتلكات وأمن الأهالي. إنني مع عرض وبيان رأيي بدافع من ولائي ووفائي لسلطاننا العظيم، أرى بهذه المناسبة أن ما أقدمه من عرض وتوضيح فيما يتعلق بالمسألة الأرمنية بصورة مختصرة لا يخلو من فائدة. فعلى نحو ما رفعته كتابيا وشفهيا إلى المقامات العليا أولا

## بەڵگەنامەی ژمارە (٢) لاپەڕە:٣ (عەرەبی)

وأخيرا فإن ملة الأرمن المخلصة الوفية التي تحتمي بجناح السلطنة السنية، تشعر بالفخر والاعتزاز من صدقها وولائها وطاعتها للعرش العثماني منذ حوالي خمسمائة عام ولم تنحرف عن هذا السلوك قيد أنملة . ومن المؤكد أنها ستكون حريصة كل الحرص وبدافع من حميتهم ومصالحهم على إبقاء ولائهم صافيا وصادقا لا تشوبه شائبة. لكنني أضيف بأن أفراد ملة الأرمن يريدون أن ينعموا بالأمن والأمان في ظل عدالة مولانا السلطان وأن يخصص مقدار كاف من الضرائب التي كلفوا بدفعها لاحتياجات بلادهم وشئونها العامة وتعليم وتربية أطفالهم كي يستفيدوا منها بصورة مباشرة. وفي حالة تعداد السكان الأتراك والأكراد في أرمينيا كلا على حدة فإن الأرمن سيشكلون أكثرية السكان، وسيكون لهم الحق في استخدامهم في شئون البلاد. لذلك فقد لجأوا بواسطتي إلى باب العدالة بطلب تعيين الأكفاء منهم في خدمة الوطن وأن تكون لهم حصة من الحقوق المدنية والحرية الشخصية وأن يعملوا لحماية ملتهم ومذهبهم ووطنهم. فمنذ الجلوس الميمون لحضرة مولانا السلطان نراه يبذل كل جهده واهتمامه للإصلاحات وخاصة أن الخط الهمايوني الذي نشره بمناسبة إصدار القانون الأساسي (الدستور) يؤكد عدم كفاية شكل الإدارة الحالية للحكومة وأنه يجب على الحكومة وضع القواعد السليمة لإدارة شئون الحكم. ورغبة الأرمن عبارة عن رؤيتهم تأسيس إدارة سليمة ومنتظمة في وطنهم ، ولاشيء في ذلك ما يمس العدل والحضارة في شيء، بقي أن نقول بأن تشكيل مثل هذه الإدارة في أرمينيا هو لمصلحة الحقوق المقدسة لحضرة مولانا السلطان في البلاد المذكورة. كما سيكون وسيلة لإحداث الغبطة والسرور في قلوب الأرمن المقيمين في البلاد الأجنبية. لكن الصحف المذكورة لم تفهم أن طلبات الأرمن هي لمصلحة الدولة العلية العثمانية ، لذلك فهي تواصل تفسيراتها المغايرة للحقيقة من جهة وإهاناتها للأرمن بالعبارات الغليظة من جهة أخرى. وقد وجدت في هذه المناسبة الجرأة في طلب توجيه التحذيرات المشددة بحق الصحف المذكورة. والأمر والإرادة لحضرة من له الأمر.

٣ شوال سنة ١٢٩٧ و ٢٧ أغسطس سنة ١٢٩٦( ٨ أيلول ١٨٨١)

الداعي

## بەڵگەنامەی ژمارە (٣) لاپەڕە:١ (عەرەبی)

تم الرفع للمنظور العالي التقرير الوارد من بحري باشا والي ولاية وان متضمنا بعض الآراء والاستطلاعات المتعلقة بالمسألة الأرمنية التي تخل بأمن واستقرار البلاد ويشغل بالتالي الحكومة السنية، وبعض الملاحظات حول ألوية الفرسان الحميدية. وسيكون في إحاطة حضرة صاحب مقام الخلافة من الاطلاع عليه أن أهم ما يلفت النظر في هذا الأمر هو أن السوق التي جرت العادة على إقامتها في كل شهر تموز من العام في الكنيسة ذات الناقوس( جاكلي كليسة) الكائنة داخل لواء موش، يحضرها الأرمن القادمون من روسيا وإيران وسائر الممالك الأجنبية بالإضافة إلى الآلاف من أرباب المفاسد من الأرمن المقيمين في البلاد السلطانية المحروسة، حيث تصدر المقررات المتعلقة بأعمال الفساد التي يخططون للقيام بها خلال عام وتكليف أعضاء اللجان بتأمين المبالغ اللازمة لمثل هذه الأعمال ، كما يحضر هذا الجمع عدد من أرباب الجرائم وأصحاب السوابق بعد أن يغيروا أسماءهم وأزياءهم ويجرون مشاورات حول الأعمال الفسادية. لذلك فإن الكنسية المذكورة تخضع للمراقبة والترصد الدائمين. ونرى أن من أسباب الحكمة الحكومية إلى إرسال لجنة خاصة لاتخاذ كافة التدابير الانضباطية اللازمة طيلة فترة السوق والعمل للقبض على أرباب المفاسد الذين جاءوا متنكرين، بطرق حكيمة ومتعقلة .

أما فيما يتعلق بالألوية الحميدية، فقد سبق أن لقي ما أوضحناه من الحاجة إلى مفرزة عسكرية يتم اختيار عناصرها من فرسان النظامية ليقوم بتعليم وتدريب الأفراد ليحصل المطلوب من الطاعة والانقياد والنظام، والفوائد والمحسنات المرجوة ، الاهتمام والاعتناء لدى حضرة صاحب مقام الخلافة ، كما علمنا بصدور الإرادة السنية لإجراء ما يلزم، وعليه فلا داعي لعرض رأيي القاصر حول هذا الموضوع، إلا أنه من الحاجة والمصلحة الحيلولة دون الأوضاع التي تؤدي إلى النزاع والتقاتل بين الأفراد والعشائر. ومن البديهي أن ذلك يتوقف ذلك على توثيق ملكية مجموعة من ضباط وأفراد العشائر للبيوت التي يسكنونها والأراضي التي يزرعونها بسندات رسمية. لأن رؤساء العشائر يستغلون هذه الأحوال أي فقدان السندات ليقوموا بطرد الأفراد من القرية متى شاءوا ، مما يجعل هؤلاء مضطرين إلى ترك مأواهم واللجوء إلى داخل إيران أو إلى سائر العشائر العثمانية. ، وأكثر الأكراد الذين يعيشون على التنقل والارتحال هم في ألوية بايزيد وموش وكنج التابعة لولايتي أرضروم وبتليس ومركز لواء ولاية وان . وإذا تم إرسال مأمور خاص من قبل نظارة الدفتر الخاقاني إلى هناك وتشكيل لجنة برئاسته يكون أعضاؤها من مأموري الدفتر الخاقاني المحلي وأعضاء مجالس الإدارة ومن الجهة العسكرية لإجراء استقصاء عن الطابو في كل لواء ، وتوزيع ما يزيد من

**بەڵگەنامەی ژمارە (٣) لاپەڕە:٢ (عەرەبی)**

الأراضي بعد الاستقصاء على الأفراد الذي لا يملكون بيوتا أو أراض ، وإسكانهم وتأمين حق تصرفهم بها. عن طريق إعطاء سندات خاقانية موشحة بالطغراء السلطاني. وغني عن البيان والتوضيح أنه إذا تفضل الوالي المشار إليه بالسفر بنفسه إلى هناك لمتابعة تطبيق التدابير المطلوبة، فمن المؤكد بأن النظام والانتظام والانضباط المطلوب سيتحقق في الألوية الحميدية على النحو المطلوب لدى المقام العالي. ونظرا إلى قيام الحاجة إلى تعيين معاون للوالي كيلا تتعطل مصالح الولاية أثناء قيام الوالي المذكور بالتفتيش، وأن غالب باشا وهو من أمراء وعيون وان وسبق أن كان وكيلا للمتصرف وله شهرة ونفوذ واسعين، فإن الموافقة على تشكيل اللجان المذكورة وتعيين غالب باشا معاونا للوالي منوط بأمر وإرادة حضرة مولانا السلطان والأمر لحضرة ولي الأمر. ٢١ شعبان سنة ١٣١٢ و ٤ شباط سنة ١٣١٠

الياور الأكرم

درويش

## بەڵگەنامەی ژمارە (٤) لاپەڕە:١ (عەرەبی)

ولاية وان

قلم المراسلات إلى المقام السامي للياور الأكرم دولة المشير درويش باشا

"خاص"

معروض داعيكم الخاص

منذ حوالي ست سنوات أخذت مسألة الأرمن التي ابتدعها البعض من أصحاب الأوهام والخيال شكلا خطيرا وبدأ خطرها يتزايد يوما بعد يوم ، هذا ما تشير إليه الصحف من خلال بعض مقالات التورية، التحركات الجارية في هذا الشأن.

إن ولاية وان التي أتباهى اليوم بأنني واليها، وأقوم بواجبي ومهامي على النحو الرضا العالي لحضرة صاحب مقام الخلافة، هي التي يسكن فيها أعداد كبيرة من الأرمن، وبالتالي، فقد رأيت أن من واجبي ، عرض هذا التقرير حول مسألة الأرمن الذي هو خلاصة وثمرة التحقيقات والدراسات التي قمت بها بصورة متعمقة وعريضة منذ بداية مأموريتي وحتّى هذا اليوم.

ذلك بأن غض النظر عما يجري في الساحة أو النظر إليه بعدم الاكتراث أو عدم البحث عن حل ينهي هذه المشكلة في وقتها قبل أن تستفحل الأمور لا يتوافق مع الولاء والوفاء بأي حال من الأحوال.

وعليه فإنني أبادر إلى عرض وتمهيد رأيي العاجز الذي لاح إلى خاطري القاصر حول الموضوع. حيث :

أنني أفهم من التحقيقات والدراسات الجارية بأنه لا يمكن إلا أن نقول بأن الرغبة في الاستقلال لدى الأرمن هو مجرد وهم وخيال استقر في أذهانهم بشكل عام. ومع ذلك فإن الكثيرين من صناديد الرجال عندهم يدركون ويتيقنون بأن الوصول إلى الهدف مباشرة ومن تلقاء أنفسهم أمام قوة القاهرة لحضرة مولانا صاحب التاج أدام الله شوكته وجلال شأنه إلى آخر الزمان بعيد كل البعد عن الحقيقة والتحقيق، لذلك فإن فكرة التمرد لم تأخذ بعد شكلا شاملا.

## بەڵگەنامەی ژماره (٤) لاپەڕە:٢ (عەرەبی)

ولكن ، لا سمح الله، إذا حصلت قناعة لدى الأرمن أو فرصة بإمكانية الوصول إلى الهدف الذي ينشدونه، فإنهم لن يتوانوا عن ارتكاب كل أنواع السوء بشكل عام دون ريب أو شك.

وإذا كانت هذه هي الحقيقة ، فإن المنافع التي يريد تحقيقها رؤساء الفساد من إقناع وإغراء بعض الشباب بأنهم فدائيون ودفعهم نحو الجريمة ما هي إلا وهم وخيال ولا يمكنهم تحقيقها بمفردهم ، وغاية ما يصبون إليه هي أن تنظر أوربا إليهم نظرة المظلومين من قبل الحكومة العثمانية فهم يتمردون على الحكومة لأنهم لا يتحملون هذا الظلم ، وأن هؤلاء النصارى المظلومين يحتاجون للعون والمساعدة. فهم يبحثون عن حام يحميهم .

وما تسعى إليه زمرة الأشرار عندهم في الليل والنهار هو لتحقيق ذلك ليس إلا. لقد دأبت مطبوعات بعض الدول من أمثال إنجلترا وأمريكا وفرنسا واليونان ورومانيا على توجيه التهم الجائرة ضد الإدارة العادلة للسلطنة السنية، فقد تعودت على نشر الترهات والأكاذيب حول المسألة الأرمنية. والهدف من ذلك هو لفت أنظار الأجانب نحو الأرمن . حيث تبين من التحقيق أن الكتاب الأجانب الذين يكتبون عن المسألة الأرمنية ينالون مبالغ كبيرة من المنظمات الفسادية التي لها علاقة بهذه المسألة.

ولذلك فإنني صنفت كتاب هذه الصحف وهم أجدر بأن يعرفوا بمجموعة الأكاذيب وبدعاة الكذب إلى قسمين:

القسم الأول : وهم الذين سفروا إلى الديار الأجنبية من الممالك السلطانية بهدف تحصيل العلوم وبقوا هناك وأصبحوا على رأس الصحف هناك، وكذلك الأرمن العثمانيون الذين ارتكبوا الجرائم السياسية أو الشخصية في وقت من الأوقات ثم فروا إلى البلاد الأجنبية تخلصا من العقوبة التي يوجبها القانون. ومنهم مغرديج برتقاليان التوقادي الذي يصدر في مرسيليا صحيفة "أرمينيا"

والقسم الآخر: هم أجانب في الأصل وقد أغرتهم الليرات الذهبية من منظمة "هنجاق" التي كان مركزها في مدينة أثينا ثم انتقلت إلى لندن للحصول على مزيد من المساعدات من الإنجليز.

وبذلك لا يبقى هناك أي شك أو شبهة في كونها من آثار الخيال والافتراءات.

## بەڵگەنامەی ژمارە (٤) لاپەڕە:٣ (عەرەبی)

ولا يخفى على مقامكم السامي في أن الأماكن التي يراد أن يمارس لعبة الأرمن فيها داخل الممالك السلطانية هي ولايات أرضروم و وان وبتليس وديار بكر وسيواس وأطنه ، كما أن هناك أماكن خارج الحدود تحولت إلى بؤر للفساد وهي "دير ديريك" داخل الحدود الإيرانية وعلى بعد ساعتين ونصف الساعة من حدود وان و "دير الكنائس الثلاثة" القريب من مدينة روان الروسية ، ومدينة تفليس.

وفيما عدا ذلك هناك بعض القصبات في إيران مثل"رومية" و "خوي" و" سلماس" و" هفتوان" و"كهنه شهر" و"تبريز" و " سنة" و "ديلمان" يعيش فيها القسم الأكبر من أرمن هذه المناطق وهم "الفدائيون" الذين ارتكبوا أعمالا ممنوعة قانونا ثم فروا إلى هذه الجهات. لكنهم أخضعوا قبل ذلك لدورات تعليمية من قبل رئيس المفسدين قريميان الموجود في "الكنائس الثلاثة" ، وبعد ذلك انتشروا في تلك المواقع ليقوموا بالاعتداءات على الحدود السلطانية كلما وجدوا الفرصة إلى ذلك.

وهناك دير بداخل موش يعرف بـــ" الكنسية ذات الناقوس" حيث يعتقد الأرمن بأن أحد الحواريين مدفون في هذا الدير، وقد استخبرنا عن أن هذا الدير يبدي اهتماما كبيرا بالمسألة الأرمنية، حتى أن الآلاف من الأرمن من روسيا وإيران ومن الممالك المحروسة يفدون في شهر تموز من كل عام إلى هذا الدير ليشهدوا السوق التي تقام فيها ، ويعقدون الاجتماعات ويصدرون القرارات عما يجب فعله خلال عام واحد ويجمعون المبالغ اللازمة ويقدمونها لرئيس المنظمة وأعضائها لتنفيذ هذه المقررات.

وبناء على ما تقدم فإنه عند إخضاع الدير المذكور للمراقبة والترصد الدائمين وخاصة أثناء الاجتماعات وإقامة السوق يتبين كيف أن أرباب الجرائم والأشرار من أعضاء تلك المنظمة يحضرون هذه الاجتماعات متخفين في أزياء وأسماء مختلفة . فيمكن بعد ذلك إلقاء القبض عليهم والحيلولة دون حضور مثل هذه الاجتماعات.

كما أنه ليس لأحد أن ينكر ما لتشكيل كتائب الفرسان الحميدية بأمر من حضرة مولانا صاحب التاج من عشائر الأكراد في ولايات أرضروم وبتليس ووان و ديار بكر من فوائد عظيمة في زيادة المكنة للدولة ورفع شأن قوتها، ومن الواجب الحتمي من الناحية الدينية والوطنية بذل القدرة على تحقيق النظام والانتظام لهذه الكتائب، ومن واجبي أيضا بيان الحاجة إلى القيام بالإصلاحات التي تحتاج إليها في الوقت الحاضر والمستقبل.

**به‌ڵگه‌نامه‌ی ژماره (٤) لاپه‌ڕه:٤ (عه‌ره‌بی)**

لأنه إذا تعرضت أعمال الإصلاح وما تحتاج إليه بعض هذه الكتائب إلى تأخير أو تعويق ، فإن التدابير التي تتخذ بعد ذلك قد لا تعطي النتائج المرجوة بسهولة.
إن الجهل لدى بعض رؤساء عشائر الأكراد وأمرائها يدفعهم إلى القيام ببعض الأعمال.
ومن أن النصائح التي تبذل في هذا الشأن وبيان أن مثل هذه التصرفات قد تؤدي إلى النتائج السيئة، وأن الرضا العالي يتطلب سلوك طريق الرشد لم تؤدي إلى النتيجة المرجوة ، لذلك نجد بين فترة وأخرى أعمال القتل والجرح ونهب الأموال والاعتداء وغير ذلك.
إن بعض رؤساء وأمراء العشائر الكردية الذين يقومون بمثل هذه الأفعال المرفوضة على مرأى ومسمع من أصحاب النوايا السيئة في أوربا الذين وجهوا أنظارهم نحو بلادنا مستغلين مسألة تالوري التي انتهت– مع أنهم تشرفوا بحمل صفة العساكر– يرون أن كتائب الحميدية هذه تتناقض مع مصالحهم الخاصة فيطلقون كثيرا من الافتراءات التي لا تخطر على بال بهدف إسقاطها من نظر حضرة مولانا السلطان. لذلك فإن القيام بتأديب هؤلاء ضمن دائرة القوانين سيؤدي إلى كثير من المحسنات.
لأن الأكراد يمكن إصلاحهم بقليل من الجهد، فإن النقص الذي يبدو عليهم ناشئ عن الجهل والوحشة المتولدة عنه. حيث يمكنني القول بأن رفع هذه النقائص عنهم وهم المعروفون بالفطنة والذكاء الفطري يحتاج إلى قليل من الجهد والعمل.
وأمر آخر يجب الانتباه إليه هو أن أكثر الضباط وصغار الضباط باستثناء رؤساء العشائر وأمرائهم لا يملكون سكنا. ويعتبر عدم وجود سكن يؤويهم من مصادر السوء الذي يلجأون إليه.
هذه الحالة ناشئة من عدم اهتمام الحكومة في السابق بأمر الإسكان وما يتوقف عليه من معاملات الطابو.
فلو ساءت العلاقة بين ضابط أو عدد من الضباط في كتائب الفرسان الحميدية مع رئيسهم في أي ولاية من الولايات، فأنهم يحملون بعض الحاجيات الخفيفة ويدفعون ما يملكونه من بعض الدواب والمواشي خارج القرية التي يسكنونها والكتيبة التي يتبعونها صوب عشائر إيران، ويبقون هناك مقابل إعطاء رئيس تلك العشيرة رأسا أو رأسين من الغنم. هذا

### بەڵگەنامەی ژمارە (٤) لاپەڕە:٥ (عەرەبی)

الوضع يؤدي إلى تناقص عدد المسجلين في الكتائب بالإضافة إلى تعذر إحضار العدد المطلوب من الفرسان الذي تعهد به رئيس العشيرة حين الاجتماع.
وإذا عرفنا أن قضية السكن هذه باتت سببا من أسباب وقوع الخلاف والاعتداء بين العشائر، وذلك بفعل التحريض والإغراء الذي يمارسه من رحل إلى العشيرة الأخرى، أدركنا مدى السوء والخطورة في عدم تأمين مساكن لهؤلاء.
ومع ذلك فلا ينكر أيضا تسبب بعض رؤساء العشائر في النزوح هذا ، لأن البيوت التي يسكنها ضباط وأفراد العشائر والأراضي التي يفلحونها ويزرعونها ليست في ملكهم بموجب الطابو ، فما أن يقول لهم رئيس العشيرة" هيا! ليس لك أن تسكن في قريتي! لا يجد بحوزته ما يبرزه من سند لإثبات حقه فلا يجد بدا من ترك مأواه هذا ويلجأ إما إلى إيران أو إلى داخل العشائر العثمانية الأخرى.
وحاصل القول بأن ما نراه من الفوضى وعدم الانتظام في بعض العشائر ناشئ بالدرجة الأولى عن عدم وجود المساكن . والحل في رأيي هو تأمين مأوى ومسكن لمن لا مأوى لهم وإعطائهم قطعة أرض وتسجيل ملكيتهم لها في الطابو. وتطبيق ذلك منوط برأي مقامكم العالي.
وعلى نحو ما هو معروف لدى مقامكم العالي، بأن الجندية هي الأساس في الحفاظ على الممالك والأوطان وأساس الجندية هو الطاعة والانضباط. وعليه يتعين بذل الجهد لترسيخ مفهوم الطاعة والانضباط واتباع الأوامر واجتناب النواهي بالإضافة إلى الأدب والتربية العسكرية لدى أفراد هذه العشائر.
والواقع فإن كل أمراء وضباط الجيش النظامي الموجودين في كل كتيبة بصفة قائد" الجزء التام" يتصفون بصفات ومزايا كلمة العسكرية ، ويملكون من المعلومات التي تمكنهم من تدريب وتعليم العسكرية للعشائر. هذا أمر مسلم به لدى الجميع. ولكن هيهات من ذلك فالأمراء والضباط والأفراد من العشائر لم يروا ما لدى الأفراد العسكريين النظاميين ولم يتعلموا منهم النظام والطاعة المطلوبين.
وأعتقد بأنه من المستحسن أن يكون كل كتيبة مفرزة من عشرين فردا من النظامي برفقة قائد الكتيبة من الجيش النظامي يدربون الأفراد ويعلمونهم العسكرية. ومن المؤكد بأنهم جميعا وخلال فترة قصيرة يطبقون الآداب والتربية العسكرية التي يتخلق بها قوادهم،

**بەڵگەنامەی ژمارە (٤) لاپەڕە:٦ (عەرەبی)**

ويجتنبون بعد ذلك القيام بأية أفعال أو تصرفات مغايرة للرضا العالي، فيتعلم الضباط الصغار والأفراد معنى الطاعة والانقياد، وبفضل ذلك تحدوهم الرغبة بتعلم وتعليم ما يلزم معرفته من قبل كل عسكري.

ومع ذلك فإن الفوائد والمحسنات التي تحققها التدابير المقترحة لا تبقى عند هذا الحد، بل تضع هذه التدابير حدا لما يصدر عن بعض العشائر من أقاويل ويضخمها الإيرانيون، ويقوم الأجانب عادة بنشرها بعد كثير من الإضافات عليها. ونأمل من الله تعالى أن تؤدي رغبة مولانا ظل الله في الأرض في تشكيل هذه الألوية إلى فوائد عظيمة وتكون عامل قوة ، وتكون ردفا للتوفيقات الإلهية التي ينعم بها على مولانا السلطان .

وسيكون الصواب فيما يصدر من الإرادة السنية لحضرة أمير المؤمنين ، وقد وجدت في نفسي الجرأة لتقديم هذا التقرير بدافع من عبوديتي وإخلاصي، وهي مجرد معلومات . والأمر لحضرة ولي الأمر والإحسان. 3 شعبان سنة 1312 و17 كانون الأول سنة 1310

والي وان

الفريق بحري باشا

# نەخشەی کوردستان

## نەخشەسازی و بڵاوکردنەوە

**د. عەبدوڵڵا غەفوور**
بەشی جوگرافیا/ کۆلێژی ئەدەبیات

هەندێ کەس، بێ ئەوەی شارەزایی لە زانستی کارتۆگرافیا و جوگرافیا و بگرە مێژوودا هەبێت، بە خەیاڵی خۆی سنووری نێوان کوردستان و وڵاتانی دەوروبەر لەسەر نەخشەیەکی رۆژهەڵاتی نێوەندا دەکێشێت و بڵاوی دەکاتەوە. هەر ئەوەش وای کردووە کۆمەڵێک لە نەخشەی بێ سەروبەر و جیاواز بە سنووری نێودەوڵەتی لە ئارادابێت. مەبەستی من لەو وتارەدا، دەستنیشانکردنی لایەنی باش و خراپیی نەخشەکان نییە، بەڵکو باسکردنە لە چۆنێتی کێشان و بڵاوکردنەوەی ئەو نەخشەیە کە خۆم لەسەر بنەمای مێژوویی و جوگرافی و ئابووری و کۆمەڵایەتی، کێشاومە و لە لایەن وەشانخانەی ئاپێک لە ستۆکهۆڵم و لە ساڵی ٢٠٠٠دا بڵاوکرایەوە (نەخشە١).

سەرەتای ئاشنابوونم بە نەخشەی کوردستان بۆ شەستەکانی سەدەی بیست دەگەڕێتەوە. روونتر بۆ سەرەتای ساڵی ١٩٦٣ کە لە عێراقدا لە زانکۆی بەغدا کۆلێژی پەروەردە بەشی جوگرافیا خوێندکار بووم.

نەخشەی کوردستان لەو سەردەمەدا، لەبەر ئەوەی بۆ عێراق بۆنی جیابوونەوەی لێ دەهات بە دەستی هەر کەسێک و بە تایبەتی خوێندکاران بگیرابوایە لە لایەن ئاسایشی ئەو وڵاتەوە، جگە لە راپێچکردن بۆ گرتووخانە تووشی ئەشکەنجەی بەدەنیش دەکرایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، لەبەر ئەوەی ئەوەندە تینووی نەخشەی کوردستان بووم، مەترسی لەو شێوە لە خەیاڵی مندا جێگەی نەدەبۆوە.

دەستمکرد بە کۆکردنەوەی ئەو نەخشانەی لە کتێبان بڵاوکرابوونەوە و ئەوانەی لای خوێندکاران و نووسەران و خەڵکی هەبوون. مەراقی من بۆ نەخشەی کوردستان لەناو دۆستانم دەنگی دابۆوە. هەر ئەوەش بوو وای لە برادەرانم کردبوو هەر نەخشەیەکیان دەست بکەوتبوایە یان کە لای کەسێک هەیە دانەیێکیان بۆ دەهێنام یان هەر نەبوایە شوێنەکەیان بۆ دەستنیشان دەکردم و منیش، هەر

چۆنێک بوایە، خۆم دەگەیاندێ. پاش نیوڕانەیەک کرێکار بە هەشتاوی بە پیلمەوە هات و نەخشەیێکی رەنگ سووری لە باغەری دەرهێناو" ئەوە بۆ تۆ باشە" و دایە دەستم.

برادەرەکانم بیستبوویان نەخشەیەکی گەورەی کوردستان لە یەک لە دووکانەکانی شاری هەولێر دەفرۆشرێت. منیش بۆ ئەوەی بە شوێنەکە بکەوم پرسیارم لەو و لەو دەکرد. وەلی، لە ترسی ئاسایش، کەسیان دووکانەکەیان بۆ هەڵنەدەدام. پاش ماوەیەک زانیم ئەو دووکانەی دیوار بە دیواری بینایەیی قوتابخانەکەی بەرامبەر بەریدی کۆن (*) بوو.

رۆژێکیان لە خاوەن دووکانەکە بە ژوور کەوتم و یەکسەر گوتم هاتووم بۆ نەخشەی کوردستان. دووکاندار هۆپێکی لە خۆ زانی ــ نەخشەی چی و کێ پێتی گوتووە نەخشە لێرە دەفرۆشرێت ـ بۆ نەخشەکە هاتووم و ئەوەندەی بخوازێت پێت دەدەم. بەس دانەیەکم لە نەخشەکە دەوێت. دووکاندارەکە دیتی من وا رشتم کەمێک شلی کرد ــ باشە وەلی ئیمڕۆ نا یەک دوو رۆژی تر وەرەوە بزانم دانەیەکت بۆ پەیدا ناکەم. وەلی یەک دینار نرخیتی. تۆ بۆم پەیدا بکە و خەمی پارەت نەبێت. ئەرێ بەڕاست ناوت چییە. ناوی خۆم و باو و باپیرم پێ گوت و لە دووکانەکە دەرچووم. دوای دوو رۆژ بە ماتەماتە بۆ دووکانەکە چوومەوە و پارەکەم لە دەستی نا ئەویش نەخشەکەی دامێ ــ نابیت بە هیچ شێوەیەک ناوم بینی دەنا هەردووکمان تێ دەچین. ئەو ترسی لە من هەبوو. منیش لە ئەوم هەبوو. وەلێ کە نەخشەکەم لەماڵەوە لێک کردەوە وەکو ئاوێکی تەزیوم پێ دابکرێت وابوو. لەبەر ئەوەی هەمان ئەو نەخشەی کتێبی خلاصەیکی تاریخی کورد و کوردستان بوو. وەلێ گەورەکراو بوو.

خەیاڵی نەخشەی کوردستان، دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٧٣ بۆ خوێندنی دکتۆرا بۆ مۆسکۆ چووم لە مێشکمدا بە تینتر بوو. ئەوە بوو لە هەر ئەو کتێبخانەیەک ئەتڵەسی یان نەخشەی رۆژهەڵاتی نێوەندی لێ بووایە، یەکسەر و بەنهێنی سنووری کوردستانم لە سەر نیشانە دەکرد. رۆژێکیان خوێندکارێکی کورد لە کتێبخانەی ئینەسترانی لیتراتوورە لە مۆسکۆ چاوی بە یەک لەو ئەتڵەسانە کەوتبوو کە من

* ئەو بینایە لە ساڵی ١٩٦٣دا حەرەس قەومییەکان کردبوویانە گرتووخانە و بەندکراوەکانی ئەندام و لایەنگرانی حزبە سیاسییەکانی ئەو سەردەم بوو. دواتر بینایەکە رووخێندراوە و زەوییەکەی کراوە بە حەوشی پارێزگای هەولێر.

سنووری کوردستانم لێ دەستنیشانکردبوو، یەکسەر زەینی بۆ ئەوە چووبوو کە من ئەو کارەم کردووە.

نەخشەیەکی ڕۆژهەڵاتی نێوەندم لە بازاڕ کڕی و دەستم دایە قەڵەمێکی ڕەنگ سوور و وەک هەمیشە سنووری کوردستانم لەسەر نیشانە کرد. بۆ ئەوەی کوردستانی لێ دەربێنم دەبووایە کەسێکی شارەزا لە نەخشەسازی پەیدا بکەم. سەرەتا خوێندکارێکی کورد، کە کاری بازرگانی لە مۆسکۆ دەکرد، قەولی ئەوەی پێدام خۆی ئەو کەسە بدۆزێتەوە و خەرجی کێشان و چاپکردنی لە ئەستۆ بگرێت. وەلی، لەبەر ئەوەی هەر یەکەو مەبەستێکمان لە نەخشەکەدا هەبوو، ئەو بۆ ناو و منیش بۆ زانست، قسەمان یەکی نەدەگرت. ئەو دەیویست ملکەچی ئارەزووەکانی بم منیش ملم نەدەدا. هەموو جارێ دەیگوت" دوو سەڵک لە مەنجەڵێک جێگەیان نابێتەوە" ئاخرەکەی ئەو لە قەولی خۆی پەشیمان بۆوە و منیش کەوتمەوە سۆراغکردن بۆ دۆزینەوەی شارەزایەک لە نەخشەسازیدا.

ناوی بەرپرسی نەخشەی لە فەرمانگەییێکی دەوڵەتدا و لە مۆسکۆ بۆ هەڵدام و منیش دۆزیمەوە. لەسەر ئەوە ڕێک کەوتین نەخشەییێکی سیاسی ــ ئیداری ڕۆژهەڵات، لە شوێنی کارەکەی، کۆپی بکات و بیدات بە نەخشەسازێک کە لای ئەو کاری دەکرد. منیش هەقدەستەکەی، کە هەزار دۆلارێک بوو ؟، بدەم. ڕۆژێکیان ژنێک، بە مەبەستی ئاشنابوون بەکارەکە و داواکارییەکانم، بۆ نهۆمی ١٨ (فاکولتێتیی جوگرافیا لەو نهۆمەدایە) لە زانکۆی مۆسکۆ هات. نەخشەی ڕۆژهەڵاتی نێوەندم بۆ لەسەر مێزێک پان کردەوە و باسی ئەوەم بۆ دەکرد کە چۆن کارەکەی بکات. لەو قسانەدا بووین بەرپرسی خوێندکارانی بیانی لە فاکولتێتیی (بەش. فەکەلتی. دانشگەدە) جوگرافیا پەیدا بوو.

خەریکی چیت؟

نەخشە.

نەخشەی چ وڵاتێک؟

کوردستان.

کارێکی زۆر مەترسیدارە. ها دەتەوێت خاکی ئێران. تورکیا. سوریا. عێراق لەت بکەیت.

خاکی کەس لەت ناکەم.

ئەدی چی دەکەیت ئەوەتە نییە کوردستانی لەسەر نەخشە دیاری دەکەیت. چی کوردستان هەیە؟

ژنــە، دوای چەنــد ڕۆژان، بــە خــۆی و نەخشــەیێکی لوولــدراو بــۆ ماڵــەوە لــە گەڕەکی ڕامنکی هات.

نەخشەکەم تەواو کردووە. بۆ ئەوەی کەموکوری تێدا نەبێت تەماشای بکە.

تەماشای چی بکەم. جگە لە شارە هەرە گەورەکانی کوردستان ئەوانی دیکەی تێدا نەبوو.

سنە کوا ؟ هەولێر کوا ؟ مەلاتیە کوا ؟ ئیتر دەیان شاری دیکە.

باشە تۆ شوێنەکانیان دەستنیشان بکە و من خاڵیان بۆ دادەنێم.

ئەو ناوانە لە هەموو نەخشەییێکی جوگرافی گشتیدا هەیە. ئەو نەخشە ئیداری ــ سیاسی نییە. بەڵکو نەخشەییێکی تۆپۆگرافی بە پێوانە بچووکە و گەورە کراوە.

ئەوەیان بە من داوە و منیش کارم لەسەر کردووە. سبەی لەسـەر ئیش باسـی ئەو گرفتانە لەگەڵ بەرپرسەکە دەکەم.

دەرکەوت نەخشـەییێکی تۆپۆگرافییـان گـەورە کـردووە. دەیانـەوێت هـەر چۆنێک بێت منی پێ ڕازی بکەن و ئەوانیش پارەی خۆیان وەرگرتووە.

داوای پارەکەم کردەوە.

دوای حەفتەیەک پارەکەم وەرگرتەوە. وەلێ ٢٥ پرۆسێنت، لەبەر ئەوەی دۆلار هەستابوو، کەمتر لەوەی من پێشی یەک مانگ دابووم.

ئەو جارەش بەخت یار نەبوو. نەخشەی کوردستان لە دایک نەبوو.

کێشانی نەخشەی کوردستان، لەبەر ئەوەی بە ئەرکێکی نیشتمانی و نەتـەوەییم لە قەڵەم دەدا، لەگەڵ خۆم بۆ سوێدم برد.

ڕەشنووسـی نەخشـەی کوردسـتانم، بـە هـەر شـێوەیەک بـوو، تـەواوکرد. بـۆ ئـەوەی بـە کۆمپیوتـەر بیکـەم، دەبوایـە، لەبـەر ئـەوەی خـۆم لـێم نـەدەزانی. کەسـێک بۆکـاری تـەکنیکی بدۆزمـەوە. لەگـەڵ کـوڕێکی هـەولێری دانیشـتووی سـتۆکهۆڵم کـە چەنـد سـاڵ بـوو خـەریکی ئـەو کـارە بـوو و نـاوی دەرکردبـوو بـە ٢٠ هـەزار کـرۆن (نزیکــەی ٧٠٠٠ دۆلار) ڕێکــەوتم. وەلــێ ئــەو، لەبــەر ئــەوەی پێشــتر کــاری وای نـەکردبوو، هیچـی لـەو کـارەی مـن نـەدەزانی. سـەرەتا، بـۆ ئـەوەی کارەکـەی بکـات، دەبوایە خۆی فێری پرۆگرامی ئیلوستراتۆر بکات. بۆ ئەو مەبەسـتە پرسـیارمان لـە سوێدی و لە خەڵکی دیکە دەکرد. تاکو وای لێ هات بە کەمێک زەحمەتییەوە ئەوەی بۆ نەخشەکێشان پێویست بوو فێری بوو. لەسەرخۆ کارەکەی دەکرد و لە ئیشـەکە باشتر دەبوو. وەلێ، من پێم دەگوت ئەو خەتـەم وا بـۆ بکێشـە ئـەو خاڵـەم بـۆ وا لـێ بکە. ئێرەم بۆ لەتلەت بکە. ئێرەم بۆ ڕەنگ بکـە. ڕەنگەکـەی کاڵ بێـت. دواتـر دەسـتی

بە منگەمنگ کرد. من ئەو نەخشەی دەکەم و دەبی ناوی منیش لەسەر نەخشەکە بێت ـ تۆ چیت بەسەر ئەو نەخشەدایە؟ پارەی خۆت وەرگرتووە. هیچ کارێک بەبێ رێنماییکردنی منیش پێت ناکرێت. تۆ هی ئەوە نیت نەخشەسازی بکەیت. ئاخرەکەی ئەوەندە پارەی لەسەری رێک کەوتبووین لە دەستم نا و کارەکەشی نەکرد. نەخشەی کوردستان ئەو کەرەتەش دونیای رۆنی نەبینی.

وەشانخانەی ئاپێک لە ستۆکهۆڵم زانیبووی کە من خەریکی کێشانی نەخشەی کوردستانم و بۆم تەواو ناکرێت. ئەویش لەبەر هەستی کوردایەتی و قازانج پێشنیازی کرد رەشنووسەکەی بۆ فەرمانگەی نەخشەکێشان لە ستۆکهۆڵم بەرین بۆ ئەوەی بۆمان تەواو بکات. بە دووان سەردانی ئەو شوێنەمان کرد. ئەوانیش دوای ئەوەی من بە کوردی باسی شتەکانم بۆ خاوەن کارەکە دەکرد و خاوەنی وەشانخانە بە سوێدی بۆ کابرای دەگوتەوە، داوای ١٥٠ هەزار کرۆن (نزیکەی ٢٢ هەزار دۆلار) ی کرد. پارەکە، لەبەر ئەوەی بۆ وەشانخانەکە زۆر بوو، دەستمان لە کێشانی نەخشەکە هەڵگرت.

نەخشەی کوردستان، وەکو خۆم ئارەزووی دەکەم، جگە لە خۆم بە کەسی دیکە نەدەکرا. کۆمپیوتەرەکەم، کە بۆ ئەو مەبەستە بە ٥ هەزار کرۆن لە کوردێکی کەرکووکی دانیشتووی ستۆکهۆڵم کڕیبوو و کوڕە هەولێرییەکە کاری لەسەر دەکرد، بۆ نینسهامن هێنایەوە. وەلێ کە دەستم دایێ، لەبەر ئەوەی هیچم لێ نەدەزانی، دەستم دەلەرزی و سەری گێژ دەکردم. کێشانی خەتێک، کە خەڵکی دیکە بە داگرتنی یەک دوگمە و نیو چرکە دەیکرد، دوو سێ رۆژی دەبرد. جاری واش هەبوو هەر بۆم نەدەکرا. پرسیارم لە سوێدییان دەکرد. رۆژێکیان بۆ لای ژنێک چووم ئەویش سەری لێ دەرنەکرد و گوتی" باشە تۆ ئەوەت بۆ چییە؟". دواتر چەند کەرەت بۆ لای کوڕێکی هەولێری (مەحموود خۆشناو) چووم و هەندێ شت لەو فێربووم. ئیتر بەرەبەرە فێری ئەو فونکشانە لە ئیلوستراتۆر کە بۆ کاری نەخشەکێشان پێویست بوو فێر بووم. کارەکانم خێراتر لەبەر دەرۆیشت. وەلێ، کێشەی نووسینی ناوەکانم بە کوردی، لەبەر ئەوەی ئیلوستراتۆر ئەوکات هەر بە ئینگلیزی دەینووسی، بۆ چارەسەر نەدەکرا و چەند کەرەت، سەردانی ناوبراوم کردەوە ئەویش بۆی نەدەکرا. ئەو کێشەیە یەک لەو هۆکارانە بوو کە ناوەکان بە کوردی لاتینی بنووسرێت.

نەخشەی کوردستانم، دوای چەند مانگ لە کاری شەووڕۆژی و بە زەحمەتێکی زۆرەوە، تەواو کرد و بۆ چاپم ئامادە کرد. هەنگین وەشانخانەی ئاپێک پێشنیازی

بڵاوکردنەوەی نەخشەکەی کرد و خەرجی چاپکردنی لە ئەستۆگرت. ئەوە بوو بە ١٠ هەزار کرۆن ( نزیکەی ٨٠٠ دۆلار) هەزار دانەی لە چاپخانەیەکی ئەهلی لە ستۆکهۆڵم چاپ کرد. رۆژی هەینی ریکەوتی ١٧ مارتی ساڵی ٢٠٠٠، رۆژی تەواوبوونی چاپ، دانەی خۆم وەرگرت. دەرچوونی نەخشەکە، بۆ کوردستان سەپاندنی ناسنامە و بۆمنیش پێداهاتنی تەزووی خۆشی بە جەستەوە بوو.

نەخشەی کوردستان، دوای تەواوبوونی لە چاپ، لە وڵاتانی ئیسکەندناڤیا بڵاوبۆوە. سەد دانەییکی بۆ ئەڵمانیا ناردرا و دانەشی لێ گەیشتە بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا و وڵاتی دیکە.

بردنەوەی نەخشەی کوردستان بۆ ناو وڵات، لەترسی کێشەی خاڵی هاتن و چوون لە فرۆکەخانەکانی ئەنقەرە و تاران، ئینجا خاڵی پشکنینی برایم خەلیل و حاجی ئۆمەران و باشماخ، درەنگ گەیشتە کوردستان. دوو کەس کاتی گەڕانەوەیان بۆ هەولێر نەخشەکەیان لەگەڵ خۆ بردبوو. یەکەکیان لە خاڵی پشکنینی خابوور کوڕێکی هەولێری (دیلان)، سەرەڕای سزای مادی ئەوەندەی حەز بکەی بەر شلاق و شاپی پۆلیسی گوومرگی سنوور کەوتبوو. بە حەنەکەوە، هەر نەبێت پارەکەم بدەوە. ئێشەکەش با بە قوربانی تۆ بیت. ئەویدیکەیان مامۆستاییکی زانکۆی سەلاحەدین کۆلێژی زمان (د. جەمشید حەیدەری) بوو. نەخشەکەی بە قەدکراوی خستبووە ژێر روکزاک (جەنتای پشتی)ی یەک لە منداڵەکانی و لە خاڵی سنووری خابوور بێ کێشە دەربازی کردبوو.

نەخشەی کوردستان، چەند کەڕەت بەو بێ رەزامەندی و ئاگاداری وەشانخانەی ئاپێک و من لە ئەوروپا و کوردستان، لە لایەن دامودەزگای فەرمی و ئەهلی و کەسان چاپ کراوەتەوە.

**یەکەم. وەشانخانەی ئاپێک.**

وەشانخانەیەکی کوردییە، خاوەنەکەی لە نەوەی ئەو کوردانەن کە کاتی خۆی بۆ ئەستانی قونیا لە رۆژئاوای تورکیا، دوورخراونەتەوە. کاری چاپەمەنی کوردی و سویدی دەکات. ئەو وەشانخانە دوای تەواوبوونی نەخشەکە لە بازاڕدا، بە هەمان ئەندازە و بێ دەستکاری و لەسەر پلیتی چاپی یەکەم، نزیکەی هەزار دانەی دیکەی لە نەخشەکە چاپ کردەوە. پاداشتی من بە هەردوو جاران ١٠٠ دانە بوو.

**دووەم. وەشانخانەی بەرفین**

وەشانخانەیەکی کوردییە، لە شاری کیۆلن لە ئەڵمانیادا. خاوەن و کارمەندەکانی لەو کوردانەن کە لە باکووری کوردستانەوە بۆ ئەوێ کۆچیان

کردووە و کاری چاپەمەنی دەکەن. ئەو وەشانخانەیە بێ رەزامەندی و ئاگاداری وەشانخانەی ئاپێک و من نەخشەی کوردستانی، دوای سڕینەوەی ناوی ئێمە لە ساڵی ٢٠٠٦دا و نووسینی TELDA verlag Medeni Ay 0172|5864857 بڵاوکردەوە. لە وەڵامی تەلەفۆنی ئێمەدا ئەوەی نەخشەکەی چاپ کردووتەوە ئێستا لێرە کار ناکات و بێ ئاگاداری وەشانخانە ئەو کارەی کردووە. بێ ویژدانییەکی گەورەی لەگەڵ وەشانخانە و دانەری نەخشەی کوردستان کردووە.

**سێیەم. گۆران جەلال**

نەخشەی کوردستانی، بە مەبەستی چاپکردنەوەی لە کوردستاندا، لە جەمشید حەیدەری خواستبۆوە. نەخشەکە، لەبەر ئەوەی کاتی خۆی بە قەدکراوی گەیاندرابۆوە کوردستان، خراپ گەچرابوو و شوێنی قەدەکان بە رووی نەخشەکەوە دیاربوو و نە دەشیا بەو شێوەی هەیە کۆپی بکرێتەوە. کارمەندێکی چاپخانەی پەروەردە لە هەولێر بە ناوی زاگرۆس ، کە ئەوەی بیستبوو، نەخشەکەی سکان کردبوو. پاشان بە فۆتۆشۆپ شوێنە گەچراوەکانی کە گەلێک زۆربوون یەک بە یەک لابردبوو. نەخشەکەی، دوای ماندووبوونێکی زۆر، ساف کردبوو و بۆ کۆپیکردنەوەی ئامادەی کردبوو. لە ساڵی ٢٠٠٥دا و لە هەولێر سێ هەزار دانەی بێ دەستکاری و بە زیادکردنی مافی چاپکردنەوەی بۆ (گۆران جلال) پارێزراوە لێ کۆپی کردبۆوە. وەلێ لەبەر ئەوەی بە لاتینی بوو و کەمێک درەنگ لە چاو ئەو نەخشەیەیی بازاڕێکی سلێمانی بە مەبەستی پوول پەیداکردن خستبووە بازاڕەوە، رەواجی کەم بوو.

**چوارەم. فەرهەنگخانەی سلێمانی**

فەرهەنگخانەی ناوبراو، پێشنیازی چاپکردنەوەی نەخشەی کوردستان و چاپکردنی نەخشەی باشووری کوردستانی کرد. بە مەرجێک ناوەکان لە شوێنی لاتینی بە کوردی بنووسرێنەوە. نەخشەکەم ئامادە کرد ئەوانیش بە چەند ملیۆن دینار لە چاپخانەی ( ...... ) سەر شەقامی شۆڕش هەر یەکەو پێنج هەزار دانەیان لێ چاپ کرد. کەوابێت ئەمەیان بۆ نەخشەی کوردستان و هی باشووری کوردستان (چاپی یەکەم ــ دەزگای موکریان. ساڵی ٢٠٠٧ تیراژ ٣٥٠٠) چاپی دووەم بوو. پاداشتی من، جگە لە ٢٠٠ دانەیەک، ٢٠٠ هەزار دینار ؟ بوو. نەخشەکان بە خۆڕایی بەسەر دامودەزگا و خەڵک بەشرایەوە و تەواو بوو.

**پێنجەم. هۆشیار محەمەدئەمین ڕەشید**

ئەمەیان لە هەولێر کاری نەخشەسازی بۆ خۆی دەکات و تاکو ئێستا چەند کاری سەربەخۆ و بە هاوبەشی لەو مەیدانەدا کردووە. ئەتڵەسی سیاسیی کوردستان و ئەتڵەسی کەرکوک و نەخشەی ئەستانەکانی هەولێر و دهۆک و سلێمانی ناوی ئەوی و هیدیکەی لەسەر نووسراوە.

ڕۆژێکیان لە کوشکەکەی سەر جادەی باتە چاوم بە نەخشەیێکی قەدکراو کەوت و لەسەری نووسرابوو نەخشەی کوردستان (نەخشە ٢). کە چاوم بە کلکی نەخشەکە کەوت یەکسەر زەینم بۆ نەخشەی کوردستان چوو. دەستم دایێ و لێکم کردەوە و بە دیقەت سەروبنم کرد. بۆم دەرکەوت، کتومت ئەوەیە کە من کردوومە و ساڵی ٢٠٠٥ و ٢٠٠٧ لە هەولێر بە لاتینی (ساڵی ٢٠٠٥) و کوردی (ساڵی ٢٠٠٧) بڵاوکراوەتەوە. وەلێ بە دیزاینێکی دیکە و ڕازاندنەوەی بە هەندێک وێنەی شارەکانی کوردستان و دەستکاری کردنی ڕێنووسی هەندێک لە ناوەکان، ئەویش بە نەزانی، و بە نووسینی کوردی و بێ ئاماژەکردن، هەر نەبوایە وەکو سەرچاوە، بە وەشانخانەی ئاپێک و دانەری نەخشەکە و شوێن و ساڵی چاپکردن.

ئاشناییم لەگەڵ ناوبراودا، ئەگەرچی هاوشار بووین، نەبوو و ناشزانم گەر پێشتر لە شوێنێکدا چاک و خۆشیمان لەگەڵ یەکتردا کردبێت. نمرەی تەلەفۆنەکەیم لە ناسیاوێک وەرگرت و ئێوارەکەی تەلەفۆنم بۆ کرد. دوای خۆ پێناساندن.

ئەرێ کاکە ئەو نەخشەی منت بۆ بە ناوی خۆت چاپ کردووتەوە؟

نەخشەی چی؟

کوردستان.

نەخشەی تۆ نییە. نەخشە خۆم کێشاومە و هیچ پەیوەندی بە نەخشەی تۆ نییە.

تۆ لەبەر ئەوەی شارەزای جوگرافیای کوردستان نیت ناتوانیت نەخشەی وا بکێشیت.

تەماشای چەندین سەرچاوەم بە زمانی تورکی و فارسی و کوردیش هەر هیچ کردووە. هەروەها لە ئینتەرنێت گەلێک شتم دەرهێناوە.

ئەدی کوا ناوی سەرچاوەکان؟

خۆ ڕاست دەکەی ئەوە لە بیرکراوە.

هیچ سەرچاوەیەک جگە لە نەخشە و جوگرافیای کوردستان بەو شێوە زانیاری تێدا نییە.

باشە ئەدی سنوورەکەت لە کێ کۆپی کردووتەوە ؟ خۆت دەزانی کوردستان وڵاتێکە وەکو وڵاتانی دیکە سنوورێکی پێناسراوی نییە. هەر لەبەر ئەمەشە هەر یەکەو بە ئارەزووی خۆی نەخشەی کوردستان دەکێشێت.

باشە ئەگەر نەخشە هی خۆت بێت دەبی بزانیت ناحیەی جەرەوباڵادە لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا کەوتووتە کێندەر ؟

ئەوجا ئەتوو. ئەوە کەوتووتە کێندەر. ناوی ئەو ناحیەیە چییە. پێت دەڵێم نەخشە نەخشەی خۆمە. چما پیاو هەموو شتێکی لەبیر دەمینێت؟

ئەو نەخشە بە تۆ ناکرێت. تۆ هی ئەوە نیت بتوانی نەخشەی وا بکێشیت.

دەزانی ئەو نەخشە کە تۆ بە ناوی خۆتەوە بڵاوتکردووتە ١٥٠ هەزار کرۆن خەرجی بووە. ئێستاش لە کوشکەکان بە ٧ هەزار دینار دەفرۆشرێت.

"دەزانی ئەگەر تۆ نەبوایت ئەو قسانەم لێ قەبوڵ نەدەکردی"

لەسەر هەقی خۆشم گەفیشم لێ دەکەی؟

دەتدەم بە دادگا و پارەکەشت لەسەر دەکەمە ماڵ.

چی دەکەی بیکە.

شەوێک ناسیاوێکی ناردبوو.

کێشەیەک، لەسەر نەخشەی کوردستان، کەوتووتە نێوانتان. ناوی منیش لەسەر نەخشەکە نییە.

ئەرێ بەڕاستی داوای چەندی دەکەی؟

داوای هیچ ناکەم تەنیا ئەوە نەبێت کە ئەو نەخشەکەی منی بە ناوی خۆیەوە بڵاوکردووتەوە و بە ٧ هەزار دینار دەیفرۆشێتەوە.

دەبوایە سەرچاوەکانی بنووسیبوایە وەلێ ئەوەی نەکردووە.

من تێی دەگەینم و کێشەکەی چارەسەر دەکەین.

کەنگین دەیدەی بە دادگا ؟

بۆلای ئاوقات شاکر رۆژبەیانی چووم و کێشەکەم تێ گەیاندووە. داوای هەندێ زانیاری، بۆ ئەوەی دەعوای لەسەر قەید بکات، کردووە.

بێ ویژدانی لەو شێوە وەکو بیستوومە و زانیومە لە کەسانێک دەکرێت دوای دەرچوونیان لە ژیاندا. وەلێ ناوبراو، ئەوەندە تامەزرۆ بووە، خۆی بۆ نەگیراوە تاکو من لەبەر چاوان بزر دەبووم.

چاپکردنەوەی بەرهەمی خەڵک، بە ناوی خۆتەوە، هەر کەسێک بیکات، رەوشتێکی یەک جار ناشرینە لە مرۆڤدا. پیاوی لە جیاتی ئەوەی لە ناو خەڵک جوان

بکات ناشرینی دەکات و هەردەم پەنجەی دزی بۆ درێژ دەکرێت. کۆمەڵگای کوردی کەسانی وای تێدا، لەبەر ئەوەی نەفس نزمێکی گەورەیە، زۆر کەمە و هیوادارم ئەوەی هەشە بیر لە خۆیان و منداڵەکانیان بکەن و دەست لەو ئاکارە ناشرینە هەڵگرن. ئەگەر کەسێک دەیەوێت خزمەتی وڵات بکات با بە رەنج و شانی خۆی بیکات نەوەک بە هی خەڵکانێکی دیکەوە.

زێتر لە ۱۰ ساڵ خەریکی نەخشەی کوردستان بووم. بێ ویژدانی لەوە گەورەتر دەبێ چی بێت کەسێک بێت و بە ناوی خۆیەوە بڵاوی بکاتەوە و بە هیچ جۆرێک ناوت نەهێنی. قسەی خۆمان بێت ئەوە دووەم کەرەتە ئەو غەدرە لە من بکرێت. جاری یەکەم کتێبێکم، لە لایەن مامخان شێروانی (ناوی خواستەمەنی ..... هەولێرییە)، دوای دەسکارییێکی کەم و زیادکردنی هەندێ قسەی ناشرین، بە ناوی خۆی چاپ کردەوە.

ناسیاوێک هەردووکمانی لە هوتێلی چوارچرا، بۆ چارەسەری کێشەکە، روو بەرووی یەکتر کرد.

ئێوە هەردووکتان دەتانەوێت خزمەتی وڵات بکەن. ئێستاکەش ئەوە لە بەینتان رووی داوە، وا باشە بێ دادگا کێشەکە یەکلا بکەنەوە.

من ئەو کارەم لە پێناوی وڵات کردووە. والله و بالله بۆ پارە نەمکردووە. پارەم لە دەوی منداڵەکانم گرتووتەوە و نەخشەکەم پێ چاپ کردووە. تاکو ئێستاکە ۱۰۰ دانەم لێ نەفرۆشتووە و من بە ۷ هەزار دینار نایفرۆشم. رەنگە کە خاوەن کوشک دەبینیت کەسێک تامەزرۆی شتێکە داوای زۆر بکات. من گەلێ سەرچاوەم تەماشا کردووە.

باشە ئەدی سنوورەکەت لە کێ وەرگرتووە؟

"سنوورەکە لە نەخشەکەی تۆ وەرگیراوە"

گرنگ لە نەخشەی کوردستان سنوورەکەیتی. کە ئەوەت کرد ئەویدیکە ئاسان دەبیت. هەروەها ناوەکانت، لەبەر ئەوەی ئاشنایەتیت لەگەڵ زمان و سەرچاوەی فارسی و تورکی نییە، بە هەڵەت نووسیونەتەوە. تۆ پێت وابووە من ناوەکانم بە هەڵە نووسیوە و تۆ راستت کردووتەوە؟ دڵنیات دەکەم لەوەش بە هەڵە چوویت.

پێم ناڵێیت تۆ بۆ خۆت تووشی ئەو کێشەیە کردووە. دەزانی قونسوڵی فلان دەوڵەت شکاتیان لێ کردووم. لە پێشانگای کتێبیش لە ئەڵمانیا نەخشەکەیان دڕاندبوو و شەڕ رووی دابوو. ئەو سەرئێشەت بۆ چی بوو.

با منیش ناوێکم هەبێت.

وەکو کابرا و کانی گوندیت کرد.

باشە چیت دەوێت بۆت بکەم؟

نەخشەکە وەکو خۆی چاپ بکرێتەوە و لەسەری بنووسرێت. نەخشەی کوردستان. دانەر عەبدوڵڵا غەفوور. نەخشەسازی فڵان کوڕی فڵان. هەروەها بنووسرێت ناوی دانەر لە چاپی یەکەم لە بیرکراوە.

هەندێک لە ناوەکانم دەستکاری کردووە و ڕەنگەکانم گۆڕیوە و وێنەم زیاد کردووە.

هەر بۆ ئەوەی خەڵک بزانی دانەری نەخشەی کوردستان عەبدوڵڵا غەفوورە، لەگەڵی پێک هاتم.

نەخشەکەی، دوای تێپەڕبوونی چەند مانگێک، وەلێ بە ئەندازەیەکی بچووکتر و لەسەر کاغەزێکی خراپ، چاپ کردەوە. ئەمەی خوارەوەی لەسەر نووسیوە.

سەرچاوەکان

ـ سەردان بۆ زۆرێک لە شوێنەکان.

ـ دکتۆر عبداللە غفور ـ نەخشەی کوردستان ـ چاپی دووەم. فەرهەنگخانەی سلێمانی ـ هەولێر ـ ٢٠٠٧

(کە زۆربەی زانیارییەکانی ئەم چاپە لەو وەرگیراوە)

ـ چەند نەخشەیەکی تر لە سایتەکانی ئەنتەرنێت

تێبینیم لەسەر لیستی سەرچاوەکان:

ـ پێم وایە ئەو شوێنانەی کە سەردانی کردوون نابێت ئەوەندە بێت. دەیان ساڵە خەریکی گەڕان و سووڕانم لە کوردستاندا هێشتا دە لە سەدم نەبینیوە.

ـ مەبەست لە زۆربەی زانیارییەکانی ئەم چاپە، واتە ئەو چاپەی ئەو کردوویەتییەوە.

ـ زۆر نەخشە لە سایتەکانی ئینتەرنێت دەست دەکەوێت. وەلێ، لەبەر ئەوە ڕاگەیاندراوین و پڕن لە کەموکوری، بۆ ئەوە ناشێن بکرێن بە سەرچاوە.

کێشانی نەخشەی کوردستان، بابەتێکی یەکجار ناسکە، لەبەر ئەوە داوا لە گشت لایەک بە تایبەتی ئەوانەی مەبەستیان ناودەرکردن و پارە پەیداکردنە، دەست لە نەخشەی کوردستان هەڵگرن. بەو کارەتان خزمەت بە کوردستان و زانست دەکەن. با خۆمان و وڵاتانی دەوروبەرمان لەو نەخشەی کە من کێشاومە رابێنین و بە دیفاکتۆ (ئەمری واقع) ی بکەین.

**شارۆچکەی نینسهامن ـ سوێد**

**٢٨ ـ ٢٩ / ٨ / ٢٠١٣**

# میژووی ڕۆژنامەوانیی کوردی
# لە ڕۆژهەلاتی گەرمیان ١٩٣٩ - ١٩٧٢

**م/ ئەحمەد محەمەد ناسر (ئەحمەد باوەڕ)**
بەشی مێژوو — کۆلێژی پەروەردە — زانکۆی گەرمیان

**بەرایی :**

بەوەی ناوچەی گەرمیان سنوور و پێدەشتێکی بەرفراوان دەگرێتەوە، ناکرێت لە چوارچێوەی بابەت و نووسینێکی وا کورتدا قسە لەسەر تەواوی ئەو لایەن و قۆناغەی بکەین کە مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردی لەم سنوورەیدا بە خۆیەوە بینیویەتی، بەڵکو لێرەدا و لە چوارچێوەی ئەم نووسینەماندا بۆئەوەی بەدواداچوونەکەمان تاڕادەیەکی زیاتر چڕتر بکەینەوە و تەواوی ئەو شار و شارۆچکە و ناوچانەش بگرێتەوە و بیکەینە بابەتی لێدوان و قسەکردن کە ئێمە دەمانەوێت لە گێڕانەوە و تۆمارکردنێکی وادا، تاڕادەیەك بەوردی و بەپوختی لەسەری بدوێین و باسی لێوە بکەین، کە ئەمەش بۆ خۆی دەکرێت ناوی لێ بنێین چاوپیاخشاندن و بەدواداچوونێکی خێرا، سەبارەت بە سەرهەڵدان و گەشەکردنی بواری ڕۆژنامەوانیی کوردی لە ڕۆژهەلاتی گەرمیان و ناوچەی گەرمەسێردا.

گەڵاڵەکردن و دەستنیشانکردنی ناونیشانێکی لەم تەرحەش ڕەنگە دەستمان کراوەتر و چوارچێوەی بابەتەکەمان بە باشی دیاریتر بکات، لە هەمان کاتیشدا هیچ گومانێکی ئەوتۆی تێدا نامێنێتەوە، کە ئەرك و تێبینیی ورد و قسەکردنمان سەبارەت بە بابەتەکە ئاسانتر دەکاتەوە، ئەمەش لەکاتێکدا کە وتمان: ناوچەی گەرمیان دەبێت هەر لە ناوچە و شارەکانی کەرکووك، چەمچەماڵ و دووز خورماتووەوە بیگرین و بە وردی لەسەریان بدوێین تا دەگاتە شارەکانی کفری، کەلار، خانەقین، تەنانەت بە دەربەندیخانیشەوە، بەلام کە وتمان ڕۆژهەلاتی گەرمیان، ئەوا هیچ گومانێکی ئەوتۆی تێدا نامێنێتەوە بۆ ئەوەی مەودای نووسینەوەکەمان ئاسانتر و چڕتر بکاتەوە و زیاتر ئەو شار و شارۆچکە و ناوچە ئاوەدانییانەش بگرێتەوە، کە لە دێرزەمانەوە کەوتوونەتە ئەمبەر و ئەوبەری

ڕووباری (سیروان)ەوە، ئەم ناوچە و هەرێمەش بەحوکمی ڕۆژگار و ئـەو هەلومـەرج و ئاسـتەنگە جـۆر بـەجۆرەی کـە هـەیبووە و ڕۆژ بـەڕۆژ بەسـەریدا هـاتووە، بەڕادەیەکی کەمتر ئارامی و هێمنـی بـە خۆیـەوە بینیـوە، جگـە لـەوەش دەزگـا و ناوەندەکانی خوێندن و ڕووناکبیری کـوردی بەهـەموو بەشـەکانییەوە درەنگـتر و زۆر بەزەحمەت تیایدا چەکەرە و گەشەی کـردووە، بـۆ نموونـە : هەرچـەندە هـەر دوو شاری کفری و خانەقین لەم سنوورەدا، بۆ خۆیان دوو ناوەندی لەمێژینەی زۆر ئاوەدان و هاوکات دوو سەرە ڕێگـای کـاروانیی گـرنگ بـوون، بـەوەی یەکـەمیان : ماوەیەکی زۆر دەروازە و شارێگەی ئەو کاروانییانە بووە، کە لە شاری سلێمانی و دەوروبەریـەوە گـوزەری لێـوە کـراوە بـەرەو شـاری کـەرکووك و ناوچـە و شـارە ئاوەدانـەکانی وەك بەغـدا و لەوێشـەوە بـەرەو ناوەڕاسـت و خـوارووی عێـراق، هەروەها دووەمیان: ڕێگەیەکی سەرەکی بووە بـەرەو سـنوورەکانی وڵاتـی فـارس (ئێـران لـە سـاڵی ١٩٣٥)ەوە و ناوچـە و شـارە ئاوەدانـەکانی تـری ڕۆژهـەڵات، بەجۆرێك ئـەم دوو شـار و ناوچـەیە بـە گشـتی ناویـان لـە زۆر تۆمـار و نووسـراوی مێژووناسـان و گەڕیـدە و ڕۆژهەڵاتناسـی بیـانی و ئیسلامیشـدا هـاتووە، کـە بـۆ مەبەسـتی جـۆر بـەجۆر بـەم سـەرزەمین و ناوچـەیەدا گوزەریـان کـردووە و تـا ڕادەیەکی زۆرباش باسیان لـە سـەربردە و چـۆنێتی ژیـان و ئـەو هەلومەرجـەیان کـردووە، کـە بـارودۆخی کۆمەڵایـەتی، ئـابووری و سیاسـی...تـاد ئـەم ناوچـەیە بەدرێژایی مێژوو بەخۆیەوە بینوویەتی.

جا بۆ گەیشتنە ئەنجامێکی پوخت و بەدواداچوونێکی بابەتییانـە، هەرچـەندە لەوانەبێ تاڕادەیەك سادە بێتە بەرچاو، بەسەریەکەوە ناوەرۆکی نووسـینەکەمان بە سوود وەرگـرتن لـە کۆمـەڵێك سەرچـاوە و، دیـدەنی (مقابلـە) و دەسـتنووسـی پەیوەندیدار بە بابەتەکـەوە وەك لـە لیسـتی پـەراوێز و سەرچـاوەکاندا ئاماژەیـان بۆکراوە، دابەشمان کردووە بەسەر کورتەیەکی بەرایی و سێ تەوەری سـەربەخۆدا یەکـەمیان : لێکدانـەوە و بـە دواداچـوونێکی خێرایـە سـەبارەت بـە مێـژوو و سەرهەڵدانی ڕۆژنامەوانیی کوردی لەم سنوورەدا کە بابەتەکەی بۆ تەرخان کـراوە، بەتایبەتی لە ماوەی جەنگی دووەمـی جیهـانی و تـا دەگاتـە کۆتاییـەکانی سـاڵی ١٩٥٤. دووەمیان: لەو ماوەیەوە سەرچاوە دەگرێ کـە شۆڕشـی ١٤ ی تـەمووزی

ساڵی ١٩٥٨ دێتە کایەوە، بەتایبەتی لە شارێکی وەك خانەقینی ئەو دەمانەدا چالاکی ڕۆژنامەوانیی کوردی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی لەو شارەدا بە چ ئاقارێکدا ڕۆیشتووە و دواتر چ ئەنجامێکی لێ دەکەوێتەوە. تا دەگاتە سەروبەندی ڕێککەوتننامەی ١١ی مارتی ساڵی ١٩٧٠ ی نێوان حکومەتی عێراق و سەرکردایەتی شۆڕشی کورد. هاوکات تەوەری سێیەم و کۆتایی درێژە و وردەکارییەکانی ئەو چالاکییە ڕۆژنامەوانییە دەگرێتەوە خۆی، کە لە ساڵی ١٩٦٢ ەوە لە شاری کەلار و دەوروبەری کفریی ئەمڕۆدا و بەشێوازی جیاواز و دەستاو دەست بڵاو کراونەتەوە تا ناوەندی حەفتاکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوو.

ئەوەشی کە زۆر پێویست بێت لەم بارەیەوە بوترێ و وەك ئاستەنگێکی بەرچاو باسی لێوە بکرێت، بە زۆری نەبوونی سەرچاوەی پێویست و دەست نەکەوتنی زۆربەی زۆری ژمارەی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەیە کە لەو ماوەیەدا و لەو هەلومەرجەدا بڵاو کراونەتەوە کە ناونیشانی بابەتەکە: (مێژووی ڕۆژنامەوانیی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی گەرمیاندا ١٩٣٩ – ١٩٧٢) دەیگرێتە خۆی، بۆیە ئێمەش بە ناچارییەوە و سەبارەت بە شێوازی ناوەڕۆك و سیستەمی بڵاوکردنەوەیان، پەنامان بردۆتە بەر دیدەنی و چاوپێکەوتنی جۆربەجۆر، بەتایبەتی لەگەڵ زۆرێك لەوانەی کە دەستیان لە بڵاوکردنەوەی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاوکراوانەدا هەبووە یان هەر هیچ نەبێت لێیەوە نزیك بوون و تاڕادەیەك ئاگایان لە چۆنێتیی بڵاوکردنەوە و دەرکردنیان هەبووە. کە ئەمەش بۆخۆی پێویستی بەماندووبوون و پشوو درێژییەکی زۆر هەبووە، بۆ ئەوەی بتوانیت لە کات و ماوەیەکی گونجاودا زانیارییەکانت دەست بکەوێت و تۆماریان بکەیت و هەڵیان بسەنگێنی و ئەوجا بیانکەیتە کەرەستەی خاوی نووسین و سەرچاوەی بابەتەکە.

## تەوەری یەکەم

## سەرهەڵدانی رۆژنامەوانیی گەرمیان

## لە هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی بەدواوە ١٩٣٩- ١٩٤٥

لە کاتێکیشدا ئەگەر بمانەوێت لەسەر گەشەکردن و لە بواری سەرهەڵدانی بزاڤی ڕۆژنامەوانیی کوردی ناوچەی گەرمیان بدوێین، ئەوا دەبێت جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە بەشێوازێکی سەلمێنراو و بەلێکدانەوەو بەڵگەی زیندووی وردەوە لە ماوە و وەرچەرخانێکی مێژوویی ئەوتۆوە دەست پێ بکەین، کە بەشێوازێکی زۆر دروست و گونجاو بمانگەیەنێتە ئەو دەرئەنجامەی کە بەپێی (کرۆنۆلۆجیا)یێکی مێژوویی ڕاست و ڕەوان قسەیان لەبارەوە بکەین، واتا بە داتا و بەمێژوو و هەروەها بە ناو و بەدەستنیشانکردنی ئەوەی کە هەبووە تا بتوانین وەك ڕووداوگەلێکی مێژوویی بیانخەینەوە بەردەستی خوێنەر و توێژی ڕووناکبیر و دەستەبژێری کورد. دیارە کە ئەمەشمان وت : بە ڕای ئێمە و سەبارەت بەبابەتێکی وا لەم سنوور و ناوچەیەدا، دەبێت بەوردی بگەڕێینەوە بۆ ڕووداوگەل و مێژوویەکی زۆر نزیك، کە ئەوەش بۆخۆی ساڵان و ماوەی بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی (١٩٣٩ – ١٩٤٥)ە، بەتایبەتی کۆتاییەکانی ئەو وەرچەرخانە مێژووییە، واتا لەو دەمانەوە دەست پێ دەکات کە ڕێکخراو و حزبێکی سیاسی وەك حیزبی هیوا (١٩٣٧ – ١٩٤٥)[1] بە تەواوی لەم ناوچەیەدا چالاکی و سەرەتای ڕێکخستنەکانی دەرکەوتووە و هاوکات کۆمەڵێك کەسایەتیی چالاك و دیاری ناوچەکەی وەك : مەلا سەید حەکیمی خانەقین (١٨٩٢– ١٩٥٧)، ڕەشید ئیسماعیل باجەلان (١٩٢٠ – ٢٠٠١)، عەزیز پشتیوان (١٩١٢ – ٧/٨/ ٢٠٠١)، مستەفا نەریمان، محمەد ئەحمەد قەرەداغی – پشکۆ (١٩١٧– ١٩٧٣)، دکتۆر موکەڕەم شێخ جەمالی تاڵەبانی و شێخ عەتای تاڵەبانی.....تاد لە ڕیزی ڕێکخستن و تەنانەت لە دەستەی باڵای ڕێکخستنەکانی بوون، سەرەڕای ژمارەیەکی زۆر لە لایەنگیر و ئەندامی کارای تایبەت، لە هەمان کاتیشدا ئەم پارتە یان حیزبە سیاسییە بەشێوازێکی بەرفراوان توانیویەتی لەم سنوورەوە مەودای ڕێکخستن و چالاکییەکانی خۆی درێژە پێ بدات و تەنانەت یەکێك لە بوار و چالاکییەکانی لەم

سنوور و ناوچەیەدا ئەوەی بووە، لە سنووری گەرمیان و شاری کفری و بەتایبەتی لە گوندێکی وەك (زەرداوی سەروو)ی ئەو دەمانەدا کە هەریەك لە: مستەفا نەریمان (١٩٢٥- ٢٧/ ٥/ ١٩٩٤)[٢] و شێخ عەتای تاڵەبانی (١٩٢٥- ٢٠٠٠)[٣] و دکتۆر موکەڕەم جەمال تاڵەبانی بەرای باسیان لێوە کردووە، بریتی بووە لە بلاْوکردنەوەی بلاْوکراوەیەکی ناو بەناو بە ناوی (شیلان)ەوە و لە ماوەی ساڵانی (١٩٤٤- ١٩٤٥) دا و بەشێوازێکی نهێنی شێخ عەتای تاڵەبانی بەخۆی وەك باڵی ڕێکخراوی (هیوای ئازاد- الامل الحر) لە ڕیزەکانی پارتی هیوادا، بەئامێری چاپ بلاْوکراوەکەی ئامادە کردووە و دواتر بەناو کۆمەڵانی خەڵك و ناوچەکەدا دەستاو دەست بلاْویان کردۆتەوە[٤]، هاوکات مستەفا نەریمانیش لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا سەبارەت بە بلاْوکراوەی ناوبراو وای دەگێڕێتەوە کە ئەو بلاْوکراوەیە: ناوی (شێلاَن) بووە و لەگەڵ ئەوەدا باسی لەوەش کردووە و وتوویەتی: ((لە ئاواییەکەی خۆی واتە: (گوندی زەرداوی سەروو) بە تایپ لەچاپی ئەدا و ئێمەیش نووسینمان دەدایە))[٥] بە مەبەستی بلاْوکردنەوە، هەندێ سەرچاوەش باس لەوە دەکەن کە (گوایە ؟) بە شێوازێکی نهێنی ژمارەی گەیشتبێتە زۆرینەی شارە کوردییەکان و چەند ژمارەیەکیشی گەیشتۆتە هەولێر و بەغدا، جگە لە مستەفا نەریمان و شێخ عەتای تاڵەبانی هەریەك لە: محەمەد تۆفیق وردی، محەمەد قەرەداغی، محەمەد نەجیب تاڵەبانی و شێخ حوسێن بەرزنجی لەوانە بوون کە ڕۆڵیان لە بلاْوکردنەوەیدا هەبووە و سەرەتا بە دوو لاپەڕەیی و پاشان بە چوار لاپەڕەیی بەسەریەکەوە (١٥٠) ژمارەی لێ بلاْو کراوەتەوە[٦].

هەرچەندە ئێمە بەڕاشکاوییەوە بەگومانین لە (١٥٠) ژمارەی بلاْوکراوەی (شیلان) و تەنانەت دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی (١٩٢٣)ش بۆ ڕاستی و بۆ مێژوو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەو: ((زۆربەی ژمارەکانی پێ گەیشتووە و خوێندوویەتیەوە، بەسەریەکەوە نزیکەی (١٤ - ١٥) ژمارەی لێ دەرچووە و لەوە زیاتر تێپەڕی نەکردووە، ئەوانەشی کە لەگەڵ ئەو باڵی (هیوای ئازاد)ەدا بوون کە ئەو بلاْوکراوەیان دەردەکرد لە (گوندی زەرداو) و هاوکارییان دەکرد و تیایدا دەیاننووسی بریتی بوون لە: شێخ عەتای تاڵەبانی، مستەفا نەریمان و کەسێکی تر

کە ناوەکەیم لە یاد نییە، بلاوکراوەکە نزیکەی ساڵ و نیوێك بەردەوام بوو و بەزۆری مانگانە تایپ دەکرا و بلاو دەکرایەوە، ژمارەکانیشی بۆ زۆر شوێن دەنێردران بەتایبەتی کەرکووك، بەغدا، خانەقین، هەولێر و سلێمانی...ئەوانەی تریش کە لایەنگیری باڵی هیوای ئازاد بوون لەو سنوورەدا لەوانە : شێخ حەمە نەجیبی شێخ وەهابی تاڵەبانی، شێخ قادری سیامەنسووری، شێخ حوسێنی خانەقا و شێخ عەبدولکەریمی شێخ ئەسعەدی تاڵەبانی و هەندێ کەسی دی....))[٧].

بەلام وەکتر تا ئێستا هیچ ژمارەیەکی لەبەر دەستدا نییە و تائێستا جگە لە تۆمارکردنی چالاکیی حیزبی و کاری ڕێکخراوەیی نازانین بەزۆری چییان تیا نووسیوە. جگە لەوەش هەر لە کۆتایی سییەکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوو و سەرەتای چلەکانیدا، بزووتنەوەیەکی تری ڕۆژنامەوانی بەجۆرێك سەرچاوەی گرتووە کە کۆمەڵێك شاعیر و نووسەر و وەرگێڕی ناسراو و دیار بوونەتە فاکتەر و دینامیکییەتی بەرەو پێش چوونی بە تایبەتی لە ناوچەی گەرمیان و گەرمەسێردا و بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی خۆیانیان لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکانی ئەودەمانەی وەك گەلاوێژ (١٩٣٩– ١٩٤٩)، دەنگی گێتی تازە (١٩٤٣– ١٩٤٧)، ژین لە سەردەمی پیرەمێرددا (١٩٣٩ – ١٩٥٠) و گەلێك گۆڤار و ڕۆژنامەی سالانی دواتر بلاو کردۆتەوە لەوانە نووسەر و شاعیرانی ناسراوی وەك : شێخ ئەحمەدی شاکەلی (١٩٠٢ – ١٩٨٢)، شێخ بابا عەلی بێدار (١٨٩٤– ١٩٤٩)، محەمەد ئەحمەد قەرەداغی (١٩١٧– ١٩٧٣)، مستەفا نەریمان (١٩٢٥– ١٩٩٤)، ژنە جافێك – حەبێ خانی کچی کەریم بەگی جاف (١٩٢٣– ١٩٩٧/٧/٢٩)، حەمە سەعید بەگی جاف (١٩٢٥– ١٩٩٦)، مینە جاف (١٩٠٥– ١٩٦٥) و زۆری دی کە لەوانە بوون چەندین جار بەرهەمی خۆیانیان گەیاندۆتە ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی کە لە شارەکانی بەغدا و سلێمانی و هەولێر بلاو کراونەتەوە[٨].

سەرەڕای ئەو تەرزەی دەستەی ڕووناکبیریی گەرمیان و هاتنەکایەوەی حیزبی هیوا و بلاوکردنەوەی ئەو بلاوکراوەیەی کە پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، هەر لەم سنوورانەدا و بەماوەیەك پێشتر، کەسایەتی و نووسەر و ڕۆژنامەنووسێکی دیاری وەك شاکر فەتاح (١٩١٤ – ١٩٨٨)[٩] لە شارۆچکەیەکی ئەو دەمانەی وەك (قادر

کەرەم)دا کە تیایدا وەکو خۆی باسی لێوە کردووە، کارگێڕی لادێ بووە، لە نێوان (٢٥ /٦/ ١٩٤٢ – ١٩٤٢/١١/٢٣) دا واتا لە ماوەی شەش مانگی تەواودا توانیبووی (٢٤) ژمارەی تەواو لە ڕۆژنامەی (باسەڕە) بلاو بکاتەوە و هەروەکو خۆشی سەرەتا لەبارەی گواستنەوەی ڕاژە و چوونیەوە بۆ شارۆچکەکە و دەست بەکاربوونی وەك فەرمانبەرێکی میری دەنووسێت : ((لە پاییزی سالی ١٩٤١ گەیشتمە (قادر کەرەم) لادێیەکە بە گەرمیان دەژمێردرێت. دەشت و هەردە. شەست حەفتا گوندێك (١٠٠٠٠) کەسێکی تێدا بوو، بەلام قادر کەرەم کە خۆی بنکەی لادێیەکە بوو هەر سەد مالێك دەبوو کە ژمارەیان دەگەیشتە (٥٠٠) کەسێك، بە هەموو لادێیەکە تاکە یەك خوێندنگا و نەخۆشخانەیەك و یەك بنکەی بالبازی تێدا بوو... چەمی باسەڕە بەناویدا تێپەڕی دەکرد، دروستکردنی بەڕە و قالیچە و ڕایەخ و خورج و هەگبە و بابەتی ڕەشمال و دەواریشی تێدابوو.. بەتێکڕایی ناوچەکە هەژار بوو. نەخۆشی و (نەخوێندەواری)یش لە ناویدا فەرمانڕەوا بوو...تاد))[10].

جگە لەوەش شاکر فەتاح لە بارەی ڕۆژنامەکەیەوە وەك ئەوەی هەر لە ٢٥ی حوزەیرانی سالی ١٩٤٢ ەوە کە دەست دەکات بە بلاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی (باسەڕە) و وەك سەرەتایەکی ڕۆشن لە سەرهەلدانی بیری ڕۆشنگەریی کوردی لەم ناوچەیەدا، بە زۆری ژمارەی لاپەڕەکانی تا دوا ژمارەی کە لە ١١/٢٣/ ١٩٤٢ بلاوی کردۆتەوە تەنها (٤) لاپەڕە بووە، لە سەردێڕی ژمارە (١)یدا و لە پەیامێکی خۆیدا و زۆر ڕاشکاوانە بۆ کۆمەلانی خەلك و دانیشتووانی شارۆچکەکە دەنووسێت :((برا گەل ئەی دانیشتوانی لادێی قادر کەرەم : بۆ ڕۆشنکردنەوەی شەقامی ژینتان، بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەوشت و خووتان بۆ بەهێزکردنی ئاینتان بە خودا و بە ڕاستی بۆ ڕزگارکردنتان لە دەست نەزانی و دەرد و خەفەتباری و هەژاری و ستەم و زۆرداری بۆ ئەمەی چێژکەی سەربەستی بکەن و لە بەروبوومی خۆشەویستی بخۆن، بە کۆمەکی هەندێ جوامێران و لاوچاکانەوە ئەم ڕۆژنامەیەمان بۆ ئێوە هێنایە بوون، تکا دەکەین ئێوەش ڕەنجمان بە با مەدەن بیخوێننەوە، یان بۆکەسانی تری بخوێننەوە و باش لە قسەکانمان ورد ببنەوە و لە پێشخستنی خۆتاندا یارمەتیمان بدەن....))[11]. هەروەها جگە لەوەش داوا لە

دانیشتوان و کۆمەلآنی خەڵك دەکات کە هەر کێشە و گرفتێکتان هەبێت بێنە لامان بۆ ئەوەی هاوکارتان بین و دەسگرۆیی و یارمەتیتان بدەین، وەك ئەوەی لە بەشێکی تری سەروتارەکەیدا دەنووسێت :((بێجگە لەوە هەر کامێکتان ئارەزوو دەکات، بێتە لامان تێر و پڕ سکالآی دڵی خۆی بکات و هەر داخێکی دڵی هەیە هەڵی بڕێژێ. هەر خواستێکیشی هەیە بە سەربەستی بیڵێ، تاوەکو ئێمەیش ئەوەندەی لە تواناماندا هەیە یارمەتی بدەین و، بەسایەی ئەم ڕۆژنامەیشەوە کە هەر هەفتەی دوو جار دەردەچێت و هەر جارەی بە یەك دانە دەردەچێت، لە خەڵك و خودایش یارمەتی بۆ داوا بکەین.....براتان : شاکر فەتاح – کارگێڕی لادێی قادر کەرەم...)). بەجۆرێك لێکدانەوە و بە هاناوە چوونێکی ئەوتۆ بەتایبەتی لەو ماوەیەدا کە ئاگری جەنگی دووەمی جیهانی ئەم ناوچەیە و ئەم وڵاتەشی گرتبووەوە، تاڕادەیەك وەرچەرخانێکی گەورەی بۆ ئەو دەمانە و لەو ڕۆژگارەدا لە سنووری گەرمیاندا هێناوەتە کایەوە، هەرچەندە ژمارەکانی ڕۆژنامەی: (باسەڕە) بە ڕادەیەکی زۆر کەم دەستی کۆمەلآنی خەڵك کەوتوون و بەشێوازێکی زۆر سنووردار و دیاریکراو سنوورەکەیان بەزاندووە و بلآو بوونەتەوە، هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەوە نەبووە، کە تەنها بەخۆی نووسین و بابەتی لە ڕۆژنامەی (باسەڕە)دا بلآو کردبێتەوە، بەڵکو ڕۆژنامەکەی بۆتە دەروازە و مینبەرێك بۆ ئەوەی گەلێك کەسایەتی و خەڵکی خوێندەواری دیاری ئەو دەمانەی ئەو شارۆچکەیە و دەوروبەری هاوکاری بەردەوامی بن و ناو بەناو لە ژمارەکانی ڕۆژنامەکە یان هەفتەنامەی (باسەڕە)ی سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا بابەت و نووسینی خۆیانی بە بەردەوامی تیا بلآوبکەنەوە لەوانە: ((مارف عەبدولکەریم، حوسێن عەبدولکەریم، مەلا ئەحمەد، ئیبراهیم ئەحمەد (قەلا مکائیل)، حەسەن محێدینی قەرەچێوار، عەبدولعەزیز قادرکەرەم و مەلا محەمەدی قەشقە))، بەزۆری لەوانەن کە لەچەند ژمارەیەکی ئەم ڕۆژنامەیەدا چەندین جار ناویان دووبارە بۆتەوە و گەلێك بابەتی جۆر بەجۆری کۆمەلآیەتی و وتار و کۆکردنەوەی بابەتی فۆلکلۆریی کوردییان بەهەموو بەشەکانیەوە تیا بلآو کردووەتەوە، سەرەڕای بلآوکردنەوەی هۆنراوە و شیعری زۆرێك لە شاعیرانی کورد و ناوچەکە لەوانە: (شێخ عەبدولکەریم – خادیم، شاکر فەتاح، حەسەن محێدین، حاجی قادری کۆیی، مارف عەبدولکەریم، فایەق بێکەس....تاد، بە جۆرێکی وا

ڕۆژنامەی (باسەڕە) هەرچەندە لە چوارچێوەیەکی زۆر سنووردار بلاّو کراوەتەوە و وەکو پێشتر ئاماژەی بۆ کرا زۆر بەکەمی دەستی کۆمەلاّنی خەلّك کەوتووە. بەلاّم وەکتر دەتوانرێت بۆ زۆر لایەنی مێژوویی و بارودۆخی کۆمەلاّیەتی و لێکۆلّینەوەکردن لەسەر ناوچەکە و ڕەوشی ناوچەکە بەهەموو بەشەکانیەوە بەتایبەتی لەو قۆناغە گرنگ و هەستیارەدا سوودی لێ وەربگیردرێت و کارئاسانیی پێویستمان بۆ بکات. بە تایبەتی بابەت و وتارەکانی وەك : (ناودارانی قادر کەرەم)، (نەوتی گل)، (زەماوەندی باخچەی گشت لاییی قادرکەرەم)، (زانستی گشت لایی) و (خوێندنگای شەوی قادر کەرەم)...تاد.

هەر دوابەدوای ئەوە و لەچەند سالّێکی دواتردا و لەماوەی پەنجاکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا وەك دەبینین ئەو بزووتنەوە ڕووناکبیری و ڕۆژنامەوانییە تا ڕادەیەك لە دەوروبەری شارۆچکەی (دەربەندیخان) و دواتر لە شارێکی ئاوەدانی وەك (خانەقین)ی ئەو کاتەدا بەرچاو کەوتووە، جگە لەوەی ئەمانە بۆ خۆیان لەو بلاّوکراوە و کاری ڕۆژنامەوانییش بوون کە دەکرێت وەك زمانحالّی ڕێکخراوە حیزبی و پیشەییەکان کە لەو شار و ناوچانەدا چالاکیی بەردەوامیان هەبووە باسیان لێوە بکرێت، بەتایبەتی لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا، وەك دەبینیت لە سالّی ١٩٥١ دا : (ڕێکخراوی جوتیاران)ی سەر بە حیزبی شیوعی عێراق لە ئاوایی (بانی خێلاّن)ی نزیك بە شارۆچکەی دەربەندیخانی ئەمڕۆ و هاوکات وەك زمانحالّی ڕێکخراوەکەیان گۆڤاری (دەنگی داس)یان بلاّو کردۆتەوە و ئەمەش بەزۆری بە سەرپەرشتی مەلا ئەحمەدی بانی خێلاّنی (١٩٢٥ – ٢٠١٣)[١٢] و هاوکاری ئەحمەد مەحموود حەلاق و حەسەنی مەلا عەبدولکەریم دەرچووە [١٣]، هەروەها ئەم بلاّوکراوەیە سەرەتا بە دەستخەتی هەریەك لە : مەلا ئەسعەدی مەلا قادری بانی خێلاّنی و حەسەنی مەلا عەبدولکەریم نووسراوەتەوە و پاشان بە ئامێری چاپ و ڕۆنیۆ لە شاری کەرکووك ڕاکێشراوەتەوە و ئینجا بەناو کۆمەلاّنی خەلّکدا بلاّویان کردۆتەوە، هەر بەپێی گێڕانەوەی مەلا ئەحمەدی بانی خێلاّنی وەك لە یادداشتەکانیدا هاتووە گۆڤاری :((دەنگی داس– صوت المنجل)) تا سەرەتاکانی سالّی ١٩٥٤ توانیویانە بە بەردەوامی بلاّوی بکەنەوە و تا ئەوکاتەی وەکو خۆی بۆی باس کردووین، لەبەر چەند هۆکارێك دواتر درێژە بە بلاّوکردنەوەی نەدراوە[١٤].

## تەوەری دووەم

## بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ و ڕەوشی ڕۆژنامەوانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی لە شاری خانەقیندا ١٩٥٨- ١٩٧٠

بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ لە وڵاتی عێراقدا کۆمەڵێك گۆڕانکاریی گەورەی بەدوای خۆیدا هێنایە کایەوە هەر لە چالاکیی کاری ڕێکخراوەیی و ئازادیی ڕۆژنامەوانی و چالاکیی ڕووناکبیری و سیاسیی جۆر بەجۆر، بەجۆرێك دەرئەنجامەکانیشی تاڕادەیەکی بەرچاو ناوچە کوردنشینەکانی باشووری کوردستانیشی گرتەوە. وەك ئەوەی لە ناوچەی گەرمیان و بەتایبەتی لە شارێکی وەك خانەقینی ئەو دەمانەدا و لە سەروبەندی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ بەدواوە و بە تایبەتی لە بواری چالاکیی ڕۆژنامەوانیدا، گۆڤارێکی خوێندکاری، کە کۆمەڵێك قوتابی و خوێندکاری کوڕ و کچی شاری خانەقین و دەوروبەری کە لەو کاتەدا لە دواناوەندی خانەقین (ثانویة خانقین) دەیانخوێند و بەزۆری سەر بە گردبوونەوەیەکی خوێندکاری (تجمع طلابي) بوون و تەنها کورسی خوێندن و قوتابخانە کۆی کردبوونەوە. لە دوای شۆڕشی ١٤ ی گەلاوێژی ١٩٥٨ ەوە هاتبوونە کایەوە بە ناوی : ((یەکێتی قوتابیانی دواناوەندی خانەقین — اتحاد طلبة ثانوية خانقين))ەوە، گۆڤارێکی مانگانەی (سیاسی – ڕووناکبیریی گشتی)یان بە ناوی گۆڤاری خەباتی قوتابیان واتە: ((نضال الطلبة))وە بەزمانی عەرەبی و لە دووتوێی (٣٦) لاپەڕەدا بڵاوکردۆتەوە، کەچی بەسەریەکەوە توانیویانە تەنها یەك ژمارەی لێ دەربکەن و بۆ مەسەلەی چاپکردنیشی ڕەنگە ئەمەیان تاقە گۆڤار و بڵاوکراوە بووبێت لە شار و ناوچەکانی دەوروبەریدا کە بتوانرێت بەشێوازێکی فەرمی ببرێتە شاری بەغدا و لە چاپخانەیەکی ناسراوی وەك (مەعاریف)ی ئەو دەمانەدا لەچاپ بدرێت و لە نێو دەستەی خوێندەوار و کۆمەڵانی خەڵکدا بڵاو بکرێتەوە[١٥].

وێڕای هەموو ئەوانەش لە ڕووی ناوەرۆکەوە (خەباتی قوتابیان) یەکێکە لەو گۆڤارانەی کە بایەخێکی بەرچاوی بە بواری سیاسی و هاوکات هاوخەباتی و برایەتیی نێوان گەلی کورد و عەرەبی داوە لە وڵاتی عێراقدا و ئەمەش لەسەر

لاپەڕەکانیدا بە ڕوونی بەرچاو دەکەوێت، وەك ئەوەی لـە بابـەتێکی سـەربەخۆدا و هـەر بەناونیشـانی برایـەتی کـورد و عـەرەب : ((الاخـوة العربیـة الکردیـة))وە کـە خوێندکارێکی قۆناغی پێنجەمی زانستی ئەوکاتەی دواناوەندی شاری خانـەقین کـە ناوی : (موەفەق سامی عەبدوڵڵای باجەڵان) بووە و لەساڵانی دواتریشـدا بـووە بـە مامۆستایەکی سـەرکەوتووی بابـەتی (کیمیـاء) لـە شـاری خانـەقین و ناوچـەکەدا، بـڵاوی کردۆتـەوە و بـەزمانێکی عـەرەبی زۆر پـاراوەوە ڕەخنـەی لـە هـەموو ئـەو بیروبۆچوونە شۆڤێنییانە گرتووە کە بوونەتە مایـەی لـێکترازان و دوورکەوتنـەوەی ئەم دوو نەتەوەیەی کە خواوەند بۆ خـۆی لـە ڕێگـای ئـایینی پـیرۆزی ئیسـلامەوە کـۆی کردوونەتـەوە و کردوونـی بـە بـرا، وەك ئـەوەی لـە بەشـێکی نووسـینەکەیدا هاتووە و ئاماژەی بۆ کردووە و دەنووسـێت : ((کـوردان وەك هـەر گـەلێکی تـری ئـازادیخواز خـاوەنی ڕابردوویـەکی شـکۆمەند و مێژوویـەکی پـڕ لـە سـەروەرین... خواوەندیش بۆ خۆی لەڕێگای کۆمـەڵێك پەیوەنـدی جـۆر بـەجۆرەوە لەگـەڵ گـەلی عەرەبدا کردوونی بە برای یەکتر لەوانـە مێـژوو و نیشـتمان، بەرژەوەنـدی پێکـەوە گرێدراو و پەیامی پیرۆز لە هەموو ڕوویەکەوە بەمەبەسـتی ئـازادکردنی نیشـتمانی زێڕینمان، سەرەڕای ئایینی پیرۆزی ئیسلام کە هەردوو گەلی عـەرەب و کـوردی لـە چوارچێوەی یەك شەریعەتدا کۆ کردۆتەوە... تاد))[١٦]. هەروەها دواتـر لەدرێـژەی نووسـین و بابەتەکەیـدا ڕەخنـەی لـە سـەردەمی فەرمانڕەوایـەتی عوسمـانی و بـەریتانیاش گرتـووە کـە لـە مـاوەی دەسـەڵات و فەرمانڕەوایەتیانـدا لـە عێـراق و ناوچەکەدا چییان بەسـەر گـەلی کـورد و عـەرەبی بـرادا هێنـاوە. ماوەتـەوە بڵـێین بـەزۆری ئـەو خوێنـدکار و قوتابیانەشـی کـە ڕۆڵـی بەرچـاویان هـەبووبێت لـە بڵاوکردنـەوە و دەرکردنـی گۆڤـاری :((نضـال الطلبـة — خـەباتی قوتابیـان))ی دواناوەندی شاری خانەقیندا بەزۆری پێك هاتبوون لە دەستە و توێژی خوێندکاران و کوڕانی وەك : ((سەلاح فەرمان، ڕامز سـامی عەبـدوڵڵا باجـەڵان، حەسـەن شـێخ موراد، عەلی جومعە چەرمەوەندی مەندەلاوی، سەلاح عەبـدولقادر، موحسـین شـێخ موراد زەنگەنە، عەبدولئیلا باقر، ئەسکەندەر ئەحمەد قۆڵچـی هەمەوەنـدی، نـەجم محەمەد ئەمین خەتات، ئەرجومەند زاهیـد باجـەڵان، قـادر شـێخ ڕەحـیم تاڵـەبانی (١٩٤٤ — ١٩٩٢)[١٧]، یەحیا محەمەد ڕەشـید جـاف و ئـەکرەم عەبـدولوەهاب مـەلا

عەزیز)). هەروەها لەخوێندکارانی کچیش بەزۆری ئەمانە بوونە: ((ڕافیدە ئەحمەد، زاهیدە خورشید زەهاوی، نەعیمە قەرەداغی و موحاسین زەینەل))[١٨].

هاوکات لەهەمان ساڵی ١٩٥٨ دا و هەر لە شاری خانەقیندا بڵاوکراوەیەکی تری ڕێکخراوی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)ی سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان بە ناوی (پرشنگ)ەوە و بە شێوەی دەستنووس لەلایەن چەند قوتابییەکی ئەودەمانەی وەك :((جەلال عەبدوڵڵا ئاغای باجەلان، حەسەن کەریم بەگی جاف و قادر شێخ ڕەحیم تاڵەبانی))یەوە دەرچووە، تەنانەت ئەمەی دواییان هەر لەو ماوەیەدا واتە لە ماوەی (١٩٥٨ – ١٩٥٩) سەرۆکی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووە لە سنووری شاری خانەقین و دەوروبەریدا، هەروەها یەکێك لەو بابەتانەشی کە لە بڵاوکراوەی (پرشنگ)دا بەرچاو کەوتبێت بریتی بووە لە نووسینێك کە لەلایەن : (جەلال عەبدوڵڵا ئاغای باجەلان) نووسراوە بەناونیشانی : ((شەوی ١٤ی تەمموز لە شاری بەغدا بووم))ەوە بڵاوی کردۆتەوە، ئەوەی شایانی باسکردن بێت بڵاوکراوەی (پرشنگ) تەنها یەك ژمارەی لێ دەرچووە و جگە لەوانەش بەچەند ساڵێك دواتر و بەتایبەتی لەساڵی ١٩٦١دا هەریەك لە : ((ئەحمەد ڕەجەب زەنگەنە کە ئێستا لە ئەوروپا دەژی و ئیبراهیم محەمەد کەریم باجەلان)) بڵاوکراوەیەکیان بە ناوی (الخرير) واتە (هاژە)وە، لە دووتوێی (٤) لاپەڕەدا بڵاوکردۆتەوە و، بە سەریەکەوە توانیویانە تەنها سێ ژمارەی بە زمانی عەرەبی لێ بڵاو بکەنەوە و ئەم بڵاوکراوەیەش جیاواز لەوانی دی زیاتر لەژێر کاریگەری و هەوادارییەکی (شۆسیالیزمی – الاشتراكية)دا بووە و دەستاودەست گەیشتۆتە نێو خوێنەران و کۆمەڵانی خەڵك لەو دەمانەدا[١٩].

دوای سێ ساڵ لەماوەی پێشوو هەر لە شاری خانەقیندا و بەتایبەتی لە مانگی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٦٤ ەوە (یەکێتی قوتابیان)ی سەر بەحیزبی شیوعی عێراقی لە شاری خانەقین، لەڕێگای چەند لاوێکی ئەو دەمانەیەوە کە لە ڕیزەکانی حیزبی شیوعیدا ئەندام بوون، ئەمانیش وەك قوتابیانی دواناوەندی خانەقین گۆڤارێکیان هەر بەناوی (نضال الطلبة)وە واتە: (خەباتی قوتابیان)ەوە و بە قەبارەی (١٢) لاپەڕەی تەواو و لەژێر دروشمی: (الطلبة زهور على صدور

العمال)دا بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی دەرکردووە و یەکێکی دی لەو دروشمانەی کە لەسەر لاپەڕەی یەکەمی هەموو ژمارەیەکی (خەباتی قوتابیان)دا بلاّو کرابێتەوە پێك هاتووە لە وێنەی کوڕ و کچێك، کوڕەکەیان مەشخەڵی ئازادی بەرز کردۆتەوە و دووەمیان : واتە کچەکەشیان کتێبێك لە بندەستیدایە و بەزۆری ئەوانەشی کە ڕۆڵی سەرەکییان لە دەرکردن و بلاّوکردنەوەی ئەم گۆڤارەدا هەبوو بێت کە بە شێوازێکی نهێنی و لەسەر لاپەڕەی زۆر شەفاف و بەدەستنووس بلاّو کراوەتەوە، بریتی بوون لە ڕووناکبیر و کەسانی وەك :((حەسەن ئەڵلاّ وەخش، ئیبراهیم محەمەد کەریم باجەلاّن (١٩٤٤)[٢٠]، عەزیز محەمەد شەریف و محەمەد عومەر سلێمان زەهاوی))، ئەم گۆڤارەی تری شاری خانەقین، بە تەرزی ئەوانی دی توانراوە چەند ژمارەیەکی سنوورداری لێ بلاّو بکرێتەوە کە تەنها بریتی بووە لە (٤) ژمارە و بەتێکڕایی و بە سەریەکەوە توانراوە هەر چوار ژمارەکەی، بۆ هەر ژمارەیەکی نزیکەی (٤٠– ٥٠) دانەی لێ بلاّوبکرێتەوە و بگەیەنرێتە دەستی خوێنەر، بەلاّم وەکتر لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٦٤ ەوە، بەپێی بڕیارێك کە لەلایەن (حیزبی شیوعی عێراق)یەوە و بۆ پاراستنی نهێنی ئەندامەکانی حیزب، بەتایبەتی لە شاری خانەقین و دەوروبەریدا، نەتوانراوە درێژە بەدەرکردن و بلاّوکردنەوەی گۆڤارەکە بدرێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ژمارەکانی جگە لە بابەتی سیاسی و سەروتاری بلاّوکراوەکە خۆی کە بە ناونیشانی :((لەم ژمارەیەدا – في هذا العدد))دا بووە، چەندین شیعری دانسقەی شاعیرانی گەورەی عێراقی وەك : محەمەد مەهدی جەواهیری (١٨٩٩– ١٩٩٧) و عەبدولوەهاب ئەلبەیاتی (١٩٢٦ – ١٩٩٩) لە بەشە عەرەبییەکەیدا و هەروەها لە بەشە کوردییەکەشیدا کە گۆشەیەکی تایبەت بووە بەناوی :((کاروانی شیعر))ەوە و شیعر و هۆنراوەی شاعیرانی کوردی وەك عەبدوڵلاّ گۆران (١٩٠٤– ١٩٦٢) و ئەحمەد دڵزار (١٩٢٠) ی شاعیر و سیاسەتمەدار لەسەر لاپەڕەکانیدا بەرچاو کەوتوون، جگە لەوانەش گۆشەیەکی تری تایبەتی تیا بلاّوکراوەتەوە بە ناونیشانی: ((لە هەر باخچەیەك گوڵێك – من كل بستان زهرة))، سەرەڕای ئەوەش بەشێك لە ژمارەکانی لەڕێگەی کەسێکی وەك (نەسرەدین مەجید دەلۆ)وە کە لە ڕیزەکانی ئەوکاتەی حیزبی شیوعیی عێراقدا نازناوی :(مەلا محەمەد) بووە

گەیەنراوەتە ناو شۆڕش و هێزی پێشمەرگەی کوردستان، بەتایبەتی بۆ ناوچەی گەرمیان و دەوروبەری (خۆرنەوەزان) و هەروەها بەشێکی تری گەیشتۆتە شاری بەغدا و بەتایبەتی: (ئامادەیی فەیلی) و لەوێشەوە لە ڕێگای لاوێکی کاکەییەوە کە ناوی فوئاد عەباس بووە گەیەنراوەتە شاری نەجەفی ئەودەمانە، لەگەڵ ئەوەشدا (خەباتی قوتابیان – نضال الطلبة) بۆ خۆی یەکێك بووە لەو گۆڤار و بلاّوکراوانەی کە لەسەر زۆربەی لاپەڕەکانی خۆیدا هەواڵی جۆر بەجۆری ناوچەکەی وەك زوڵمی حەرەس قەومی لە کۆمەلاّنی خەڵك و لە گۆشەکانی: بینیم و بیستمی گۆڤارەکەدا بلاّوکراونەتەوە، سەرەڕای ڕووماڵکردنی چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەی حیزبی شیوعی عێراق، دژی ڕژێمی ئەو کاتەی عێراق بلاّوکردۆتەوە و وەك هەواڵی گەرم و گوڕی ئەو دەمانە بایەخی تایبەتی پێ داون، بە زۆری ئەو پەیامنێرانەشی کە بە بەردەوامی هەواڵی بایەخداریان بە(خەباتی قوتابیان) گەیاندبێت و بلاّویان کردبێتەوە، هەردوو لاوی چالاکی ئەودەمانەی وەك: ((محەمەد خدر سلێمان و ئەکرەم عەلی قەساب بوون)). تا ئەوکاتەی لەنێوان سالاّنی (١٩٦٥ – ١٩٦٦) دا بلاّوکراوەیەکی تری دەستنووس کە تەنها دوو ژمارەی بە (١٦) لاپەڕەی تەواو و دووبارە هەر لە شاری خانەقیندا، بەناوی (الثقافة)وە لێ بلاّوکراوەتەوە و ئەمەش بەزۆری لەلایەن دەستەیەك لە ڕووناکبیران و نووسەرانی ئەو دەمانەی وەك :((جەلال حوسێن وەردە (زەنگابادی)[٢١]، ئیبراهیم محەمەد کەریم باجەلاّن، وەلید جەعفەر ڕەسام و زەینەبی مەلا تۆفیق))ەوە و بەزمانی عەرەبی بلاّویان کردۆتەوە، هاوکات بەزۆری هەر خۆشیان بابەت و نووسینیان تیایدا بلاّو کردۆتەوە، بەلاّم وەك لایەنی هەواڵ و ڕاپۆرتی هەستیار کچە ڕۆژنامەوانێکی ئەوکاتەی وەك زەینەبی مەلا تۆفیق جگە لەوەی بەناوی تەواوی خۆیەوە لە بلاّوکراوەی (الثقافة)دا دەینووسی، لە هەمان کاتیشدا بۆ هەندێك بابەت و ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەوانیی هەستیار کە خۆی حەزی نەکردبایە ئەوەیان لە نووسینی ئەو بێت، ئەوا بەناوی خواستراوی : ((الجاسوسة الحسناء))ەوە دەینووسی و ئینجا بلاّوی دەکردەوە[٢٢].

بەڕادەیەك ئیدی لەم ماوەیە بەدواوە و بەپێی زانیاریی ئێمە سۆراغی هیچ گۆڤار و ڕۆژنامە و بلاّوکراوەیەکی تر لە سنووری شاری خانەقین و دەوروبەریدا

بەرچاو ناکەوێت، هەر ئەوەیان نەبێت لە کاتی ڕێککەوتننامەی ١١ ی مارتی ساڵی ١٩٧٠ بەدواوە و بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٧٢ دا دەستەیەك لەوانەی کە پێشتر بەکاری سیاسی و چالاکیی ڕۆژنامەوانییەوە سەرگەرم بوون، توانیویانە ڕێکخراوێکی ڕووناکبیری بەناوی : ((کۆمەڵەی ڕووناکبیری خانەقین – الرابطة الثقافية في خانقين)) دابمەزرێنن و دەستەی دامەزرێنەریشی بەزۆری ئەمانە بوون : ((ئیبراهیم محەمەد کەریم باجەلان، مەجید کەریم ئەحمەد، مەجید ئیبراهیم ڕەزای خانەقینی (١٩٤١– ٢٠٠٨)، مەلا موحێدین دای زادە، فازیل کەریم ئەحمەد، عەبدولستار ڕەشید خالیدی، جەلیل محەمەد عەلی بەگ (١٩٤٣ – ٨/٦ / ٢٠٠٩)، ئەحمەد شێرزاد (ڕەشپۆش)، کەریم سۆران کۆیی (ئەبو کارسان) و ئەحلام مەنسوور (١٩٥١ – ٢٠١٣)[٢٣] ی چیرۆك نووس. بە زۆری چالاکییان بریتی بووە لە کۆڕی هەفتانە و خوێندنەوەی دەقی نوێ لە شیعر و چیرۆك و ڕەخنە لێگرتنی، لێرەش بەدواوە بە زۆری نووسین و بابەتی خۆیان لەو گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و عەرەبییانەدا بڵاو کردۆتەوە کە لە شاری بەغدا و لە دەرئەنجامی بەیاننامەی ١١ مارتی ساڵی ١٩٧٠ و ئاگربڕی نێوان حکومەتی عێراق و سەرکردایەتی شۆڕشی کورددا دەردەچوون، سەرەڕای پێکهێنانی ئەو بەرەیەش کە لە نێوان حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی و حیزبی شیوعی عێراقیدا لە ساڵی ١٩٧٣دا هاتە کایەوە بەوەی کە ئەمانیش گۆڤار و ڕۆژنامەی خۆیان هەبوو و زۆرێك لە ڕووناکبیرانی کوردیش لە ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانی حیزبی شیوعیی عێراقیدا کاریان دەکرد و نووسین و بابەتی خۆیان بڵاو دەکردەوە [٢٤].

## تەوەری سێیەم

## ڕۆژنامەوانیی کوردی لە سنووری شاری کەلار و کفریدا ١٩٦٢- ١٩٧٢

ئەمە و لەکاتێکدا کە دووبارە دەگەڕێینەوە بۆ ناوەندی گەرمیانی ئەو دەمانە و بەتایبەتی سنووری شاری کەلار، لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەمی رابردووەوە، دەبینین بزووتنەوەیەکی تری بڵاوکراوەیی و تاڕادەیەك ڕۆژنامەوانی هەبووە و بە زۆری بە تیراژێکی تاڕادەیەك زۆر کەم و زۆربەشیان بەشێوەی دەستنووس و لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو و سنووردارداا دەستاو دەست بڵاو کراونەتەوە، تەنانەت بە هۆی بارودۆخی ئەو دەمانەی باشووری کوردستان و هۆیەکانی هاتوچۆ و ئەو ڕەوشە کۆمەڵایەتی و ئاستە هۆشیارییەی کە لەو دەمانەدا هەبوون، بڵاوکراوە و هەفتەنامە و ئەوانەیشی کە ناو بەناو دەردەچوون، سنووری ناوچەکەیان بەڕادەیەکی زۆر کەم نەبێت، نەتوانیوە ببەزێنێت، سەرەڕای ئەوەش وەك پێویست ناوەندێکی ئەوتۆی بەڵگەنامەیی و ئەرشیفی نەبووە، کە بتوانرێت نموونەیان لێ بپارێزرێت و ئەرشیف بکرێت، تا لە ئایندە و لە داهاتوودا بۆ لێکۆڵینەوەکردن و کاری ڕۆژنامەوانی سەبارەت بەم ناوچەیە و مێژووی ئەم ناوچەیە سوودیان لێ وەربگیردرێت. وەك ئەوەی فەرهاد شاکەلی (١٩٥١)[٢٥] لەم بارەیەوە وای دەگێڕێتەوە : ((لە سەرەتای منالێمەوە بووبوومە ئاشنای ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی لەو سەردەمانەدا بڵاو دەکرانەوە. باوکم ئەندامێکی چالاکی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. کاتێ مەلا مستەفای بارزانی لە پاییزی ١٩٥٨ دا لە سۆڤێت گەڕایەوە، خەڵکی کوردستان دەستە دەستە دەچوونە سەردانی بۆ بەخێرهاتنەوەی. باوکم لە ناو ئەو وەفدەدا بوو کە لە گەرمیانەوە (یا بەناوی کفرییەوە) چوون بۆ لای بارزانی. هەر لە ساڵی ١٩٥٩وە باوکم ئابوونەداری ڕۆژنامەی (خەبات) بوو پێشتریش گۆڤارەکانی (هیوا) و (هەتاو)ی بۆ دەهاتن سەرەڕای گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) هەفتەنامەی (کوردستان) ئەم هەلومەرجە فەرهەنگییە کارکردێکی زۆری لەسەر من هەبوو لە بەهاری ساڵی ١٩٦٢ یا ١٩٦٣ کە هێشتا نەگەیشتبوومە تەمەنی دوازدە ساڵان دەستم کرد بەنووسینی (ڕۆژنامەیەك) و ناوم نابوو (لادێ) ئەگەرچی ناوی ڕۆژنامە بوو، بەڵام هەفتەی دوو

سێ دانەیەکم لێ بڵاو دەکردەوە. هێندەی لە بیرم بێ سەرجەم (٥٠ — ٦٠) ژمارەیەکم لێ بلاو کردەوە. ڕۆژنامەکە لە یەك پەڕە کاغەز پێك هاتبوو، واتە دوو لاپەڕە، کە لە دەفتەری نووسینی خوێندنگەکەم دەمدڕی و لە سەری دەمنووسی))[٢٦]. جگە لەوەش فەرهاد شاکەلی لە بارەی ناوەرۆك و ئەو بابەتانەوە کە لە ڕۆژنامەی (لادێ)دا بڵاوی کردۆتەوە زۆر بە ئەمانەتەوە دەنووسێت : ((ناوەرۆکەکەشی زیاتر دەنگوباسی ماڵی خۆمان و هەندێکیش دەنگوباسی گوندەکانی سەیدە و شاکەل و دێینە. لەوەیش زیاتر هەندێ قسەی سیاسی و کوردایەتیم تێدا دەنووسی، وەك بژی کوردستان، چەند جارێکیش بە خەتێکی گەورە دەمنووسی: (ئازادی بۆ عوسمان سەبری و هاوڕێکانی) ئەمە لاساییکردنەوەی ڕۆژنامەی (خەبات) و (ڕۆژی نوێ) بوو کە بەهۆی گیرانی هەندێ تێکۆشەری کوردی سووریاوە لەلایەن ڕژێمی ئەوسای سووریاوە دەیاننووسی)) بە جۆرێك ئەم ڕۆژنامە دەستنووسە و لەلایەن فەرهاد شاکەلییەوە، لە گوندی شاکەلی ئەودەمانەدا تا ساڵی ١٩٦٣ بەردەوام بووە[٢٧].

سەبارەت بەساڵی دواترو دوای وەستانی ڕۆژنامەی دەستنووسی (لادێ) فەرهاد شاکەلی باس لەوەش دەکات کە لە بەهاری ساڵی ١٩٦٣ دا کەوتۆتە بڵاو کردنەوەی گۆڤارێکی دەستنووسی تر بەناوی (بەهار)ەوە و ژمارەی لاپەڕەکانی نزیکەی (١٠— ١٢) لاپەڕە بووە، لەبارەی ناوەرۆك و بابەتەکانییەوە دەڵێ : ((زۆربەی بابەتەکان خۆم دەمنووسی وەك لاساییکردنەوەی گۆڤاری کوردی ئەو سەردەمە لە هەموو ژمارەیەکدا گۆشەی (بۆ پێکەنین)، (ئایا دەزانیت) و دەنگوباس و شتی لەو بابەتەی تێدا بوو))، هاوکات باس لەوەش دەکات کە (٣ — ٤) ژمارەی لێ بڵاو کردۆتەوە و یەك دوو ژمارەیەکیشی کەوتۆتە هاوینی ساڵی ١٩٦٣وە کاتێك :((بەعس هێرشێکی سەختی کردە سەر کوردستان هەندێ لە نووسینەکان لەبەر ئەوە سیاسی بوون. دەنگوباسی گوندەکانی گەرمیان (بەتایبەتی بۆردومانی گوندی ژاڵەی حاجی قادر لە دەنگوباسە گرنگەکان بوو))، لە بارەی ئەوانەشی کە بەزۆری یارمەتییان دابێ و بە بەردەوامی پشتگیرییان لێ کردبێت کە لەسەر ئەم چالاکییەی بەردەوام بێت بەزۆری ئەو کادیر و پێشمەرگانە بوون کە بە گوندەکانی گەرمیاندا لە جەولەکردنی بەردەوامدا بوونە وەك ئەوەی

لەم بارەیەوە و لەدرێژەی دەستنووسەکەیدا ئاماژەی بۆ کردووە : ((ئەو بەهار و هاوینە کادیرانی پارتی بە گوندەکاندا دەگەڕان و خەڵکیان بۆ پارتی ڕێکدەخست. دوو لەو کادیرانە زۆر پشتگیری منیان دەکرد و هانیان دەدام بۆ بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانم: مەلا یاسین کە چەمچەماڵی بوو، هەروەهایش عەبدوڵڵای بابا عەلی کە بە ناوە حیزبییەکەی بە (نالە) ناسرابوو. ئەوان کاغەز و قەڵەم و مەرەکەبیان دەدامێ و ژمارەکانیان دەخوێندەوە و پێشنیازی چاککردن و پێشخستنیان بۆ دەکردم))[٢٨].

بە ماوەیەك دوای فەرهاد شاکەلی و بە هەمان تەرز، لەتیف هەڵمەت (١٩٤٧)[٢٩] ی شاعیر لە شاری کفریدا و لەنێوان ساڵانی (١٩٦٧– ١٩٦٨) دا گۆڤارێکی دەستنووسی بەناوی (گۆڤاری بەرزنجە)وە لە شاری کفریدا بڵاوکردۆتەوە و بە زۆری ئەمیش پێك هاتووە لە گۆڤارێکی ڕووناکبیریی گشتی و بەسەریەکەوە توانیویەتی زیاد لە (١٥) ژمارەی لێ دەربکات، ئەوانەشی کە لەو بڵاوکراوە یان (گۆڤاری بەرزنجە)دا بابەت و نووسینی خۆیانیان بۆ ناردبێت و هاوکاری بڵاوکردنەوەی بووبێتن بە زۆری کەسانی وەك : ئەحمەد شاکەلی، لەتیف هەڵمەت و فەرهاد شاکەلی (ئەنوەر شاکەلی) بوون و تەنانەت لە نامەیەکی دەستنووسیدا کاك ئەنوەر شاکەلی کە لە ٢ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٧ دا بۆ: ((گۆڤاری بەرزنجە)) و لەتیف هەڵمەتی شاعیری نووسیوە و بە لەتیف مەحموود محەمەد بەرزنجی ناوی هێناوە و تائێستا بە پارێزراوی لە ئەرشیفی لەتیف هەڵمەتدا ماوەتەوە، ناوەڕۆکەکەی سەبارەت بە(گۆڤاری بەرزنجە)یە و بە بۆنەی دەرچوونیەوە پیرۆزبایی و دەستخۆشی لێ کردووە[٣٠].

هاوکات ئەحمەد شاکەلیش کە لەو دەمانەدا خوێندکاری: ((پەیمانگە و خانەی مامۆستایانی سەرەتایی– کەرکووك – معهد و دار المعلمین الابتدائیة / کرکوك)) بووە، لە نامەیەکی دەستنووسیدا کە لە ١٨/ ١١/١٩٦٨ دا لە شاری کەرکووکەوە بۆ لەتیف هەڵمەتی ناردووە، بەهەمان شێوە، سەبارەت بە گۆڤاری بەرزنجە و بۆ لەتیف هەڵمەت دەنووسێت وەك لە بڕگەیەکیدا هاتووە: ((گۆڤارەکەت گەیشت بەڵێ دڵشادم کە ئەوەندە ئازای بە بێ ترس ئەڵێی : لە خۆشی کوردایەتی لە کانگای خەباتەوە....تاد)). پاشان لە درێژەی نامەکی تریدا و هەر بۆ لەتیف

هەڵمەتی شاعیر و خاوەنی گۆڤاری بەرزنجە دەنووسێت : ((نامەی وێژەیی نە گۆڤارەکەی تۆیە و نەدێڕەکانی من بەڵکو ئەبێ دوور بێ لە وشەی ئینشائی)). دوا بەدوای ئەمە و لەبڕگەی نامەیەکی تریشیدا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت و ئەوە روون دەکاتەوە بەوەی کە : ((تۆش باوەڕت بەوە هەیە کە وێژەکەمان دواکەوتووە چونکە ئەڵێی: سأظل انتظر میلاد زرادشت ثاني. لیوقد النیران في تلك المعابد المندثرة ولیکمل کتابه الخالد (ئاوێستا) لکي یصل الادب الکردي الی السواحل التي بلغتها الآداب العالمیة))[٣١].

هاوکات لەتیف هەڵمەتی شاعیر وەك وەلامدانەوەیەك کاتێك بۆ ئەحمەد شاکەلی دەنووسێت، بەهەستێکی کوردانەوە ئەڵێت: ((برای بەڕێزم کاك ئەحمەد شاکەلی: ئەبێ ئەوە بزانی، ڕق و کینە ئاگرێکە هەموو جوانییەك ئەسووتێنێ، پێویستە لە پەرستگای خۆشەویستییا بە ئاوازی خۆشەویستی بیکوژێنینەوە.. پێویستە دڵمان پڕکەین لە خۆشەویستی.. خۆشەویستی ئالای منە...برایەتی بەستەی منە...کوردایەتی ڕێگای منە...مرۆڤایەتی مەبەستی هەمیشەییمە.......٢٩/١١/١٩٦٨))[٣٢].

هەر لە هەمان ماوەشدا و لە نێوان سالآنی (١٩٦٦ – ١٩٦٧) دا لە گوندی (دێبنە)ی نزیك بە شاری کەلاری ئەمڕۆ هەر مامۆستا ئەحمەد شاکەلی (١٩٤٨)[٣٣] وەك خۆی باسی لێوە دەکات، بلأوکراوەیەکی دەستنووسی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بە ناوی (هەللولیا)وە بلأوکردۆتەوە، ناوەکەشی لە ناوی وشەیەکی سەرنجراکێشی ناو ڕۆمانێکی بیانییەوە وەرگیراوە کە لەو دەمانەدا ئەوان خوێندوویانەتەوە کە بەمانای (بەخێرهاتن) هاتووە و تێکڕای ژمارەی لاپەڕەکانی بلأوکراوەی (هەللولیا) کە لە نێوان (٤ – ٨) لاپەڕەی مام ناوەنجیدا بووە و نزیکەی (٨) ژمارەی دەستنووسی لێ بلأو کراوەتەوە، بەلأم لەبارەی ئەوانەشی کە بەزۆری لەم بلأوکراوەیەدا نووسینیان بلأو کردبێتەوە، هەر ئەحمەد شاکەلی دەڵێت: ((هەموو شاکەلییەکان تیایدا دەماننووسی)) بەتایبەتی هەریەك لە: ((ئەمجەد شاکەلی و شێخ محەمەدی شێخ ئەحمەد شاکەلی))، جگە لەوەش بە زۆری دەنگوباس و هەواڵی ناوچەکە و بارودۆخی کشتوکاڵ و قسەکردن لەسەر مەسەلەی کوردایەتی و باسکردنی ئەزموون و تەجروبەی کەسایەتی و نووسەرە

جیهانییەکان لەوانە: ژیان و سەربردەی نووسەری ناسراوی فەرەنسی ئەلان دیلۆن (alan delon)، شۆڕشگێڕی ناسراوی وڵاتی کوبای بە ڕەسەن ئەرجەنتینی کە ئەوان زۆر پێی کاریگەر و سەرسام بوون واتە ئەرنستۆ ئەرنستیکۆ گیڤارا – تشێ گیڤارا (١٩٢٨/٦/١٤ – ١٩٦٧/١٠/١٩)، هەروەها زۆرێك لە کەسایەتی و نووسەرە کوردەکان لەوانە شاکر فەتاح، وێڕای بایەخدان بە مێژووی شارەکان بەتایبەتی شارە کوردییەکان لە وانە شاری خانەقین کە لەیەکێك لە ژمارەکانیدا بایەخێکی بەرچاومان پێ دابوو سەرەڕای گەلێك بابەتی دی کە بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی لە بلاوکراوەی (هەللولیا)دا دەخوێندرانەوە، شان بەشانی ئەوانەش بایەخدان بە گۆشەی تایبەتی لەوانە: ئایا دەزانیت ؟ پاشان بلاوکردنەوەی وێنەی کاریکاتێری جۆربەجۆر کە هەر بەدەست دەکێشران و دواتر لە زۆربەی ژمارەکانیدا بلاو دەکرانەوە....تاد. کەچی بلاوکراوەی دەستنووسی: (هەللولیا) وەك ئەوەی ئەحمەد شاکەلی باسی لێوە دەکات و دەڵێت : بەداخەوە کۆتاییەکی زۆر تەراژیدی و ناخۆشی هەبوو، بۆ ئێمەی لاو کە هێشتا تازە بوو دەستمان دابووە نووسین و ناو بەناو بلاوکردنەوە، بەوەی هەموو ژمارەکانی بە ئاگاداری نووسەر کاك ئەمجەد شاکەلی و بە بەرچاوی هەردووکمانەوە، لەلایەن کەسێکی بەتەمەنتر و بە ساڵاچووتری ئەو کاتەوە کە ئەمان وەك دوو لاوی ئەو دەمانە زۆر ڕووی چەندوچوون کردنیان لەگەڵیدا نەبووە و تەنانەت ئێستاش حەز بەناوهێنانی ناکەن، کۆکراوەتەوە و لە سووچی دیوارێکی گوندی شاکەلدا بە تەڵە شقارتەیەك کراوەتە خۆراکی ئاگردان و سووتێنراوە[٣٤].

جگە لەو بلاوکراوەیەی سنووری کەلاری ئەوکاتە لە ساڵی (١٩٦٨) دا گۆڤارێکی تری ڕووناکبیری گشتی بەناوی (شەپۆلەکان)ەوە و لە شاری کفریدا بەشێوازی دەستنووس کە تەنها دوو ژمارەی لێ بلاوکراوەتەوە و بە زۆری بە دەستخەتی سیروانی حاجی ئەمین ڕەباتی کە ئێستا لە ئەوروپا ئەژی نووسراونەتەوە، لەم ماوەیەدا دەرچووە، بە پێی گێڕانەوەی لەتیف هەڵمەتی شاعیر ژمارەی یەکەمی تەنها (٣٠) دانەی لێ بلاوکراوەتەوە و تا ڕادەیەك توانراوە بە شار و ناوچەکەدا دەستاو دەست بلاو بکرێتەوە، ئەوانەشی کە بە زۆری نووسین و بابەتی جۆربەجۆری ڕووناکبیریی خۆیانیان تیا بلاو کردبێتەوە بە

زۆری بریتی بوون لە لاوان و ڕووناکبیرانی ئەو ماوەیەی وەك :((کەنعان مەدحەت، عەلی عەبدوڵلا ئەحمەد، لەتیف هەڵمەت، غازی سالاری کاریزی کە ئێستا پارێزەرە، محەمەد داماو)). بەلاّم ئەمەی دواییيان لەو ماوەیەدا بەناوی محەمەد بێ کراس (١٩٤٧– ٢٠٠٥)[٣٥]ەوە دەستی داوەتە نووسین و ناو بەناو بلاّوکردنەوە. لە ڕووی نووسین و ناوەرۆکیشەوە لەتیف هەڵمەت دەڵێت: ((وتار و نووسین بوو، شیعر بوو، لێکۆڵینەوە بوو، نوکتە بوو، گۆوارێکی هەمەڕەنگ بوو، تەنانەت هەندێ پارچە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیشمان تێ ئاخنی بوو))[٣٦]. بۆ ساڵی دواتریش واتا لە ساڵی ١٩٦٩دا و هەر لە شاری کفریی ئەو کاتەدا، گۆڤارێکی تری دەستنووس کە لە قەوارەی دەفتەرێکی (٣٠) لاپەڕەییدا بووە و بەناوی (باوە شاسوار)ەوە بلاّو کراوەتەوە، بەسەریەکەوە توانراوە تەنها (٢– ٣) ژمارەی لێ دەربکرێت و لەلایەن چەند شاعیر و ڕووناکبیرێکی لاوی خوێندەواری وەك: ((فەرهاد شاکەلی، لەتیف هەڵمەت و کەنعان مەدحەت، عەبدوڵلا سابیر، عەلی عەبدوڵلا ئەحمەد، محەمەد ئەحمەد ڕەشید (داماو)..))ەوە بلاّو کراوەتەوە، بەڕادەیەکی زیاتر ئەمەشیان بریتی بووە لە گۆڤارێکی ئەدەبی، ڕووناکبیری گشتی و بەزۆری هەر خۆیان نووسین و شیعر و بابەتیان تیا بلاّو کردۆتەوە بۆ نموونە: لە ژمارەی یەکەمیدا و وەکو خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە، نووسینێکی لەتیف هەڵمەتی شاعیری تیا بلاّو کراوەتەوە بە ناونیشانی: ((ئەدەب بۆ ئەدەبە و هونەر بۆ هونەر))، سەرەڕای شیعرێکی غازی سالاری کاریزی وەکو خۆی دەڵێت: زیاتر شیعرێکی ستوونی سیاسی بووە و پاش ئەوەی لەتیف هەڵمەت سووکە دەسکارییەکی کرد ئەوجا لە گۆڤاری (باوە شاسوار)دا بلاّو کرایەوە[٣٧]. بەلاّم دکتۆر کەنعان مەدحەتیش بەزۆری بە بلاّوکردنەوەی شیعر نووسینی لە (گۆڤاری باوە شاسوار) بلاّو کردۆتەوە[٣٨]. هەر وەك خۆشی لە پێشەکی دیوانە شیعری: ((گەڕان لە بەهجەت حیکمەت)دا ناوی گۆڤاری باوە شاسواری هێناوە و خۆشی نووسینی تیا بلاّو کردۆتەوە[٣٩]. هەروەها دکتۆر کەنعان لە بارەی گۆڤاری باوە شاسوارەوە دەڵێت : تا ئەم ساڵانەی دواییەش کە لە ولاّتی ڕۆمانیا بووم، ژمارەیەکی گۆڤاری باوە شاسوارم بە پارێزراوی لا مابوو، تەنانەت لەو کاتەشدا کە بە دەستنووس بلاّومان دەکردەوە، کەوتینە هەوڵی ئەوەی لەلایەن حکومەت

و دەزگا پەیوەندداره‌کانی میرییەوە بە شێوازێکی فەرمی ڕێگەمان پێ بدرێت بۆ ئەوەی ژمارەی تری بەدوادا بێت و بلاو بکرێتەوە[٤٠]. ئەوە بوو ویستمان لە ڕێگای هەریەك لە جەلالی میرزا کەریم و عەبدوڵلاّ عەباسەوە کە ئەوکاتە ئەوان لە شاری بەغدا بوون لە حکومەت ئیجازەی بلاوکردنەوە بۆ گۆڤاری (باوە شاسوار) وەربگرین و ئەم هەنگاوە بهێنینە جێ، کەچی بە پێچەوانەوە لەسەر دواکارییەکەمان ڕازی نەبوون و ئێمەش نەمانتوانی درێژە بەبلاوکردنەوەی بدەین[٤١].

دوا بەدوای ئەوانە و هەر لەساڵی (١٩٦٩)دا هەریەك لە فەرهاد شاکەلی و محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق لە دواناوەندی شاری کفری دوو بلاوکراوەی سەر دیوار واتا (نشرة جدارية)یان بلاوکردۆتەوە، ئەوەی فەرهاد شاکەلی بەناوی (جیکۆر)ەوە بووە و تەنها یەك ژمارەی لێ دەرکردووە و بەزۆری بۆ بابەت و وتار و نووسینی ئەدەبی تەرخان کرابوو، ناوەکەشی بەناوی ئەو (گوند)ەوە بووە کە شاعیری عەرەبی عێراقی بەدر شاکر ئەلسەیاب (١٩٢٦– ١٩٦٤) تیایدا هاتۆتە دونیاوە، لە پارێزگای بەسرە، بەلام ئەوەی دواییان، کە محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق دەری کردووە، بەناوی (الكواكب)ەوە، بەسەریەکەوە بلاوکراوەیەکی، ئەدەبیی هەمەجۆر و تێکەڵ بووە و تەنها دوو ژمارەی لێ دەرکردووە، بەناونیشانی: (الكواكب الاولى) و (الكواكب الثانية)، تەنانەت بۆ درێژەدان و بەوەی لە داهاتوودا ژمارەی تریشی بە دوادا بێت داواکارییەك لە ڕێگای بەڕێوەبەرێتی دواناوەندیی کفرییەوە دراوەتە: ((بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کەرکووك))ی ئەوکاتە بۆ ئەوەی لەو بارەیەوە ڕەزامەندی دەرببڕێت، ئەوانیش هەرچەندە هەنگاوێکی لەم بابەتەیان پێ خۆش بووە، وەك چالاکییەکی قوتابیان لەو کاتەدا. بەلام وەکتر وایان بەباش زانیوە کە بە شێوازێکی تاکە کەسی نەبێت، بەڵکو وەك پرۆژەیەکی هەرەوەزی بێت و کۆمەڵێك قوتابی ڕۆڵیان هەبێت لە دەرکردن و بلاوکردنەوەیدا[٤٢].

لە ساڵی (١٩٧٠)یشدا هەر فەرهاد شاکەلی بلاوکراوەیەکی تری ئەدەبی سەردیواری بە ناوی (گیڤارا)وە بلاو کردۆتەوە، یەکێك لە بابەتە بلاوکراوەکانی وەك لەتیف هەڵمەتی شاعیر باسی لێوە دەکات، چاوپێکەوتنێکی ئەدەبی و شیعری بووە لەگەڵ ئەودا، بۆ نموونە لە پرسیارێکدا کە ئاڕاستەی کراوە

نووسراوە: (شیعری کوردی چۆن دەبینیت؟)، ئەمیش لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا وتوویەتی: کورد شیعری نییە، تا دیوانەکەی من دەرنەچێت، واتا مەبەستی لەتیف هەڵمەت لە دیوانی (خوا و شارە بچکۆلەکەمان) بووە، کە بە ماوەیەك دواتر و هەر لە ساڵی (١٩٧٠) دا لە چاپخانەی (الشمال) لە شاری کەرکووك بەچاپی گەیاندووە و بڵاوی کردۆتەوە[٤٣].

دوا بەدوای هەموو ئەمانە و لە ساڵی ١٩٧٢ دا و لە: (ناوەندی کەلاری کۆن)ی ئەوکاتە، بە سەرپەرشتی مامۆستا ناسیح غەفوور ئاغجەلەری کە مامۆستای زمانی عەرەبی بووە، دوو بڵاوکراوەی سەردیوار (نشرة جدارية) وەك چالاکییەکی قوتابیانی ئەوکاتە بڵاوکراوەتەوە لەو قوتابخانەیەدا بەناوەکانی : (تیشك) بە زمانی کوردی و زیاتر بابەتی هەمەجۆری ئەدەبی لە خۆ گرتووە، دووەمیشیان: کە ناوی (المعرفة) بووە بە زمانی عەرەبی و بە هەمان شێوە ئەم جۆرە نووسینانەی تیا بڵاوکراوەتەوە کە لەگەڵ ئاوەز و بیرکردنەوەی قوتابیی قۆناغی ناوەندیدا بگونجێت بۆ نموونە: پەندی پێشینان، بۆ پێکەنین، شیعر و کورتە چیرۆکی جۆربەجۆر و گۆشەی ئایا دەزانی؟، ئەمەش بۆخۆی هەنگاوێك بووە بۆ ئەوەی خوێندکار بتوانێت زیاتر مێشکی خۆی بگوشێ و نووسین و بابەتی دەوڵەمەندتر بەرهەم بهێنێت لەو قۆناغەدا[٤٤].

**پەراوێزەکان :**

١– بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت بە چالاکییەکانی (پارتی هیوا ) لە سنووری گەرمیاندا، بڕوانە: ئەحمەد باوەڕ، پارتی هیوا لە کاتی دروست بوونیەوە لە شاری کەرکوک تا هەڵوەشاندنەوەی لە کۆنفرانسی کەلاردا ١٩٣٧ – ١٩٤٤، کەرکووک (گۆڤار )، ژمارە (٥ )ساڵی (٢٠٠٠ )، ل ٩٣ – ١١٠.

٢– مستەفا نەریمان: ساڵی ١٩٢٥ لە کفری لەدایك بووە، پلەکانی خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی، دواناوەندی و خانەی مامۆستایانی لە کفری و کەرکووک و شاری بەغدا تەواو کردووە، لە گەلێك شوێنی وەك: کەلار، کفری، کەرکووک و بەغدا مامۆستا و سەرپەرشتیاری پەروەردەیی بووە. سەرەڕای بلاْوکردنەوەو چاپکردنی چەندین کتێب، ماوەیەك ئەندامی پارتی هیوا بووە و دوای خانەنشین بوونی و تا کاتی وەفاتکردنی لە بواری ڕۆژنامەوانیدا کاری کردووە و لە ٢٧ /٥ / ١٩٩٥ دا لە شاری بەغدا وەفاتی کردووە و لە گۆڕستانی (محەمەد سەکران ) ئەسپەردەی خاك کراوە: جمال بابان، اعلام الكرد ، ج١، ط٢، (اربيل: ٢٠١٢)، ص ٥٦٧– ٥٦٨.

٣ – شێخ عەتای تاڵەبانی: کوڕی (شێخ جەمالی شێخ محەمەد عەلی تاڵەبانی) یە، ساڵی ١٩٢٥ هاتۆتە دونیاوە و قۆناغی سەرەتایی خوێندنی لە کەرکوك تەواو کردووە، بەهۆی مردنی باوکیەوە دەستی لێ هەڵگرتووە، ماوەیەك ئەندامی پارتی هیوا بووە و لە ساڵی ١٩٤٧ ەوە پەیوەندی کردووە بەڕیزەکانی حیزبی شیوعی عێراقەوە، لە ساڵەکانی ١٩٥٤ و ساڵی ١٩٦٠ بەهۆی چالاکیی حیزبییەوە دەستگیر کراوە و لە ساڵی ١٩٦١ دا دوور خراوەتەوە بۆ بەندینخانەی عیمارە و دواتر لەسەر فەرمان و لێبووردنی عەبدولکەریم قاسم گەڕاوەتەوە کوردستان و بووە بە بەرپرسی لیژنەی قەزای کفری حیزبی شیوعی، لەساڵی ١٩٧٢ دا کراوەتە بەڕێوەبەری شارەوانی کفری و لە دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ەوە یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی (کۆمەڵەی هیوای عێراقی )، لە ٤/ ٥ / ٢٠٠٠. وەفاتی کردووە: انظر: الشيخ عطا الطالباني، ذكريات النضال في كوردستان، ط١، (السليمانية: ٢٠١٠ )، الصفحة الاخيرة.

٤– عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨ – ١٩٥٨، ط١، (بغداد: ١٩٨٩ )، ص ٩٦، الدكتور مكرم طالباني، حزب هيوا، مركز خاك للنشر والاعلام، مطبعة خاك ، (السليمانية، ٢٠٠٢ )، ص١٨٠ – ١٨١.

٥– مستەفا نەریمان، بیرەوەریەکانی ژیانم، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاْوکردنەوەی کوردی، دار الحرية للطباعة والنشر، (بەغدا: ١٩٩٤ )، ل ١٢٠، هلبين محمد امين المزوري، حزب هيوا (الامل) ١٩٣٩ – ١٩٤٦ دراسة تاريخية – سياسية، دار سپيرێز للطباعة والنشر، ط١، (دهوك: ٢٠٠٨ )، ص ٩٥.

٦- حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ، ناوچەی کفری لە نێوان ساڵانی ١٩١٤ – ١٩٤٥، لێکۆڵینەوەیەکە لە بارودۆخی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری، بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوک (٨٣ ) ، (کەرکووك: ٢٠١٠ )، ل ١٨٩ – ١٩٠.

٧- دیدەنی لەگەڵ دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی لەڕێگەی (ئاشتی شێخ عەتای تاڵەبانی) یەوە، سلێمانی ٨/ ١١ / ٢٠١٣.

٨- بڕوانە: مستەفا نەریمان، ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەوروپشتی، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، (بەغدا: ٢٠٠٧ )، ل ل١٣ – ١٣٢.، ئەحمەد باوەڕ، خەباتی سەربازێکی ون لە پەراوێزی کوردایەتیدا، ڕامان (گۆڤار )، ژمارە (١٨٠ )، ساڵی ٢٠١٢، ل ١٢٧– ١٣٠، حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ، ناوچەی کفری..، س. پ، ل ١٨١ – ١٨٧.

٩- شاکر فەتاح: شاکر میرزا فەتاح ئەحمەد ساڵی ١٩١٤ لەدایك بووە، ساڵی ١٩٣٦ کۆلێژی حقوقی لە شاری بەغدا تەواو کردووە، لەو ماوەیە بەدواوە و بۆ ساڵانێکی زۆر لە دام و دەزگاکانی میریدا کاری کردووە، بەزۆری لەو شوێنانەشی کە وەزیفەی گرتبێتە دەستەوە ڕۆژنامە و گۆڤاری جۆر بەجۆری بەناوی ئەو شوێنانەوە بڵاو کردۆتەوە لەوانە: باسەڕە لە قادر کەرەم، ڕۆژنامەی چەمچەماڵ، ڕۆژنامەی ئاگرێ، ڕۆژنامەی خورماڵ.....، سەرەڕای لە چاپدان و بڵاوکردنەوەی دەیان کتێبی جۆر بەجۆر بۆ دواکات و لە ٢٧ حوزەیرانی ١٩٨٨ دا لە لایەن دەزگای ئەمنی شاری هەولێرەوە و لەبەر داکۆکیکردن لە مەزلوومییەتی نەتەوەکەی سەرنگون کراوە و تائێستاش هیچ سۆراخێکی نییە: انظر: الدکتور محمد علي الصویرکي، معجم اعلام الکرد في التاریخ الاسلامي والعصر الحدیث في کردستان، بنکەی ژین، (السلیمانیة: ٢٠٠٦ )، ص ٣٣٩.

١٠- شاکر فەتاح، ئاوێنەی ژینم، یاداشتەکانی شاکر فەتاح، کۆکردنەوە و ڕێکخستنی: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، ب١، (هەولێر: ٢٠٠٣ )، ل ٣٢٨.

١١- شاکر فەتاح، س. پ، ل ٣٣٣.

١٢- مەلا ئەحمەدی مەلا قادری بانی خێلانی: لە خانەوادەیەکی ئاینی و لە ١٩٢٥/٥/٢٨ دا لە گوندی (فەقێ جنە)ی سەربەشاری دەربەندیخانی ئەمڕۆ لە دایك بووە، لە تیرەی وەلی هۆزی گەورەی جافە و خوێندنی ئایینی لە نێو بنەماڵەکەی خۆیانەوە دەست پێ کردووە، هەر لە تافی لاوییەوە پەیوەندی کردووە بە ڕیزەکانی حیزبی شیوعی عێراقەوە و بەدرێژایی کاری حیزبی و ڕێکخراوەیی چەندین بەرپرسیارێتی حیزبی بینیوە، لەم ساڵانەی دواییەوە چۆتە وڵاتی سوید و دوای نەخۆشییەکی زۆر هەر لەو وڵاتە و لە زستانی ٢٠١٢ دا کۆچی دوایی کردووە، انظر: احمد باني خیلاني، مذکراتي، (بغداد: ٢٠٠٩ ).

١٣- احمد باني خيلاني، مذكراتي، دار الرواد المزدهرة للطباعة والنشر والاعلان، (بغداد: ٢٠٠٩)، ص ٦٠، رەفیق ساڵح، ئیندێکسی ڕۆژنامەوانی نهێنی کوردی تا چواردەی تەمووزی ١٩٥٨، ڕۆژنامەنووس (گۆڤار )، ژمارە (١ )، ٢٠٠٤/٤/٢٢، ل ٢٣٦ .

١٤- احمد باني خيلاني، مذكراتي، المصدر السابق، ص ٦٠.

١٥- انظر: عزيز یاوەر، التعليم وفصول من تاريخ مدارس خانقين ١٨٨٧ – ٢٠٠٧، مؤسسة حمدي للطباعة والنشر، ط ١، (السليمانية: ٢٠٠٩ )، ص ١٩٦، دیدەنی لەگەڵ کاك ئیبراهیم باجەلانی نووسەردا، ٢٠١٣ / ١٠/٢٤.

١٦- عزيز یاوەر، المصدر السابق، ص ١٩٧.

١٧- قادر شێخ ڕەحیم تاڵەبانی: ساڵی ١٩٤٤ لە گوندی (حاجیلەر)ی ناحیەی مەیدانی سەربە خانەقین لەدایك بووە، قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی و دواناوەندی لە شاری خانەقین تەواو کردووە و قۆناغی زانکۆیی لە کۆلێژی ئەندازیاری (ئەندازیاری کیمیا ) لە زانکۆی بەغدا درێژە پێ داوە و دوای تەواوکردنی وەك ئەندازیارێك لە کۆمپانیای (نەوتخانە)ی شاری خانەقین دامەزراوە و لە تەمەنی (٤٩) ساڵی و لە ڕێکەوتی ١٩٩٣/٧/٢٢ بەنەخۆشی لە شاری بەغدا وەفاتی کردووە، لە سەر وەسیەتی خۆی لە گۆڕستانی (پاشا کۆپری )ی خانەقین نێژراوە: نامەیەکی دەستنووسی دکتۆر ئومێد شێخ ڕەحیم تاڵەبانی، خانەقین، ٢٠١٣/١٠/٢٦.

١٨- المصدر السابق، ص ١٩٨.

١٩- دیدەنی لەگەڵ ئیبراهیم باجەلانی نووسەردا، خانەقین، ٢٠١٣/١٠/٢٤.

٢٠- ئیبراهیم باجەلان: ئیبراهیم محەمەد کەریم ساڵی ١٩٤٤ لە گوندێکی سەر بە ناحیەی (قۆرەتوو )ی شاری خانەقین لەدایك بووە، دوای مردنی باوکی و لە ساڵی ١٩٥١ ەوە خراوەتە بەرخوێندن و لە ساڵی ١٩٥٨ دا قۆناغی سەرەتایی تەواو کردووە. بەلأم لەبەر بارودۆخی ژیان نەیتوانیوە درێژەی پێبدات، لەساڵی ١٩٦٤ بەدواوە و لەشاری خانەقیندا کتێبخانەیەکی بەناوی (الثقافة)وە کردۆتەوە و تاساڵی ١٩٦٨ بەردەوام بووە، ماوەیەك پەیوەندی کردۆتە ڕیزەکانی حیزبی شیوعی عێراقەوە و ئەندامێکی چالاکی بزووتنەوەی جووتیاران بووە لەناوچەی خانەقیندا، پاشان بۆتە پەیامنێری ڕۆژنامەی (التآخي )، سەرەڕای کاری فەرمانبەری لە فەرمانگەکانی میریدا، تائێستاش بە بەردەوامی دەنووسێ و خاوەنی چەند کتێبێکی چاپکراوە بڕوانە: جمال بابان، اعلام الكرد، الجزء الاول، دار آراس للطباعة والنشر، (اربيل: ٢٠١٢)، ص ١٣- ١٥.

٢١- جەلال زەنگابادی: جەلال حسێن محەمەد ئەمین پالأنی – لوڕستانی ساڵی ١٩٥١ لەگوندی (قەلأ)ی ناوچەی زەنگابادی سەر بەناحیەی (جەلەولا) لە دایك بووە، لەساڵی

١٩٦٩دا خانەی مامۆستایانی کەرکووکی تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٦٥ەوە دەستی بەنووسینی شیعر کردووە و لە ساڵی ١٩٦٧ەوە بەناوی (جەلال وەردە)وە دەستی بەبڵاوکردنەوە کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئاشنایەتی لەگەڵ هونەر و کاری وێنەکێشاندا هەبووە و زمانەوانێکی شارەزایە تائێستاش بە بەردەوامی بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بەردەوامە لە نووسین و کۆمەڵێك بەرهەمی چاپکراوی هەیە بڕوانە: حسين عارف، عشرون قصة كردية، منشورات مجلة كاروان، (اربيل: ١٩٨٥ )، ص، google.iraqi writer. Comliraqiwriter Iraqi-writersfolder..

٢٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، خانەقین ، ٢٠١٣/١٠/٢٤.

٢٣- ئەحلام مەنسوور: ئەحلام مەنسوور عەلی ئەکبەر ساڵی ١٩٥١ لە گەڕەکی (عەبدوڵڵا بەگ)ی شاری خانەقین لە دایك بووە، دایکی (ڕەسمیە حاجی حەمە ساڵح بەزاز) لە هۆزی گەورەی باجەلانە و پلەکانی خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی، دواناوەندی و قۆناغی زانکۆیی لە خانەقین و شاری بەغدا تەواو کردووە، سەرەڕای ئەوەی چیرۆکنووسێکی دیار و لەبواری ڕۆژنامەوانیشدا کاری کردووە، لەساڵی ١٩٨٦ەوە بەمەبەستی خوێندنی باڵا ڕووی لە فەرەنسا و زانکۆی (سۆربۆن ) کرد، بەڵام بەهۆی بارودۆخی ژیان و دەست کورتییەوە بۆی تەواو نەکرا و گەڕایەوە عێراق، دوای ماوەیەکی زۆر و لەساڵی ١٩٩٩ دا خوێندنی ماستەری لە کۆلیژی پەروەردەی (ابن رشد)ی زانکۆی بەغدا تەواو کرد، نامەکەی بەناونیشانی (بینای هونەری چیرۆکی کوردی ١٩٧٠- ١٩٨٠ ) بوو، لە بەرهەمە چاپکراوەکانی: کۆمەڵە چیرۆکی پرد، ڕۆمانی ئەڵوەن، خەون و خوێن، ئەزموون...تاد، لەم ساڵانەی دواییشدا ماوەیەك مامۆستای زانکۆی سلێمانی بوو و لە ڕێکەوتی ٢٠١٣/١/١٠ کۆچی دوایی کرد، لەسەر وەسیەتی خۆی لە خانەقین ئەسپەردەی خاك کرا. بڕوانە: نامەیەکی دەستنووسی کاك ئیبراهیم باجەلان، کە بۆ نووسەری ئەم بابەتەی ناردووە ٢٠١٣/١١/٤، عادل گەرمیانی، ئەحلام مەنسوور و خەونەکانی داهێنەرێکی نەگبەت، شیکار (گۆڤار )، گۆڤارێکی هزری ئەکادیمی وەرزییە، پەیمانگای یەکێتی ئافرەتانی کوردستان بۆ پرسە کۆمەڵایەتییەکان دەری دەکات، ژمارە (٣ )، پایزی ٢٠١٣، ل ١٤٣ – ١٤٧.

٢٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ٢٠١٣/١٠/٢٤.

٢٥- فەرهاد شاکەلی: ئەنوەر شێخ محەمەدی شێخ سلێمانی شاکەلی کە بە فەرهاد شاکەلی ناسراوە ساڵی ١٩٥١ لە گوندی شاکەلی ناوچەی گەرمیان لە دایك بووە، پلەکانی خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی، دواناوەندی و قۆناغی زانکۆیی لە کفری و شاری بەغدا تەواو کردووە، لە ناوەندی شەستەکانی سەدەی بیستەمی ڕابردووەوە دەستی بە نووسین و بڵاوکردنەوە کردووە و، یەکەم بەرهەمی لە ساڵی ١٩٦٧ لە هەفتەنامەی (دەنگ وباس)دا و یەکەم دیوانە

شیعری ساڵی ١٩٧٣ بەناوی: (پرۆژەی کودەتایەکی نهێنی)یەوە بلاو کردۆتەوە، لە هاوینی ١٩٧١ دا ئامادەی کۆنگرەی یەکێتی نووسەرانی کورد بووە لە هەولێر و لەهەمان ساڵیشدا لەگەڵ لەتیف هەڵمەت بەیاننامەی شیعریی (گرووپی کفری)یان ڕاگەیاندووە، لە دامەزرێنەرانی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی)یە و نازناوی (فەرهاد)یش ناوی نهێنی ناو ئەو ڕێکخراوە بووە، تا ئێستا بە بەردەوامی دەنووسێ و بەرهەمەکانی بۆسەر گەلێك لە زمانە جیهانییەکان وەرگێڕدراوە، هەروەها خاوەنی دەیان کتێبی چاپکراوە لە بوارەکانی شیعر، چیرۆك ، زمان و ڕووناکبیریی گشتیدا، مامۆستای زانکۆیە و لە سوید دەژی بڕوانە: فەرهاد شاکەلی، پرۆژەی کودەتایەکی نهێنی، چ٢، (کوردستان: ٢٠٠٠ )، ل ٨٣ – ١٠٢، حوسێن مەحموود عەلی کەلاری، شێواز لە هۆنراوەکانی فەرهاد شاکەلی دا، نامەیەکە وەك بەشێك لە پێداویستییەکانی پلەی ماستەر پێشکەش بە کۆلێژی زمانی زانکۆی کۆیە کراوە لە ئەدەبی کوردیدا، (کۆیە: ٢٠٠٨ )، ل x-x1.

٢٦– دەستنووسێکی تایبەتی فەرهاد شاکەلی کە بەتایبەتی بۆ نووسەری ئەم بابەتەی نووسیوە، گوندی شاکەل – کەلار، ٢٠١٣/١٠/٢٨.

٢٧– نامەیەکی دەستنووسی پێشوو ، گوندی شاکەل، ٢٠١٣/١٠/٢٨

٢٨– سەرچاوەی پێشوو ، گوندی شاکەل، ٢٠١٣/١٠/٢٨.

٢٩– لەتیف هەڵمەت: لەتیف مەحموود محەمەد کەسنەزانی بەرزنجی، ساڵی ١٩٤٧ لە بنەماڵەیەکی ئایینی شاری کفری لەدایك بووە، تا پۆلی سێیەمی ناوەندی خوێندووە و دواتر نەیتوانیوە درێژە بەخوێندن بدات، یەکەم بەرهەمی شیعریی خۆی لە گۆڤاری ڕزگاری ژمارە (٩)ی ساڵی ١٩٦٩دا بلاو کردۆتەوە و یەکەم دیوانی شیعریشی بەناوی (خواو شارە بچکۆلەکەمان )ەوە لە ساڵی ١٩٧٠ لە چاپخانەی (الشمال)ی شاری کەرکوك بە چاپ گەیاندووە، لێرە بەدواوە و تا ئێستا بە بەردەوامی دەنووسێت و بلاو دەکاتەوە، شیعرەکانی بۆسەر چەندین زمانی زیندووی جیهان وەرگێڕدراون و خاوەنی دەیان بەرهەمی چاپکراوە لە بوارەکانی شیعر و چیرۆك و تەسەوف و ڕووناکبیریی گشتیدا بڕوانە، لەتیف هەڵمەت و داهێنان، لە بلاوکراوەکانی مەکتەبی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری حزبی شیوعی کوردستان، ژمارە (١٢)، (سلێمانی: ٢٠١٣ )، ل ٥– ٣٠.

٣٠– بڕوانە: نامەیەکی دەستنووسی مامۆستا ئەنوەر شاکەلی (فەرهاد شاکەلی) بۆ لەتیف هەڵمەتی شاعیر ٢ ی حوزەیرانی ١٩٦٧.(ئەرشیفی لەتیف هەڵمەت).

٣١– بڕوانە: چەند نامەیەکی دەستنووسی ئەحمەد شاکەلی بۆ لەتیف هەڵمەتی شاعیر ساڵی ١٩٦٨. (ئەرشیفی لەتیف هەڵمەت).

٣٢- دەستنووسی لەتیف هەڵمەت لە ئەرشیفی ئەحمەد شاکەلی دا و لە وەڵامی ئەو نامەیەیدا کە باسیان لە گۆڤاری بەرزنجە و گفتوگۆی ئەدەبیی نێوانیان کردووە ٢٩/ ١١/١٩٦٨.

٣٣- ئەحمەد شاکەلی: ئەحمەد محەمەد عەبدولقادر، وەکو خۆی ئەڵێ: بەپێی دەستنووسێکی باوکی (شێخ محەمەدی دێبنە) لە سەعات نۆی شەوی ٢٣ لەسەر ٢٤ی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ لە گوندی (دەککەی سەرچەم)ی شاری خانەقین لە دایك بووە، پلەکانی خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی، دواناوەندی و خانەی مامۆستایانی لە شارەکانی کەلار، کفری، خانەقین و کەرکووك تەواو کردووە، لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە دەستی بە نووسین و بلاوکردنەوە کردووە و یەکەم بەرهەمی خۆی لە ڕۆژنامەی (هاوکاری)دا بلاو کردۆتەوە. دواتر بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی وەك: هاوکاری، بەیان، ڕوانگە، خەبات، التآخي، النور، کوردستانی نوێ....تاد، نووسینەکانی لە شیعر و چیرۆك و بابەتی ڕۆژنامەوانی بەم ناوانەوە: (ا. الشیخ، ئەحمەد قەلاتەبزانی، ئەحمەد شاکەلی و داراش)ەوە بلاو کردۆتەوە، لە ساڵی ١٩٧٠وە: (ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردە)، ئێستاش مامۆستای خانەنشینە و لە شاری کەلار دەژی بڕوانە: دەستنووسێکی تایبەتی نووسەر کە بۆ نووسەری ئەم بابەتەی ناردووە، کەلار ٢٠١٣/١١/٤.

٣٤- ئەحمەد باوەڕ، چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ ئەحمەد شاکەلی، تۆژەر (گۆڤار) لە بلاوکراوەکانی پەیمانگای تەکنیکیی کەلار، ژمارە (١)، هاوینی ١٩٩٨، ل ٣٧ – ٤٢. هەروەها دیدەنییەکی نوێتر لەگەڵ ئەحمەد شاکەلی ١٦/ ١٠/ ٢٠١٣.

٣٥- محەمەد داماو (بێ کراس): محەمەد ئەحمەد ڕەشید، ساڵی ١٩٤٧ لە کفری لە دایك بووە و تا پۆلی دووەمی ناوەندی توانیویەتی درێژە بە خوێندن بدات، فەرهاد شاکەلی کە هاوڕێیەکی سەردەمی خوێندن و لاوی بووە لەبارەیەوە دەڵێت: ((یەکێك بوو لەو خوێندکارانەی هەر لە سەرەتاوە ناسیم. ئەو کوڕە بەشێوە و جلوبەرگ و ڕوواڵەت زۆر هەژار بوو، بەلام منیش و لەتیفیش تێگەیشتین کە حەزی لە شیعر و ئەدەبە و هەر لەبەر ئەوەیش بووین بەدۆست....بەداخەوە محەمەد کەمنووس بوو لە ماوەی ئەو هەموو ساڵەدا کە لەیەکەوە نزیك بووین هەمووی چەند جارێك بەرهەمی خۆی پێشان دابووم. ئاگاداریش نیم هیچی بلاو کردبێتەوە ڕۆحی شاد))، لەڕێکەوتی ٢٠٠٥/١٠/٧ کۆچی دوایی کردووە بڕوانە: فەرهاد شاکەلی، زمانی گەردەلوول و خەونی شنەبا، کۆمەڵە دیدار...، ١٩٩٠ – ٢٠١٠، چ٢، (هەولێر: ٢٠١١)، ل ٢٥٩ –٢٦٠.

٣٦ – شەمێران سلێمان، ڕوو بەڕوو لەگەڵ لەتیف هەڵمەتدا، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، (هەولێر: ٢٠١١)، ل ٢٣ – ٢٤، دیدەنی لەگەڵ کاك لەتیف هەڵمەتی شاعیر ٢٠١٣/١٠/٩.

٣٧- دیدەنی لەگەڵ غازی سالار کارێزی، کەلار، ٢٠١٣/١٠/٢٠.

٣٨- دیدەنی لەگەڵ لەتیف هەڵمەتی شاعیر ٢٠١٣/١٠/٩.

٣٩- کەنعان مەدحەت، گەڕان لە بەهجەت حیکمەت، هۆنراوە، چاپخانەی ئارارات، (سوید: ١٩٨٧ )، ل ٥.

٤٠- دیدەنی لەگەڵ دکتۆر کەنعان مەدحەت، کفری، ٢٠١٣/١٠/٨.

٤٠ – دیدەنی لەگەڵ دکتۆر کەنعان مەدحەت، کفری، ٢٠١٣/١٠/٨، دیدەنی لەگەڵ لەتیف هەڵمەتی شاعیر ٢٠٠٦/٣/١٨.

٤١- سەبارەت بەبڵاوکراوەی (جیکۆر ) و (الکواکب ) زانیارییەکانمان لە مامۆستا (محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق)ەوە وەرگرتووە، ٢٠١٣/١٠/٢٥ .

٤٢- دیدەنی لەگەڵ کاك لەتیف هەڵمەتی شاعیر ٢٠١٣/١٠/٩.

٤٤- دیدەنی لەگەڵ عەبدوڵڵا حەسەن قادر، کەلار، ٢٠١٣/١٠/٢٥.

## لیستی سەرچاوەکان:

**یەکەم / نامەی زانکۆیی بلاْونەکراوە:**


١- حوسێن مەحموود کەلاری، شێواز لە هۆنراوەکانی فەرهاد شاکەلی دا، نامەیەکە وەك بەشێك لە پێداویستییەکانی پلەی ماستەر پێشکەش بە کۆلێژی زمانیی زانکۆی کۆیە کراوە لە ئەدەبی کوردیدا، (کۆیە: ٢٠٠٨).


**دووەم / کتێبی چاپکراو بە زمانی کوردی:**


١- حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ، ناوچەی کفری لە نێوان سالاْنی ١٩١٤- ١٩٤٥، لێکۆلێنەوەیەکە لە بارو دۆخی رامیاری و کۆمەلاْیەتی و ڕۆشنبیری، لە بلاْوکراوەکانی کۆمەلّەی رووناکبیری و کۆمەلاْیەتی کەرکووك (٨٣)، (کەرکوك: ٢٠١٠).

٢- شاکر فەتاح، ئاوێنەی ژینم، یاداشتەکانی شاکر فەتاح، کۆکردنەوە و ڕێکخستنی: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، ب١، دەزگای چاپ و بلاْوکردنەوەی ئاراس، (هەولێر: ٢٠٠٣ ).

٣- شەمێران سلێمان، ڕوو بەڕوو لەگەلّ لەتیف هەلّمەتدا، (دیدار )، دەزگای چاپ و بلاْوکردنەوەی ئاراس، (هەولێر: ٢٠١١)

٤- فەرهاد شاکەلی، زمانی گەردەلوول و خەونی شنەبا، کۆمەلّە دیدار، ١٩٩٠ - ٢٠١٠، چ٢، (هەولێر: ٢٠١١).

٥- فەرهاد شاکەلی، پرۆژەی کودەتایەکی نهێنی، چاپی دووەم، (کوردستان: ٢٠٠٠ ).

٦- کەنعان مەدحەت، گەڕان لە بەهجەت حیکمەت، هۆنراوە، چاپخانەی ئارارات، (سوید: ١٩٨٧).

٧- مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاْوکردنەوەی کوردی، دار الحرية للطباعة والنشر، (بەغدا: ١٩٩٤).

٨- مستەفا نەریمان، ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەوروپشتی، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاْوکردنەوەی کوردی، (بەغدا: ٢٠٠٧).

٩- مەکتەبی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری حیزبی شیوعی کوردستان، لەتیف هەلّمەت و داهێنان، (سلێمانی: ٢٠١٣).


**سێیەم / کتێبی چاپکراو بە زمانی عەرەبی:**


١- احمد باني خيلاني، مذكراتي، دار الرواد المزدهرة للطباعة والنشر والاعلان، (بغداد: ٢٠٠٩)

٢- جمال بابان، اعلام كرد العراق، الجزء الاول، ط٢، (اربيل: ٢٠١٢).

٣- حسين عارف، عشرون قصة كردية، منشورات مجلة كاروان، (اربيل: ١٩٨٥).

٤– هلبين محمدامين المزوري، حزب هيوا (الامل) ١٩٣٩ – ١٩٤٦ دراسة تاريخية – سياسية، دار سپيرێز للطباعة والنشر، ط١، (دهوك: ٢٠٠٨).
٥– عزيز ياوەر، التعليم وفصول من تاريخ مدارس خانقين ١٨٨٧ – ٢٠٠٧، مؤسسة حمدي للطباعة والنشر، ط ١، (السليمانية: ٢٠٠٩ ).
٦– عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨ – ١٩٥٨، ط١، (بغداد: ١٩٨٩).
٧– الشيخ عطا الطالباني، ذكريات النضال في كوردستان، ط١، (السليمانية: ٢٠١٠)، الصفحة الاخيرة.
٧– محمد علي الصويركي، معجم اعلام الكرد في التاريخ الاسلامي والعصر الحديث في كردستان، بنکەی ژين، (السليمانية: ٢٠٠٦)، ص ٣٣٩.
٨– مكرم طالباني، حزب هيوا، مطبعة خاك، مركز خاك للنشر والاعلام، (السليمانية، ٢٠٠٢).

**چوارەم / گۆڤار بە زمانی کوردی:**

١– ئەحمەد باوەڕ، پارتی هیوا لە کاتی دروست بوونیەوە لە شاری کەرکوك تا هەڵوەشاندنەوەی لە کۆنفرانسی کەلار دا ١٩٣٧ – ١٩٤٤، کەرکووك (گۆڤار )، ژمارە (٥) ساڵی (٢٠٠٠).
٢– ئەحمەد باوەڕ، چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ ئەحمەد شاکەلی، تۆژەر (گۆڤار) لە بڵاوکراوەکانی پەیمانگای تەکنیکی کەلار، ژمارە (١)، هاوینی ١٩٩٨.
٣– ئەحمەد باوەڕ، خەباتی سەربازێکی ون لە پەراوێزی کوردایەتی دا، ڕامان (گۆڤار)، ژمارە (١٨٠)، ساڵی ٢٠١٢.
٤– ڕەفیق ساڵح، ئیندێکسی ڕۆژنامەوانی نهێنی کوردی تا چواردەی تەمووزی ١٩٥٨، بەشی یەکەم، ڕۆژنامەنووس (گۆڤار)، گۆڤارێکی وەرزییە، سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، ژمارە (١)، ٢٢/٤/٢٠٠٤ .
٥– عادل گەرمیانی، ئەحلام مەنسوور و خەونەکانی داهێنەرێکی نەگبەت، شیکار (گۆڤار)، گۆڤارێکی هزری ئەکادیمی وەرزییە، پەیمانگای یەکێتی ئافرەتانی کوردستان بۆ پرسە کۆمەڵایەتییەکان دەری دەکات، ژمارە (٣)، پایزی ٢٠١٣.

**پێنجەم / دەستنووس:**

١– چەند نامەیەکی دەستنووسی ئەحمەد شاکەلی بۆ لەتیف هەڵمەتی شاعیر ساڵی ١٩٦٨. (ئەرشیفی لەتیف هەڵمەت).

٢- دەستنووسێکی لەتیف هەڵمەت لە ئەرشیفی ئەحمەد شاکەلیدا و لە وەڵامی ئەو نامەیەیدا کە باسیان لە گۆڤاری بەرزنجە و گفتوگۆی ئەدەبی نێوانیان کردووە ١٩٦٨/١١/٢٩.
٣- نامەیەکی دەستنووسی مامۆستا ئەنوەر شاکەلی (فەرهاد شاکەلی) بۆ لەتیف هەڵمەتی شاعیر ٢ی حوزەیرانی ١٩٦٧. (ئەرشیفی لەتیف هەڵمەت).
٤- دەستنووسێکی مامۆستا فەرهاد شاکەلی کە بەتایبەت بۆ نووسەری بابەتەکەی نووسیوە، گوندی شاکەل – گەرمیان، ٢٠١٣/١٠/٢٨.
٥- دەستنووسێکی دکتۆر ئومێد شێخ ڕەحیم شەمسەدین تاڵەبانی بۆ نووسەری بابەتەکەی نووسیوە، خانەقین، ٢٠١٣/١٠/٢٦.
٦- دەستنووسێکی ئەحمەد شاکەلی کە بەتایبەت بۆ نووسەری بابەتەکەی نووسیوە، کەلار ٢٠١٣/١١/٤.
٧- دەستنووسێکی ئیبراهیم باجەلان سەبارەت بە ئەحلام مەنسوور، کە بۆ نووسەری ئەم بابەتەی ناردووە ٢٠١٣/١١/٤

**شەشەم / دیدەنی:**

١- دیدەنی لەگەڵ دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی، سلێمانی، ٢٠١٣/١١/٨.
٢- دیدەنی لەگەڵ ئیبراهیم باجەلان، خانەقین ، ٢٠١٣/١٠/٢٤.
٣- دیدەنی لەگەڵ ئەحمەد شاکەلی، کەلار ٢٠١٣/١٠/١٦.
٤- دیدەنی لەگەڵ غازی سالار کارێزی، کەلار، ٢٠١٣/١٠/٢٠.
٥- دیدەنی لەگەڵ لەتیف هەڵمەتی شاعیر، کفری ٢٠١٣/١٠/٩.
٦- دیدەنی لەگەڵ دکتۆر کەنعان مەدحەت، کفری، ٢٠١٣/١٠/٨.
٧- دیدەنی لەگەڵ عەبدوڵڵا حەسەن قادر، کەلار، ٢٠١٣/١٠/٢٥.
٨- دیدەنی لەگەڵ محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق، سلێمانی، ٢٠١٣/١٠/٢٥ .

**حەوتەم / تۆڕی ئینتەرنێت:**

1- google.iraqi writer. Comliraqiwriter Iraqi-writersfolder..

## ملخص البحث

هذا البحث يسلط الضوء على (تاريخ الصحافة الكردية في شرق منطقة گرميان ١٩٣٩ – ١٩٧٢) يتضمن البحث مقدمة وعدة محاور رئيسية، الاولى منها: ظهور الصحافة الكوردية في شرق منطقة گرميان منذ اندلاع الحرب العالمية الثانية (١٩٣٩ –١٩٤٥) وحتى اواخر عام ١٩٥٤. اما المحور الثاني فقد خصص لتاريخ بعض النشريات والصحافة الكردية التي صدرت في مدينة خانقين باللغتين الكردية والعربية، لاسيما بعد ثورة ١٤ من تموز من عام ١٩٥٨ وحتى اتفاقية مارس – آذار عام ١٩٧٠ بين الحكومة العراقية وقيادة الحركة الكوردية. وأما فيما يتعلق بالمحور الثالث والاخير فقد خصص للحديث عن نشاط الصحافة الكوردية في مدينتي كلار وكفري وما والاهما وخصوصا خلال الفترة (١٩٦٢ – ١٩٧٢).

## Abstract

This study sheds light on the history of Kurdish journalism in eastern Garmyan province during 1939-1972. It includes an introduction and several key sections; the first covers the rise of Kurdish journalism in eastern Garmyan area since the outbreak of the second world year until late 1954. The second section covers the history of some periodicals and journals published in Khanaqin in both Kurdish and Arabic particularly after the July revolution of 1958 until the March Agreement of 1970 between Iraq and the Kurdish leadership. The third chapter, however, is devoted to Kurdish journalistic activities in the towns of Kalar and Kifri and others between 1962-1972.

# كاریگەرییەكانی ململانێی نێوان سەفەوی و عوسمانی لە سەر پێگەی میرنشینی ئەردەڵان

د. قوباد مەنسوور بەخت [1]    مودەڕڕیس سەعیدی[2]

**كورتەی توێژینەوەكە:**

ئەردەڵانەكان بنەماڵەیەكی كوردن كە لە هەلومەرجی ئاڵۆز و ناسەقامگیریی دوای هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی ئیلخانی، حكوومەتێكی نیمچە سەربەخۆیان لە بەشێكی كوردستاندا پێك هێنا. لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوی ، لەسەر دەستی شا ئیسماعیلی یەكەم كۆتایی بە تەمەنی زۆربەی ئەو دەسەڵاتە هەرێمییانە كە لە ماوەی نێوان ڕووخانی دەوڵەتی ئیلخانی و دروستبوونی دەوڵەتی سەفەویدا سەریان هەڵدابوو، هات. بەڵام میرنشینی ئەردەڵان لەم قۆناغەشدا سەرەڕای هەندێ هەڵچوون و داچوون ، توانی درێژە بە بوون و مانەوەی خۆی بدات. ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی پێوەندییەكانی میرنشینی ئەردەڵان و حكوومەتی سەفەوی دەری دەخات كە میرەكانی ئەردەڵان بە كەڵك وەرگرتن لە ئاڵۆزبوونی پێوەندیی نێوان سەفەوی و عوسمانی توانیبوویان تا ڕادەیەكی زۆر دەسەڵات و سەربەخۆیی خۆیان تەنانەت لە سەردەمی حوكمڕانی پادشا بەهێزەكانی وەكو تەهماسبی یەكەم و عەباسی یەكەمدا بپارێزن. بەڵام دوابەدوای ئیمزاكردنی پەیماننامەی زەهاو (١٦٣٩ ) كە كۆتایی بە شەڕە دوور و درێژەكانی نێوان دوو ئیمپراتۆرییەكە هێنا، میرنشینی ئەردەڵانیش پێگەو گرنگیی خۆی كە ئاكامی هەڵكەوتن لە سەر سنوورە ستراتیجییەكان و ئیمكانی كەڵك وەرگرتن لە شەڕ و ئاڵۆزییەكانی نێوانیان بوو، لە دەست دا. دوای ئەمە سەرەڕای لاوازبوونی دەوڵەتی ناوەندی، دەستێوەردانی حوكمڕانە سەفەوییەكان لە كاروباری ناوخۆی میرنشینی ئەردەڵان بە شێوەیەكی بەرچاو زیادی كرد.

زاراوە سەرەكییەكان: میرنشینی ئەردەڵان، سەفەوی، عوسمانی، شەڕ، ئاڵۆزی.

## پێشەکی

یەك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی دەوڵەت و حوکمڕانی لە سەردەمی پێش مۆدێرن، لامەرکەزییەت و سەنترالیستی نەبوونی شێوازی بەڕێوەبردنی وڵاتە. لە ڕاستیدا ئەو دەوڵەتانەی کە لە سەردەمی پێش ئیسلامەوە تا بەر لە شۆڕشی مەشرووتە (١٩٠٦ ز) لە ئێراندا دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست، سەرەڕای ئەو جیاوازییانەی کە لە ڕوانگەی هێز و دەسەڵاتی ناوەند و دەستگرتن بە سەر دەسەڵاتە هەرێمییەکانەوە هەیانبووە، لە بەراورد لەگەڵ حکوومەتە مۆدێرنەکاندا بە گشتی خاوەن تایبەتمەندییەکی لامەرکەزی بوون.

لە ئێرانی پێش ئیسلامدا ئەم یەکە لە چەمکی «شاهەنشا»دا وەکو حوکمڕانێکی گەورە کە دەسەڵاتی بە سەر هەموو حوکمڕانەکانی تردا هەیە، خۆی دەبینێتەوە. ئەم ڕوانینە بۆ دەسەڵات و دەسەڵاتدار کە لە سەردەمی ئیسلامیشدا درێژەی هەبوو ڕێگای بۆ قەبوولکردنی دەسەڵاتە ناوچەییەکان و پێناسەی پێگەیەکی دیاریکراو بۆیان لە ناو سیستەمی گشتی بەڕێوەبردنی وڵات، خۆش کرد. ئەڵبەت هاوکات لەگەڵ قەبوولکردنی سیستەمی هەرێمایەتی وەکو تایبەتمەندییەکی سەرەکی دەوڵەتەکانی پێش سەردەمی مۆدێرن، دەبێ ئەوەشمان لە یاد بێت کە پێوەندیی نێوان دەسەڵاتی ناوەندی و دەسەڵاتە ناوچەییەکان یان ئەوەی لە سەرچاوەکاندا بە ملوك ئەڵتەوائیف (ملوك الطوائف) ناویان دەبرێت، هەمیشە و بەردەوام لە یەك ئاستدا نەبووە و بە پێی کات و بارودۆخ گۆڕانی بە سەردا هاتووە. بە گشتی گرنگترین فاکتەرێك کە چۆنێتی ئەم پێوەندییانەی دیاری دەکرد بریتی بوو لە بە هێزبوون یان لاوازبوونی حکوومەتی ناوەندی. گونجاوترین هەل بۆ دەسەڵاتە ناوچەییەکان، بەدیهاتنی بۆشایی هێز و نەبوونی حکوومەتێکی ناوەندی بەتوانا بوو کە هێزە هەرێمییەکان تێیدا گەشەیان دەکرد و دەسەڵاتیان دەگەشتە ئەوپەڕی خۆی، لە کاتێکدا کە حوکمڕانە بەهێزەکان بەردەوام کاریان بۆ بەرتەسککردنەوە و سنووردارکردنی دەسەڵاتی حاکمە ژێردەستەکان و هێزە ناوچەییەکان دەکرد. بۆیە دەکرێ باس لە فۆرمولێکی گشتگیر لە مەڕ پێوەندییەکانی نێوان حکوومەتی ناوەندی و دەسەڵاتە ناوچەییەکان لە مێژووی ئێراندا بکرێ کە تێدا هێز و دەسەڵاتی ئەم دووە لە

ئاڕاستەیەکی پێچەوانەی یەکدا بووە. واتە هەرکات دەوڵەتێکی ناوەندی بەهێز لە ئارادا بووبێت، هێز و دەسەڵاتی حوکمڕانە ناوچەییەکان ڕووی لە کەمی کردووە و بە پێچەوانەوە. ئەمە لەگەڵ لۆژیکی دەسەڵات و پێوەندیی نێوان هێزەکان یەك ئەگرێت و ئاوڕدانەوە لە مێژووی ئێرانیش ڕاستییەکەی دەسەلمێنێ، بۆیە بەرچاو کەوتنی نموونەیەکی دژ بەمە بە مانای ئامادەبوونی فاکتەرێکی بە هێزی دیکە دێت کە هاوسەنگییەکەی بە ئاڕاستەیەکی دیکەدا بردووە.

ئاوڕدانەوە لە مێژووی فەرمانڕەوایەتی میرنشینی ئەردەڵان لە سەردەمی سەفەویدا یەك لەم نموونە دەگمەنانەمان دەخاتە پێش چاو کە تێدا پێوەندی نێوان دەوڵەتی ناوەندی (حکومەتی سەفەوی) و دەسەڵاتێکی هەرێمی (میرنشینی ئەردەڵان) بە ئاڕاستەیەکی جیاوازدا دەڕوا. لە مەڕ دەوڵەتی سەفەوی ئەگەر بمانەوێ بە لە بەرچاو گرتنی هەندێ فاکتەری وەك بەهێزبوونی حوکمڕانەکان، ڕادەی ئامادەیی هێزە سەربازییەکان و توانای ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەڕەشە دەرەکییەکاندا، چارتێك بۆ پیشاندانی قۆناغەکانی بەهێزبوون یان لاوازبوونی ئەم حکوومەتە دابنێین، سەرەڕای ئەو بەرزی و نزمییانەی کە پیشاندەری هەندێ قۆناغی کاتی و نا ئاساییی وەکو سەرەتای هاتنە سەرکاری حوکمڕانەکان یان فەرمانڕەوایەتی هەندێ کەسایەتی لاواز وەکو «شا محەمەدی خودابەندە»یە، ئاڕاستەی گشتی چارتەکە لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی سەفەوی تا کۆتایی حوکمڕانیی شا عەباسی یەکەم، ڕوو لە بەرزبوونەوەیە و لە سەردەمی شا عەباسی یەکەمدا هێز و دەسەڵاتی دەوڵەتی سەفەوی دەگاتە لووتکەی خۆی. پاش ئەمە ڕەوتی بەرەوخوار بوون بە لێژاییەکی توندەوە دەست پێ دەکات کە بە داڕووخانی دەوڵەتی سەفەوی لە سەردەمی شا سوڵتان حسەیندا کۆتایی پێ دێت. خاڵی سەرنجڕاکێش لە مەڕ پێوەندیی نێوان دەوڵەتی سەفەوی و میرنشینیی ئەردەڵان لەوەدایە کە سەردەمی هێز و لاوازیی ئەم دەسەڵاتە ناوچەییە بە گشتی لەگەڵ سەردەمی هێز و لاوازیی دەوڵەتی ناوەندی، یەك دەگرێتەوە. بەو مانایە کە هەندێ لە بەهێزترین و گرنگترین میرەکانی ئەردەڵان وەکو سۆرخاب بەگ و هەڵۆخان لە سەردەمی بەهێزترین پادشا سەفەوییەکانی وەکو شاه تەهماسبی یەکەم و شاعەباسی یەکەمدا ژیاون و سەردەمی لاوازی و بێ

هێزی هەردوو حکوومەتەکەش تا ڕادەیەکی زۆر لە ڕووی کاتەوە، لێك نزیکە. ئەمە لە پێوەندیی نێوان دەوڵەتی ناوەندی و دەسەڵاتە هەرێمییەکاندا بە نموونەیەکی دەگمەن دەژمێردرێت و بۆ لێکدانەوە و تێگەیشتنی دەبێ بە دوای ئەو فاکتەر یان کۆمەڵە فاکتەرەدا بگەڕێین کە ڕێگەی بۆ هاتنە کایەی ئەم دیاردە نائاساییە خۆش کردووە.

ئەم توێژینەوەیە هەوڵێك بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە و وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەیە کە چ هۆکارێك بۆتە هۆی هاوکات و هاوتەریببوونی نائاسایی سەردەمی بەهێزی و لاوازیی دەوڵەتی سەفەوی و میرنشینی ئەردەڵان؟ وەڵامی سەرەتایی (فرضیة) پرسیارەکە ئەوەیە کە شەڕ و ئاڵۆزییەکانی نێوان دوو دەوڵەتی زلهێزی سەفەوی و عوسمانی ببووە هۆی زۆربوونی گرنگی جیۆپۆلۆتیك و بەرزبوونەوەی پێگەی میرنشینی ئەردەڵان کە لە سەر سنووری دەسەڵاتی هەردوو لا هەڵکەوتبوو و لەگەڵ کۆتاییهاتن بە شەڕ و شۆڕ و کەمبوونەوەی ئاڵۆزییەکان کە هاوکات بوو لەگەڵ قۆناغی لاوازبوونی دەوڵەتی سەفەوی، پێگەو گرنگی و ڕادەی سەربەخۆیی میرەکانی ئەردەڵانیش ڕووی لە کەمبوونەوە کرد.

### جوگرافیا و سنووری میرنشینی ئەردەڵان لە سەردەمی سەفەویدا

ئەردەڵانەکان بنەماڵەیەکی کوردن کە بۆ سەردەمێکی دوورودرێژ (لە سەدەی (١٣)ەوە تا سەرەتای سەدەی ١٩مـی زایینی) حوکمڕانی بەشێکی گەورەی کوردستانیان کردووە. سەرچاوە مێژووییەکان سەبارەت بە بنەما و بنچینەی خانەدانی ئەردەڵان و چۆنێتی دەسەڵات گرتنیان، زانیارییەکی ڕوون بەدەستەوە نادەن. شەرەفنامە وەکو کۆنترین کتێبی مێژووی کورد، پێشینەی حوکمڕانییان بۆ کۆتاییەکانی دەوڵەتی "بنەماڵەی چەنگیز" کە مەبەست حکوومەتی ئیلخانییە دەگەڕێنێتەوە و دەڵێت کە لەم سەردەمەدا کەسێك بە ناوی بابا ئەردەل کە لە ڕەچەڵەکی فەرمانڕەوا مەروانییەکانی دیاربەکر بوو، دەستی بەسەر شارەزووردا گرت و حکوومەتێکی سەربەخۆی تێدا دامەزراند (بدلیسی، ١٨٦٠: ٨٣). بدلیسی هەروەها ناوی ٧ کەسی وەکو جێنشینەکانی بابا ئەردەل لە ماوەی نێوان کۆتایی حکوومەتی ئیلخانی و سەرەتای حکوومەتی سەفەوی،

هێناوە . بەڵام بێ ئاگابوونی خۆی لە ڕووداوەکانی سەردەم و ماوەی حوکمڕانیی هەریەکیان دەردەبڕێت (پێشوو)، بۆیەش هیچ زانیارییەك لە مەڕ پێوەندییان لەگەڵ حکوومەتەکانی تری ناوچەکە، سنووری ناوچەکانی ژێر دەسەڵات، و ڕادەی سەربەخۆبوونیان بە دەستەوە نادات. گومان دەکرێ کە لە سەردەمی باسکراودا ناوچەیەکی تا ڕادەیەك بچووك کە ناوەندەکەی شارەزوور بوو، لە ژێر دەسەڵاتی ئەردەڵانەکاندا بووبێت و هاوکات لەگەڵ دەربڕینی گوێڕایەڵیی خۆیان بۆ حوکمڕان و پادشا بەهێزترەکان، هەر کات هەلێکی گونجاویان بۆ ڕەخسابێت، پەلیان بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی دەوروبەر هاویشتووە. وادیارە کە بۆشایی هێزێك کە لە مەودای نێوان شکستی ئوزون حەسەنی ئاققوینلوو لە سولتان محەمەدی فاتیح (١٤٧٣/١٤٧٤) و سەرهەڵدانی شا ئیسماعیلی یەکەم (١٥٠١)دا وەدی هاتبوو، یەك لەو گونجاوترین هەلانە بووە. لەم قۆناغەدا کە سیمای بەرچاوی لاوازبوونی دەسەڵاتی حکوومەتی ئاققوینلوو و شەڕی نێوخۆی ئەندامانی بنەماڵەی فەرمانڕەوایە، مەئموون بەیگی یەکەم (١٤٥٧–١٤٩٥) دەسەڵاتی میرنشینی ئەردەڵانی بەدەستەوە بوو. ناوبراو بە باشی توانی دۆخەکە بقۆزێتەوە و ناوچەکانی کۆی و حەریر و ڕواندز کە بە پێی سەرچاوەکان پێشتر سەر بە میرنشینی ئەردەڵان بوو و لە سەردەمی یەکێك لە میرانی پێشوودا لە کیس چووبوو، بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی (ئەلحوسەینی، ٢٠٠٢: ١١، مردوخ کردستانی، بی تا: ٩٤). بەم پێیە دەتوانین بڵێین کە لەم سەردەمەدا میرنشینی ئەردەڵان گەیشتۆتە ئەوپەڕی گەشەی خۆی، چونکو ئەو ناوچانەی کە مەئموون بەیگی یەکەم بەڕێوەبردنیان دەسپێرێتە دەست کوڕەکانی، پانتاییەکی بەرین کە لە ڕۆژهەڵاتەوە دەگاتە ناوچەی عەلی شەکەر (هەمەدانی ئێستا) و لە ڕۆژئاواوە دەگاتە ئامێدی (لە باکووری مووسڵ)، لە خۆ دەگرێت (مصنف، ٢٥٣٦: ١١، ئەلحوسەینی، ٢٠٠٢: ١١و١٢، مردوخ کردستانی، بی تا: ٩٤).

کۆتایی حوکمڕانی مەئموون بەیگی یەکەم لە میرنشینی ئەردەڵان هاوکاتە لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی لە لایەن شا ئیسماعیلی یەکەمەوە (١٥٠١–١٥٢٤)، لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوی و پەل هاویشتنی ئیمپراتۆری عوسمانی بۆ داگیرکردنی ناوچە کوردنشینەکان، میرنشینی ئەردەڵانیش لە دوو

لاوە کەوتە ژێر گوشاری ئەم دوو هێزە گەورەیە و تا کۆتایی سەردەمی سەفەوی ناچار کرا کە لە بەشێکی سەرەکی قەڵەمڕەوی خۆی بە تایبەت لە لای ڕۆژئاواوە بۆ قازانجی عوسمانی، چاوپۆشی بکات (اسکندر، ٢٠٠٨: ٦٢). بۆیە کاتێ باس لە قەڵەمڕەو و جوگرافیای یەکەیەکی سیاسی، بە تایبەت حکوومەتێکی درێژخایەن وەکو میرنشینی ئەردەڵان دەکرێ، دەبێ ئەوەمان لە یاد بێت کە لەگەڵ چەمکێکدا ڕووبەڕووین کە بە درێژایی کات گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە. مەخابن هیچ کام لە سەرچاوەکانی سەردەمی سەفەوی باسێك لە جوگرافیا و سنووری ناوچە ژێردەسەڵاتەکانی میرنشینی ئەردەڵان ناکەن. بۆیە لەم بارەوە ناچارین کە بە زانیاریی مێژوونووسە کوردەکانی سەردەمی قاجار کە ئاوڕیان لە بابەتەکە داوەتەوە و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی میرانی ئەردەڵانیان هەڵداوە، پشت ببەستین. ئەڵبەت ئاشکرایە کە زانیاریی ئەم سەرچاوانەش پێوەندیی بە سەردەمی قاجار و دوا قۆناغی ژیانی میرنشینی ئەردەڵان کە تێدا قەڵەمڕەوی میرنشینەکە بەرتەسك ببووەوە، هەیە و بۆ ناسینی قەڵەمڕەوی ئەردەڵانەکان لە سەردەمی سەفەوی و بە تایبەت لە نیوەی یەکەمی ئەم سەردەمەدا، دەبێ بە زانیاری سەرچاوەکانی سەردەمی سەفەوی و ئەو ئاماژە ناڕاستەوخۆیانەی کە لە کاتی باسکردنی ڕووداوەکاندا، دەیکەنە سەر بابەتەکە، دەوڵەمەند بکرێت.

**حەدیقەی ناسرییە** کە سەرچاوەیەکە لە کۆتایی سەردەمی قاجاردا نووسراوە، باس لە ١٧ "بلوك" واتە حاکمنشینی سەر بە میرنشینی ئەردەڵان دەکات. لە باکووری ئەم بلوکانەدا بانە و سەقز، لە باشوور جوانڕۆ ، لە ڕۆژهەڵات ئێسفەندئاباد و لەیلاخ و لە لای ڕۆژئاواوە مەریوان و هەورامان بەرچاو دەکەون (وقایع نگار، ١٩٨٥: ٤٣–٧٥). **سیر الاکرادیش** کە کتێبێکی تری سەردەمی قاجارە سنوورێکی هاوشێوەی وەکو ناوچەی ژێر دەسەڵاتی میرنشینی ئەردەڵان دەستنیشان کردووە کە لە لایەن ڕۆژهەڵاتەوە دەگاتە هەمەدان و لە ڕۆژئاواوە دەگاتە پێنجوێن و لە باکوور و باشووریشەوە ناوچەکانی موکریان و زەهاو هەڵکەوتوون (بابابانی، ١٣٧٧: ١٩٠–١٩٢). ئەم ناوچەیە تا ڕادەیەکی زۆر لەگەڵ سنووری ئێستای پارێزگای کوردستان لە ئێران یەکدەگرێت ، بەڵام نەختێکی

لەویش زیادە و سەرەڕای ئەو هەندێ ناوچەی لای باکووری خۆرهەڵاتی پارێزگای کرماشان کە بریتییە لە قەزاکانی پاوە و جوانرۆ، لە خۆ دەگرێت.

بە ئاوڕدانەوە لە سەرچاوەکانی مێژووی سەفەوییە و ئەو ئاماژە ناڕاستەوخۆیانەی کە مێژوونووسە کوردەکانی سەردەمی قاجار لە بارەی پێشهاتە سیاسییەکانی میرنشینی ئەردەڵان لەم سەردەمەدا بەدەستیەوە دەدەن، دەکرێ بگەینە ئەم باوەڕەی کە جگە لە سنووری خۆرئاوای قەڵەمڕەوی ئەردەڵانەکان کە لە سەردەمی سەفەویدا بە هۆی شەڕ و ئاڵۆزی و یانیش هاوپەیمانی و یەکگرتن لەگەڵ عوسمانیدا، هەندێ جار گۆڕانی بەرچاوی بەخۆیەوە دەبینی، سنوورەکانی تری ئەم میرنشینە تا ڕادەیەکی زۆر جێگیر بووە و جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەوی کە لە سەرچاوەکانی سەردەمی قاجاردا هاتووە، نەبووە و نموونەیەکی وەك هێرشەکانی تەیموورخانی ئەردەڵان بۆ سەر هاوپەیمانەکانی دەوڵەتی سەفەوی لە نیوەی یەکەمی ئەم سەردەمەدا، بە دیاردەیەکی دەگمەن دەژمێردرێت. بە شێوەیەکی گشتی لە سەردەمی سەفەویشدا دەسەڵاتی ئەردەڵانەکان لە باکوور و باشوورەوە لە لایەن هۆزە کوردەکانی موکری و کەلهوڕ و لە ڕۆژهەڵاتیشەوە لە لایەنەن بیگلەربەگی ناوچەی عەلی شەکەرەوە (هەمەدانی ئێستا) کە سەربە دەوڵەتی سەفەی بوو، بەرتەسك دەکرایەوە. بەڵام لە لای ڕۆژئاواوە، بە هۆی شەڕ و ئاڵۆزییەکانی نێوان سەفەوی و عوسمانییەکان، سنووری میرنشینەکە گۆڕانی زۆری بە خۆیەوە دەبینی و هەروەها کە لە درێژەی باسەکەدا شی دەکەینەوە، هەندێ لە میرانی ئەردەڵان بە شێوازی جۆراو جۆر هەوڵیان دەدا کە دەسەڵاتی خۆیان بە سەر ناوچەکانی ڕۆژئاوای دەشتی شارەزووردا کە بەشێکی گرنگی هەرێمی ئێستای باشووری کوردستان لە خۆ دەگرێت و ئەردەڵانەکان بە سنووری سروشتیی ناوچەی ژێردەسەڵاتی خۆیان دادەنا، بسەپێنن و بۆ گەیشتن بەم ئامانجە سیاسەتێکی بگۆڕیان لە دۆستایەتی لەگەڵ عوسمانی تا لیستنی ڕۆڵی هاوپەیمانی قزڵباشەکان، گرتە بەر. تەیموورخانی ئەردەڵان و هەروەها هەڵۆ خان لە ساڵەکانی سەرەتای دەسەڵاتدارێتی خۆیدا، توانییان بە ڕەزامەندی دەوڵەتی عوسمانییەوە، دەست بەسەر ئەم ناوچانەدا بگرن. بەڵام خان ئەحمەد خان جێنشینی هەڵۆخان لە ڕێگەی شەڕ و بەکارهێنانی هێزی سەربازییەوە بە

پشتیوانیی شاعەباسی سەفەوی و لە دەسپێشخەرییەکدا  کە لە چوارچێوەی پلانە گشتییەکانی شاعەباسی یەکەم دژ بە عوسمانی لێک دەدرێتەوە، ناوچەیەکی بەرینی کە لە ڕۆژئاواوە تا نزیکەی مووسڵ دەگەیشت، خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە (ترکمان، ١٣٥٠ : ١٠٠٦ ، مصنف، ٢٥٣٦: ٢٨). بەڵام سەرەڕای ئەم هەوڵانە ئەردەڵانەکان لە ئاکامدا شکستیان  لە چەسپاندنی دەسەڵاتی بەردەوامیی خۆیان لەم ناوچەیە هێنا. نموونەی خان ئەحمەد خان دوایین نموونەیە  کە ئەوان توانییان سوود لە ناکۆکیی نێوان سەفەوی و عوسمانی  وەرگرن. دوای ئەمە لەگەڵ کۆتاییهاتن بە شەڕ و ئاڵۆزیی نێوان دوو ئیمپراتۆری سەفەوی و عوسمانی و هێوربوونەوەی بارودۆخەکە بە تایبەت پاش ئیمزاکرانی ڕێکەوتننامەی زەهاو (١٦٣٩)، ئەردەڵانەکانیش تا کۆتایی حوکمڕانیی بنەماڵەی سەفەوی ئیمکانی سوود وەرگرتن لە ناکۆکییەکانی نێوان ئەم دوو دەوڵەتانەیان لە دەست دا.  لە کۆتاییدا ئەوان بۆ هەتاهەتایە ناوچە بە پیتەکانی ڕۆژئاوای شارەزووریان لە کیس چوو و لەم ناوچانەدا بە پشتیوانی دەوڵەتی عوسمانی میرنشینێکی تری کورد کە ڕکەبەرایەتی ئەردەڵانەکانی دەکرد (میرنشینی بابان) ، سەری هەڵدا (اسکندر، ٢٠٠٨: ٦٣).

## پێگەی جیۆپۆلیتیکی کوردستان لە سەردەمی سەفەویدا

سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوی لە ئێران و پەل هاویشتنی ئیمپراتۆری عوسمانی بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات، سەرەنجام ڕێگەی بۆ پێکدادانی ئەم دوو هێزە خۆش کرد. یەکەم شەڕی گەورە لە ساڵی ١٥١٤. لە دەشتی چالدێران ڕووی دا. دوای ئەمە لە سەرتاسەری سەدەی دەیەم و نیوەی یەکەمی سەدەی یازدەی کۆچیدا، سەرەڕای ئیمزاکرانی چەند ڕێکەوتننامەی ئاشتیی کاتی و ناجێگیر، پێوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت  کە زۆر جار شەڕی خوێناوی و گەورەی لێ دەکەوتەوە، درێژەی هەبوو. کوردستان بە شێوەیەکی گشتی و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی میرنشینی ئەردەڵان بە تایبەتی، لە ناوەندی ئەم شەڕانەدا هەڵکەوتبوو و بۆیەش سەرکەوتن لەم ناوچانە و دەستگرتن بەسەر ڕێگاوبان و قەڵا ستراتیجییەکانی، ڕۆڵێکی یەکجار گرنگی لە شکاندنەوەی

هاوسەنگی هێز لە بەرژەوەندی یەك لە لایەنەكانی شەڕەكەدا دەبینی و ئەم یەكەش بەبێ یارمەتیی میر و سەرۆك هۆزە كوردەكان كە ناوچەكانیان بە سەر ئەم ڕێگایانەوە بوو، نەدەچووە سەر. شا ئیسماعیلی یەكەم بە هۆی دەمارگرژیی مەزهەبییەوە نەیتوانی كە هاوكاری سەرۆك و میرە كوردەكان بەلای خۆیەوە ڕاكێشی و سیاسەتی دانانی سەرۆكە تورك و قزلباشەكان لە حكومەتی ناوچە كوردییەكان كە لە لایەن ناوبراوەوە پێڕەو دەكرا (لەوانە حەسەن كێف و چەمەشگەزك و جزیرە ، بڕوانە: بدلیسی، ١٣٤٣: ٢٠٦و٢١٧و١٦٨) ، ڕێگای بۆ هەڵگەڕانەوەی كوردەكان لە سەفەوییە و یەكگرتنیان لەگەڵ عوسمانی خۆش كرد، بە شێوەیەك كە هاوكاری هۆز و سەرۆك هۆزە كوردەكان، ڕۆڵێكی گرنگی لە سەركەوتنی عوسمانی و شكستی سەفەوییە لە شەڕی چالدێراندا هەبوو (اسكندر، ٢٠٠٨: ٤٦، ئیسكەندەر، ٢٠٠٩: ١٠٠).

شكستی چالدێران بە خاڵی دەسپێكی گۆڕانی سیاسەتی سەفەوییەكان لە كوردستان دەژمێردرێت. دوای ئەمە ئەوان گرنگیی ڕۆڵی كوردیان لە شەڕ لەگەڵ عوسمانی بۆ دەركەوت. شا تەهماسبی كوڕ و جێنشینی شائیسماعیل بە گرتنە بەری سیاسەتێكی ڕیالیستی هەوڵی دا كە لە ڕێگای سازان و پێكهاتن لەگەڵ هەندێ سەرۆك هۆزی كورد و ناسینی ماف حوكمڕانی پشتاوپشتیانەوە، یارمەتییان لە ململانێ لەگەڵ عوسمانی بۆ خۆی دەستەبەر بكات (اسكندر، ٢٠٠٨: ٥١). ئەم سیاسەتە دوای شاتەهماسب لە لایەن جێنشینەكانیشیەوە درێژەی پێ درا و هەندێ میرنشین و دەسەڵاتی عەشیرەیی كورد لە بەرانبەر یارمەتیدانی سەفەوییەكان لە شەڕ لەگەڵ عوسمانی و ناسینی گەورەیی و باڵادەستیی ئەوان، دەیانتوانی لە چوارچێوی ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی سەفەوییدا، درێژە بە بوون و حوكمڕانی نیوە سەربەخۆی خۆیان بدەن. هاوكات عوسمانییەكانیش قازانجی پشتیوانیی میرە كوردەكانیان لە پێش چاو بوو و لە ڕێگای هاوشێوەوە هەوڵیان دەدا كە بە لای خۆیانەوە ڕایانبكێشن. ئەم كێبڕكێیە بووە هۆی ئەوەی كە پێگە و گرنگیی میرنشینە كوردییەكان لە درێژەی شەڕەكانی نێوان سەفەوی و عوسمانیدا بە شێوەیەكی بەرچاو زیاد بكات. بە درێژایی سەدەی ١٠ و نیوەی یەكەمی سەدەی ١١ ك. كە ئەم شەڕ و ململانێیە بەردەوام بوو، هەر هۆز و

عەشیرەتێکی کورد کە لە عوسمانی یاخی بووایە، لە لایەن سەفەوییەکانەوە پێشوازی لێ دەکرا و هەروەها هۆز و عەشیرەتێکیش کە لە دژی سەفەوییەکان سەری هەڵدابا، لە لایەن عوسمانییەوە پشتگیری دەکرا. بتلیسی دەڵێ کە سوڵتان سولەیمانی غازی بۆ دابینکردنی بژێوی محەمەد خان سەرۆکی عەشیرەتی مەحموودی کە پشتی لە شا تەهماسبی سەفەوی کردبوو و خۆی خستبووە ژێر ڕکێفی عوسمانییەوە، ڕۆژانە ١٠٠ ئاقچەی بڕیبوویەوە (ئیسکەندەر، ٢٠٠٩: ١٣٦ ، هەروەها بڕوانە: بدلیسی، ١٣٤٣: ٣٩٢). سوود وەرگرتنی میرە بچووکەکان لە ململانێ و ناکۆکیی نێوان هێزە گەورەکان، دیاردەیەکی باو بووە و نموونەی هاوشێوەی لە مێژوودا زۆر بەرچاو دەکەوێ. ئیسکەندەر بەیگی مۆنشی بە چەند ڕستەیەکی جوان و ڕوون چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم تاکتیکەی لە لایەن عەلائودەولەی زولقەدر میری مەرعەش و ئەلبۆستان کە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی دەکەوتە مەیدانی ململانێی عوسمانی و مەملووکەکانی میسرەوە، شی دەکاتەوە و دەری دەخات کە ناوبراو چۆن لە ڕێگای ترساندنی هەریەك لەو دوو حکوومەتە بە بەستنی هاوپەیمانی لەگەڵ ئەوی دیکە، هەوڵ دەدات کە پێگە و دەسەڵاتی خۆی پتەو بکات. سیاسەتێك کە لە درێژایی شەڕی دوور و درێژی نێوان سەفەوی و عوسمانی لە لایەن زۆرێك لە میرە کوردەکانەوە پێڕەو دەکرا. ئیسکەندەر بەیگ دەنووسێ : « عەلائودەولە...کاتێ نوێنەری ڕۆم دەهاتە لای، چەند پێشکارێکی خۆی دەستنیشان دەکردن و بەرگی میسرییانەی پێ لەبەر دەکردن و بە نوێنەرانی ڕۆمی دەوت: نوێنەری میسری هاتووە، لە دژی ئێوە داوای یارمەتیم لێ دەکەن، بەڵام من لەبەر ئەوەی دۆستی سوڵتانم، خواستی وا قەبووڵ ناکەم. هەرکە نوێنەری میسریش دەهاتە لای هەر بەو جۆرە ڕەفتاری لەگەڵ دەکردن. عەلائودەولە هەمیشە دەیوت: «من دوو باڵداری زێڕینم هەن، یەکیان هێلکەی زێڕ و ئەوی دیکەیان هێلکەی زیوم بۆ دەکات » (ئیسکەندەر،٢٠٠٩: ٩٥، بڕوانە: ترکمان، ١٣٥٠: ١/٣٣).

میرنشینیی ئەردەڵان لە جەرگەی ئەو میرنشین و دەسەڵاتە عەشیرەییە کوردانەدا کە لە ململانێی سەفەوی–عوسمانیدا ڕۆڵیان دەبینی، لە بەر هەندێ هۆکاری جۆراوجۆر، لەوانە بەرفراوانبوونی ناوچەکانی ژێر دەسەڵات، زۆربوونی

حەشـیمەت ، پێشـینەی دوور و درێـژی حـوکمڕانی و زاڵبـوون بەسـەر ئـەو ڕێگـا سـتراتیجییانەی کـە ناوچـەی مێسـۆپۆتامیای بـە بەرزاییـەکانی زاگرۆسـەوە دەبەسـتەوە، خـاوەن گرنگییـەکی تایبـەت بـوو. لـە ڕوانگـەی سـەفەوییەکانەوە میرنشینی ئەردەڵان و قەڵا و بەرزاییەکانی، بەربەستێکی پتەویان لە بەرانبەر ئەو هێرشـانەدا کـە عوسمـانی بـە ئامـانجی داگیرکردنـی ناوچـەکانی ڕۆژئـاوای ئێـران دەیکرد، پێك دەهێنـا و داگیرکردنـی بـۆ عوسمانییـەکانیش بـە واتـای خۆشـبوونی ڕێگا بۆ دەستگرتن بەسەر قووڵایی خـاکی دەوڵـەتی سـەفەوی دەهـات (کجبـاف، میرجعفری و نوری، ۱۳۹۰: ۱۱۱). بۆیە هەردوو دەوڵـەت هـەوڵیان دەدا کـە میرانـی ئـەردەڵان بـەلای خۆیانـەوە ڕاکێشـن و ئەردەڵانـەکانیش ئـەم هەلـەیان لـە بەرژەوەندیی خۆیان دەقۆستەوە و هەوڵیان دەدا کە بۆ پتەوکردنی پێگە و گرتنی ئیمتیـاز لـەم دەوڵەتانـە بـەکاری بهێـنن . سـەرەنجام ئـەوان زۆرتـر بـەلای سـەفەوییەکانەوە ڕاکێشـران و بـە ناسـینی گـەورەیی و باڵادەسـتی پادشـا سـەفەوییەکان توانییـان وەکـو یـەك لـە چـوار والییەکـەی ئیمپراتـۆری سـەفەوی، بەشێکی زۆر لە سەربەخۆیی و مـافی میرایـەتی پشتاوپشـت لـە نـاو بنەماڵەکەیانـدا بپـارێزن. جێـی ئاماژەیـە کـە والییـەکان لـە ڕیـزی میرەکـانی سـەر بـە دەوڵـەتی سەفەویدا خاوەن پێگەیەکی بەرز و تایبەت بوون. بـە پێـی زانیارییـەکانی (تـذکرة الملـوك) کـە دەربـارەی سیسـتەمی کـارگێڕی دەوڵـەتی سـەفەوییەوە نووسـراوە، قەڵـەمڕەویی پـان و بـەرینی ئیمپراتـۆری سـەفەوی لـە لایـەن هەنـدێ حـاکم و کاربەدەستەوە، کە دەسەڵاتی جیاوازیان هەبوو، بەڕێوە دەبرا. ئـەم ئەمیرانـە کـە لە بەرانبەر ئەوانەی کە لە کۆشکی شاهیدا (دولەتخانە) دەژیان بە ئەمیرانی غەیری دەولەتخانە (غیر دولتخانە) یا سەرحەد (امراء سرحد) دەناسران، بـە پێـی پێگـەو گرنگی بریتی بوون لەمانە:

١- والییـەکان ٢- بیگلەربەگـەکان ٣- خانـەکان ٤- سـوڵتانەکان (مـیرزا سمیعا، ۱۹۸۹: ٤).

بە باوەڕی ئێمە مەبەست لە" شان و شـکۆ" کـە لـە تـذکرة الملـوك وەکـو بنەمای ئەم دابەشـکارییە ئامـاژەی پـێ دەدرێـت، پـێش هـەموو شـتیك بـۆ ڕادەی سـەربەخۆیی و گـەورەبوونی قەڵـەمڕەویی هەریـەك لـەو ئـەمیر و کاربەدەسـتانە

دەگەڕێتەوە . لە سەرتاسەری ئیمپراتۆریدا تەنها چوار کەس نازناوی والییان هەبوو کە بریتی بوون لە حاکمەکانی عەرەبستان (بەشێك لە پارێزگای خوزستانی ئێستا) و کوردستان (ئەردەڵان) و گورجستان و لوڕستان (پێشوو: ٥). لەم چوار ویلایەتەدا مافی حوکمڕانی پشتاوپشت لە بنەماڵە فەرمانڕەواکانی ناوچەکەدا دەمایەوە و سەفەوییەکان دانیان بە دەسەڵاتی نیمچە سەربەخۆیاندا نابوو. ڕەهێر بێرن، نووسەری کتێبی: «نظام ایالات در دورەی صفویه » لە بارەی ڕادەی سەربەخۆیی و دەسەڵاتی «چوار والی » یەکەوە دەنووسێ: « لە چاو هاوچەرخەکانیەوە، والی بە پێچەوانەی حاکم و میرانی ئاساییەوە، بە خاوەن و دەسەڵاتداری ڕاستەقینەی ویلایەتی ژێر فەرمانی خۆی دەژمێردرا. هەروەها کە پادشا خاوەنی قەڵەمڕەوی خۆی بوو. ئیسکەندەر بەیگی تورکمان لە جێگایەکدا خان ئەحمەد خان میری کوردستان بە" فەرمانڕەوای سەربەخۆی ئەردەڵان و ڕێوەبەری موڵکی میراتی"...ناو دەبات. هەمان نووسەر سوڵتان مەحموود (سیمۆنی یەکەم) حوکمڕانی کارتیل بە"خاوەنی ئەلکای ویراسی" دەزانێ (برن، ١٣٤٩: ١٣٨).

والی هەروەها دەسەڵاتێکی فراوانی لە دانانی حاکم و بەرپرسانی ژێر دەستی خۆیدا هەبوو. لە پێوەندیی لەگەڵ میرنشینی ئەردەڵاندا، بێجگە لە کۆتاییەکانی سەردەمی سەفەوی کە لەگەڵ قۆناغی لاوازی و بێهێزبوونی ئەردەڵاندا هاوکاتە، دەوڵەتی ناوەندی دەستی لە کاروباری ناوخۆی میرنشینەکە و دانان و لادانی حاکمە ژێردەستەکان وەرنەدەدا. "والی نشینەکان " باج یان "مالیات" ێکیشیان بۆ ناوەند نەدەنارد و تەنیا لە هەندێ بۆنەی تایبەت وەکو جەژنی نەورۆزدا دیارییەکیان پێشکەشی سوڵتان دەکرد (میرزا سمیعا، ١٣٦٨: ٧٦، برن، ١٣٤٩: ١٣٩ ، اردلان، ١٣٨٧: ٥٧). لە بەرانبەردا ئەرکی سەرەکی والی پاراستنی سنوورەکان لە دەسدرێژی عوسمانی بوو، ئەوان دەبوو ئینتیمایان بۆ شا هەبێت و لە کاتی شەڕ و لەشکرکێشیدا سەربازی بۆ کۆبکەنەوە (اردلان، ١٣٨٧: ٥٧).

لە ڕاستیدا هەڵکەوتنی هەر چوار والی نشینەکەی ئیمپراتۆری سەفەوی لە سەر سنووری ڕۆژئاوا ، بەڕێکەوت نییە و تا ڕادەیەکی زۆر شەڕ و ئاڵۆزییە

بەردەوامەکانی ئەم سنووره لەگەڵ عوسمانی، ئەو شێوازی بەڕێوەبردنەی فەرز کردبوو. ناسینی مافی حوکمڕانی پشتاوپشتی میرانی ئەم ناوچانە، یارمەتی و پشتیوانیی ئەوانی لە شەڕ لەگەڵ عوسمانی دەستەبەر دەکرد. یارمەتییەك کە بە هۆی توانای بنەماڵە دەسەڵاتدارەکان بۆ کۆکردنەوەی سەرباز لە ناوچەکانی خۆیان (کە بەهۆی پێوەندییە عەشیرەیییەکان و ڕەوابوونێك کە بەرهەمی حوکمڕانیی دوور و درێژ بوو، بە باشی پێیان هەڵدەسووڕا) و ناسینی جوگرافیا و ڕێگاوبانەکان، کاریگەری و گرنگییەکی تایبەتی لە یەکلاییکردنەوەی ململانێ و بردنەوەیی شەڕەکاندا هەبوو. هاوکات هەوڵ دەدرا کە بەم کارە پێش بە بەستنی هاوپەیمانی لەگەڵ دەوڵەتی نەیاردا بگیرێ. چونکە لە هەلومەرجێکدا کە شەڕ و ململانێی نێوان سەفەوی و عوسمانی بەردەوام بوو، هەر چەشنە هەوڵێکی ئاشکرا بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی ناوەند بە سەر میرنشینەکانی سەر سنووردا، دەبووە هۆی ئەوەی کە بەرەو ئۆردوگای بەرانبەر و یەکگرتن لەگەڵ دوژمن هان بدرێن. بۆیە دەتوانین بڵێین کە پێگە و گرنگی و تەنانەت بوون و مانەوەی میرنشینەکانی سەر سنوور، تا ڕادەیەکی زۆر بە بەردەوامبوونی شەڕ و ئاڵۆزییەکانی نێوان دوو ئیمپراتۆری سەفەوی و عوسمانی بەسترابوویەوە.

### میرنشینی ئەردەڵان لە دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوییەوە تا ڕێکەوتننامەی زەهاو (١٥٠١-١٦٣٩)

بەردەوامیی شەڕ و ئاڵۆزییەکانی نێوان دەوڵەتی سەفەوی و ئیمپراتۆری عوسمانی، دیارترین فاکتەرێکە کە قۆناغی پێش ڕێکەوتننامەی زەهاو لە قۆناغی دوای خۆی جیا دەکاتەوە. پێش ڕێکەوتنی زەهاو، سەرەڕای چەند پەیماننامەیەکی ئاشتی و لەوانە پەیماننامەی ئەماسیە (٢٩ی ئایاری ١٥٥٥) و ئەو دوو ڕێکەوتننامەی کە لە سەردەمی حوکمڕانی شا عەباسی یەکەمدا لە ساڵەکانی ١٥٨٩ و ١٦١٣. لە ئیستانبوڵ واژۆ کران، کۆتایی بە شەڕەکە نەهات و هەردوولا وەکو تاکتیکێك سەیری ئەمەیان دەکرد و چاوەڕێ بوون کە لە هەلێکی گونجاودا بە زووترین کات شەڕ دەست پێ بکەنەوە. لە ساڵی ١٥٧٨ دا سوڵتان مورادی سێهەم ئەو هەلەی کە لە ئاکامی ئاڵۆزییە ناوخۆیییەکان و لاوازبوونی حوکمڕانیی

شا محەممەدی خودابەندە ، دەستی دابوو، قۆزتەوە و بە هێرشکردنە سەر قەڵەمڕەوی سەفەوی، کۆتایی بەو ناوبەرە ئارامە کە دوای ٥٠ ساڵ شەڕ لە ئەنجامی ڕێکەوتننامەی ئاماسیاوە هاتبووە ئاراوە، هێنا (بیانی، ١٣٥٣: ١٧٢). هەروەها ئیمزاکرانی پەیماننامەی ئاشتی لە ساڵی ١٥٨٩. لە لایەن شا عەباسی یەکەمیشەوە، تاکتیکێك بوو بۆ ئەوەی بتوانێ دوای زاڵبوون بەسەر ڕەوشی ناوخۆی وڵات و بەرەنگار بوونەوەی هێرشی ئوزبەکەکان لە سنووری ڕۆژهەڵات، پلانەکانی بۆ دەستپێکردنەوەی شەڕ لەگەڵ عوسمانی و گرتنەوەی ناوچە داگیرکراوەکان، جێبەجێ بکات. لە ساڵی ١٦٠٣دا پاش ئەو سەرکەوتنانەی کە لە بەرەی ڕۆژهەڵات بە دەستی هێنا، شا عەباس شەڕ لەگەڵ عوسمانی دەست پێ کردەوە و ناچاری کردن کە بە ئیمزاکردنی ڕێکەوتننامەیەکی دیکە لە ساڵی ١٠٢٢ ك، ناوچە داگیرکراوەکان بۆ دەوڵەتی سەفەوی بگەڕێننەوە (رویمر، ١٣٥: ٣٥٤). بەڵام تەنانەت ئەم ڕێکەوتنەش نەبووە هۆی سەقامگیریی ڕەوشەکە و لە ساڵی ١٦٢٣، سەفەوییەکان لە ناوچەی میزۆپۆتامیا دەستیان بە شەڕی هێرشکارانە کردەوە (پێشوو).

ئەردەڵانەکان لە دەسپێکی شەڕ و ململانێی سەفەوی– عوسمانیدا، هەوڵیان دا کە بە گرتنەبەری سیاسەتێکی بێ لایەن، خۆیان لە ئاگری شەڕی خوێناوی ئەو دوو هێزە دوور بگرن. تەنانەت لە شەڕی گەورەی چالدێرانیشدا (٢٣ی ئابی ١٥١٤) کە زۆرێك لە هۆز و سەرۆك هۆزە کوردەکان ڕۆڵی چالاکیان تێدا گێڕا، ئەردەڵانەکان زۆری لە بەر دووربوونی ناوچەکانیان لە مەیدانی شەڕەکەوە، تێوە نەگلان (خضري و قائدان و آيينەپور، ٢٠١٢ :١٩). بەڵام لەگەڵ پەرەسەندنی ململانێکە و پەل هاویشتنی بۆ ناوچەکانی دەوروبەر، چیتر درێژەدان بە سیاسەتی بێلایەنی مومکین نەبوو. لە ساڵی ١٥٣٢ دا، سوڵتان سولەیمانی قانوونی یەکەم هێرش لە زنجیرە هێرشەکانی خۆی بۆ ئێران دەست پێ کرد کە داگیرکردنی شاری تەورێز، پایتەختی پێشووی سەفەوییەکانی لێ کەوتەوە.

لە سەروبەندی ئەم هێرشەدا کاتێ کە سوپای عوسمانی بۆ دابینکردنی تفاقی خۆی تووشی ئاستەنگی بووبوو، بەگە بەگ (١٤٩٤/٦/١٥٣٥) میری ئەوکاتی ئەردەڵان بە ناردنی کاروانێکی هەڵگری پێداویستییەکانی سوپا، هاوکاری

عوسمانییەکانی کرد (پێشوو:٢٠). بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هێندەی پێ نەچوو کە مەترسی دەوڵەتی پاوەنخوازی عوسمانی، ئاشکرا بوو. چەند ساڵ دواتر سوپایەك لە لایەن سوڵتان سولەیمانی قانوونییەوە، بە سەرکردایەتی حسێن پاشا ڕووی لە شارەزوور کە ئەوکات ناوەندی دەسەڵاتدارێتی ئەردەڵانەکان بوو، کرد و مەئموون بەگی سانی (١٥٣٥ـ ١٥٣٨/٩) کوڕ و جێنشینی بەگە بەگی لە قەڵای زەڵم، لە بناری چیاکانی هەورامان، گەمارۆ دا و دوای ماوەیەك بەرگری لەو قەڵایەدا دەستبەسەر ڕەوانەی ئەستەنبۆڵی کرد (بدلیسی ، ١٨٦٠: ٨٤). وا دەرئەکەوێت کە دوای ئەم ڕووداوە، سۆرخاب بەگ مامی مەئموون بەگ کە حوکمڕانی قەڵای مەریوان و ناوچەکانی دەوروبەری بوو، بە ڕادەی مەترسی دەوڵەتی عوسمانی بۆ میرنشینی ئەردەڵانی زانیبێت. بۆیە ناوبراو بۆ بەرەنگار بوونەوەی مەترسیی عوسمانییەکان کە لەم کاتەدا زۆرتر بوو، ڕووی لە سەفەوییەکان کرد و لەگەڵ دەربڕینی فەرمانبەرداری خۆی بۆ شا تەهماسبی یەکەم، قەڵەمڕەوی پێشووی مەئموون بەگ و محەمەد بەگی برا بچووکیشی زەوت کرد و خستیە سەر قەڵەمڕەوی خۆی (پێشوو: ٨٥). لە ساڵی ١٥٤٠ نموونەیەکی بەرجەستەی هاوکاریی هەردوو لا دژ بە عوسمانی بەرچاو دەکەوێت. دەوڵەتی عوسمانی سوپایەکی گەورەی بە سەرکردایەتی ڕۆستەم پاشا کە دوو ئەمیرزادەی ئەردەڵانی (مەئموون بەگ و محەمەد بەگ) لەگەڵدا بوو، ڕەوانەی شارەزوور کرد. سۆرخاب بەگیش بە سوپاکەی خۆیەوە کە ژمارەیان زۆر کەمتر بوو، بەرگری کرد و پاش چەند ڕۆژ پێکدادان لە دەشتی شارەزوور، پەنای بردە قەڵای زەڵم و توانی بە ماوەی دوو ساڵ تا کاتێ کە شا تەهماسب توانی لەشکرێکی پانزە هەزار کەسی بۆ یارمەتی بنێرێ، خۆ ڕاگرێت. بە هاتنی ئەم هێزە سوپاکەی عوسمانی بەناچار دەستی لە ئابلۆوقەی زەڵم هەڵگرت و شارەزووریشی بە جێهێشت (مصنف، ٢٥٣٦ :١٥ ، ئەلحوسەینی ، ٢٠٠٢: ١٤و١٥، قمی، بی تا: ٣٤٣). ئەمە نموونەیەکی باش لەو بەرژەوەندییە هاوبەشانەیە کە هەر یەك لە ئیمپراتۆری سەفەوی و میرنشینیی ئەردەڵان لە ڕێگای هاوکاریکردنەوە بە دەستیان دەخست. میری ئەردەڵان بۆ ماوەی دوو ساڵ لە بەرانبەر ژمارەیەکی زۆری لەشکری عوسمانی خۆ ڕادەگرێت و ڕێگا نادات کە دەربازی قووڵایی خاکی ئیمپراتۆری سەفەوی بن و لە

بەرانبەردا پادشای سەفەویش بە ناردنی هێز، پێش بە شکستخواردنی لە عوسمانی و لەناوچوونی میرنشینەکەی دەگرێت. نموونەیەکی دیاریتر لە داستانی ئەلقاس میرزا برا یاخییەکەی شا تەهماسب کە بە پشتیوانیی عوسمانی بۆ ماوەیەکی زۆر ئاژاوەی بۆ دەوڵەتی سەفەوی نابووەوە و شا تەهماسبی نیگەران کردبوو، خۆی ئەنوێنێ. سۆرخاب بەگ لە ساڵی ٩٥٦ ك، ئەلقاس میرزای کە پاش تێکشکانی سوپاکەی لە دەشتی شارەزوور، لە قەڵای مەریوان خۆی دابوو بە دەستەوە، ڕەوانەی لای شا تەهماسب کرد (روملو، ١٣٤٢: ٣٤٠ ، قمی، بی تا :٣٣٨ ، مصنف، ٢٥٣٦: ١٤). دەرئەنجامی ئەم کارە بەرزبوونەوەی زۆرتری پێگەی سۆرخاب بەگ لای شا تەهماسب بوو. بە چەشنێك فەرمانی دا کە لە بەرانبەر ئەم خزمەتە دیارەدا، ساڵانە یەك هەزار تمەنی لە خەزێنەی پادشایی بۆ دیاری بکەن (مصنف، ٢٥٣٦: ١٥ ، ئەلحوسەینی ، ٢٠٠٢: ١٥).

سۆرخاب بەگ لە ڕێگای هاوکاری و هاوپەیمانی لەگەڵ سەفەوییەکاندا مەترسی دەوڵەتی عوسمانی لە خۆی و ئیمارەتەکەی دوور خستەوە. وا دیارە کە ڕادەی سەرکەوتنی ئەم سیاسەتە ئەوەندە زۆر بوو کە سۆرخاب بەگ توانی هەرێمەکانی ڕۆژئاوا تا نزیك ئامێدی (عمادیة) و ڕواندز بخاتەوە سەر قەڵەمڕەوی خۆی، چونکە ناوی ئەم هەرێمانە لە میانەی ئەو مەڵبەندانەی کە لە کاتی مردن لە ژێر فەرمانیدا بوون، دێت (ئەلحوسەینی ،٢٠٠٢ : ١٦). لە لایەکی تریشەوە سەرەڕای ئەوەی کە حوکمڕانی سۆرخاب بەگ سەرلەبەری کەوتبووە سەردەمی پادشایەکی بە هێزی وەك تەهماسبی یەکەم، هیچ بەڵگەیەك کە باس لە دەستێوەردانی دەوڵەتی سەفەوی لە کاروباری ناوخۆی میرنشینی ئەردەڵان و بە تایبەت لە بارەی دانانی جێنشینییەوە بکات، لە سەرچاوەکاندا وەدی ناکرێت. ئەمە لە کاتێکدایە کە مردنی سۆرخاب بەگ و جێنشینی بەسات بەگی کوڕی لە ساڵی ١٥٦٧/٨ ، واتە لە کاتێکدا ڕووی دا کە شا تەهماسب لەو پەڕی دەسەڵاتی خۆیدا بوو.

یەکەم جارێك کە سەرچاوەکان ئاماژە بە کرانەوەی دەستی دەرباری سەفەوی لە ململانێ ناوخۆیەکانی میرنشینی ئەردەڵان ئەکەن، بۆ سەردەمی فەرمانڕەوایی شا ئیسماعیلی دووەم (١٥٧٦–١٥٧٧) دەگەڕێتەوە. بە پێی

نووسینی شەرەفنامە کە خاوەنەکەی هاوچەرخی ئەم ڕووداوانەیە، تەیموورخانی ئەردەڵان و هەڵۆخانی برای کە لە دایك و بابێك پەیدا بووبوون و بە کچەزای یەکێك لە سەرۆك هۆزەکانی ئەستجانلوو دەژمێردران، لە بەسات بەگی ماميان (١٥٧٠/١-١٥٧٨/٩) یاخی بوون و ڕوویان لە دەرگای شا ئیسماعیلی سانی لە قەزوێن کرد. بەڵام پێش ئەوەی بە کردەوە کارێك بۆ پشتیوانیکردن لێیان ئەنجام بدرێت، بەسات بەگ بە مەرگی سروشتی تیا چوو و هەراکە دامرکایەوە (بدلیسی ، ١٨٦٠: ٨٧). هەڵبەت دەبێ ئەوەمان لە یاد بێت کە داڵدەدانی ئەو دوو میرزادە ئەردەڵانییە دەبێ تەنها وەکو هەوڵێکی دەوڵەتی سەفەوی بۆ دزەکردنە ناو بنەماڵەی ئەردەڵان لێك بدرێتەوە و نموونەی هاوشێوەی تەنانەت لە پێوەندیی نێوان دەوڵەتە هاوڕەدە و هاوتاکانیشدا زۆرە و هیچ دەوڵەتێك هەلێکی وەهای بە ئاسانی لە دەست نەدەدا. ئەمە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ دەستێوەردانی ڕاستەوخۆ لە کاروباری میرنشینەکە کە لە کۆتاییەکانی سەردەمی سەفەویدا بووبوو بە نەریتێکی باو، هەیە.

تەیموورخان (١٥٧٨/٩-١٥٨٩/٩٠) دوای دامەزران لە سەر تەختی حوکمڕانی ئەردەڵان ئەوەی سەلماند کە خۆی ناچاربە پاراستنی ئەو هاوپەیمانییەی کە لە سەردەمی سۆرخاب بەگەوە لەگەڵ دەوڵەتی سەفەوی بەسترابوو، نازانێت. بدلیسی لە ئاماژەیەکدا بۆ ڕەفتاری سیاسی ئەو دەنووسێت کە تەیموورخان «ساتێ ڕوومی و ساتێك قزڵباش بوو » (پێشوو:٨٨). لە کۆتاییدا ناوبراو زۆرتر بە لای عوسمانییەوە بای دا، چونکو دەوڵەتی سەفەوی و شا محەمەدی خودابەندە (١٥٧٧-١٥٨٨) لەوە لاوازتر بوون کە لە بەرانبەر عوسمانی کە لە سەردەمی سوڵتان موورادی سێیەم (١٥٧٤/١٢/٢٢-١٥٩٥/١/١٦) دەستی بە پەلامارەکانی خۆی کردبووەوە، بیپارێزن و لەولاشەوە تورکەکان کە لەم قۆناغەدا هێز و دەسەڵاتی سەردەمی سوڵتان سولەیمانیان نەمابوو، زۆرتر لە جاران ئامادەی هاوکاریکردن لەگەڵ هێزە ناوچەییەکاندا بوون (کجباف و میرجعفری و نوری، ١٣٩٠: ١١٤). بۆیە کاتێك تەیموورخان گوێڕایەڵیی خۆی بۆ سوڵتان مورادی سالس ڕاگەیاند، پێشوازییەکی زۆر لە کارەکەی کرا و نازناوی " میری میران"ی پێ بەخشرا (مردوخ کردستانی، بی تا: ٩٨). ئەم حوکمڕانە بەهێزەی ئەردەڵان لە

ڕێگای بەستنی هاوپەیمانی لەگەڵ عوسمانییەوە، ڕەزامەندی "بابی عالی" بۆ دەستگرتن بە سەر ناوچەیەکی بەرفراوان کە دەکەوتە خۆرئاوای دەشتی شارەزوور بە دەست هێنا. ئەمە ئامانجێك بوو کە سۆرخاب بەگی باپیری لە ڕێگای هاوکاریکردنی سەفەوییەکانەوە پێی گەیشتبوو. تەیموورخان پێی لەمە لەولاتریش نا و بە پشتبەستن بە پشتگیریی عوسمانی، پەلاماری ناوچەکانی سەر بە دەوڵەتی سەفەوی دا. لە ساڵی ١٥٨٥ دا هێرشی کردە سەر ناوچەی دینەوەری ژێر دەسەڵاتی عومەربەگی کەلهوڕ و لەگەڵ شا هوێردی خان والی لوڕستانیش بەشەڕهات، بەڵام چەند ساڵ دواتر لە کاتی پەلاماردانی قەڵەمڕەوی حوکمڕانیی ناوچەی زەڕین کەمەر (گەڕووسی دواتر)، کە کاربەدەستێکی تری دەوڵەتی سەفەوی بوو، کوژرا (بدلیسی ، ١٨٦٠ : ٨٨ ، ئەلحوسەینی ، ٢٠٠٢ :١٨ ، سنندجی، ١٣٦٦: ١٠١).

بە ماوەی دوو ساڵ دوای کوژرانی تەیموورخان (لە ساڵی ١٥٨٧)، ڕێکەوتننامەی یەکەمی ئەستەمبوڵ لە نێوان ئێران و عوسمانیدا واژۆ کرا. بە پێی ئەم ڕێکەوتنە شا عەباسی یەکەم (١٥٨٨–١٦٢٩) کە لە سەرەتای حوکمڕانیی خۆی لەگەڵ چەندین کێشەی ناوخۆیی و دەرەکیدا ڕووبەڕوو بوو، ناوچەیەکی فراوان لەوانە ئازەربایجان و بەشێك لە کوردستان و گورجستانی دا بە عوسمانی بۆ ئەوەی دەرفەتی پێویست بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئۆزبەکەکان لە بەرەی ڕۆژهەڵات ، بە دەست بخات (سیوری ، ١٣٨٧ :٧٥ ، رویمر ، ١٣٨٥ :٣٥٣).

بۆیە هەڵۆخانی (١٥٨٩/٩٠–١٦١٦) برا و جێنشینی تەیموورخان لە سەرەتادا پێوەندیی بە عوسمانییەکانەوە کە بە شێوەیەکی پراکتیکی هێزی یەکەمی ناوچەکە بوون، کرد. وادیارە کە دەوڵەتی عوسمانیش لەم کاتەدا بە ملکەچبوونی ڕواڵەتی هەڵۆخان ڕازی و دڵخۆش بووە، تاکو بتوانێ هێزەکانی بۆ داگیرکردنی هەندێ مەڵبەندی تر وەکو ئازەربایجان و شروان بە کار بهێنێت. بدلیسی کە گێڕانەوەی لە مێژووی ئەردەڵانەکان بە هەڵۆخان کۆتایی پێ دێت، نووسیویەتی: «هەڵۆخان ئیزهاری ئیتاعەت و گوێڕایەڵی بۆ پادشای جەمجای غۆفران پەنا، سوڵتان مورادخان علیە الرحمە والرضوان ئەکرد و لە هەمان کاتیشدا لەگەڵ سەلاتینی قزڵباشییە ڕێگای مودارا و سازشی ئەپێوا و لە حوکوومەتدا سەربەخۆیی

و ئیستبدادێکی تەواوی هەبوو و ئێستا کە ساڵی کۆچی لە هەزار و پێنجدایە، بێ هیچ بەربەستێك بە دارایی و بەڕێوەبردنی موڵکەوە خەریکە» (بدلیسی ،١٨٦٠ : ٨٩).

ئەوەی کە هەڵۆخان لە چ ساڵێکدا هەڵوێستی خۆی لە هاوپەیمانی عوسمانییەوە بۆ هاوپەیمانی لەگەڵ سەفەوییە گۆڕیوە، بە دروستی نازانرێت. بەڵام بە گوێرەی گێڕانەوەی سەروو، دەبێ لە سەرەتای هاتنە سەر دەسەڵاتیەوە لە ساڵی ١٥٨٩/٩٠، لانی کەم هەتا ساڵی ١٥٩٦/٩٧ کە ڕاپۆرتەکەی بدلیسی کۆتایی دێت، بە ڕواڵەت ملکەچی سوڵتانی عوسمانی بووبێت. ڕەنگە هەڵۆخان هەستی بە مەترسییەك کە بەردەوامبوونی درێژ ماوەی دەسەڵاتی عوسمانی لە ناوچەکە بۆ سەر میرنشینەکەی هەیبوو، کردبێت. هەندێ لە مێژوونووسان باس لە گواستنەوەی ناوەندی حوکمڕانیی ئەردەڵان لە قەڵای زەڵم و مەریوانەوە بۆ پالَنگان کە لە قووڵاییەکی زۆرتری ڕۆژهەڵات و لە ناوچەیەکی سەخت و شاخاویی تردا هەڵکەوتبوو، دەکەن. کە ئەکرێ بە ڕەنگدانەوەی نیگەرانیی هەڵۆخان لە عوسمانی، لێك بدرێتەوە. هەڵبەت لە هەمان کاتدا قەڵاکانی زەڵم و مەریوانیش نۆژەن کرانەوە و لەوپەڕی ئامادەییدا ڕاگیران (مردوخ ، بی تا : ١٠٠، ئەلحوسەینی، ٢٠٠٢ : ١٩).

سەرەڕای هەستکردن بە مەترسیی عوسمانی لە لایەن هەڵۆخانەوە، هۆکاری سەرەکیی هەڵوێست گۆڕینی دەبێ لە گۆڕانی هاوکێشەی هێز لە نێوان ئێران و عوسمانیدا بدۆزرێتەوە. لە ساڵی ١٦٠٣/٤، شا عەباسی یەکەم ، دوای زنجیرەیەك چالاکی سەربازی سەرکەوتوو لە بەرەکانی ڕۆژهەڵات و وەدەستهێنانی سەرکەوتنی دیار لە شەڕ لەگەڵ ئۆزبەك و مەغۆلەکانی هیند و سەرکوتکردنی یاخیبووەکانی گۆشە و کەناری وەڵات، ڕووی سەرنجی بەرەو عوسمانی گەڕاندەوە و لە یەکەم هەنگاودا شاری تەورێزی کە بەساڵان لە ژێر دەستی عوسمانیدا بوو، گرتەوە ( منجم، ١٣٦٦: ٢٤٨–٢٥٠، بیانی، ١٣٥٣ : ٢٩٤ و٢٩٥). ئەم سەرکەوتنە لە ساڵی ١٦١٣ بە بەستنی پەیماننامەیەك کە تێدا عوسمانییەکان ناچار بە چۆڵکردنی هەرێمەکانی ڕۆژئاوا و باکووری ڕۆژئاوای ئێران کران، جێگیر بوو (رویمر، ١٣٥٨: ٣٥٤). لەوانەیە کە هەڵۆخانی ئەردەڵانیش وەکو ژمارەیەکی تر لە

میرانــی کوردســتان، لــەم قۆناغــەدا هەڵوێســتی گۆڕیبێــت و پێوەنــدیی بــە ســەفەوییەکانەوە کردبێــت ( مــنجم، ١٣٦٦: ٢٦٧ و٢٥٣، منشــی ترکمــان، ٢/١٣٥٠:٦٦٥).

گەڕانــەوەی ســەفەوییەکان بــۆ نێــو هاوکێشــەکانی ناوچــەی کوردنشــین، هەرچەند کە لە سەرەتادا گۆڕانکارییەکی لە بەرژەوەندی میرنشینی ئەردەڵان بوو و ئـەم میرنشـینەی لـە ژێـر گوشـاری یەکلایەنـەی ئیمپراتـۆری عوسمـانی دەربـاز دەکـرد، بــەڵام بــەردەوامبوونی درێــژماوەی باڵــا دەســتیی ســەفەوییەکانیش بەهەرەشـەیەکی جیدی دەدرایـە قەڵـەم کـە بەرقـەراربوونی هاوسـەنگیی هێـز تـا ڕادەیەك لـە مەترسـییەکەی کـەم دەکردەوە. شـا عەباسـی یەکـەم لـە قۆناغێکدا هەوڵی دا کە لە ڕێگای بەکارهێنانی هێزەوە، هـەڵۆخان ناچاربە چوونە ژێـر بـاری چــاودێرییەکی زۆرتــری دەوڵــەتی ناوەنــدی بکــات. بــۆ ئــەم مەبەســتەش بــە سوپایەکەوە تا نزیك هەمەدان هات، بەڵام لە کۆتاییدا بە بێ ئـەوەی شـەڕێك بێتـە ئـاراوە، بـە ئەنجامـدانی ڕێکـەوتنێك لەگـەڵ هـەڵۆخان ڕازی بـوو. سەرچـاوەکان پەشیمانبوونەوەی شاعەباس لە شەڕ لەگەڵ هەڵۆخانیان بۆ ڕاسپاردەی کەسێك بە نـاوی ئـالی بـالی زەنگەنـە یـەك لـە ڕاوێـژکارەکانی گەڕاندۆتـەوە، کـە سـەخت و شاخاویبوونی کوردستان و بێهوودەبوونی شەڕ لـەوێی بـە بـیری شـا هێنـاوە و لـە ئەگـەری دەسـتێوەردانی عوسمـانی ئاگـەداری کردۆتـەوە (قاضـي، ١٣٧٩ :٢٢). بەشی دوایی لە قسەکانی ئالی بالی کـە بـاس لـە دەستێوەردانی چاوەڕوانکراوی عوسمانی دەکا، زۆر سەرنجڕاکێشە و دەری دەخات کە بۆچی پادشـایەکی مـەزنی وەك عەباسـی یەکـەم خـۆی لـە ڕووبەڕووبونـەوە لەگـەڵ میرێکـی ناوچـەیی دوور ئەگرێت. ناوبراو گوتبووی: «هەڵۆخان ماوەیەکە خۆی داوەتە پاڵ ئالی عوسمـان و هەرکاتێك تەلەبی کۆمەك و ئیمداد بکات، لە لایەن پادشای ڕۆمەوە سەرعەسکەر و عەساکیری زۆر و چەند کەس لە پاشایانی سەرحەدات بـۆ کۆمـەك و ئیستیخلاسـی لە دەست ئەعیددا دیار و تەعین کراون» (پێشوو).

حوکمڕانیەتی هەڵۆخان تا کۆتایی (١٠) ساڵی سێهەمی پادشـایی عەباسـی یەکەم (واتە ساڵی ١٦١٦ی ز) درێژەی کێشا. لە هەموو ئـەم ماوەیـەدا، سـەرەڕای ئــەوەی کــە شــاعەباس دوای کــۆنترۆڵکردنی ســەرۆك هــۆزە قزڵباشــەکان و

سەرکوتکردنی ئاژاوەگێڕە ناوخۆییەکان، دەوڵەتێکی ناوەندی بەهێزی دروست کردبوو، میرنشینی ئەردەڵان توانی بەشێکی بەرچاو لە ماف و سەربەخۆییە کلاسیکەکانی خۆی بپارێزێ. تا ئەو جێگایەی کە شاعەباس لەوپەڕی دەسەڵاتیشدا دەستێوەردانی ڕاستەوخۆی لە کاروباری ناوخۆیدا نەدەکرد و بەپێچەوانەی ئەو ڕەوتەی کە لە کۆتایی حکوومەتی سەفەوییەدا ئاسایی ببووەوە و تێدا پادشا هەرکاتێك بیویستایە فەرمانی لە کارلادانی میری ئەردەڵانی دەردەکرد، شاعەباس بۆ لاوازکردنی دەسەڵاتی هەڵۆخان ناچار بوو کە شێوازی پیلانگێڕی و فرتوفێڵ بەکاربهێنێ. لەم چوارچێوەدا خان ئەحمەدخانی کوڕی هەڵۆخانیان کە هاوسەری" زەڕڕین کۆلاخاتوون"ی خوشکی شا بوو و وەکو بارمتە لە دەرباری ئەسفەهان دەژیا، بۆ کوردستان ناردەوە و هانیان دا کە بانگەشەی حوکمڕانی بەرز بکاتەوە. لە ساڵی ١٠٢٦ ك.دا، خان ئەحمەدخان لە دەرفەتێکدا کە هەڵۆخان قەڵای حەسەن ئاوای بە جێ هێشتبوو، بە کودتایەك دەستی بەسەر قەڵاکەدا گرت و دوای لەسەر کار لابردنی باوکی، دەسەڵاتی گرتە دەست (منشی ترکمان، ١٣٥٠: ٢/٩٢٦ ).

خان ئەحمەد خان (١٦١٦–١٦٣٦) لەگەڵ ئەوەشدا کە یەکەم حوکمڕانی ئەردەڵانە کە لە ئاکامی دەستێوەردانی دەوڵەتی سەفەویدا هاتە سەر کار، بەڵام بە هۆی ڕۆڵێکەوە کە وەکو فەرمانڕەوای میرنشینێکی گرنگی سەرسنوور دەیبینی، هێشتا جێگە و پێگەیەکی شایەنی هەبوو. لە ساڵی ١٦١٧/٨ دا، شا عەباس ئالۆزییە ناوخۆییەکانی ناوچەی بەغدای ژێر کۆنترۆڵی عوسمانی قۆزتەوە و پەلاماری هەرێمەکەی دا (سیوری ، ١٣٨٧: ٨٦). خان ئەحمەد خان هەوڵی دا کە لەم دەرفەتە بۆ بەرفراوانکردنی دەسەڵاتی خۆی کەڵك وەرگرێت و بە ئاگاداری و زانینی شا عەباسەوە، جگە لە لەشکرکێشی بۆ سەر ناوچەکانی کۆی و حەریر کە ئەردەڵانەکان بە قەڵەمڕەوی سروشتیی خۆیان دەزانی، بۆ یەکەم جار هێرشی کردە سەر مووسڵ و کەرکووك و دوای داگیرکردنی مووسڵ، حاکمەکەی بۆدیاربەکر دەرپەڕاند (مصنف ،٢٥٣٦ : ٢٨ ، ئەلحوسەینی، ٢٠٠٢ :٢٢). لە کاتی داگیرکردنی بەغداش لە لایەن سەفەوییەکانەوە، خان ئەحمەد خان ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕا و لە نێو یەکەم سەرکردەکانی هاوپەیمانی سەفەویدا بوو کە چوونەوە ناو شارەکەوە (پێشوو).

هاوکاریکردنی نزیکی خان ئەحمەد خان لەگەڵ دەوڵەتی سەفەوی و ڕۆڵێك کە شا عەباس لە هاتنە سەر کاریدا هەیبوو، وای کردووە کە هەندێ توێژەران لکاندنی یەکجاری میرنشینی ئەردەڵان بە دەوڵەتی سەفەوییەوە، بۆ ئەم سەردەمە بگەڕێننەوە (برن ، ١٣٤٩: ١٢٠). لەگەڵ ئەمەش خان ئەحمەدخان بە یەکێك لە میرە بەهێزەکانی ئەردەڵان دەژمێردرێت کە توانی وەکو یەکێك لە چوار والییەکەی ئیمپراتۆری سەفەوی، ڕادەیەکی زۆر لە سەربەخۆیی و دەسەڵاتی ناوخۆیی کە تایبەت بە والییەکان بوو، بۆ خۆی دەستەبەر بکات (اردلان ، ١٣٨٧ : ٥٤). هەروەها بە هۆی بەشداریکردن لە پلانە سەربازییەکانی شا عەباسی یەکەم دژ بە عوسمانی، پلە و پایەیەکی بەرزی بە دەست هێنا و لەم دەرفەتە بۆ فراوانکردنی قەڵەمڕەو و داگیرکردنی هەرێمەکانی ڕۆژئاوای شارەزوور کە ماوەیەك بوو عوسمانییەکان چاویان تێ بڕیبوو، کەڵکی وەرگرت. سەرچاوە مێژووییەکان باس لە داگیرکردنی هەرێمەکانی وەك مووسڵ و کەرکوك لە لایەن خان ئەحمەد خانەوە دەکەن کە پێش ئەوە هیچ سەرچاوەیەك لە میانەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی میرنشینی ئەردەڵاندا، ناوی نەهێناون. ئەسکەندەر بەیگی تورکمان، مێژوونووسی دەرباری شا عەباس، لکاندنی کەرکوك بە قەڵەمڕەوی ئەردەڵانی دوای داگیرکردنی بەغداد (١٦٢٣)، پشتڕاست کردۆتەوە: «سەربازەکانی قەڵای کەرکویە (کەرکوك) توانای بەرگرییان نەما، بەرەو دیاربەکر هەڵاتن و قەڵاکە لە لایەن خان ئەحمەد خان و عەشایری ئەردەڵانەوە دەستی بەسەردا گیرا و هەستان بە بەڕێوەبردنی ئەلکا و چاودێریکردنی رەعیەت » (منشی ترکمان، ١٣٥٠ : ٢/١٠٠٦).

شا عەباسی یەکەم لە ماوەی زێدەتر لە چل ساڵ حوکمڕانیی خۆیدا، هەموو هەوڵێکی بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندی خستە گەڕ. لەم چوارچێوەدا زۆرێك لە حوکمڕانە ناوچەیی و خێڵەکییەکان بە توندی سەرکوت کران، کە بۆ نموونە دەکرێ ئاماژە بە کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی هۆزی ئەفشار لە کرمان، زولقەدر لە فارس و ڕووخاندنی میرنشینەکانی مازندەران (١٥٩٦/٧)، گیلان (لاهیجان ١٥٩١/٢، ڕەشت ١٥٩٤/٥) و لار (١٦٠١/٢) بکەین (رویمر، ١٣٨٥: ٣٥٥). هەروەها هەوڵ درا کە حاکمی ویلایەتەکان بخرێنە ژێر چاودێرییەکی

زۆرتـــرەوە. هەنـــدێ جـــار دەوڵـــەتی ناوەنـــدی نوێنـــەرێکی خـــۆی کـــە زۆرتـــر کاربەدەسـتێکی دیـوانی بـوو بـە مـل ویلایەتەکانـدا دەسـەپاند کـە بەڕواڵـەت بـۆ یارمەتی هەڵسووڕاندنی کاروباری ویلایەت نێردرابوو، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا بـە نهـێنی پادشای لە جموجووڵی حاکم ئاگادار دەکردەوە. هاوکـات ڕێوشـوێنی تونـدتر بـۆ پرۆسـەی وەرگـرتنی بـاج لـە ویلایەتـەکان، گیرایـە بـەر. بـەڵام لەگـەڵ ئەمـەش کوردستان تا ڕادەیەکی زۆر لـەم ڕەوتـە بـە دوور مـا. هـیچ نوێنـەرێکی دەوڵـەتی ناوەندی لە دەزگای میرەکانی ئەردەڵاندا بوونی نەبوو، باجێك نەدەدرایە ناوەنـد و وەکو ڕابردوو پادشای سەفەوی بۆی نەبوو کە بە ئاشکرا دەست لە پرۆسەی دانان و لادانی میرەکان وەربدات، یان کەسێکی بـە دەر لـە بنەماڵـەی ئـەردەڵان بەسـەر میرنشینەکەدا بسەپێنێت ( اسکندر، ۲۰۰۸ :٥٤).

هۆکاری ئـەوەی کـە سیاسـەتی ناوەندگەرایانـەی شـا عـەباس کوردسـتانی نەگرتـەوە، پـێش هـەموو شـتێك بـۆ هەڵکـەوتی سـتراتیجی ناوچـەکە و گرنگیـی دابینکردنی ئاسایشی سنوورەکان دەگەڕێتەوە. چونکە هێزی سەربازیی خێڵەکانی هەرێمەکـە بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی هێرشـی لـە ناکـاوی پاشـا و کاربەدەسـتانی عوسمانی زۆر شیاوتر و کارامـەتر لـەو سـوپا نوێیـەی کـە شـا عـەباس لـە دیـل و غوڵامــە قەوقازییــەکان پێکــی هێنــابوو و بــە نیشــانە و ئــامرازی ســەرەکیی بەرەوپێشبردنی سیاسـەتەکانی دەژمێـردرا، ڕۆڵـی دەبـینی. ڕەنگـە ئـەم ڕاسـتییە بووبێتە هۆی ئەوەی کە ویلایەتـە سـنوورییەکان لـە پـرۆژەی گـۆڕینی زەویـوزاری مەمالك (املاك ممالك) و کردنیان بە زەویوزاری میری (املاك خاصة) کە پلانێك بوو بـۆ بـەهێزکردنی دەسـەڵاتی ناوەنـد، بـەری بکـرێن. تەنانـەت لـە هەنـدێ ناوچـەی سـنووری کـە بـەر ئـەم سیاسـەتە کـەوتبوون، لـە کـاتی دروسـتبوونی ئـاڵۆزی و قەیراندا، جارێکی تر حوکمڕانە خێڵەکەکان دادەنرانانەوە( سیوری ، ۱۳۸۷: ۷۸).

پێوەندییە باشەکانی خان ئەحمەد خان و دەوڵەتی سەفەوی هـەتا کۆتـایی تەمەنی شا عەباسی یەکەم درێـژەی هـەبوو. بـەڵام شـا سـەفیی یەکـەم (۱٦۲۹–۱٦٤۲) وەکو بـاپیری ئاقـڵ و بەتـەگبیر نـەبوو. کـوێرکردنی سـۆرخاب بـەگ، تاقـە کوڕی خـان ئەحمـەد خـان و زەڕڕیـن کـۆڵاه خـاتوون، کـە پادشـای نـوێ گومـانی چاوبڕینە تەختی لێ دەکرد، لە ناکاو ئەم دۆستایەتییەی بـە ڕق و کینـە گـۆڕی .

لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە، خان ئەحمەد خـان، هاوپـەیمانیی خـۆی لەگـەڵ ئێـران هەڵوەشاندەوە و پەلاماری ناوچـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی دەوڵـەتی سـەفەوی دا کـە تێدا توانی ناوچەیەکی فراوان کە لە کرماشانەوە دەگاتە ورمێ، بخاتە ژێر کۆنترۆڵ و لە لایەن خۆیەوە حوکمڕانی بۆ دیاری بکات. لە ساڵی ١٦٣١ی کۆچیش لە قەڵای حەسەن ئـاوا بـە نـاوی شـا ئەحمـەد خانـەوە تـاجی شـایی لـە سـەر نـا ( اردلان ، ١٣٨٧: ٤٨). لــە کۆتــایی وتارێــك کــە لــەم ڕێوڕەسمــەدا لــە لایــەن شــێخ عەبدولغەففاری مەردۆخییەوە خوێندراوەتەوە، وەها هاتووە: « والی کـوڕی والـی، خـاوەن شـکۆ خـان ئەحمـەد خـانی ئـەردەڵان، پادشـای سـەربەخۆی مـەمالیکی کوردستان» (مردوخ کردستانی، بی تا: ١٠٦).

خان ئەحمەد خان بە مـاوەی پێـنج سـاڵ وەکـو پادشـا حـوکمڕانی بەسـەر ناوچەیەکی گەورەی کوردسـتاندا کـرد و لـەم ماوەیـەدا خـۆی لـە عوسمـانی نزیـك خستەوە. لە ساڵی ١٠٤٥ ك. دا، شا سەفی سوپایەکی مەزنی بۆ سەرکوتکردنی نارد ( استری بادی، ١٣٦٤ :٢٥٤) و لە بەرابەریشدا خان ئەحمـەد خـان داوای یارمـەتی لە سوڵتان موورادی چوارەم کرد. لە شەڕێکدا کە لە مـانگی «ربیـع الاول» ی سـاڵی ١٦٣٦، لە قەراخ گۆلی زرێبار، هاتە ئاراوە، سـوپا هاوپەیمانەکـەی خـان ئەحمـەد خان تێك شکا. سوڵتان موراد بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم شکستە سـوپایەکی تـری بە سەرکردایەتی خەسرەو پاشـای سەرعەسـکەر ڕەوانـە کـرد کـە جـارێکی تـر لـە دەشتی مەریوان ڕووبـەڕووی سـوپای سـەرەکی سـەفەوییەکان کـە زەینـەل خـانی شـاملوو سـەرکردایەتی دەکـرد، بـووەوە (ڕەمــەزانی ١٦٣٦) و ئـەم جـارە دوای سەرکەوتن بەسەریدا، تا هەمەدان پێشڕەوی کرد، بەڵام بە هۆی کێشەی لۆجیستی و کەمبوونی پێداویسـتییەوە، نـەیتوانی سـەرکەوتنەکانی بپارێزێـت و ناچـارما کـە هەرێمەکە جێ بهێڵێت (مردوخ کردستانی، بی تا:١٠٧).

یارمەتی وەرگرتنی خـان ئەحمـەد خـان لـە سـوڵتان مـورادی چـوارەم، بـە دوایین نموونەی هاوپـەیمانی حـوکمڕانێکی ئـەردەڵان لەگـەڵ عوسمـانی، دەدرێتـە قەڵـەم. بەماوەیـەکی کـورت دوای ئـەم ئەزموونـە سـەرنەکەوتووە، پەیماننامـەی ئاشتیی زەهاو (١٦٣٩) لە نێوان هەردوو دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانیدا واژۆ کرا. دوای ئەمــە لەگــەڵ کۆتاییهــاتن بــە شــەڕ و ئــاڵۆزیی نێــوان ئــەم دەوڵەتانــە و

کەمبوونەوەی خواستیان بۆ دەستتێوەردان لە کاروباری یەکدی، میرەکانی ئەردەڵانیش ئیمکانی کەڵك وەرگرتن لە ناکۆکی هەردوولایان لە دەست دا.

## میرنشینی ئەردەڵان لە ڕێکەوتننامەی زەهاوەوە تا کۆتایی سەردەمی سەفەوی (١٦٣٩-١٧٢٢)

شەڕەکانی سەردەمی فەرمانڕەوایی شا سەفی بە دوایین ئەڵقەی زنجیرە پێکدادانەکانی سەفەوی و عوسمانی دەژمێردرێت. چەند ساڵ پاش شەڕی مەریوان (١٦٣٦) کە دوا شەڕی گەورەی نێوانیان بوو، ئاخری هەردوولا لە ساڵی ١٦٣٩ بە ئیمزاکردنی ڕێکەوتننامەی ئاشتیی زەهاو بۆ کۆتاییهێنان بەم ناکۆکییانە پێك هاتن. بە پێی ئەم ڕێکەوتننامەیە ناوچەکانی مسۆپۆتامیا ، بەغداد و بەسرە و بەشی گەورەتری کوردستان دران بە عوسمانی و لە بەرانبەردا ئازەربایجان و ئەرمەنیستان و گورجستان بۆ دەوڵەتی سەفەوی مایەوە. بەم جۆرە کێشەی ئەو هەرێمانەی کە بە ساڵان جێگای ناکۆکی هەردوو دەوڵەت بوو، یەکلایی کرایەوە (نوایی ،١٣٨١: ٢٢٨). پەیماننامەی زەهاو بە خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگ لە پێوەندییەکانی ئێران و عوسمانی دەژمێردرێت. چونکە بە پێچەوانەی ڕێکەوتنەکانی ترەوە، سەرەنجام بووە هۆی ئەوەی کە ئارامییەکی درێژخایەن لە سنوورەکان پەیدا ببێت. دوای ئەمە هەردوولا لە ناوەرۆکی ڕێکەوتنەکە لایان نەدا و ئیتر لە نێوان دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی، شەڕێك نەهاتە ئاراوە.

بەرقەراربوونی ئاشتی و کەمبوونەوەی ئالۆزی نێوان ئێران و عوسمانی، کاریگەرییەکی نەرێنی لە سەر ڕۆڵ و پێگەی میرنشین و خێڵە کوردییەکانی سەرسنوور کە پێشتر بەشداریی چالاکیان لە شەڕەکاندا هەبوو، دانا. دوای ئەمە پێویستی نەدەکرد کە چیدی لانی ئەم هێزانە ڕابگیرێ بەڵکو وەکو سەرچاوەیەکی مەترسی کە دەکرا لە کاتی لاوازبوونی دەوڵەتی ناوەندیدا هەڕەشەیەك پێك بێنن، سەیر دەکران. بە پێی یەك لە بەندەکانی پەیماننامەی زەهاو هەریەك لە دوو دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی لەسەر ئەوە پێکهاتن کە ژمارەیەك لە قەڵاکانی سەر سنوور تێك بدەن. زۆربەی ئەم قەڵایانە هی میرە کوردەکان و پەناگە و حەشارگەی ئەوان لە کاتی تەنگانەدا بوون (حەمەد ئەمین و مەحموود

عەبدولڕەحمان، ٢٠١١ :٤١). بۆیە دەکرێ بڵێین کە کۆتاییهاتن بە شەڕی نێوان سەفەوی و عوسمانی لە دوو لاوە بە زیانی میرنشینی ئەردەڵان شکایەوە. لە لایەکەوە ئەردەڵانەکان چیتر نەیاندەتوانی کە درێژە بە یاری لە نێوان دوو ئیمپراتۆری و قۆزتنەوەی ناکۆکییەکانی نێوانیان بدەن و لە لایەکی دیکەوە دەوڵەتی ناوەندیش بەرژەوەندی خۆی لە بەهێزبوونی ئەواندا، نەدەبینی. ڕێکەوتننامەی زەهاو سنووری نێوان ئێران و عوسمانی بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دەستنیشان کرد و تێدا ناوچە کوردییەکانی خۆرئاوای شارەزوور کە بەشێکی زۆریان لە کۆنەوە بەناوچەی دەسەڵاتی میرەکانی ئەردەڵان دەژمێردرا، بەر عوسمانی کەوتن. بەم شێوەیە ئەوان بۆ هەتاهەتایە زەویوزارەکانی بناری ڕۆژئاوای زنجیرە چیای هەورامان و دەشتە بە پیتەکانی شارەزوور و قەرەداغ و مەڵبەندەکانی کۆی و حەریریان لە کیس چوو و ئەوەش کە بۆیان مایەوە، بە یەکجاری لە نێو سنوورەکانی دەوڵەتی سەفەویدا گەمارۆ درابوو. لەگەڵ دۆڕاندنی هەرێمەکانی خۆرئاوای قەڵەمڕەوی ، میرنشینی ئەردەڵان بەشێکی زۆری توانای ئابووری و سەربازی و جوگرافی خۆشی لە دەست دا (اردلان ، ١٣٨٧: ٥١).

بەراوردی نێوان هەندێ لە فاکتەرەکانی حوکمڕانی ئەردەڵانەکان، لە هەردوو قۆناغی پێش و دوای ڕێکەوتننامەی زەهاو، تا ڕادەیەکی زۆر کاریگەرییە سەلبییەکانی کۆتاییهاتن بە شەڕی نێوان سەفەوی و عوسمانی لە سەر دەسەڵاتی ئەردەڵانەکان دەردەخات:

**میرەکانی ئەردەڵان پێش پەیمانی زەهاو**

| | حوکمڕانی ئەردەڵان | ساڵەکانی حوکمڕانی | پادشای سەفەوی هاوچەرخ | پەیوەندی لەگەڵ حاکمی پێش خۆی | چۆنیەتی کۆتاییهاتن بە دەسەڵاتی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | بەگە بەگ | ١٤٩٤/١٥٣٥ | ئیسماعیلی یەکەم تەهماسبی یەکەم | کوڕ | مردن |
| ٢ | مەئموون بەگی دووەم | ١٥٣٥–١٥٣٨/٩ | تەهماسبی یەکەم | کوڕ | عوسمانییەکان بەدیلیان گرت |

| ٣ | سۆرخاب بەگ | ١٥٣٨/٩–١٥٧٨/٩ | تەهماسبی یەکەم | مام | مردن |
|---|---|---|---|---|---|
| ٤ | بەسات بەگ | ١٥٧٨/١٥٧٠ | تەهماسبی یەکەم ئیسماعیلی دووەم | کوڕ | مردن |
| ٥ | تەیموورخان | ١٥٧٨/٩–١٥٨٩/٩٠ | محەمەدی خودابەندە | برازا | کوژران لە شەڕدا |
| ٦ | هەڵۆخان | ١٦١٦/١٥٧٨/٩٠ | عەباسی یەکەم | برا | پیلانگێڕی |
| ٧ | خان ئەحمەد خانی یەکەم | ١٦٣٦/١٦١٦ | عەباسی یەکەم شا سەفی | کوڕ | دوای شکست لە سەفەوییەکان دەسەڵاتی لەدەست دا |

## میرەکانی ئەردەڵان پاش پەیمانی زەهاو

| ٨ | سولەیمان خان | ١٦٥٧/١٦٣٦ | شا سەفی عەباسی دووەم | لقی دیکەی بنەماڵەکە | مردن |
|---|---|---|---|---|---|
| ٩ | کەلبعەلی خان | ١٦٧٨/١٦٥٧ | عەباسی دووەم | کوڕ | مردن |
| ١٠ | خان ئەحمەدخانی دووەم ( جاری یەکەم) | ١٦٧٨/٩–١٦٩٣/٤ | شا سولەیمان | کوڕ | لادران بە حوکمی شا |
| ١١ | خەسرەو خان | ١٦٨٢/١٦٨٠ | شا سولەیمان | مام | لادران و کوژران بە حوکمی شا |
| ١٢ | تەیموورخانی ئاجۆرلوو | ١٦٨٧/١٦٨٢ | شا سولەیمان | ئەردەڵانی نەبوو | لادران بە حوکمی شا |

| ١٣ | خان ئەحمەدخانی دووەم (جاری دووەم) | ١٦٨٧-١٦٩٥/٦ | شا سولەیمان شا سولتان حسەین | | لادران بە حوکمی شا |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٤ | محەمەد خان | ١٦٩٥/٦-١٧٠١/٢ | شا سولتان حسەین | کوڕی مام | لادران بە حوکمی شا |
| ١٥ | محەمەد خانی گورجی | ١٧٠٤/٢-١٧٠٤/٥ | شا سولتان حسەین | ئەردەڵانی نەبوو | لادران بە حوکمی شا |
| ١٦ | حەسەنعەلی خان | ١٧٠٤/٥-١٧٠٦/٧ | شا سولتان حسەین | ئەردەڵانی نەبوو | مردن |
| ١٧ | حسەینعەلی خان | ١٧٠٦-١٧٠٧/٨ | شاسولتان حسەین | ئەردەڵانی نەبوو | لادران بە حوکمی شا |
| ١٨ | کەیخەسرەو بەگ | ١٧٠٨-١٧٠٨/٩ | شا سولتان حسەین | ئەردەڵانی نەبوو | لادران بە حوکمی شا |
| ١٩ | عەباسقولی خان | ١٧٢٤/١٧١٠/١١ | شا سولتان حسەین | لقی دیکەی بنەماڵەکە | لادران بە حوکمی شا |
| ٢٠ | عەلی قولی خان | ١٧١٦-١٧١٩/٢٠ | شا سولتان حسەین | لقی دیکەی بنەماڵەکە | هەڵاتن بۆ ئیسفەهان دوای هێرشی بابانەکان |

ئەم خشتەیە دەرفەت بۆ هەڵسەنگاندنی نێوان دوو قۆناغی جیاوازی مێژووی میرنشینی ئەردەڵان لە ڕوانگەی سێ فاکتەری گرنگی دەرخەری ڕادەی سەقامگیربوون و بەهێزی حکوومەتەکانەوە (واتە درێژخایەنبوونی ماوەی حوکمڕانی، شێوازی ئاڵوگۆڕی دەسەڵات و چۆنیەتی کۆتاییهاتن بە حوکمڕانی) دەرەخسێنێت. خاڵی جیاکەرەوەی ئەم دوو قۆناغە بەستنی پەیمانی زەهاوی نێوان ئێران و عوسمانییە (١٦٣٩). تایبەتمەندیی سەرەکی قۆناغی "پێش زەهاو" بەردەوامبوونی شەڕ و ئاڵۆزیی نێوان ئێران و عوسمانی و تایبەتمەندیی قۆناغی

"پـاش زەهـاو"یـش بـاڵ کێشـانی ئـارامی بەسـەر پێوەندییـەکانی هـەردوولا و کۆتاییهـاتن بـە شـەڕ و ئاڵۆزییەکانـە. بۆیـە بـەراوردکردنی ئـەو سـێ فاکتـەرەی سەرەوە لە هەریەك لەو دوو قۆناغەدا، تا ڕادەیەکی زۆر کاریگـەریی شـەڕ لـە سـەر پێگە و دەسەڵاتی میرەکانی ئەردەڵان دەردەخات.

لە پێوەندیی لەگەڵ فاکتەری یەکەم واتە درێژبوونی مـاوەی حوکمڕانییـەوە، دەبێ بڵێین کـە لـە قۆنـاغی (١٤٠) سـاڵەی پـێش ڕێکەوتننامـەی زەهـاو (واتـە لـە دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوییەوە تا کـاتی بەسـتنی پەیماننامـەی زەهـاو) تـەنیا حەوت جـار ئـاڵوگۆڕی دەسـەڵات لـە میرنشـینیی ئەردەڵانـدا ڕووی داوە، واتـە بـە شـێوەیەکی ڕێـژەیی (٢٠) سـاڵ حـوکمڕانی بـۆ هـەر ئـەمیرێکی ئـەردەڵانی تۆمـار کراوە. ئەمە لە کاتێکدایە کە لە ماوەی هەشتاو چەند ساڵەی پاش ڕێکەوتننامـەی زەهـاودا (١٣) حـوکمڕان گـۆڕاون و مـاوەی حـوکمڕانی بـۆ کەمترلـە حـەوت سـاڵ دابەزیوە. هەروەها لە قۆناغی پێش ڕێکەوتننامـەی زەهـاودا، ویراسـەت گـرنگترین ڕۆڵی لە گواستنەوەی دەسەڵاتدا هەبووە. لە ناو ئەو حەوت حوکمڕانەی کە پـێش ڕێکەوتننامەی زەهاو یەك لە دوای یەك دەسەڵاتی میرنشینیی ئەردەڵانیان گرتۆتـە دەسـت، پێـنج کەسـیان پێوەنـدیی خـوێنیی پلـە یـەکیان (کـوڕ–بـرا) لەگـەڵ حوکمڕانیی پێش خۆیاندا هەبووە و لە ناویاندا هیچ کەسێکی بـەدەر لـە بنەماڵـەی ئەردەڵان یان کەسێکی خاوەن پێوەندیی بنەماڵەیی پلـە چـەند (ئامۆزاکـان یـان لقەکانی دیکەی خانەدان) بەدی ناکرێت. بەڵام لە قۆناغی پاش ڕێکەوتنی زەهاودا، لەگەڵ زیاتر بـوونی ڕۆڵـی دەوڵـەتی سـەفەوی لـە پرۆسـەی ئـاڵوگۆڕی دەسـەڵات، کاریگەریی ویراسەت کـەمتر بۆتـەوە. لـەم قۆناغـەدا بـە تـەنیا دوو کـەس لـە (١٣) حوکمڕان، پێوەندیی خزمایەتی پلە یەکەمیان لەگەڵ حوکمڕانەکانی پێش خۆیاندا هەبوو و تەنانـەت لـە ناویانـدا چـوار کەسـی بـەدەر لـە بنەماڵـەی ئـەردەڵان و دوو کەسی خاوەن پێوەندیی بنەماڵەیی دوور(لە لقەکانی دیکەی بنەماڵەی ئەردەڵان)، بـەدی دەکـرێن. هـەروەها تـا پـێش ڕێکەوتننامـەی زەهـاو هـیچ یـەك لـە پادشـا سـەفەوییەکان پێیـان نـەکرا کـە بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ فـەرمانی لـەکارلادانی میرێکی ئەردەڵان دەربکەن و تەنیا هەندێ جـار وەك نموونـەی هـەڵۆخان هـەوڵیان دەدا لە ڕێگای پیلان گەڕاندن و فرتوفێڵەوە، دەست لە کـار وەردەن، لـە کاتێکدا

کە پاش ڕێکەوتنی زەهاو (٩) حوکمڕانی ئەردەڵان بە فەرمانی ڕاستەوخۆی ناوەند لە سەرکار لابراون و تەنانەت یەکیشیان لە سێدارە دراوە. بۆیە بە پشتبەستن بە فاکتەرەکانی سەرەوە بە شێوەیەکی یەکلاییکەرەوە دەتوانین ئەوە بسەلمێنین کە بەستنی پەیمانی ئاشتیی زەهاو و نەمانی شەڕ و ئاڵۆزیی نێوان هەردوو دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی، میرنشینی ئەردەڵانی لاواز کردووە و لە دەسەڵات و سەلاحیەتە ناوخۆیییەکانی کەم کردۆتەوە.

یەکەم نیشانەکانی لاوازبوونی میرنشینی ئەردەڵان لە سەردەمی پادشایی "شا سەفی" و دوای شکستهێنانی خان ئەحمەد خان لە وەرگرتنەوەی دەسەڵات بە یارمەتی عوسمانی، خۆی نواند. سولەیمان خانی کوڕی میرعەلەمەددین کە لە لقی دیکەی بنەماڵەی ئەردەڵان بوو و شا سەفی لە بەرانبەر خان ئەحمەد خانی یاخیبوودا پشتیوانی لێ دەکرد، لە بەردەم شادا بەڵێنی دا کە دارولمولکی (پایتەخت) کوردستان لە قەڵای سەرکەشی پاڵنگانەوە بۆ سنە (سنەدژ) کە دەستڕاگەیشتن پێی ئاسانتر بوو، بگوازێتەوە. هەڵبەت بەمە ڕانەوەستا و سولەیمان خان (١٦٣٦-١٦٥٧/٨) لە ژێر گوشاری دەرباری ئیسفەهاندا ناچار کرا کە چوار قەڵا بەناوبانگەکەی میرنشینی ئەردەڵان (واتە قەڵاکانی زەڵم ، مەریوان، پاڵنگان و حەسەن ئاوا) کە سونبۆلی دەسەڵات و شان و شکۆی ئەم میرنشینە بوون، بە تەواوی تێك بدات (سنندجی: ١٣٦٦: ١٢٢ ، مردوخ کردستانی، بی تا: ١٠٨ ، ئەلحوسەینی ، ٢٠٠٢ : ٢٦). سەرچاوە مێژووییەکان ساڵێك کە ڕووداوی کاولکردنی قەڵاکانی تێدا قەوماوە، بە وردی دەستنیشان ناکەن، بەڵام بە گوێرەی هەندێ ئاماژە و نیشانە دەکرێ بەو ئاکامە بگەین کە ڕووداوی باسکراو دوای بەستنی پەیماننامەی زەهاو و لە چوارچێوەی جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی ڕێکەوتنەکە ڕووی داوە. بە گوێرەی تاریخ مردوخ ، سولەیمان خان لە ساڵی ١٦٣٦ دوای هاتنە سەر کار، سنەی کرد بە ناوەندی حوکمڕانیی خۆی و پاش ئەوەی کە قەڵای حوکمڕانی تێدا بونیاد نا، قەڵاکانی دیکەی وێران کرد (مردوخ کردستانی، بی تا: ١٠٨) بەو پێیەی کە سولەیمان خان دەبێ ماوەیەکی بۆ دروستکردنی قەڵای نوێ تەرخان کردبێت، کاتی تێکدانی چوار قەڵاکەی دیکە لە ساڵی بەستنی پەیمانی زەهاو(١٦٣٩) نزیك دەبێتەوە. سەرەڕای ئەمەش لۆژیکی

نییە کە  لە کاتێکدا کە هێشتا شەڕ لەگەڵ عوسمانی لە ئارادا بووبێت ، قەڵا هەستیارەکانی سەر سنوور تێك بدرێن. ئەم گومانە کاتێ بەهێزتر دەبێ کە بە بیری بهێنینەوە کە ناوەرۆکی یەك لە بەندەکانی ڕێکەوتننامەی زەهاو، تێکدانی قەڵاکانی سەر سنوور بووە (حەمەد ئەمین و مەحموود عەبدولرەحمان، ٢٠١١: ٤١).

دوای مردنی شا  سەفییش، دەستێوەردانی دەوڵەتی سەفەوی لە کاروباری ناوخۆی میرنشینی ئەردەڵان درێژەی هەبوو. لەم کاتەدا بۆ یەکەم جار باس لە دەستوەردانی ڕاستەوخۆی دەوڵەتی ناوەندی لە دانانی حوکمڕان بۆ بەشە جیاجیاکانی میرنشینەکە دەکرێت. شاعەباسی دووەم (١٥/٥/١٦٤٢–٢٦/١٠/١٦٦٦) لە ساڵی ١٦٥٧ دوای مردنی سولەیمان خان ، قەڵەمڕەوی ئەردەڵانی بۆ (٦) پشك دابەش کرد و بەڕێوەبردنی هەر بەشێکی بە یەکێك لە کەسوکار و خزمانی میری پێشوو سپارد (مردوخ کردستانی، بی تا: ١١٠). ئەگەرچی کەلبعەلی خانی (١٦٥٧–٩/١٦٧٨) کوڕە گەورەی سولەیمان خان هێشتا بە ڕواڵەت نازناوی والی و میری بۆ خۆی پاراست ، بەڵام  واتای ئەم کارە کورتکردنەوەی دەستی میرەکانی ئەردەڵان لە یەکێك لە گرنگترین و هەستیارترین ئەرکەکانیان بوو و بە خاڵی دەستپێکی لاوازیی زۆرتر و پارچەبوونی میرنشینی ئەردەڵان دەژمێردرێت. دوای ئەمە هەرکە دەچوو دەستێوەردانی پادشا سەفەوییەکان زیادی دەکرد، تا ڕادەیەك کە پرۆسەی ئالوگۆڕی دەسەڵات لە میرنشینی ئەردەڵان کە پێشتر لە کاتی فەرمانڕەوا  بەهێزەکانی وەك عەباسی یەکەمیشدا، بەدەر لە خواست و ئیرادەی پادشا بەڕێوە دەچوو، بە تەواوی کەوتە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتی ناوەندییەوە. شا سولەیمانی سەفەوی (١٦٦٦/١٦٩٣) کاتێك کە خەسرەوخانی مامی خان ئەحمەد خانی دووەم میری ئەوکاتی ئەردەڵان،  لە بەردەم شادا ناڕەزایەتی لە برازاکەی دەربڕی، ئەمەی بە هەل زانی و بە ئاسانی خان ئەحمەد خانی لە حوکمڕانی وەلا نا و خەسرەوخانی لە جێگای دانا ( ئەلحوسەینی ، ٢٠٠٢: ٢ ، مردوخ کردستانی: ١١١). هەڵبەت چارەنووسی خەسرەوخان لەمەش خراپتر بوو. لە ساڵی ١٦٨٢، شا سولەیمان بە بیانووی ئەوەی کە زوڵم و زۆر لە خەڵك دەکا، کەسێك بە ناوی تەیموورخانی ئاجۆرلووی بۆ

تەمێکردنی ڕاسپارد. سەرداری ناوبراو دوای هاتن بۆ کوردستان خەسرەو خانی قۆڵبەست ڕەوانەی ئەسفەهانی کرد و خۆی دەسەڵاتی گرتە دەست. خەسرەوخانیش لەگەڵ گەیشتنی بە ئیسفەهان بە فەرمانی شا سولەیمانی سەفەوی لە سێدارە درا (سنندجی، ١٣٦٦: ١٢٦، مردوخ کردستانی، بی تا: ١١١). بەم جۆرە بێجگە لە دەستگرتنی دەوڵەتی ناوەندی بەسەر پرۆسەی ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتی میرنشینی ئەردەڵاندا، دوو "بدعەت"ی دیش لە پێوەندییەکانی ئەم میرنشینە لەگەڵ دەوڵەتی سەفەوی تۆمار کرا: یەکەم لە سێدارەدانی میرێکی ئەردەڵانی و ئەوی دی دانانی کەسێکی بەدەر لە بنەماڵەی ئەردەڵان بە حوکمڕانی ئەم بەشەی کوردستان، چونکە کە تەیموورخان ئاجۆرلوو کە لە جێگای خەسرەوخانی لە سەر کار لابراو دەسەڵاتی گرتە دەست، لە بنەماڵەی ئەردەڵان نەبوو ( سنندجی، ١٣٦٦: ١٢٦). نیشتنی کەسێکی بیانی لە سەر تەختی ئەردەڵان خۆی بە تەنها ڕادەی لاوازبوون و توانەوەی ئەم میرنشینە لە سەردەمی دوایین شاکانی سەفەویدا دەردەخات. بە تایبەت کە حوکمڕانییەکەی شەش ساڵی خایاند و دوای ئەوەش تەنها بە فەرمانی شا سولەیمانی سەفەوی، خان ئەحمەد خانی لە کارلادراو (دووەم) جارێکی تر بۆ دەسەڵات گەڕایەوە ( مردوخ کردستانی، بی تا: ١١٢). ئەوەی سەرنجڕاکێشە کە خان ئەحمەد خانی دووەمیش کە پێشتر جارێك گۆشەگیر کرابوو و ئێستا دووبارە دەسەڵاتی گرتبووەوە، دوای ئەوەی کە لە خولی دووهەمی میرایەتیدا دوو ساڵ بەردەوام بوو، لە ساڵی ١٦٩٥ بۆ جاری دووەم لەسەر کار لابرایەوە و محەممەد خانی کوڕی خەسرەو خان کە بابی لە سێدارە درابوو، بۆ حوکمڕانی ڕاسپێردرا (پێشوو: ١١٣).

سەردەمی حوکمڕانی شا سوڵتان حسەین (١٦٩٤-١٧٢٢) لە لایەن زۆربەی توێژەرانەوە، بە لاوازترین قۆناغی ژیانی دەوڵەتی سەفەوی دەژمێردرێت. لەم کاتەدا بزاڤ و جموجۆڵ و توانای سەربازیی ئیمپراتۆری سەفەوی گەیشتە نزمترین ئاستی خۆی و زۆری نەبرد کە لە ئەنجامی هێرشی هۆزە ئەفغانییەکان کۆتایی بە تەمەنی هات. بەڵام بە پێچەوانەی ڕەوتی ئاسایی لە پێوەندییی نێوان دەوڵەتی ناوەندی و حکوومەتە هەرێمییەکان کە لاوازیی یەکەمیان بەهێزبوونی ئەوی دی لێ دەکەوێتەوە، ئەوپەڕی لاوازی میرنشینی ئەردەڵانیش دەکەوێتە ئەم

قۆناغەوە. شاسولّتان حسەین لە سۆنگەی هێزەوە لەگەڵ میرەکانی ئـەردەڵان کـە دوای کۆتاییهاتن بە شـەڕ لەگـەڵ عوسمـانی ڕۆڵـی پێشـوویان لـە دەسـت دابـوو و ترسێك لە یارمەتیدانیان لـە لایـەن دوژمنـەوە لـە ئـارادا نـەبوو، ڕەفتـاری دەکـرد. نـاکۆکی و دووبـەرەکی نێـوان ئەنـدامانی بنەماڵـەی ئـەردەڵانیش کـە سیاسـەتی دەوڵەتی سەفەوی پەرەی پێ دەدا، ڕێگای بۆ دەستێوەردانی زۆرتر لـە کاروبـاری میرنشینیی ئەردەڵان خۆش کردبوو. شا سولّتان حسەین لـە سـاڵی ١٧٠١ دوای لـە کارلادانی محەمەد خانی ئەردەڵان کە هەوڵی ئامۆزایـەکی خـۆی لـە پشـتەوە بـوو، جـارێکی تـر کەسـێکی بیـانی بـە نـاوی محەمـەد خـانی گـورجی وەك حـوکمڕانی کوردستانی ئەردەڵان دیاری کرد (قاضی،١٣٧٩: ٣٦). دوای ئەمە لـە مـاوەی (٨) ساڵدا، چوار حوکمڕانی بیانی و "نا ئەردەڵانی" یەك لە دوای یـەك لـە کوردسـتانی ئەردەڵاندا حوکمڕانییان کرد (بڕوانە : مردوخ کردستانی، بـی تـا: ١١٣ –١١٦) کـە ئەمە پێشتر تەنها یەك جار و ئەویش لە سەردەمی شا سولەیماندا وێنـەی هـەبوو. ئەگـەر چـی لـە سـاڵی ١٧١٠/١١ دا ، شـا سـولّتان حسـەین دیسـانەوە کەسـێك لـە بنەماڵەی ئەردەڵانی وەکو حوکمڕانی کوردستان دەستنیشان کردەوە، بەڵام ئەمـە تاڕادەیـەکی زۆر دەبـێ وەك پێویسـتییەکی سـەردەم بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی یاخیبوونی ئەفغانەکان کە لەم کاتەدا وەکو هەڕەشەیەکی گـەورە خـۆی نوانـدبوو، لێـك بدرێتـەوە. چـونکە عەباسـقولی خـانی ئـەردەڵان دوای ماوەیـەکی کـورت لـە دامـەزرانی لـە حـوکمڕانی بـە سـوپای ئەردەڵانـەوە بـۆ بەشـداریکردن لـە شـەڕی ئەفغانەکان بانگ کرا (قاضی،١٣٧٩ :٣٨ ).

سـەرەڕای لاوازبـوونی میرنشـینی ئـەردەڵان، سەرچـاوەیەکی وەك تـذکرة الملوك کە لە کۆتایی سەردەمی سەفەویدا نووسراوە، هێشتا کوردستانی ئەردەڵان لە هەژماری چوار والی نشینەکەی ئیمپراتۆری سەفەویدا ناودەبـات (بڕوانـە: مـیرزا سمیعا،١٣٦٨: ٥). هەڵبەت لەوانەیە کە ئەمـە ڕەنگدانـەوەی بـارودۆخی پێشـووتر بوو بێـت. چـونکە لـەم کاتـەدا میرەکـانی ئـەردەڵان بەشـێکی زۆری دەسـەڵات و سـەربەخۆیی خۆیـان لـە دەسـت دابـوو. هەنـدێ دیـاردەی وەك دەسـتێوەردانی بەردەوامی دەوڵەتی ناوەندی لە ئاڵوگۆڕی دەسەڵات و بە تایبەت دانـانی کەسـانی بیـانی بـە حـوکمڕانیی کوردسـتانی ئـەردەڵان، هەنـدێ توێـژەرانی گەیاندۆتـە ئـەو

باوەڕەی کە میرنشینی ئەردەڵان لە سەردەمی شا سوڵتان حسەینی سەفەویدا لە پلەی "والی نشین"ەوە بۆ پلەی "بیگلەربەگی" دابەزیبوو (اردلان، ١٣٨٧: ٥٨ ، برن ، ١٣٤٩ :١١١). دەکرێ بڵێین کە ئەگەر ڕووداوی داگیرکردنی ئەسفەهان لە لایەن ئەفغانەکان و ڕووخانی دەوڵەتی سەفەوی نەهاتبایە پێشەوە، بەردەوامبوونی ڕەوتی ڕوو لە زیادەبوونی دەستێوەردانی دەوڵەتی سەفەوی لە کاروباری ناوخۆی میرنشینی ئەردەڵان و بەتایبەت دانانی حوکمڕانی بیانی بۆ ئەم میرنشینە، سەرەنجام ڕووخانی حکوومەتی ئەردەڵانی لێ دەکەوتەوە. بەڵام هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی سەفەوی ڕەوتەکەی بە ئاراستەیەکی جیاوازدا برد.

## ئەنجام

میرنشینی ئەردەڵان لە هەلومەرجی دوای لێك هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی ئیلخانی لە بەشێکی کوردستاندا کە ناوەندەکەی شارەزوور بوو دامەزرا و بە کەڵك وەرگرتن لە بۆشایی هێزێك کە لە ئەنجامی نەمانی دەوڵەتێکی گەورە لە ناوچەکەدا هاتبووە ئاراوە، توانی درێژە بە بوون و مانەوەی خۆی بدات. لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوی لە سەرەتای سەدەی نۆهەمی کۆچیدا، بۆ یەکەم جار لە دوای ڕووخانی دەوڵەتی ئیلخانییەوە، حکوومەتێکی بەهێز و یەکپارچە کە دەسەڵاتی بەسەر سەرتاسەری ئێراندا هەبوو دامەزرا. لە لایەکی دیکەوە هاوکات لەگەڵ ئەم پەرەسەندنانە ئیمپراتۆری عوسمانیش دەستی بە پەل هاویشتن بۆ داگیرکردنی ناوچە کوردییەکان کردبوو. ئەمانە میرنشینی ئەردەڵانی لەگەڵ جیددیترین قەیرانێك کە لە سەرەتای دروستبوونیەوە تا ئەو کاتە تووشی هاتبوو، بەرەوڕوو کرد و لە دوو لاوە خستیە ژێر گوشاری ئەم دەوڵەتە زلهێزانەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ناکۆکی و ململانێی نێوان دوو ئیمپراتۆری سەفەوی و عوسمانی هەلێکی زێڕینیشی بۆ میرانی ئەردەڵان ڕەخساند. ئاشکرایە کە ئەگەر ڕکەبەرایەتی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە لە ئارادا نەبوایە یان ئەردەڵانەکان بە تەنها لەگەڵ پاوەنخوازی یەك دەوڵەتدا ڕووبەڕوو بوونایە، توانای خۆڕاگرتنیان نەدەما و هەرزوو لە نێو قەڵەمڕەویدا دەتوانەوە. ململانێی سەفەوی – عوسمانی دەرفەتێکی نوێی بۆ درێژەدان بە حوکمڕانی و دەسەڵات، خستە بەردەم میرانی ئەردەڵانییەوە. ئەوان دەبوو بە لیستنی یارییەکی گرنگ و هەستیار، ئەوپەڕی سوود لە ناکۆکیی نێوان دوو ئیمپراتۆری وەرگرن. ئەم یارییە یاسا و ڕێسایەکی دیاریکراوی نەبوو و هەندێ جار پێویستی بە ڕەفتاری ناتەبا و دژبەیەکیش دەکرد. بۆ نموونە کاتێ لەگەڵ ئەم و کاتێك لەگەڵ ئەو دەوڵەت، جارێك لەگەڵ لایەنی بەهێز و هەندێ جار لە ترسی زاڵبوونی لایەنی بەهێز لەگەڵ دەوڵەتی لاواز و ئەوەی کە لە دۆخی بەرگریدا بوو، هاوپەیمانییان دەبەست. ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی میرنشینی ئەردەڵان لە سەرەتای سەردەمی سەفەوییەوە تا کاتی ڕێکەوتننامەی زەهاو (١٦٣٩)، ئەو شێوە جیاوازانە دەردەخات کە میرە بەهێزەکانی ئەم بنەماڵەیە بە پێی کات بۆ پاراستنی هاوسەنگی لە پێوەندیی لەگەڵ دوو دەوڵەتی سەفەوی و

عوسمانیدا، بەکاریان دەبەست. بە کورتی ئەو ڕەفتارانە لە چوارچێوەی یەك لەم بژارانەی خوارەوە دەگونجێن:

١- لە کاتی بەهێزتر بوونی یەکێك لە لایەنەکان و کاریگەر نەبوونی ئەوی دیکە، لانی ئەو دەوڵەتەیان دەگرت کە بە شێوەیەکی پراکتیکی بە سەر هەرێمەکەدا زاڵ بوو. (هاوپەیمانی لەگەڵ لایەنی بەهێز).

٢- لە کاتی زۆربوونی مەترسی و هەڕەشەی یەکێك لە لایەنەکان بۆ سەر میرنشینەکە، لانی دەوڵەتی بەرانبەریان دەگرت. (هاوپەیمانی لەگەڵ لایەنی لاواز)

٣- بە رەزامەندی دەوڵەتی هاوپەیمانەوە، دەستیان بەسەر ئەو هەرێمانەی کە بە قەڵەمڕەوی سروشتیی خۆیان دەزانی دەگرت. (ڕێککەوتن لەسەر قەڵەمڕەو).

٤- لە ڕێگای بەکارهێنانی هێزەوە و بە پشتبەستن بە یارمەتی دەوڵەتی هاوپەیمان، بەشێك لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی بەرانبەریان داگیر دەکرد (داگیرکردنی زۆرەملێ).

٥- هاوکات لەگەڵ دەربڕینی گوێڕایەڵی بۆ لایەنێك، ئیمکانی ئەوەیان هەبوو کە لە ئەگەری زۆربوونی مەترسی ` و هەڕەشەی ئەو لایەنەدا هاوپەیمانیی خۆیان لەگەڵی هەڵبوەشێننەوە و لەگەڵ لایەنی بەرانبەردا کار بکەن. هەڵبەت دەوڵەتی ناوەندیش بەمەی دەزانی و هەوڵی دەدا کە هاوسەنگی پێوەندییەکانی لەگەڵ میرنشینی ئەردەڵان بپارێزێت.

تا ئەو کاتەی کە شەڕی نێوان دەوڵەتی سەفەوی و عوسمانی درێژەی بوایە، هەموو ئەم بژارانەش لە بەردەم میرەکانی ئەردەڵاندا بوو. کەسانێك وەك سۆرخاب بەگ و تەیموورخان و هەڵۆ خان کە هاوچەرخی فەرمانڕەوا بەهێزەکانی وەك تەهماسبی یەکەم و عەباسی یەکەم بوون، ئەم هەلەیان لە بەردەستدا بوو و لە ململانێی نێوان سەفەوی و عوسمانی بۆ پاراستنی دەسەڵات و تەنانەت فراوانکردنی قەڵەمڕەویی خۆیان، کەڵکیان وەردەگرت. بەڵام لە نیوەی دووهەمی دەوڵەتی سەفەوی و دوابەدوای بەستنی پەیماننامەی زەهاو (١٦٣٩) کە ئارامییەکی درێژخایەن باڵی بەسەر هەرێمەکەدا کێشا، ئەم دەرفەتە فەراهەم نەبوو. ئەمەش زیانی بە شان و شکۆ و دەسەڵاتی میرانی ئەرەڵان گەیاند. تا ئەو جێگایەی کە لە کۆتاییەکانی سەردەمی سەفەویدا، پێگەی میرنشینی ئەردەڵان لە "والی نشین"ەوە بۆ" بیگلەربەگی " دابەزیبوو.

## پەراوێزەکان:

١. مامۆستای بەشی مێژووی زانکۆی شەهید بێهێشتی تاران

٢. خوێندکاری قۆناغی دکتۆرای بەشی مێژووی زانکۆی بێهێشتی تاران.
meriwan2009@gmail.com

٣. سەرەڕای ئەوەی کە شەرەفنامە دان بە نەبوونی زانیاری باوەڕپێکراو لە بارەی حوکمڕانانە ئەردەڵانییەکانی پێش سەردەمی سەفەویدا دەنێت، هەندێ سەرچاوەی تازەتر کۆمەڵێك زانیارییان وەکو ڕووداوی سەردەمی ئەم حوکمڕانانە گواستۆتەوە کە ناڕوون و گشتین و هەڵەی مێژوویی ئاشکرایان پێوە دیارە. بۆ وێنە تاریخ مردوخ دەنووسێ کە خزر بەیگی دووەم ، یەك لە میرە ئەردەڵانییەکان کە لە ساڵی ١٣١٠/١٣١١. دەسەڵاتی گرتۆتە دەست و ماوەی ٣٦ ساڵ حوکمی کردووە، ناوچەکانی هەولێر و کۆی و ئامێدی کە پێشتر لە سەر خاکی ئەردەڵان بوون، بۆ دەوڵەتی عوسمانی بە جێ هێشتووە (مردوخ کردستانی، بی تا: ٩٢). ئەمە لە کاتێکدایە کە ئەم بەرواره دەکەوێتە سەردەمی لووتکەی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیلخانی و دەوڵەتی عوسمانیش لەم کاتەدا نەیدەتوانی هیچ ڕۆڵێکی لە ڕووداوەکانی کوردستاندا هەبێت.

٤. سیستەمی کارگێڕی ویلایەتەکان لە سەردەمی سەفەویدا.

٥. هەر چەندە کە گێڕانەوەی قازی ئەحمەدی قومی ئەسڵی ڕووداوەکە واتە هاتنی لەشکری عوسمانی بۆ سەر سۆرخاب بەگ و یارمەتی شا تەهماسب بۆ ئەو لە خۆ دەگرێت، هەندێ هەڵەی مێژووی تێدایە کە دەبێتە هۆی ئەوەی ڕیوایەتی مێژوونووسە کوردەکانی سەردەمی قاجار، سەرەڕای ئەوەی کە دواتر نووسراون، بە ڕاستتر بزانین. ناوبراو هاتنی لەشکرەکەی بۆ ساڵی ٩٥٧ ك گەڕاندۆتەوە و لە بری برازاکانی سۆرخاب بەگ، دەڵێت کە بەگە بەگی برای لەگەڵ لەشکری عوسمانیدا بووە. ئەمە لە کاتێکدایە کە بەگە بەگ زۆر پێش لەم بەرواره مردبوو.

٦. ئەستجانلوو هۆزێکی تورکە و بە یەك لەو حەوت هۆزە سەرەکییە دادەنرێ کە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی یارمەتی شا ئیسماعیلی یەکەمیان دا و پاشانیش بەردەوام وەکو یەك لە کۆڵەکە گرنگەکانی ئیمپراتۆری سەفەوی ڕۆڵی گێڕا.

٧. لە شارباژێر و قەرەداغ و ناوچەکانی کۆی و حەریر لە ناو ئەو ناوچانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی تەیموور خاندا بوون، ناو دەبرێت. بڕوانە: (بدلیسی، ١٨٦٠ :٨٨، ئەلحوسەینی، ٢٠٠٢: ١٨).

٨. بە پێی ئەم ڕێکەوتنە هەڵۆخان لە بەرانبەر کشانەوەی هێزەکانی شا عەباسدا، خان ئەحمەد خانی کوڕی وەکو بارمتە نارد بۆ دەرباری شاعەباس. شا عەباس خوشکێکی خۆی بە ناوی زەڕڕین کۆڵاه خاتوون (کڵاو زێڕ خاتوون)ی لە خان ئەحمەد خان مارە کرد و سەرەنجامیش وەکو ئامرازێك لە دژی هەڵۆخانی باوکی کەڵکی لێ وەرگرت. لەم بارەوە بڕوانە: (منشی ترکمان، ١٣٥٠ :٩٢٦ /٢ ، قاضی، ١٣٧٩: ٢٣).

٩. خان ئەحمەد خان دوای ئەوەی کە لە وەرگرتنەوەی دەسەڵات بە یارمەتی سوپای عوسمانی شکستی هێنا، ماوەیەك لە لایەن عوسمانییەوە کرا بە حوکمڕانی کەرکووك و مووسڵ و دوای مردنیشی لە تەنیشت مەزارگەی نەبی یونس لە مووسڵ بە خاك سپێردرا (مردوخ کردستانی، بی تا: ١٠٧).

١٠. جێی ئاماژەیە کە بدلیسی ماوەی حوکمڕانی سۆرخاب بەگ بە ٦٧ ساڵ دەزانێت کە ڕەنگە بەو ساڵانەوە بێت کە ناوبراو لە قەڵای مەریوان وەکو حوکمڕانی ژێر دەستی بەگە بەگی برای ڕۆژگاری بەسەر دەبرد. بڕوانە: (بدلیسی، ١٨٦٠: ٨٦).

## سەرچاوەکان

١. اردلان، شـيرين، (٢٠٠٨)، خانـدان كـرد اردلان در تلاقـى امپـراطـورى هـاي ايـران و عثمانى، ترجمه: مرتضى اردلان، تهران، نشر ٢٠٠٨ ايران.
٢. استرآبادي، سيد حسن بن مرتضى حسيني، (١٩٨٥)، از شيخ صفي تا شاه صـفي از تاريخ سلطاني، به كوشش دكتر احسان اشراقي، تهران، انتشارات علمي.
٣. اسـكندر، سـعد بشـير، (٢٠٠٨)، قيـام النظـام الامـاراتي في كردسـتان وسـقوطه، السليمانية، بنكەی ژين.
٤. ئەحمــەد حەمــەد ئــەمين و دلشــاد مــەحموود عەبـدولڕەحمان (٢٠١١)، كاريگــەری پەيماننامەی زەهاو ١٦٣٩ لە سەر كوردستان، هەولێر، دەزگای موكريانی.
٥. ئەلحوســەينی، عـــەلی نـــەقی، (٢٠٠٢)، مێـــژووی ٦٤١ ســـاڵەی فـــەرمانڕەوايی ئەردەڵانييەكان، وەرگێڕان لە فارسييەوە: ئاسۆس هەردی، سلێمانی، سەردەم.
٦. ئيسكەندەر، شەمسی محەممەد، (٢٠٠٩)، مێژووی كورد لە سەدەی ١٦ هەمدا، شوكر مستەفا لە ئازەربايجانييەوە كردوويە بە كوردی، هەولێر، ئاراس.
٧. بابانی، عبدالقادر بن رستم، (١٩٩٨)، سير الاكراد (در تاريخ وجغرافيـای كردسـتان)، به اهتمام محمد رئوف توكلی، سنندج، انتشارات توكلی.
٨. بدليسی، شرفخان بن شمس الدين، (١٨٦٠)، شرفنامە، بطربورغ، دارالطبـاع آكادميـە ايمبراطوريە.
٩. ـــــــ ، ـــــــــــــــــــــــ، (١٩٦٤)، شـرفنامە، بـا مقدمـە و تعليقـات محمد عباسی، تهران، نشر علمی.
١٠. برن، رهـر (١٩٧٠)، نظـام ايـالات در دورەی صـفويە، ترجمـە كيكـاووس جهانـداری، تهران، بنگاه ترجمە و نشر كتاب.
١١. تركمان، اسكندر بيگ منشی، (١٩٧١)، تاريخ عـالم آرای عباسـی، تهـران، انتشـارات امير كبير، ج ٢.
١٢. خانبابا، بيانی، (١٣٥٣)، تاريخ نظامي ايران (در دورەی صفويە)، تهران، انتشـارات ستاد بزرگ ارتشتاران.
١٣. خضري، احمد رضا و اصغر قائدان و ستار ايينە پـور، (٢٠١٢)، « دور امـارە اردلان في الصراع الصفوي العثماني» مجلة العلوم الانسانية الدولية، العدد ١٩.
١٤. روملو، حسـن، (١٩٦٣)، احسـن التـواريخ، تصـحيح چـارلس نـارمن سـيدن، تهـران، انتشارات كتابخانەـی شمس.

١٥. رویمر، هانس روبرت، (٢٠٠٦)، ایران در راه عصر جدید (تاریخ ایران از ١٣٥٠تا ١٧٥٠)، ترجمه ادز اهنچی، تهران، انتشارات دانشگاه تهران.

١٦. سنندجی، میرزا شکرالله (فخر الکتاب)، (١٩٨٧)، تحفەی ناصری (در تاریخ وجغرافیای کردستان)، تهران، امیر کبیر.

١٧. سیوری، راجر، (٢٠٠٨)، ایران عصر صفوی، ترجمه کامبیز عزیزی، تهران، نشر مرکز.

١٨. قاضي، ملا محمد شریف، (٢٠٠٠)، زبدة التواریخ سنندجی، به کوشش محمد رئوف توکلی، سنندج، انتشارات توکلی.

١٩. قمی، قاضي احمد بن شرف الدین الحسین ، (بی تا)، خلاصة التواریخ، به تصحیح دکتر احسان اشراقی، بی جا، بی نا، ج١.

٢٠. کجباف، علی اکبر و حسین میر جعفری و فریدون نوری، (٢٠١١)، «بررسی روابط سیاسی والی نشین اردلان با حکومت صفویه»، مجلەی پژوهشهای تاریخی دانشگاه اصفهان، شماره اول (پیاپی ٩).

٢١. مردوخ کردستانی، محمد، (بی تا)، تاریخ مردوخ (تاریخ کرد و کردستان)، بی جا، بی نا، جلد٢، چاپ دوم.

٢٢. مصنف، خسرو بن محمد بن منوچهر، (٢٥٣٦)، لب التواریخ، تهران، کانون خانوادگی اردلان.

٢٣. منجم، ملا جلال الدین، (١٩٨٧)، تاریخ عباسی (یا روزنامەی ملا جلال)، به کوشش سیف الله وحیدنیا، تهران، انتشارات وحید.

٢٤. میرزا سمیعا، (١٣٦٨)، تذکرة الملوك (وتعلیقات مینورسکی بر تذکرة الملوك)، به کوشش سید محمد دبیر سیاقی، ترجمه مسعود رجب نیا، تهران، امیر کبیر.

٢٥. نوایی، عبدالحسین و عباسقلی غفاری (٢٠٠٢)، تاریخ تحولات سیاسی، اجتماعی، اقتصادی و فرهنگی ایران در دوران صفویه، تهران، انتشارات سمت.

٢٦. وقایع نگار، علی اکبر، (١٩٨٥)، حدیقەی ناصریه (در جغرافیا و تاریخ کردستان)، تصحیح محمد رئوف توکلی، سنندج، ناشر محمد رئوف توکلی.

## ملخص البحث

## تاثير الصراع الصفوي العثماني على امارة اردلان الكردية

تمكنت العائلة الاردلانية الكردية من تاسيس امارة شبه مستقلة في جزء من كوردستان في ظل ظروف سيادة عدم الاستقرار السياسي والتعقيدات في المنطقة وذلك بعد انهيار الدولة الايلخانية. جاءت نهاية نفوذ وسلطات معظم الكيانات المحلية والامارات شبه المستقلة، والتي تاسست في الفترة مابين انهيار الدولة الايلخانية وقيام الدولة الصفوية، على يد الشاه اسماعيل الصفوي. مع ذلك استطاعت الامارة الاردلانية ان تحافظ على كيانها الشبه مستقل لفترة اخرى رغم بعض المشاكل والصراعات التي واجهتها.

تظهر المراجعة التاريخية لعلاقات امارة اردلان بالحكومة الصفوية، ان امراء اردلان من خلال استغلالهم لتوتر العلاقات بين الصفويين والعثمانيين، استطاعوا ان يحافظوا على سلطاتهم واستقلالهم حتى في ظل اقوى الحكام في الدولة الصفوية كطهماسب الاول وعباس الاول. ولكن وبعد التوقيع على معاهدة زهاو عام ١٦٣٩ وتراجع حدة الصراع العثماني – الصفوي والحروب الطويلة بين الطرفين، بدأت امارة اردلان تفقد اهميتها السابقة على حدود الدولتين المتصارعتين وامكانية الاستفادة من تنافسهما على النفوذ والسيطرة. وهكذا بدأنا نرى بعد هذه الاتفاقية رغم ضعف الدولة المركزية، ان تدخل الحكام الصفويين في شؤون امارة اردلان الداخلية بدأ يتنامي بشكل كبير.

اعتمد الباحثان في اعداد دراستهما هذه على المصادر الايرانية الاصلية، الامر الذي نفتقده في دراساتنا عن تاريخ الكرد في ايران بشكل كبير.

## Abstract

### The Impact of the Safavid-Ottoman conflict on The Kurdish Princedom of Ardalan

The Kurdish Princedom of Ardalan founded a quasi-independent princedom in parts of Kurdistan under the prevailing circumstances of political instability and intricacy of the region created after the fall of the Elkhan state. Notably, King Ismael the Safavid's accession to power brought the demise of most of the local entities and quasi-independent princedoms founded in the period between the collapse of the Elkhan state and the rise of the Safavid state. Yet, the Ardalan princedom managed to preserve its semi-independent entity for some time despite the challenges it encountered.

A historical reconsideration of Ardalan princedom relations with the Safavid government would reveal that Ardalan princes were able to maintain their power and independence even under the strongest and toughest Safavid rulers such as Tahmasp the first and Abbas the first by capitalizing on the tense relations between the Safavids and the Ottomans.

Yet, after Zahab treaty was signed in 1639 which eased the tensions between the two powers and the long-standing wars between them, the princedom began to lose its former significance on the borders between the two powers, thus minimizing the possibility of taking advantage of influence and power any longer. Yet, even though the central government became weak in the aftermath of the treaty, the Safavid ruler's interference in the internal affairs of Ardalan princedom increased significantly.

Finally, it is worth mentioning that the researchers have consulted authentic Iranian sources for achieving the study, something that we find missing in most of our studies on the Kurdish history in Iran.

# دوكتۆر مارف خەزنەدار لە

# (ڕۆژگاری من )دا

محەمەد بەهرەوەر

**پێشەكی :**

دوكتۆر مارف خەزنەدار لە چوار بەرگی كتێبێكدا بە ناوی "ڕۆژگاری من" بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە. كتێبەكان ئەمانەن:

١. ڕۆژگاری من. پەیدابوون.. (١٩٣٠–١٩٤٩) یاداشتی دوكتۆر مارف خەزنەدار. بەرگی یەكەم. هەولێر ٢٠٠٩.

٢. ڕۆژگاری من. دروست بوون (١٩٤٩–١٩٦٠) یادداشتی دوكتۆر مارف خەزنەدار، بەرگی دووەم. هەولێر ٢٠٠٩.

٣. ڕۆژگاری من. ژیانی ڕووسیا (A) (١٩٣٠–١٩٣٨) یادداشتی دوكتۆر مارف خەزنەدار. بەرگی سێیەم. هەولێر ٢٠١٠.

٤. ڕۆژگاری من. ژیانی ڕووسیا (B) (١٩٣٠–١٩٣٨) یادداشتی دوكتۆر مارف خەزنەدار. بەرگی چوارەم. هەولێر ٢٠١٠.

لەو یاداشتانەدا زۆر بابەتی جۆراوجۆر بیر و مێشكی نووسەریان ورووژاندووە و بۆچوونی خۆی لە ڕووداوەكان بە شێوەیەكی زانستییانە دەربڕیوە. بەرگی یەكەم و دووەمی سەردەمی منداڵی و خوێندنی ناوخۆیی و وڵات لە خۆی دەگرێ. بەرگی سێیەم و چوارەمیش باسی هەشت ساڵی ژیانی لە ڕووسیا دەكا. ئەوەی لەو یاداشتانەدا سەرنجراكێشە، گێڕانەوەكانی بە ڕواڵەت ساكار و ئاساین، بەڵام لە هەمان كاتدا مێژوویەكی گرنگ و پڕ ناوەڕۆكن و خوێنەر بە دوای خۆیان ڕادەكێشن، بە بڕوای من سەرنج و وردەكارییەكانی دەكرێ وەكو داهێنەرێك لەم بوارەدا چاوی لێ بكرێ.

## ١- ژیانی منداڵیی مارف خەزنەدار:

دوکتۆر مارف لە "ڕۆژگاری من" بەرگی یەکەمدا دەنووسێ: "کە من لە دایك بووم، منداڵێکی لەڕو لاواز و هەناسە تەنگ، شیر دەمژێ لە لووتی دێتە دەرەوە، سنگی بە پشتییەوە نووساوە، قەفەزەی سنگی شکاوە، چاڵێکی دروست کردووە، خەڵکی دەیانگوت ئەمەش نەبووایە!".

بەڵام بەرخ هەمیشە لەبن سەوەتەیدا نابێ، خەزنەدار لە دواڕۆژدا دەبێتە خەزێنەیەکی ئەدەبی و ڕووناکبیری بۆ نەتەوەکەی، لەپێناو گەل و نیشتماندا هەست بە لێپرسراوی دەکا، هەر لە سەرەتای ژیانیدا ئەو هەستە ڕۆژ بە ڕۆژ و بەرە بەرە گەشە دەکا و لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا خۆی دەنوێنێ.

خەزنەدار، لە یەکەم ڕۆژی دەرس خوێندنیدا، لەلای مەلا عەبدوڵڵا لە حوجرەی مزگەوت، کاتێك مامۆستا بە زمانی تورکمانی دەرسەکەی دەڵێتەوە هەڵدەداتێ و دەڵێ: "مامۆستا بۆ بە کوردی پێمان ناڵێی؟". لەو تەمەنەدا هەستکردن بە زمانی زگماکی، هەستێکی نیشتمانپەروەری و پیرۆزە کە لە دەروونێکی پاك و بێگەرد سەرچاوە دەگرێ. کەسێکی لە سەرەتای ژیانیدا ئەو هەستەی تێدابێ، بێ شك لە دواڕۆژدا دەبێتە جێگای ئومێد و بەو بیرۆکەوە بیر و مێشکی پەروەردە دەبێ و هەستی خۆشەویستی زمان ڕۆژبەڕۆژ بەرەو سەر دەبا.

دوکتۆر مارف، لەو کاتەوە کە فامی کردووەتەوە، مێشکی بە بیرۆکەی هەستی نەتەوایەتی ئاو دراوە و هەست بە بەرپرسیارێتی دەکا و بۆچوونی خۆی سەبارەت بە دەسەڵاتی عوسمانییەکان لە ناوچەکەدا لە لاپەڕە ٣٧ی ڕۆژگاری من، بەرگی یەکەمدا دەنووسێ: "بۆنی ئەو چەند سەد ساڵەی تورکە عوسمانییەکان فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەیان کردبوو، ئێستا هەر دەهات، لەلای هەندێ کەس بۆنی لاشەی بۆگەنی کەلاکە بوو. بۆ هەندێکی دیکەش ئەو بۆنە بۆیان بووبوو بە عەتر و گوڵاو و هەندێ کەس بە تایبەتی دەوڵەمەندی ناو بازاڕ و ئاغا و دەرەبەگی شار لە ژێر سایەی عوسمانییەکاندا بوون بە خاوەن ماڵ و سامان".

لێکدانەوەی هەلومەرجی ئەوکاتە و لەو تەمەنەدا، گێڕانەوە بۆ بەرەی داهاتووە کە ئاگاداری ڕابردوو بن و بیر لە بەرژەوەندی خۆیان بکەنەوە، خۆیان نەدەنە دەست قەزاو قەدەر، بەڵکو دەبێ بیر لەوە بکەنەوە کە چارەنووسی

خۆیان، بۆخۆیان دیاری بکەن. بە کورتی هەلومەرجی ئەو کاتی هەولێر بە هەموو چین و توێژەکانەوە، بەپێی قازانج و بەرژەوەندە چینایەتییەکان شی دەکاتەوە و کۆمەڵگای لێ ئاگادار دەکاتەوە و زانیاری گەلەکەی بۆ تێگەیشتن لە ڕووداوەکان دەباتە سەر. دیارە ئەوە بەشێکە لە ئەرکی ڕووناکبیر و نیشتمانپەروەر و دوکتۆر و داکۆکی لەو ڕێبازە بە چاوێکی نیشتمانییانە چاو لێ دەکا.

مامۆستا ئەو کاتانەی لەگەڵ باوکی دەچن بۆ گوند و سەر لە خزمان و دۆست و ناسیاوەکانیان دەدەن، بە سەرنجەوە چاو لە چۆنێتی ژیانی گوندییەکان دەکا و لەگەڵ ژیانی خەڵکی شار هەڵیاندەسەنگێنێ و کەم و کوڕییەکان لە مێشکیدا دێنی و دەبا، بەڵام هۆیەکانی بۆ ناچنەوە سەریەك. ئەوەی زیاتر لە هەموو شتێك بەلایەوە گرینگ بوو، نە بوونی قوتابخانە بوو لە گوندەکان، لە لاپەڕە ٥٠ی بەرگی یەکەمی "ڕۆژگاری من"دا دەنووسێ: "لەو کاتەدا بیرم لە قوتابخانەی خۆم دەکردەوە، پێم سەیر بوو بۆچی قوتابخانە لە گوندا نییە، بۆ ئەوەی ئەم منداڵە جوانانە فێری خوێندنەوە و نووسین بن. ئەم پرسیارەم بەرەو ڕووی قادر ئاغا کردەوە، گوتی: "ئێمە لە گوندا خوێندەواری تێدا نییە".
هەرچەند مامۆستا لە پۆلی سەرەتاییدا، قوتابییەکی سەرکەوتوو نەبووە، بەڵام هەستکردن بە مەسەلەیەکی وا گرینگی کۆمەڵایەتی ئەویش لە تەمەنێکی ئەوتۆدا — ئەوە دەگەیەنێ کە پێی خۆش بووە جیاوازی لە نێوان منداڵی شار و دێدا نەبێ و قوتابخانە بۆ هەمووان وەك یەك دابین بکرێ.

## ٢- پەروەردەبوونی هەستی نیشتیمانپەروەری:

"هیچ کەس لە پڕێ نابێ بە کوڕێ" بێگومان ئەوە شتێکی حاشا هەڵنەگرە. خەزنەداریش لەو پەندە بەدەر نییە و هەڵسوکەوتی بنەماڵە و دۆست و ناسیاوی نیشتمانپەروەر بوونە هۆی ئەوەی کە خۆشەویستی و دڵسۆزی بۆ گەل و نیشتمان لە مێشکیدا پەروەردە بێ و هەنگاو بە هەنگاو ئەو هەستە نیشتمانپەروەرییە پەرە پێبدا. لە دووکانی وێنەگری گیوی موکریانی، وەك هەر شوێنێکی تر، بە سەرنجەوە چاو لە دەرو دیوار و قوژبنی هۆدەکە دەکا و نووسینی ڕستەی "وێنەی هۆنراوەی" لەسەر تەختەیەك سەرنجی ڕادەکێشێ و دەنووسێ: "ئەمە یەکەمین

تەختە بوو لە هەولێر بە زمانی کوردی نووسرابێ". هەر بەم بۆنەوە زۆر ڕێز لە گیو دەگرێ و بە سەرچاوەی یەکەمی بیری کوردایەتی خۆی دادەنێ.

چەوسانەوە، لە هەر وڵاتێك و لە لایەن هەر کەسێکەوە بێ، هەم کردەوەیەکی بێ شەرمانەیە و هەم پێشێلکردنی مافی مرۆڤە. دەسەڵاتە پاوان خوازەکان، لەهەر وڵات و نەژادێك و نەتەوەیەك بن بۆ چەوسانەوەی گەلانی ژێر دەست و درێژەدان بە دەسەڵاتی خۆیان لێك دەکەن. مامۆستا قەڵاچۆی گەلی کورد بەدەستی ئەو وڵاتانەی کوردی تێدا نیشتەجێن، لەقاو دەدا و جیاوازییان لە نێواندا بەدی ناکا. هەر بۆیە پان ئێرانیزمی فارس و تورانیزمی تورك، وەك یەك تەماشا دەکا و پێی وایە خراپ و خراپترن.

ڕژێمی پاشایەتی بە درێژایی مێژوو زیاتر بۆ قۆرغکردنی دەسەڵات کەڵکی لێ وەرگیراوە و بەرژەوەندی کۆمەڵگای پێشێل کردووە. بەڵام ململانێ و خەبات دژی دیکتاتۆری بە بەردەوامی درێژەی هەبووە، نەپساوەتەوە و ڕێڕەوانی ڕێگای ئازادی لە خەبات نەوەستان. مارف خەزنەدار، بەپێی دارشتنی پایە و بناغەی بیرۆکەی نەتەوایەتی کە لە مێشکیدا گورا بوو، ڕژێمی پاشایەتی بە دڵەوە نەدەنووسا. کاتێك باوکی هەواڵی مەرگی مەلیك غازی ڕادەگەیەنێ، ئەو خەڵکانەی لە ماڵی ئەوان دەبن هەریەکەی بە جۆرێك هەستی خۆی دەردەبڕێ. خەزنەدار، لەلاپەڕە (٨)ی بەرگی یەکەمی "ڕۆژگاری من"دا دەنووسێ: "من مەلیکم خۆش نەدەویست. نەك لەبەر ئەوەی خەڵکی ئەم وڵاتە نەبوو و لە حیجازەوە هاتبوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی کوردی نەدەزانی، لەوکاتەدا بەلای منەوە ئەگەر وڵاتێك لە دوو نەتەوە پێکهاتبێ، پێویستە مەلیکەکەی زمانی هەردوو نەتەوەکەی بزانێ".

خەزنەدار، بە هۆی هەستی نەتەوایەتی نزیکەی هەشتا ساڵ لەمەوبەر پێی وابوو عێراق لە دوو نەتەوەی کورد و عەرەب پێکهاتووە و پێویستە وەك یەك لە بەڕێوەبردنی چارەنووسی خۆیان بەشدار بن و کە سەرئەنجامیش بوو بە بیرۆکە و ئێستا وڵاتی عێراق دوای ڕووخانی دیکتاتۆری خوێن خۆر، سەددامی گۆڕبەگۆڕ، بە فەرمی دەستووری عێراق ئەو مافەی دیاری کردووە و کورد بە مافی ڕەوا و سروشتیی خۆی گەیشتووە.

### ٣- مارف خەزنەدار وەك ڕۆژنامەنووس و ڕووناكبیر:

كـاری ڕوونـاكبیری و ڕۆژنامــەوانی ئــەركێكی پــیرۆز و قورســە، كـاركردن و هەنگاونان لەم بوارەدا گیانی لەخۆبردوو و ماندوونەناسانەی دەوێ. مەلـەوانی ئـەو ڕێبازە دەورێكی گرنگی لەسەر شانە و بناغەی شارستانییەت و مەدەنییـەت لـەنێو كۆمــەڵگادا دادەڕێــژێ و دەروازەیەكــە بــۆ چــوونە نێــو دونیــایی كۆمەڵگایــەكی بەختەوەر و پێشكەوتوو.

مامۆستا خەزنەدار، یەكێك بوو لە ڕێبوارانی ئەو ڕێگا پیرۆزە، بـە كـردەوە و بیروبــاوەڕێكی قــایم و پتــەو، ڕۆژنامــەوانی هەڵبــژارد بــۆ وەدەســتهێنانی مــافی چارەنووسی نەتەوەكەی، بە هەست و گیـانێكی پـاك و كوردانـە وەك ئاڵاهـەڵگری ئەو ڕێبازە زۆر بوێرانە تا دوا هەناسەی ژیانی قەڵەمی لـە دەست نەكـەوتووە، بـە نووسین و بڵاوكردنەوەی دەیان كتێب و وتار، ئەو ڕاستییەی سـەلماند كـە مرۆڤـی كـورد ڕوونـاكبیریی زۆر لـە سـەرێیە، بـەڵام نـەیارەكانی ئاسـتەنگیان بـۆ دروست كردووە و نەیان هێشتووە گەشە بكا.

مامۆستا، وەك هەموو مرۆڤێكی دیكە هەوراز و نشێوی زۆر لـە ژیـان تـووش هاتووە و ئاڵوگۆڕی بەسـەر هـاتووە، بـەڵام سـەرەنجام بـۆ چارەسـەریی مـافی لـە دەستچـوو و خـوراوی نەتەوەكـەی. شۆڕشـی قەڵـەمی هەڵبـژاردووە و لـە لاپـەڕە (٢٠٥)ی "ڕۆژگـاری مـن" بـەرگی یەكەمـدا دەنووسـێ: "لـەو سـەردەمەدا وام بـیر دەكردەوە، كورد ناتوانـێ شۆڕشـی سیاسـی بـەرپا بكـا و مـافی وەربگـرێ، بـەڵام دەتوانـێ شۆڕشـی خوێنـدەواری و ڕۆشـنبیری هەڵبگیرسـێنێ، ڕۆژنامـە و گۆڤـار و كتێب و ڕادیۆ بەلامەوە گرنگ بوو".

### ٤- مارف خەزنەداری ڕۆژنامەنووس و بەندیخانە:

قانع دەڵێ: "**بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر دەبێ**

**قوربەسەر ئەو دوژمنەی هیوای بە بەندیخانەیە**".

دوژمنــانی ئــازادی و دیموكراســی هەمیشــە بەنـدكردنی ڕووناكبیرانیـان وەك چــەكێكی بــراوەی ئامانجــە چــەپەڵەكانیان بــۆ درێــژەدانی حكوومەتەكــەیان بەكارهێناوە. بەڵام ڕێبوارانی ڕێگـای ڕزگـاریی مرۆڤایـەتی، زۆر جـار بەندیخانـەیان

کردۆتە قوتابخانەی شۆڕش و سەرچاوەی زانیاری و بیری ئازادیخوازییان بەربڵاوتر بووە. دیکتاتۆرەکان تەنیا بەڕواڵەت لە زیندانەکاندا توانیویانە لەشی بەندییەکان زیندانی بکەن بەڵام بۆیان نەکراوە بیر و ڕای ئازادیخوازییان لێ بستێنن. بە پێچەوانەوە بیر و ڕای پتەو بە دیموکراسییان کردووە بە گوللە و ئامانجە چەپەڵەکانیان کردوون بە نیشانە و بناغەی کۆشکی دەسەڵاتدارانی دژ بە ئازادییان بنکۆڵ و لەرزۆك کردووە.

مامۆستا خەزنەدار، یەکێك بوو لەو ڕووناکبیرانەی کە زیندان ورەی نەڕووخاندووە، بەڵکو بناغەی باوەڕ بە ئازادی و ئازادیخوازی پتەوتر بوو. وەرێخستنی نارەزایەتی لە نێو بەندیخانە، کەڵك وەرگرتن لە نامەخانەی بەندیخانە، بیرۆکەی خوێندەواریی دەرمانی سەرەکی کۆمەڵانی ژێردەست دەزانی و لە زینداندا دەگۆڕێ و تا دوا هەناسەی ژیان لەو ڕێبازە دوور ناکەوێتەوە. هەڵسوکەوت و وتار و نووسراوەکانی بەڵگەی زیندوون و حاشا هەڵنەگرن. خەزنەدار، بایەخی زۆر بە ئازادی دەدا. لە لاپەڕە (٢٢٩)ی بەرگی یەکەمی "ڕۆژگاری من" دەنووسێ: "من ئامانجێکی پیرۆز تێدەکۆشم، ڕزگاریی نەتەوەیی کورد لە پێش هەموو شتێکدایە، ئینجا لە پێناوی سووککردنی باری ژیانی هەژاری کورد، لە پاشان بۆ هەموو مرۆڤایەتی".

### ٥- مارف خەزنەدار و ناساندنی کورد:

خەزنەدار، هەمیشە لە خەمی ئەوەدا بوو، کە نەتەوەی کورد بە گەلانی دیکە بناسێنێ، بە تایبەت عەرەب. لە لاپەڕە (٢٧)ی بەرگی دووەمی "ڕۆژگاری من"دا بە کردەوە لەم بوارەدا دەست پێدەکا و دەنووسێ: "ئەو هاوینە لە ماڵ نەدەهاتمە دەرەوە، پارەی چاخانەی ڕۆژانەم کۆدەکردەوە و گۆواری میسریم پێ دەکڕی، بە تایبەتی گۆواری (الهلال). پڕۆژەییێکیشم دانابوو بە عەرەبی زنجیرەیەك وتار بنووسمەوە لە بابەت ئەدەبی کوردییەوە، بڕیارم وا بوو هەر وتارەی لەسەر شاعیرێکی کورد بێ".

مامۆستا خەزنەدار، لە کاتی قوتابیبوونی لە بەشی زمانی عەرەبی لە زانکۆی بەغدا زیاتر لەگەڵ ئەدەبیات و ڕووناکبیرانی کورد و غەیرە کورد ئاشنا

دەبێ. ئاشنایی تازە و نووسراوەی نوێ سەرنجی مامۆستا ڕادەکێشن، بەرە بەرە ئامانجەکانی دێنەدی، قۆڵ هەڵدەماڵی و دەست دەکا بەکاری چالاکی و ڕۆژنامەوانی، لە کۆڕو کۆبوونەوەکانی قەڵەم بە دەستان و نووسەراندا بەشداری دەکا. هەرکات هەلی بۆ ڕەخسابێ و باسی کورد کرابێ بیر و ڕای خۆی دەربڕیوە، بەرگری لە کورد و کەلتوورەکەی کردووە. بۆ وێنە زۆر جار کە عەرەبەکان داوای نووسینیان لێ کردووە بە ئاشکرا وتوویەتی من ئەگەر بنووسم لەسەر کورد دەنووسم. "غازی عەبیاش" یەکێك بووە لە ڕۆژنامەنووسە دیارەکانی بەغدا و سەرنووسەری (اخبار المساء — هەواڵی ئێوارە) بووە. داوا لە خەزنەدار دەکا وتاری بۆ بنووسێ، ئەویش دەڵێ: "ئەگەر بنووسم لەسەر کورد دەنووسم، نووسینیش لەسەر کورد بە تایبەتی ئەگەر قسەی ڕاست و ڕەوان و بێ پێچ و پەنا بێ، گرژی لای میری دروست دەکا. گوتی: چۆن؟ بەڵگەیێکم بۆ بهێنەوە. گوتم: ئێمە خوێندەوارێکمان لە ئەوروپا هەیە ناوی دوکتۆر کامەران بەدرخانە، باب و باپیری شۆڕشگێڕ بوون، خۆشی سیاسی و دیپلۆماس و خوێندەوارە، گەر من وتارێکی لەسەر بنووسم، دیارە تەنیا لایەنی خوێندەواری باس دەکەم، بەڵام گومان لەوەدا نییە سانسۆر بە تۆ دەڵێ بۆچ شتتان لەسەر ئەو پیاوە سیاسییە نووسیوە کە لە پاریس دانیشتووە، پڕوپاگەندە بۆ کورد دەکا. غازی عەبیاش ئازایانە گوتی: وتارێکی وام بۆ بنووسە ئینجا بزانە چۆن بڵاوی دەکەمەوە".

مامۆستا، غازی عەبیاشی ڕازی کردووە وتارەکەی بە ناوی "لە گەورە پیاوانی ڕۆژهەڵات کامیران بەدرخان" بنووسێ و لە ڕۆژنامەی (اخبار المساء) بڵاو دەبێتەوە... ئەو وتارە لە ناوخۆ و دەرەوەش دەنگ دەداتەوە. مامۆستا، بە هەڵبژاردنی ئەو وتارە، دوو ئامانج بەیەکەوە دەپێکی: یەکەم، دەوڵەتی عوسمانی و سیاسەتە چەوتەکانی سەبارەت بە بنەماڵەی بەدرخانییەکان و ئاوارەکردنیان. دووهەم، هەستی نەتەوایەتی و کوردایەتی بەبێ جیاوازیی سنووری دەری کرد".

وەرگێڕان لە ژیانی کۆمەڵگادا دەورێکی سەرەکی هەیە، بە هۆی وەرگێڕان مرۆڤ دەتوانێ لە ئەزموونی وڵاتانی پێشکەوتوو کەڵك وەرگرێ و کۆمەڵگای خۆی پێ دەوڵەمەند بکا. هەروەها، لەو ڕێگاوە دەتوانێ کلتووری نەتەوەکەی خۆشی بە گەلانی دیکە بناسێنێ. زمان کەرەستەی بنەڕەتی هەموو گەلێکە، واتە زمان

پێناسەی نەتەوایەتییە، لە خۆڕا نییە دوژمنانی نەتەوەی کورد زمانی زگماکیان لێ قەدەغە دەکەن. ئەوان خاڵی سەرەکییان پێکاوە، بەڵام ڕێبوارانی ڕێگای ڕووناکبیری و خەمخۆرانی ڕۆژنامەوانی ئامانجی چەپەڵ و دژ بە مرۆڤایەتی دوژمنانیان بەرپەچ داوەتەوە و ئەرکی نەتەوایەتیی خۆیان ڕاپەڕاندووە و ڕیسەکەیان لێ کردوونەوە خوری.

دوکتۆر خەزنەدار، هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری، وەك کەلتوور، خوێندەواریی، سیاسی، ستەمی نەتەوایەتی، ڕووناکبیری، زمانەوانی، چیرۆك، شیعر، ئەدەب، ژیانی شار و لادێ، خواردەمەنی. تەنانەت کەرەستەی هێندێك خواردەمەنی باوی کوردەواری، داب و نەریتی ناوچەکان، بۆنە و جێژنە ئایینی و نەتەوایەتییەکان و زۆر شتی تر دەخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. لە لاپەڕە (١٠٤)ی بەرگی دووەمی "ڕۆژگاری من"دا باسی گۆواری (الصحيفة) دەکا کە (ریاز هەمزە شێر عەلی) خەڵکی کەربەلا دەری دەکا، پێوەندی پێوە دەگرێ ، دەبێ بە هاوکاری گۆوارەکە و دەست دەکا بە کاری ڕۆژنامەوانی، زانیاری لە بابەت کەلتوور و ڕۆشنبیری کورد دەکاتە هەوێنی نووسراوە و کەسایەتییەکانی کورد و بە وەرگێڕانی بەرهەمەکانیان بە زمانی عەرەبی، ئەرکی ڕووناکبیریی خۆی بە چاکی بەڕێوە دەبا لە نێو کۆمەڵگای عەرەبیدا.

دوکتۆر خەزنەدار، کاتێك دەبێتە قوتابی لە زانکۆی بەغدا، زیاتر لە پێشوو لەگەڵ نووسەران و ڕووناکبیران و ڕۆژنامەنووسان تێکەڵ دەبێ و دەست دەکا بە نووسین لەسەر ئەدەبی کوردی لە ڕۆژنامەی (ژین) و (هەتاو)دا. هەروەها پێوەندی لەگەڵ ڕووناکبیرانی کورد و عەرەب پتەوتر دەکا و پلەی زانیاری ڕۆژبەڕۆژ دەباتە سەر. جگە لە نووسین لە ڕادیۆی بەغداش جێ پێی خۆی دەکاتەوە و زنجیرە وتارێك بەناوی (ئەدەبی کوردی) دەست پێ دەکا و هەفتەی جارێك بۆ خۆی لە ڕادیۆ دەیخوێنێتەوە و گەلێك دۆست و ئاشنای ڕۆشنبیر و هونەرمەند لە بەشی کوردی ڕادیۆی بەغدا پەیدا دەکا. خەزنەدار، کوردایەتی لە حیزبایەتیکردن پێ چاکتر بوو، پێی وابوو سیاسەت زیان لە نووسەری سەربەخۆ دەدا و بەرژەوەندی بەرتەسکی حیزبی لە چوارچێوەی تەسکدا دەیهێڵێتەوە.

مامۆستا خەزنەدار، لەلاپەڕە (١٣٥)ی "ڕۆژگاری من" بەرگی دووەمدا دەنووسێ: "ڕووی شارستانیی هەولێر لە ترووسکاییەکی دووکانە بچووکەکەی "گیوی موکریانی" دەبینرا کە لە سەری نووسرابوو (چاپخانەی کوردستان). گۆواری (هەتاو) چاو ڕوونکەرەوە بوو، لە ژمارەیێکدا گیوی موکریانی وتارێکی منی بە زمانی کوردی پێشانی "یەحیا جوبووری"دا، گوتی: باوکم هاوڕێی مام بەختیارە بە دوو زمان دەنووسێ. سوپاسم کرد، بەڵام لە ناوەوەی خۆمدا دەمگوت بریا یەك زمانم بزانیایە و خاوەنی خۆم بوومایە".

دوکتۆر خەزنەدار، هەرچەند بە زمانی زگماکی خۆی وتاری نووسیوە، بەڵام لە دەروونێدا ئەو هەستەی لەلا پەروەردە بووە کە خاوەنی زمانی خۆی نییە و دەسەڵاتداران ئەو مافە ڕەوا و مرۆڤانەی کە خوا پێی داوە چاویان پێی هەڵنایە. مامۆستا، لە هەموو شوێن و کات و سات و جێگایەك ڕای خۆی دەربڕیوە و بوێرانە هەستی نەتەوایەتیی خۆی ڕاگەیاندووە و ئاواتی دڵی نەشاردووەتەوە.

خەزنەدار، وەك زۆربەی ڕووناکبیر و کەسایەتی و جەماوەری کوردستان بە گشتی پێی وابوو کوردستان دابەش کراوە و ئەو سنوورانەی بە سنووری دەستکرد دەزانی کە نەیارانی کورد و کوردستان بە پشتیوانی زلهێزەکان لە نێوان خۆیاندا بەشیان کردبوو. مامۆستا لە سەفەرێکیدا بۆ ئێران کە دەگاتە سنووری نێوان ئێران و عێراق پێی دەڵێن ئێرە دوا وێستگەی خاکی عێراقە و "خەسرەوی"یە یەکەم ئێسگەی ئێرانە، لە لاپەڕە (١٤١)ی بەرگی دووەمی "ڕۆژگاری من"دا دەنووسێ: "بەلای منەوە سەیر بوو، هیچ دروشمێکی سروشتی لە سنووردا نەبوو ئەم لاو ئەولا لە یەکتری جیا بکاتەوە، خاك یەك ڕەنگ و ئادەمیزاد یەك دەنگ، ئەویان کورد و کوردستان ئەمیان کورد و کوردستان بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبوو لە مونزیریە بڵێین: عێراق خودا حافیز! لە خوسرەوی بڵێین: ئێران ڕۆژباش".

بۆنی سیاسی و نەتەوایەتی، لە گەشتەکانی مامۆستادا زۆر زەق و بەرچاون، دیارە ئەوەش لە دەروونێکی نیشتمانپەروەرەوە سەرچاوە دەگرێ کە خەزنەدار بەو بیر و فامەوە هەنگاوی هەڵێناوە و ئامانجی سەرەکی خەباتی ڕووناکبیری بووە و سەردانی هەر جێگایەکی کردبێ بە بیر و تێڕوانینێکی نیشتمانییەوە سەیری

ڕووداوەکـانی کـردووە و تێبینـی لەسـەر دەربڕیـون. لـە لاپـەڕە (١٣٨)ی بـەرگی دووەمی "ڕۆژگـاری مـن" وشـەی ئێرانـی سـەرنجی ڕادەکێشـێ و دەنووسـێ: "لـە موزەی ئێرانی کۆن دەگەڕام، لە خیابانی سوپە، دۆزیمەوە. دەبوو بۆ ناسینی ئەم وڵاتە لەم موزەیەوە دەست پێبکەم، پێشانگایەکی دەوڵەمەند بـوو، شارسـتانیەتی خەڵکی ئەم سەرزەمینەی لە کۆنی کۆنەوە دەور دەکردەوە تا سـەردەمێکی نزیـك لە ئێستا. هەر چەندە بیرم لە وشەی (ئێران) دەکردەوە ئەگەرچی ڕاسـتیش بـوو، بەڵام لەناو بیر و هۆشم جێی خۆی نەدەکردەوە. بەلامەوە ڕاستتر ئەوە بـوو، ئـەم موزەیە بکرایە بە چەند موزەیەك بەپێی نەتەوەکان، یا خـاکی نەتـەوەکان، وەکـو وڵاتی فـارس و کوردسـتان و (ئازەربایجـان) و بلووجسـتان..هتد. وشـەی (ئێـران) ئەگەرچـی ڕاستیشـە بـەڵام لـە سیاسـەتدا هـەر (فـارس) دەگەیـەنێ. کـۆنترین مەڵبەندەکانی ئەم سەرزەمینەش کە ئێرانـی پـێ دەڵـێن، ناوچـە کوردنشـینەکان، بەپێی زاراوەی جوگرافی و بـۆ مەبەسـتی داگیرکـردن و بـە کـەم زانینـی نەتـەوەی کورد پارچە پارچەیان کردووە و ناوی سەیریان لێناون وەکو ئازەربایجـانی ڕۆژاوا، کرماشان، بەختیاری، لوڕ و هی تر".

دوکتۆر خەزنەدار، بەپێی ئەم لێکدانەوەی، پێی وایە جگە لەوەی ئێران فرە نەتەوەیە، بۆ مەبەستی سیاسـی ئـەو مەڵبەندانـەی لـە ڕابردووشـدا کوردیـان تێـدا نیشتەجێ بووە، شێواندوویانە و مافی چارەنووسیان لێ زەوت و پێشـێل کـردووە. هەروەها لـەنێو ئـەو نەتەوانەشـدا نەتـەوەی فـارس دەسـەڵات بـە دەسـت دێنـێ. مامۆستا باوەڕی بە دیموکراسی و ئازادی هەیە و مافی نەتەوایەتی هەموو گەلان بە چـاوێك چـاوی لێـدەکا، واتـە ئـەوەی بـۆ نەتـەوەی خـۆی دەوێ بـۆ نەتـەوەکانی دیکەشی بە ڕەوا دەزانێ.

خەزنەدار، لە ئێران چاوی بە مامۆستای زانکۆی تاران وەك: "ئیبراهیم پوور داوود"، "دوکتۆر محەمەد موعین"، "دوکتۆر پـەرویز ناتـل خانلـەری" و "دوکتـۆر محەمەد ئیقباڵ" دەکـەوێ و ئـاڵوگۆڕی بـیر و ڕاو بۆچـوون لـەو دیدارانـەدا قسـەی لەسەر دەکرێ و باسی کوردناسی و زانست و زانستگا بابەتی گرنگـی وتووێـژەکان دەبن. لە لاپەڕە (١٧١)ی بـەرگی دووەمـی "ڕۆژگـاری مـن"دا دەنووسـێ: "هـەوڵم دەدا تێیـان بگەیـەنم ئـەوەی مـن دەمـەوێ لـە تـاران چـنگم ناکـەوێ، واتـە بـە

سەربەستی خەریکی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی ببم. ئەوان پێشنیازی ئەوەیان دەکرد کارێکی باش دەبێ ئەگەر خەریکی لێکۆڵینەوە بم لە ئەدەبی بەراوردکاری لە بابەتێکی فارسی و کوردی، بەڵام ئەمە نەچووە مێشکەوە، چونکە لەوە دڵنیا بووم پەردەیەکی ئەستوور بەسەر خوێندەواری و ڕۆشنبیریی کوردی لە ئێران داکێشاوە، بە هیچ جۆرێ تەماشای زمانی کوردی ناکرێ وەکو زمانێکی سەربەخۆ، تەنیا وەکو دیالێکتێکی زمانی فارسی نەبێ".

خەزنەدار، لەبەر ئەوەی هەست بە پەراوێزکردنی کورد و زمانەکەی دەکا، پێشنیازەکەی بە دڵەوە نانووسێ. ئەمە بیر و بۆچوونی شەست ساڵ لەمەو بەرە، بەڵام بەداخەوە دوای ئەم هەموو ئاڵوگۆڕەی کە بەسەر دنیادا هاتووە، ئێران تاوەکو ئێستاش نە کورد بە نەتەوە دەناسێ و نە زمانەکەی بە فەرمی دەناسێ. هەر چەند لە ماددەی یازدەمی یاسای کۆماری ئیسلامیدا هاتووە کە لە پاڵ زمانی فارسیدا خوێندن بە زمانی کوردی ئازادە، بەڵام بە داخەوە ئەو مادە کاری پێ ناکرێ و گوێی خۆیان لێ ئاخنیوە. لە بارەی نەتەوەوە خودای بەدیهێنەری ئەرز و ئاسمان فەرموویەتی: "ئەی خەڵکینە! هەر لە نێر و مێیەکەوە ئێوەمان وەدی هێناوە و کردوومانن بە چەند گەلێك و چەند هۆزێك هەتا یەکتری بناسن. بەڕێزترینتان لای خودا، پارێزگارترەکانتانن. خوا زانایە و ئاگادارە". سوورەی حوجرات. ئایەتی سێزدەمی بیست و شەشەم. وەرگێڕانی مامۆستا هەژار.

کاری چاپەمەنی و ڕۆژنامەوانی یەکێکە لەو ئەرکە گرنگانەی کە لە دواڕۆژدا دەبێ بە مێژوو و مێژووی نەتەوەکان بۆ بەرەی دوای خۆیان تۆماری دەکەن. مامۆستا خەزنەدار، بە هەستێکی بەرپرسانە و ڕۆحێکی کوردانەوە هەستاوە، قەڵەمی کردووە بە چەك و خەباتی ڕووناکبیری هەڵبژاردووە، بەشێکی بەرچاوی بە کردەوە لەو خەباتە بۆ خۆی بڕداوە و هەزاران لاپەڕەی بە وتار و وەرگێڕان و نووسینی کتێب لەسەر نەتەوەکەی بڵاو کردووەتەوە و کەلتووری مێژووی گەلەکەی پێ دەوڵەمەند کردووە و پێشانی داوە کە زوڵم و زۆری نەیارانی کورد نەیتوانیوە هەستی نەتەوایەتی گەلی کورد دامرکێنێ. لێکۆڵینەوە لەسەر مێژووی ئەدەبی کوردی یەکێك بووە لە ئامانجەکانی مامۆستا و ئەو ئاواتانەی بە نووسینی حەوت بەرگ کتێب بە ناوی (مێژووی ئەدەبی کوردی) لە سێ هەزار و حەوسەد و

بیست و حەوت لاپەڕەدا هاتووەتە دی و کتێبخانەی کوردی پێ دەوڵەمەند کردووە.

مامۆستا خەزنەدار، هەمیشە لە بیری ئەوەدا بووە کە بۆ گەشەکردنی گەلەکەی لە ئەزموونی وڵاتانی پێشکەوتوو کەڵك وەربگرێ و بیکاتە سەروەت و سامانی بەرەی دوای خۆی و دەنووسێ: "لە سەدەی نۆزدەمەوە ئێران و عوسمانی بایەخێکی تایبەتییان بە دەرکردنی ساڵنامە دەدا. لە لاپەڕە (١٩٩)ی "ڕۆژگاری من" بەرگی دووەم. خەزنەدار بۆ بەدیهێنانی ئەم پرۆژەیە لە ساڵی (١٩٥٧) هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر دەدا و تەنانەت لە ڕۆژنامەی (ژین)ی سلێمانی هەواڵەکەی بڵاودەکاتەوە، بەڵام بەداخەوە لەبەر هەندێ هۆی سیاسی ریسەکەی دەبێتە خوری، تەنانەت لەناوچوونی کەرستەکانی کارەکەشی.

## ٦- "مەلای جزیری" ، "خانی" و "نالی" لە خەیاڵی مارف خەزنەداردا:

کەسایەتییەکان و ڕووناکبیرانی کوردستان لە هەر کوێیەکی ئەم سەرگردە زەوییە بووبن خۆشی ویستوون و بە ئاواتەوە بووە لە نزیکەوە چاوی پێیان بکەوێ. بەڵام بەغدا دوورە بۆ پیاوی فەقیر و بە ناچاری ئەو ئاواتە بە خەون و خەیاڵ گەلاڵە دەکا و لە لاپەڕە (٣٠١)ی "ڕۆژگاری من". بەرگی دووەمدا دەنووسێ: "نازانم لە کەیەوە گرفتاری گێتی ڕۆژهەلاتی کۆن بووم، بەڵام ئەوەندە دەزانم زۆر حەزم بەوە بوو شەو زوو باڵە ڕەشەکانی بەسەر ڕووناکیدا بکێشێ بۆ ئەوەی بچمە ناو جێگەکەمەوە و بە خەیاڵ جڵەو بە ئاواتەکانم شۆڕ بکەم و بیانفرێنم بۆ ئەو ڕۆژگارە دوورە.

زۆر خۆش بوو دەفڕیم بۆ وڵاتی بۆتان، لە ژوورێکی بچووکی نیوە تاریکی شێخی جەزیری شاعیر لەسەر حەسیرە کۆنەیێك دانیشتووە، شاپڵێتەیێکی کز چاوی پیرەمێرد ڕووناك دەکاتەوە، بە دەیان دەستنووسی گەورە و بچووك لە دەوریدا پاڵ کەوتوون، خانوولکەیێکی بچووکیان دروست کردووە، وەکو ئەو خانوولکانەی منداڵان دروستی دەکەن، تەنیا جێگەی شاعیری لێ دەبێتەوە، شێخی جزیری بیردەکاتەوە و شیعر دادەنێ.

هەر لەوێوە دەفڕم بۆ بایەزید، بۆلای ئەحمەدی خانی، لە دەرگای مزگەوتە گەورەکە دەچوومە ژوورەوە، حوجرەی شاعیر ئەگەرچی بچووکیش بوو، بەڵام جێی زۆر کەسی لێ دەبۆوە. شاعیری گەورە شیعرە پڕ ماناکانی نەدەخوێندەوە، باسی مەم و زینی نەدەکرد، بەڵکو ئامۆژگاری میوانەکانی دەکرد، باسی کوردایەتی بۆ دەگێڕانەوە، داوای دەرمانی دەکرد بۆ دەردی ئەم نەتەوەیە.

خەیاڵە و کردوومە بە باڵندە، دەفڕێ بۆلای حەزرەتی نالی، بۆ حوجرەی لە مزگەوتی مەلا حەسەن لە وڵاتی سلێمانی شاعیری مەزن چوار مەشقی دانیشتووە، ئەموستی ڕاستی لەسەر پەلاپیتکەی قەڵەمدایە، بیر دەکاتەوە، تەماشای پشکۆی ناو ئاگردان دەکا، شیعری وا دادەنێ کەس نەتوانێ داینێ، بەدەم ئەم خەیاڵە خۆشانەوە چاوم دەچووە خەوەوە".

دەوری ئەو سێ کەسایەتییە کە خەزنەدار، باسیان دەکا لە مێژووی کورد و کوردستاندا نەتەوەی کورد شانازییان پێوە دەکا و شاکارەکانیان لە دنیای ئەدەبیاتدا گەیشتوونەتە لووتکە. ئەوینی نەتەوایەتی بۆتە هۆی ئەوەی کە مامۆستا بە شوێن ڕووناکبیری نەتەوەخوازدا بگەڕێ، بەبێ ئەوەی گوێ بداتە سنووری دەستکرد، دەبێ بە باڵندە و خۆشەویستیی خۆی بۆ ڕووناکبیرانی پارچەکانی تری کوردستان دەردەبڕێ، باسی شوێنی حەوانەوە و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ژیانیان بە تام و چێژێکی تایبەت و ئەدەبییانە دەڕازێنێتەوە.

### ٧- خەزنەدار و داڵدەدانی حەسەن زیرەك:

خەزنەدار، جگە لەوەی ڕێزێکی تایبەتی بۆ ڕووناکبیر و ڕۆژنامەوان داناوە، لە هەمان کاتدا هونەرمەندیشی خۆش ویستووە، بایەخی پێداوە و بەکردەوە هەنگاوی بۆ هەڵێناوە، بۆ وێنە ئەو کاتەی حەسەن زیرەکی ڕەحمەتی لە بەغدا ئاوارە دەبێ، لە ماڵی خۆی داڵدەی دەدا وەك ئەندامێکی بنەماڵەی خۆیان چاوی لێ دەکەن و دەبنە هۆی ئەوەی کە بەبێ دڵەڕاوکێ و نیگەرانیی بەڕێچوونی ژیان، گەشە بە هونەرەکەی بدا و فۆلکلۆری کوردەواری لە فەوتان بپارێزێ. لە لاپەڕە (٢٠٤)ی "ڕۆژگاری من". بەرگی دووەمدا دەنووسێ: "حەسەن زیرەك دەنگ خۆشی بلیمەت، هەموو ڕۆژ لە ماڵی ئێمە بوو، ئەوەندە ڕێزمان لێ دەنا کەس زاتی

ئەوەی نەدەکرد گۆرانی لیّ داوا بکا. وەکو مـاڵی خـۆی وابـوو، بـە هەوەسـی خـۆی گۆرانی دەگوت".

## ٨- پێگەی ژن لای مارف خەزنەدار

کەسیش خەیاڵی لیّ قەدەغە نەکردبووم لە ناو ئەشکەوتێکی ئەفسانەیی بە بار کتێب و کاغەز بدۆزمەوە، یا کچێکی جوان هەناسەی گوڵاوی پڕ دەروونم بکا، ئەمە بۆ خۆم، دیارە هیوای گەورەی خۆشـم (کوردسـتان) بـووە. مـافی ژن لـە زۆربـەی وڵاتـانی پێشـکەوتنخوازدا پـارێزراوە، ژن وەك پیـاو مـافی ئـەوەی پێـدراوە، ببـیّ بەسەرکۆمار، سەرۆك وەزیر، وەزیر، ئەندام پەرلـەمان، پـارێزەر و...و، بـەکردەوە نیشانیان داوە، کە لە بەڕێوەبردنی کار و ئەرکی کۆمەڵگادا سەرکەوتوو بوون و لـە پێســـپێراوەکانیان کـــەمیان نـــەهێناوە. زۆربـــەی روونـــاکبیرانیش لایـــەنگری کۆمەڵگایەکن کە مافی ژنی تێدا پارێزراو بـیّ و بـەرگری لـە مـافی یەکسـانیی ژن و پیاو دەکەن.

مامۆستا خەزنەدار، وەك ڕووناکبیر و ڕۆژنامـەوان لـە نـاوخۆی وڵات و دەرەوە ناسراوە و بەکردەوەش ئەو ئەرکەی ئەنجام داوە، بـەڵام بەداخـەوە سـەبارەت بـە خێزانەکەی خۆی زۆر دواکەوتووانە بـیر دەکاتـەوە و ئـازادیخوازیی خـۆی دەخاتـە بەر پرس و گومان. بـۆ پشـت راسـتکردنەوەی ئـەم بۆچـوونە نووسـراوەی لاپـەڕە (٣١٠)ی (( ڕۆژگاری من. بەرگی دووهەم)) وەك بەڵگەیـەکی زینـدوو دەخەمـە روو. مامۆستا دەنووسیّ: (( لە بەسەرهاتی ژیانی ساکاری ((سەعدیە))):

لە سەردەمی منداڵییەوە ئاشـنای بـووم، چـونکە لـە گـەڕەکێك نزیـك یـەکتری ژیاوین، بە هۆی خزمایەتییەوە هەمیشە لە ماڵی ئێمە بووە، کچێکی ژیری کـارزانی هێمن و  زۆرزان بوو، بەلای ئێمەی خوێندەوارەوە ئەگەرچی نەخوێندەواریش بـوو، بەڵام سیفەتی ڕۆشنبیری تێدا هەبوو، دەیزانی چۆن قسە دەکـا، هەڵسـوکەوتی لـە جێـی خـۆی بـوون شـارەزای ئـەتیکێت و رەوشـتی هـەموو جـۆرە کۆمـەڵێك بـوون نەخوێندەوارییەکەی جێگەی ڕەزامەندیی من بوو، چونکو بۆ ژیانم گونجاوتر بـوون من لە منداڵییەوە ڕۆژیّ لـە ڕۆژان بـیرم لـەوە نـەکردبووەوە هاوسـەرێکم هـەبیّ لـە دەرەوەی ماڵ کـار بکـا. مـن ئێسـتا و ئەوسـاش لەسـەر ئـەو بـاوەڕەم نـابیّ مـاڵم

دابخریّ، پێویستە هەمیشە کراوە بێ، هاوسەرم هەموو شتێك بێ لە ماڵەوە، لە کاری پێشوازیی میوان و خزمەتی نامەخانە و ئاودانی دار و گوڵ بەو لاوە کاری تری نەبێ. بە پێی ئەم بۆچوونە، دەردەکەوێ کە دوکتۆر خەزنەدار، وەك کۆیلە چاو لە خێزانی دەکا نەك هاوبەشی ژیان. قسەکانی زۆر لێك جیاوازن و بە قیلیش پێکەوە نانووسێن. لە لایەك دەڵێ " خێزانم سیفەتی ڕۆشنبیری تێدا هەبوو"، دێرێك دواتر دەنووسێ: " نەخوێندەوارییەکەی جێگەی ڕەزامەندیی من بوو". دەوری خێزان لە ژیانی مامۆستادا، پێشوازیکردن لە میوان و میوانداری و خزمەتی نامەخانە و ئاودانی گوڵ و دار بووە و هیچی تر. ئەم بیر و بۆچوونە لەگەڵ بیر و ڕای ڕووناکبیری یەکتری ناگرنەوە. وەباڵی سەرکوتکردنی ئەو سیفەتە چاکانەی کە مامۆستا سەبارەت بە خێزانی نووسیویێتی دەکەوێتە سەرشانی خەزنەدار. هەروەها سووکایەتیکردنە بە نیوەی مرۆڤایەتی واتە ژن. ئەو وڵاتانەی کە کورد تێیدا نیشتەجێن، ژمارە و نفووسی کورد بە ڕوونی دیار نییە یا باشتر ئەوەیە بڵێین بە ئانقەست دیاری نەکراوە. بۆ هەموو لایەك ڕوون و ئاشکرایە ئەو دەوڵەتانە هیچ کات نەیانویستووە و نایانهەوێ ژمارەی دانیشتوانی کوردی وڵاتەکەیان بە فەرمی دیاری بکرێ. بەڵام دەبێ ئەوەی بزانن بەری خۆر بە بێژینگ ناگیرێ، ئاڵوگۆڕی زەمان ملیان پێ رادەکێشێ، هەر ئێستا دەبینین ئەوانەی حاشایان لە نەتەوەی کورد دەکرد دێنە بن ئاڵای کوردستان و دان بە واقیع دادەنێن.

### ٩- خەزنەدار لە دووڕێیانی هەڵبژاردنی زانستی و ئەویندارییدا :

ژیانی مرۆڤ بەبێ ئاوات و ئارەزوو، واتە ژان، بەڵام مرۆڤەکان هەروەك لە ڕەنگ و دەنگ و روخساردا وەك یەك ناچن، سروشتییە کە بیر و بۆچوونەکانیشیان لێك جیان. جیاوازیی بیروباوەڕ لە نێو هەموو کۆمەڵگایەکدا هەیە. ئەگەر ئینسانەکان هەموویان وەکو یەك بیر بکەنەوە، کۆمەڵگا هیچ گەشەکردنێك بە خۆیەوە نابینێ. دوکتۆر خەزنەدار، وەکو هەموو تاکی ئەم کۆمەڵگایە بە هیوا و ئاوات دەژی، بەڵام ئاواتی سەرەکی و گەورەی لە ژیاندا بەختەوەری کوردستان بووە و بەباوەڕێکی پتەو بەخۆی ئەو ڕێگایەی هەڵبژاردووە، هەزینەی بۆ داناوە و ئەرکی ڕووناکبیری خۆیی ڕاپەڕاندووە. لە لاپەڕە (٣٠٦)ی "ڕۆژگاری من" بەرگی

دووهەمدا دەنووسێ: "من هەمیشە خەونم بەوە دەدی ببم بە ئەوقات (پارێزەر، محامی) لە پاشانا مەیلم کەوتە سەر ئەدەب و فەلسەفە، بە تایبەتی کە بووم بە قوتابی کۆلێجی ئەدەبیات هەوەسم کەوتە سەر ئەوەی ببم بە مامۆستای زانستگا، ئەمەش بەبێ خوێندنی ئەورووپا و باوەڕنامەی بەرز نابێ.

مامۆستا خەزنەدار، لە هەموو کات و هەولێکدا بە بیری نەتەوایەتی بیر دەکاتەوە و بۆ ئەو مەبەستە هەل و دەرفەت لە کیس نادا. لەسەرژمێریی ساڵی ١٩٥٧ی عێراق وەك ژمێریار دیاری دەکرێ. مەسەلەی سەرژمێریکردنی نەتەوە لە لیستی هەڵبژاردندا ئاماژەی پێ ناکرێ، بەڵام پرسی زمان بە ((قەومیەتی)) خەڵکی دەزاندرا. مامۆستا لە بەغدا لە ناوچەی کەرخ کۆڵانێکی بۆ سەرژمێری بەردەکەوێ کە چەند ماڵێکی کوردی فەیلی لێ دەبێ. لە بابەت زمانەوە، زمانی کوردییان لە پێشەوە بۆ دەنووسێ و بەم جۆرە هەستی نەتەوایەتی خۆی دەردەبڕێ.

### ١٠- مارف خەزنەدار لە نێوان دەروەستبوونی بە سوێندی میری و مافی گەلەکەیدا:

١٩٥٨/٩/٢٩ مامۆستا خەزنەدار، وەك هەموو مووچەخۆرێکی میری سوێند دەخوا کە ڕێز لە دەستووری کۆماری عێراق بگرێ. داننان بە تاوان لە گوناح کەم دەکاتەوە و گێڕانەوەی ڕووداو و بەسەرهات وەك خۆی، بە تایبەت بۆ ئەو کەسەی کە بە سەر خۆی هاتووە، دەگەڕێتەوە بۆ بوێریی کەسەکە کە پێ لە هەڵەی خۆی دەنێ و مێژوو وەك خۆی دەگێڕێتەوە. هەر لەو سەردەمەدا، مامۆستا لە شۆڕشکردن بە قەڵەم ڕانەوەستاوە و بە نووسینی وتار و بڵاوکردنەوەیان لە ڕۆژنامە و گۆوارەکاندا ئەرکی ڕووناکبیریی خۆی ڕاپەڕاندووە و بۆ پەرەپێدان و گەشەکردنی کەلتوور و زیندوو ڕاگرتنی زمانی کوردی هەستی بە بەرپرسیارێتی کردووە و دەوڵەمەندی ئەو زمانەی لە ڕێگای وەرگێڕانەوە گەیاندووەتە نووسەران و زانایانی وڵاتانی تر بە تایبەت عێراقییەکان. مامۆستا، شەڕی قەڵەمی لە هەلومەرجێکدا هەڵبژاردووە کە کەم کەس خۆی لێ داوە و ئەو سەردەمە شەڕی چەکداری باو بووە، بەڵام دوای تێپەڕینی زەمانێکی زۆر بەسەر

ئەو سەردەمەدا، دروشمەکەی مامۆستا بۆتە دروشمی سەرەکی زۆربەی ڕێکخراوە سیاسییەکان و ڕێگا حەللی سیاسی بۆ چارەسەری کێشەی نەتەوایەتی هەڵدەبژێرن.

باسی سیاسی و سیاسەتکردن مێژوویەکی دوورودرێژی هەیە، مەلەوانی شارەزای دەوێ کە بتوانێ لەو گۆمە قووڵە مەلە بکات و بپەڕێتەوە. لێکدانەوەی سیاسەت لە نووسینی ئەو وتارەدا مەبەستی ئێمە نییە و زیاتر بۆچوونە. لە وڵاتی ئێمەدا زیاتر بەو کەسانە دەڵێن سیاسی کە لە ڕێکخراوێکی سیاسی خەبات دەکەن و چەکی خەباتیان دەست داوەتێ و خەباتی چەکدارییان هەڵبژاردووە. دیارە خەباتی چەکداری لووتکەی خەبات و خۆبەختکردنە و دروستکردنی مێژووی نەتەوەیەکە کە بە خوێن و گیان بەرگری لێ دەکا. جێگای خۆیەتی دەوری ڕووناکبیر و دانیشتووانی شارەکان، بە تایبەت گوندنشینەکان لەبەرچاو بگرین کە پشتیوانێکی لەبن نەهاتووی خەباتی چەکدارین و تەواوکەری یەکترن.

بە چاوخشاندنێکی سەرپێیی ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لە خەباتی نەتەوایەتی گەلی کورددا شەهیدانی خەڵکی ئاسایی ئەگەر لە ڕۆڵەی پێشمەرگە زیاتر نەبن کەمتر نین، بۆ وێنە ئەنفالکردنی ١٨٢٠٠٠ مرۆڤی بێ چەك لە ماوەیەکی کورتی زەمانیدا بەڵگەیەکی زیندووە بۆ ئەو بۆچوونە و نابێ خەباتگێڕی شاخ خۆی بکا بە خاوەنی بنەڕەتیی سەرکەوتنی خەباتی نەتەوەیی خەڵکی کوردستان.

### ١١- ڕەوشتی ئەمەکناسیی مارف خەزنەدار:

ئەمەکناسی لە ژیانی مرۆڤدا یەکێکە لەو ئاکارە چاکانەی کە لە نێو کۆمەڵگادا بە چاوێکی پۆزەتیڤ چاوی لێ دەکرێ. تاکی ئەمەکناس لەلای هەموو کەس ڕێز و حورمەتی تایبەتی هەیە. مامۆستا خەزنەدار، یەکێکە لەو کەسانەی کە چاکەی لەبیر ناچێتەوە، بە تایبەت لە بارەی فێرکردنی زمان، لە لاپەڕە (١٥)ی ڕۆژگاری من. بەرگی سێیەمدا دەنووسێ: (( لە ژیانی خوێندنمدا سێ وانەی فێربوونی زمانم لە بیر ناچێتەوە، یەکەمیان لە حوجرەی مزگەوتی ناو بازێڕی هەولێر (مەلا عەبدوڵڵا) یەکەمین وانەی ئەلف و بێی عەرەبی پێ گوتم بە زمانی کوردی، دووەمیان بۆ یەکەمین جار (جەمال جەمال) لە پۆلی پێنجەمی قوتابخانەی (ئوولای

سەرەتایی) ئەلف و بێی ئینگلیزی (لاتینی) فێرکردم، سێیەمیان وانەکەی بێلینا ئیڤا نۆڤنایە کە ئەلف و بێی سلاڤی (سیرلی) بۆ نووسیمەوە)).

## ١٢- بەشداری لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا:

مامۆستا خەزنەدار، لە زۆربەی کۆڕ و کۆبوونەوە و بۆنەکاندا بە ئامانجەوە بەشداری دەکا، ئامانجی سەرەکیش لەلای مامۆستا ناساندنی نەتەوەکەیەتی و بایەخێکی تایبەت دەدا بە ئەدەب و کەلتووری کورد. کورد وەك هەر گەلێکی دیکە تایبەتمەندیی تایبەت بە خۆی هەیە و لە گەلانی دیکەی جیادەکاتەوە. کەلتووری کورد بریتییە لە خاك، ئایین، زمان، داب و نەریت، جلوبەرگ و بۆنەکانی ئایینی و نەتەوەیی. خەزنەدار، بۆ ناساندنی گەلی کورد، لە وڵاتێکی گەورە و زەبەلاح و بەدەسەڵاتی وەك یەکێتی سۆڤیەت بە سۆز و هەستێکی کوردانەوە، بەشداری لە جێژنی یەکی ئەیاردا، جێژنی ڕۆژی کرێکار دەکات، بۆ ئەو کۆبوونەوە جلوبەرگی کوردی لەبەر دەکا بۆ پڕوپاگەندە و لە لاپەڕە (٣٨)ی ڕۆژگاری من، بەرگی سێیەمدا، دەنووسێ: (( ئەگەر یەکێك پرسی خاوەنی ئەم جلانە چ میللەتێکن، لە وەڵامدا پێی بگوترێ کوردن)).

زمان گرنگترین پێناسەی نەتەوایەتییە، ئەگەر باسی هەر نەتەوەیەك بکرێ بەر لە هەموو شتێك دەپرسن بە چ زمانێك قسە دەکەن. مامۆستا خەزنەدار، پێی وابوو زمان و زمانزانی کەرەستەیەکی بنەڕەتین بۆ ناساندنی هەر نەتەوەیەك بە تایبەت نەتەوەی کورد، هەستکردن بەو مەسەلە لە کاتی مانەوەی لە ڕووسیا، کە بۆ خوێندنی بەرز دەچێتە ئەو وڵاتە، زیاتر لە پێشوو گەشە دەکا و ئەکادیمییانە بۆ مەسەلەکە دەچێ. بە شەوق و ئارەزوویەکی زۆر و ماندوونەناسانە زمانی ڕووسی فێر دەبێ و ئەو ئەزموونە بەنرخە دەکاتە دەسمایە و لە ڕێگای بەرژەوەندیی گەلەکەیدا بەکاری دێنێ. خەزنەدار، ئەو ماوەیەی کە لە ڕووسیا ماوەتەوە، هەوڵی داوە نەتەوەکانی ئەو وڵاتە بناسێ و شار و دێهات و ئاوەدانییەکانیان بەسەر بکاتەوە و ئەزموون و تاقیکردنەوەکانیان لە پێناو پێشکەوتن و ئاوەدانی وڵات بکاتە دیاری بۆ نیشتمانی خۆی. ئەو هەستە لە سەردانەکانی مامۆستادا لە شوێنە جۆربەجۆرەکان بەرچاو دەکەوێ و بەڕوانینێکی

زانستییانە بارگەی خۆی لێ دادەگرێ، بە هیوا و ئاواتی بەدیهێنانی ئاسۆیەکی ڕوون مێشکی پڕ دەکا لە زانست و ئەزموون بۆ بووژاندنەوەی وڵاتەکەی.

بەشێك لە شاعیران و نووسەرانی کورد زمان، بەرهەمەکانیان بە زمانی فارسی نووسیوە و بڵاویان کردووەتەوە و ڕاستەوخۆ خزمەتی زمانێکیان کردووە کە زمانی کوردی بە زمان ناناسن. زۆر کەس ئەم پرسیارە دەکەن کە هۆکاری ئەو کردەوە دەبێ چی بێ؟ بێ گومان سەردەمانێك نووسین بە زمانی زگماکی لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە بە تاوان زاندراوە و سزاشیان بۆ دیاری کردووە، هەروەها وێدەچێ بێ وڵاتی وای کردبێ کە ئەو تاقمە نەتوانن خزمەت بە زمانەکەیان بکەن. ئەم هەویرە ئاوی زۆر دەبا و لە جێگا و شوێنی پێویست باسی دەکەین و پێویستی بە شیکاریی زانستییانە و ئەکادیمییانە هەیە. مامۆستا خەزنەدار، جگە لەوەی کە حەزی لە ئەدەبیاتە، لە هەمان کاتدا بە شوێن مێژوودا دەگەڕێ و لە گەشتەکانیدا بە بایەخەوە تەماشای مێژوو دەکا. کورد لە وڵاتانی دەوروبەر و دوورتریش ئاوارە و پەرەوازەبوون، لە نێویاندا ڕووناکبیر و هەڵکەوتەی گەورە و بە توانا هەڵکەوتوون. مامۆستا بەلێکدانەوەیەکی نەتەوایەتی بۆ مەسەلکە دەچێ و هۆکاری کەمتەرخەمی ئەو کەسانە شی دەکاتەوە. لە گەشتکردنیدا بۆ شاری باکۆ واتە ئازەربایجانی شوورەوی سەردانی مەزاری شاعیری پایەبەرزی ڕۆژهەڵات، ((نیزامی گەنجەوی)) دەکا کە بە نەژاد کوردە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەرهەمەکانی بە فارسی گوتووە، فارس کردوویانە بە هی خۆیان. خەزنەدار دەنووسێ: ((نیزامی گەنجەوی شاعیری گەورەی ڕۆژهەڵات، بە نەژاد کورد و بەرهەمەکەی لاپەڕەی زێڕینیان داگیر کردووە لە مێژووی ئەدەبی فارسیدا، لەو وڵاتە زۆر بە گەورەیان داناوە، شانازی پێوە دەکەن، تەنیا لەبەر ئەوە کردوویانەتە هی خۆیان چونکە لە شاری گەنجە لە دایك بووە. (ڕەئیسە)ی دایکی نیزامی کوردە، بەڵام ئەگەر بە نووسین بیڵێ زمانی دەبڕن)). "دوکتور عەبدولحوسێنی زەرین کوب" لە کتێبی (پیر گنجه در جستجوی ناکجا اباد) و "دوکتۆر بێهرۆزی سەروەتیان" لە کتێبی (ائینه غیب نظامی گنجه‌ای)دا لە لێکدانەوەکانیاندا بەو ئاکامە گەیشتوون کە شوێنی زمانی دایك (کوردی) لە بەرهەمەکانی نیزامی دا بە تایبەت لە ((لەیلێ و مەجنوون))دا بە ڕوونی دیارن. پێویستە لێرەدا ئەو پرسیارە بکرێ، بۆ خەڵکی

کورد بە گشتی و ڕووناکبیران بە تایبەتی پرسی ئەو شاعیر و نووسەرە کوردانەی کە بە زمانی بێگانە بەرهەمەکانیان بڵاوبوونەوە و شانازییان پێوە دەکەن، خستۆتە پشت گوێ.

تەنگ و چەڵەمە و کۆسپ و قۆرت، لە ژیاندا ئاساییە و ژیانی مرۆڤەکان تێکەڵاوێکە لە خۆشی و ناخۆشی و هیچ کامیان ئەبەدی نین. هیوا و ئومێد بە دواڕۆژ پشتیوانێکی مەزنە بۆ درێژەدان بە ژیان و دەبێتە هۆی ئەوەی کە لەبەرامبەر کۆسپەکاندا چۆك دانەدەین و بە گیانێکی خۆڕاگرانە بەرەوڕووی نەهامەتییەکان بین. خەزنەدار پێی وایە ژیان ناوەستێ و گەشبینە بە دواڕۆژ و لە لاپەڕە (١١٥)ی ڕۆژگاری من، بەرگی سێیەمدا دەنووسێ: ( خۆ هەموو سووچێکی ژیان تاریك نییە، تیشکی ڕووناکی هەر هەیە چونکە ژیان ماوە). مانەوەی خەزنەدار، لە دەرەوەی وڵات بیری نەتەوایەتی بەهێزتر دەکا و لە هەموو جێگا و وڵاتێك سەر هەڵدەدا و بەرپرسایەتی خۆی بۆ گەشەپێدانی نیشتمانەکەی پیشان دەدا، زیاتر لە هەموو شتێك فێربوونی زمانی بەلاوە گرنگ بووە، بۆ ئەوەی خزمەتی زمانی کوردی پێ بکا.

**١٣- مارف خەزنەدار لە بەشی کوردناسی ئەکادیمیای زانستی سان پیترسبۆرگدا:**

١٩٥٩/٣/١ لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی دادەمەزرێ و خەزنەدار دەبێتە قوتابی ئەو بەشە، واتە بەشی کوردناسی لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی ئەکادیمییەی زانستی لە سان پیترسبۆرگ و لەگەڵ کوردناسی گەورە ((یوسف ئەبگارۆفیچ ئۆربێلی)) ئاشنا دەبێ لە ئامۆژگارییەکانی کەڵك وەردەگرێ و هەموو هەوڵەکانی بۆ خوێندن و فێربوون تەرخان دەکا و بیری ڕووناکبیری و زمانەوانی ڕۆژ بە ڕۆژ گەشە دەکا و وەك شارەزا لە بواری زمان و ئەدەبی کوردیدا دەبێ بە وانەبێژ لە دەورانی خوێندنی زانکۆدا، بە پوخت و پاراوی ئەو ئەرکە بەڕێوە دەبا. لە لاپەڕە (١٣٧)ی ڕۆژگاری من، بەرگی سێیەمدا دەنووسێ: (( بەشی کورد لە ئامۆژگا پێویستییەکی زۆری بە شارەزای زمان و ئەدەبی کوردی هەبوو، بە تایبەتی کرمانجی خواروو، لەبەر ئەوە کۆرسێك لە بەشەکە کرایەوە بۆ زمان و ئەدەب

هەفتــەی دوو ســەعات زمــانی کــوردی و دوو ســەعات ئــەدەبی کــوردی، دیــالێکتی کرمانجی خوارووم دەوتەوە)).

مامۆستا، بەو کارەی لێهاتوویی خۆی دەرخست و توانی ئاواتی کوردناسـێکی وەکو((ئەلێکساندر ژابا)) بهێنێتە دی. (( ئەلێکساندر ژابا، لە ناوەڕاستی سـەدەی نـۆزدەم قونسـوڵی ئیمپراتۆریـەتی ڕووسـیا بـوو لـە ئـەرزەڕووم. دەسـتنووس و سەرچاوەی کۆ دەکردەوە لـە بـارەی کـوردەوە و دەینـاردە ئـەکادیمیای زانسـتی سان پیترسـبۆرگ. خۆزگـەی ئـەوەی دەکـرد ڕۆژێ لـە ڕۆژان ئـەم کەرەسـتانە بـۆ دۆزینــەوەی ڕاسـتی بـەکار بهێنـرێن و دەنگـی مامۆسـتای کـورد لـە ژوورەکـانی ئەکادیمییە بەرز بێتەوە و بە زمانی کوردی وانەی زمانی کـوردی بڵێتـەوە، لاپـەڕە (١٣٧–١٣٨)ی ڕۆژگاری من، بەرگی سێیەم)).

### ١٤- مارف خەزنەدار لە نێوان حەز و مەیلی تـاکە کەسی و دابی گشتیدا :

دوکتور خەزنەدار، ئاشـقی جـوانی بـووە و خواردنەوەشـی پـێ خـۆش بـووە، حەزی زۆر لە دانس و گـۆرانی و ئاهـەنگگێڕان بـووە و کیژۆڵـەی جـوان سـەرنجیان ڕاکێشاوە، ئەویش لەبەر جوانی بـووە نـە بـۆ خۆشـگوزەرانی. لـە لاپـەڕە (١٤١)ی ڕۆژگاری من، بەرگی سێیەمدا دەنووسێ: (( هەموومان دانسمان دەکرد، گۆرانیمان دەگوت، گوێمان لە مۆسـیقا گـرت، لـە هەمووشـیان بـەختیارتر مـن بـووم چـونکە ئاهەنگەکە بۆ من کرابوو، سۆزم بەرامبـەر بـە هـەموویان هـەبوو، بـەڵام دانسـەکانم لەگەڵ لووبا (لووبۆڤ "لووبـا" کیژۆڵەیـەکی بەشـداربووی ئاهەنگەکـە بـووە) تـام و چێژێکی تایبەتی هەبوو خۆشمان نەمان دەزانی لەبەر چی بوو)).

### ١٥- هەڵوێستی مارف خەزنەدار لە بەرامبەر ستـالین:

کورد بە درێژایی مێژوو، لە هەموو بارێکەوە چەوسـێنراوەتەوە، زۆر جـاریش بە قسە و بەڵێنی خۆش هەڵیان خەڵەتاندوون. بـە داخـەوە تەجروبـەیان لـە مێـژوو وەرنەگرتووە و هەڵەکانیان دووپات کردووەتەوە. ئەوەش دەگەڕێتـەوە سـەر وەك یەك نەچوونی هەڵوێستی کورد لە بەرامبەر نەیارەکانیدا. هەروەها لەبیرکردنی ئەو هەموو ڕووداوە تاڵانەی بەسەر گەلەکەماندا هاتووە. دوکتۆر خەزنـەدار، تاوانبـاری

کـورد لەهــەر پلــە و پایەیێکـدا بـێ دەستنیشــان دەکـا، ڕووداوەکـە وەك خـۆی دەگێڕێتــەوە. هەســت و خۆشەویســتی کــورد و کوردســتان هــانی دەدا بــە گــژ گەورەترین دەسەڵاتداری وەك ستالیندا بچێتەوە و بە تاوانبار ناوی بـەرێ. هەشـتا و یەك سالْ لەمەوبەر لـە وڵاتـی ڕووسـیا خوێنـدن بـە زمـانی کـوردی وەك مـافێکی ئینسانی چاوی لێ کراوە، کتێبی کـوردی چـاپ کـراوە و قوتابخانـەیان بـۆ دانـاون. کتێب، بە تایبەتی کتێبی کوردی لە لای مامۆستا زۆر خۆشەویست بـووە، بایـەخی پێداوە. هەروەها گەڕان بـە شـوێن نامەخانەکانیشـدا بـۆ دۆزینـەوەی سەرچـاوە و بەڵگەنامــەی کــوردی ئەوپــەڕی هــەوڵی خــۆی داوە. لــە ڕووســیا، ئەرمەنســتان، ئازەربایجان و تورکمانسـتان کتێـب بـۆ منـاڵانی کـورد چـاپ دەکـرێ، بـەڵام دوای ماوەیەك دەسەڵات لەو کردەوە پاشـگەز دەبێتـەوە و دەیـەوێ ئـەوە لـەبیر خـەڵك بەرێتەوە کە ((ڕۆژێ لە ڕۆژان کتێبی قوتابخانە بـە زمـانی کـوردی و ئـەلف و بێـی لاتینی لە باکۆ و عەشقاباد چاپ کراون)). مامۆستا باسی شۆڕشی ئۆکتۆبەر دەکا و لـە لاپـەرە (١٥١)ی ڕۆژگـاری مـن بـەرگی سـێیەمدا دەنووسـێ: ((لـە ڕۆژگـاری جێگیربـوونی دەسـەڵاتی شۆڕشـی ئۆکتۆبـەر بـە تایبـەتی لـە خـاك و هەرێمـەکانی دەرەوەی ڕووسیا لە قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاست (١٩٣١) مـافی خوێنـدەواری و خوێندن بە زمانی دایك درایە نەتەوەی کوردی ئەوێ، لـە یـەریڤانی ئەرمەنسـتان و باکۆی ئازەربایجان، عەشقابادی تورکمانستان چاپخانەکان کتێبیان بـۆ قوتابخانـە کوردییەکان چـاپ دەکـرد تـا سـاڵی ١٩٣٨. لـەو سـاڵەی پـێش جـەنگی گێتییـەدا ستالینی تاوانبار کەوتە گیـانی نەتـەوەی کـورد، لـە ئازربایجـان و تورکمانسـتان و ئەرمەنستانیش شوێنەواری کوردی نەهێشت، هەندێکی ئـاوارە کـرد، هـی تـری بـە تیرۆر و ئازارەوە کوشت)). لە درێژەی باسەکەدا دەنووسـێ: ((بـۆ هێنانـەدی ئـەم ئامانجە چەپەڵە دەستی کرد بە جینۆسـاید لـە دژی هـەموو کـوردێکی ئـەو وڵاتـە، تەنیا ئەو بەشەی ئەرمەنستان نەبێ)). تاوانبارکردن و لە قـاودانی جینۆسـاید دژی کــوردانی وڵاتــی ڕووســیا، بــە دەســتی دەســەڵاتدارانی ئــەو ســەردەمە، ڕەنگــە خەزنەدار، یەکـەم کـەس نـەبێ کـە ئـەو مەسـەلەی بـە نووسـراو هێنابێتـە گـۆڕێ. (ڕۆژگاری من) یەکێکە لەو بیرەوەرییانەی کە بە بابەتی جۆربەجۆری وەك، مێژوو، ئەدەب، ئایین، نەتەوە، زمان و زمانناسی، کەلتوور و زۆرشتی تر دەوڵەمەند کراوە و دەکرێ وەك ئەزموونێکی چاك چاوی لێ بکرێ.

**١٦- مارف خەزنەدار و رۆژنامەی کوردستان:**

دۆزینــەوەی ژمارەیــەکی رۆژنامــەی (کوردســتان) بــۆ مامۆســتا خەزنــەدار و تاقمێـك لـە خوێنـدەوارانی کـورد گـرێ کوێرەیـەك بـووە لـە ژیـانی رۆژنامەگـەریی کوردیدا. خەزنەدار، دوای هەوڵ و تەقەڵایەکی زۆر و هەڵسووڕان بەم لا و ئەو لادا لە لاپەڕە (١٥٥)ی ڕۆژگاری من بەرگی سێیەمدا دەنووسێ: ((لە پـایزێکی ڕەنگـا و ڕەنگی رووسدا نامەخانەی بەشی تورکی– مەغۆلیان بەسەر کردبـۆوە، سـەرلەنوێ کارتیان بـۆ رۆژنامـە و کۆوارەکـان دانـابوو، هـەموو چاپەمەنییەکیان پـەڕە پـەڕە هەڵگێڕ و وەرگێڕ کردبوو، لە ناو رۆژنامەیەکی قەوارە گەورەی بـەرگکراوی تـورکی عوسمانی، ژمارەی یەکەمی ڕۆژنامەی (کوردستان) یان دۆزیبۆوە. هـەر لـە هـەمان لاپــەڕەدا دەنووســێ ((ئـەم ژمارەیـە لـە ڕۆژی ٢٣ی نیسـانی ١٨٩٨ لـە قـاهیرە دەرچووە، لـە پـاش دوو سـاڵی تـر لـە بەغـدا ئـەم مێـژووەم بـە خـەڵکی گەیانـد و پێشنیازم کرد ئـەم رۆژە نـاو بنـرێ (جـەژنی ڕۆژنامەگـەریی کـورد). پێشـنیازێکی ئـەوتۆ لـە سـاڵی ١٩٤٠–١٩٤٨ ئـەو کاتـەی دوکتـۆر خەزنـەدار لـە ڕووسـیا بـووە، دەگەڕێتەوە بۆ نیشتمانپەروەریی مامۆستا و جێگای شانازیی نەتەوەی کوردە کـە دایکی نیشتمان ڕۆڵەیەکی وا بە ئەمەکی پەروەردە کردووە.

هەموو نەتەوەیەك بـۆ پێناسـەی نەتەوایـەتیی خـۆی مێـژوو دەکاتـە بەڵگـە و خۆی پێ رادەنێ. بەڵام بەداخەوە کورد لەبەرئەوەی بۆ خۆی لە دەستی نەهاتووە مێـژووی خـۆی بنووسـێتەوە، هەمیشـە لـە هـەوڵی ئـەوەدا بـووە ئـەو سەرچـاوە مێژووییانـە بدۆزێتــەوە کـە باسـی نەتــەوەی کوردیـان تۆمـار کـردووە. دوکتـۆر خەزنەدار. لەبەرئەوەی عەوداڵی مێژووی نەتەوەکەی بووە، لە ژیـانی روونـاکبیریی خۆیدا، بە تایبەت ئەو ماوەی کە لە ڕووسیا ژیاوە، چـۆتە هـەموو ئـەو نامەخانـە و شوێنە مێژووییانەی کە بەڵگەنامەکانیان لێ پارێزراوە. وەك ئـەرك بـە شـوێن ئـەو سەرچاوانەدا گەڕاوە کە لە بارەی کورد و کوردسـتان شـتیان نووسـیوە، کـەلێن و قوژبن نەماوە سەری پێدا نەکا، لە هەر جێگایەك دەستنووس یا کتێبێکـی دەسـت کەوتبێ کە باسی کورد و کوردستانی تێدا نووسرابێ وەکـو بەڵگەمـە. لـە یـەریڤان چاوی بە نوسخەیێکی ئینجیل دەکەوێ. ئینجیل باسی بەسەرهاتی عیسا پێغەمبەر دەکا. دەڵێن پێنج وانە لەم دەسنووسە لە هەموو گێتیدایە ئەوەی ئێـرە و ئـەوانی

تـر لـە لەنـدەن و فاتیکـان و پـاریس و میشـیگان پـارێزراون. لـە لاپـەڕە ١٨٨ی ڕۆژگاری من، بەرگی سێیەمدا دەنووسێ: ((وەکو لەم دەسنووسە دەردەکەوێ ئەم تۆمارە بەشێك لە بەسەرهاتی مێژووی نەتەوەی کورد دەگێڕێتەوە)).

## ١٧- کەلتوور و نەریتی کوردەواری لە کتێبی رۆژگاری من دا :

کتێبـی ڕۆژگـاری مـن، وەك هەمبانـە بۆرینـە وایـە، هـەموو شـتێکی تێدایـە. مامۆستا خەزنەدار جگە لە مێژوو و ئەدەب و زانست، خولیای ژیانی عەشـیرەتی و کوێسـتان و هـەوار و هۆبـە و داب و نـەریت، میـوان و میوانـداریی گونـد و کـۆچ و کۆچبەران بووە و بـە چـاوێکی کوردانـە و زانسـتییانەوە خوێنـەر بـە دوای خۆیـدا ڕادەکێشێ و ژیانی کوێستانچییان بە زمانێکی پوخت و پاراو و ئەدەبیانە ئەوەندە بـەتام و چـێژ دەگێڕێتـەوە، مـرۆڤ لەگـەڵ خـۆی دەباتـە نێـو سروشـت و دیمەنـە جوانەکانی. لە لاپەڕە (٣٠٣)ی ڕۆژگاری من، بەرگی سێیەمدا ، بە یادی کوردستان لە سانت پیترسبۆرگ دەچێتە هەوار و دەنووسێ: ((خەڵکی لە خـەو هەڵسـتابوون، ژنان مەشکەیان دەژەند، لـە نزیـك ڕەشماڵەکـەی ئێمـەوە خانەخوێیـەکمان مـەڕی سەربڕیبوو، کەوڵی دەکرد، لـەو لاوە کـەیبانوو تـەنووری دادەخسـت، یـەکێکی تـر سفرەی نانی بەیانی لە ناو ڕەشماڵدا دەڕازانـدەوە، زۆر ئاسـاییە نـەریتی ڕووسـی ئەوروپایی لە ناو ڕەشماڵی کـوردی ئەلەگـەز ببینـرێ، مـام قەشـەنگ بـەدەم پێـك هەڵدانەوە دەیگوت: میوان گەورەیە، هەواری ئەلەگـەز خۆشـە، ئـەرزمان سـەوزە، ئاسمانمان شینە، شەرابمان پیاو سەرخۆش ناکا، سێومان بـۆ نیشـتمان بنێـرن)). لەوێوە دەچنە هەوارێکی تر و دەنووسێ: ((لـە پـاش بڕینـی شـەش کیلۆمـەتر بـە سواری و بە پـێ، گەیشـتینە هەوارگـەی (کـۆخ) ئەمـە زۆزانـی گونـدی (تـالیش)ە. شەبابێ تەمۆ بە پیر میوانانەوە هات، دەیگوت: ئەوە چەند ڕۆژ بـوو لەسـەر ئـاو و ئاگر بووم، تا دوێنێ ترسی ئەوەم هەبوو ئێـوەی بـەڕێز گـەورەمان نەکـەن، بـەڵام دوێنـێ یەکێك ئێوەی لـە زۆزانـان دیبـوو، مـژدەی داینـێ. شـەباب هەشـت منـداڵی هەیە، شەشـیان لـە قوتابخانـەن، گەورەکـەیان پـۆلی دەیەمـە، دووانیـان منـداڵن و نەگەیشتوونە تەمەنی قوتابخانە. خێزانی شەباب نـاوی تـەورێزا عومـەر بـوو، سـێ

جار میدالیەی (دایکی قارەمان) ی وەرگرتبوو. ئـەو نیشـان وەرگرتنـە پێشکێشـی ئەو ژنانە دەکرێن منداڵیان زۆر بێ)).

**١٨- مارف خەزنەدار و عەرەبی شەمۆ:**

((عەرەبی شەمۆ))، لـە دنیـای رووناکبیریـدا وەك چـیرۆکنووس و رۆمـاننووس ناسراوە. هـەروەها وەك هـەموو نووسـەرێك بەسـەرهاتی تایبـەت بـە خـۆی هەیـە، زۆربەیان ژیان و بەسەرهاتی خۆیان نووسیوەتەوە و تارادەیەك خەڵکیان لێ ئاگادار کردووە. عەرەبی شەمۆ بـۆ زۆربـەی نووسـەران و رووناکبیران نـاوێکی ئاشـنایە و خزمـەتی ئـەو کەسـایەتییە لـە مێـژوودا لـە کـەس شـاراوە نییـە و نووسـراو و بەرهەمـــەکانی لاپەڕەیـــەکی زێڕینیـــان لـــە مێـــژوودا تۆمـــار کـــردووە و وەك سەرچاوەیەکی مێژوویی و جێگای متمانـە کـەڵکیان لێ وەردەگیرێ. بـۆ ناسـاندنی ژیان و بەسەرهاتی ئەو زاتە ناودارە، لە زمان مامۆسـتا خەزنـەدارەوە بەسـەرهاتی ژیانی عەرەبی شەمۆتان بۆ دەگێڕینەوە. مامۆستا لە لاپەڕە (٣٣)ی ڕۆژگـاری مـن بەرگی سێیەمدا دەنووسـێ: عـەرەبی شـەمۆ لـە بنەماڵەیـەکی شـێخی ئێزیدییانـە، باوکی ناوی شێخ شەمۆ بوو، واتە شەمسەددین، ناوی باپیری شێخ شـامیلە، نـاوی تەواوی بە ڕووسی (ئـەرەب شـەمۆیێڤیچ شـامیلۆڤ)ە. یەکـەم چیرۆکنووسـی کـورد بووە لەوناوە، خوێندەوارێکی چـاك بـووە، لـە سـاڵی ١٩٣٣ لـە سـان پیترسـبۆرگ بووە بە قوتابی خوێندنی بەرز. لەو کاتەدا "مار" و "ئوربێلی" لە زانـا دیارەکـانی ئـەو ئەکادیمییـە بـوون. پێوەنـدی لەگەڵیانـدا بـاش بـوو. لـە سـاڵی ١٩٣٧ نامـەی خوێندنی بەرزی لە تەواوبووندا بوو کە تیۆری داپلۆسێنەری ستالینی فاشیست لـە دژی کورد دەستی پێکرد و عەرەبی شەمۆشی گرتەوە. بۆ ماوەی بیست ساڵ ون بوو. لە ساڵی ١٩٥٧ لە سیبیریا سەری دەرهێنا و هێشتا زیندوو بوو، لـێم پرسـی: ئەوە راستە هۆی ئاوارەکردنت بە ناوی ئەوەوە بوو گوایە ڕۆمـانی (شـڤانی کـورد) لە سوریا کوردەکان چاپیان کردووەتەوە. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە عەرەبی شەمۆ پەیوەندی بە بورجـوازیی دەرەوەی ئـەمپریالیزمی ئـەوروپاوە هەیـە، لەبـەر ئـەوە تاوانبارە گوتی: بەڵێ ئەمە ڕاستە، بـەڵام مەسـەلە لـەناوبردنی هـەموو کـورد بـوو، دەبـوو شـتێکیش بـۆ مـن بکـەن. لـە سـاڵی ١٩٣٧ پیـاوکوژانی سـتالین عـەرەبی

شەمۆیان گرتبوو، لە ناو شەمەندەفەرێکیان نابوو، پێنج شەو و پێنج ڕۆژ بەڕێوە بوو، ئینجا خستوویانەتە ناو هەلیکۆپتەرێك و چاویان بەستووە، لە جێگەیەکی زۆر سارد هێناویانەتە خوارەوە، جل و بەرگی تەواوی نەبووە، خۆی لەم زەحمەتییە بپارێزێ، سێ شەو و سێ ڕۆژ بەبێ نان و ئاو لە ناو بەفر و سەهۆڵبەنداندا سووڕاوەتەوە، نەیزانیوە لە کوێیە، ئینجا کابرایێکی ڕووسیی پیر تووشی هاتووە و بردوویەتییەوە مالّی خۆی، لە ترسی تیرۆری ستالین هەوالّی گەیاندووەتە کاربەدەستان. ئەوان بەڕیشی پیرەمێرد پێکەنیون و ئەوەیان بۆ ئاشکرا کردووە. ئاگاداری هەلّسوکەوتی عەرەبی شەمۆ بوون لەو کاتەوە لە هەلیکۆپتەر هێنابوویانە خوارەوە بەجێیان هێشتبوو، ئیتر پیرەمێردیان کردبووە لێپرسراو لە عەرەبی شەمۆ و مووچەیەکی کەمیان بۆ ئەو مالّە بڕیبۆوە.

عەرەبی شەمۆ دەیگوت: ئێستا و ئەوساش نەمزانی من لە کوێ بووم، ئەوەندەم دەزانی لە سیبیریام، پێشان وامدەزانی بەندیخانەی لێیە و نەمدەزانی ئەو گوندەی تێیدا دەژیم، نابێ لێی بێمە دەرەوە.

تا کۆتایی جەنگی دووەمی گێتی عەرەب لەو مالّە بووە، کچێکی ڕووسیی ئەو مالّەی هێنا. سێ کچی لە سیبیریا لەو ژنە ڕووسە بوو: (ڤێرا ١٩٤٦)، ئاسێ (١٩٥٣)و زینێ (١٩٥٦). لە سالّی ١٩٥٧ لەو ماوەیەی کە کاروبار بەدەست خرۆشۆڤەوە بوو و ڕەخنەی لە ستالین دەگرت بۆ ئەوەی جێی پێی خۆی خۆش بکا، عەرەبی شەمۆ ئازاد کرا و خۆی و مالّ و مندالّی گەڕانەوە یەریڤان. لە پاش بیست سالّ ناو گومبوون، ناوی عەرەبی شەمۆ وەکو چیرۆکنووس و ڕۆماننووس هاتەوە سەر کتێبی چاپکراو و ڕۆژنامەکان، تاوانی چی بوو؟ هیچ: تەنیا ئەوە بوو کورد بوو!)).

نەتەوەبوون شتێك نییە بە هاسانی لە مێژوودا پاك بێتەوە. ڕەنگە بۆ ماوەیەکی کورت پشت گوێیان بخرێ، بەلاّم ئالّوگۆڕی زەمان و سەرهەلّدانی بیروڕای نوێ و هێنانە گۆڕی مافی چارەنووسی نەتەوە جیاوازەکان بۆتە هۆی ئەوەی کە زلهێزەکان بەخۆیان بچنەوە و چیتر نەتەوە بن دەستەکان نەچەوسێننەوە. نەتەوایەتی وەك داری ریشاژۆ دەچێ ئەگەر هێندێك لە ریشەکانی ببڕن یان وشکی کەن لە جێگایەکی تر سەر هەلّدەداتەوە و پەل دادەکوتێتەوە.

سەدەی بیست بۆ نەتەوەی کورد پـڕ بـوو لـە نەهامـەتی بـۆ چەوسـاندنەوە و تواندنەوە و لەناوبردنی بە پێی پیلانی داڕێژراو گەیشتە لووتکە، بـەڵام لەبـەر ڕەوا نەبوونی هەموو ئەو پیلانە چەپەڵانە بوونە بڵقی سەر ئاو و پووچەڵ کرانەوە. هـەر دەبێ بە نەدار و ڕێبوارانی ڕێگای ئازادی و خەمخۆرانی ڕاستەقینە بە پشـتیوانی و پشت گەرمی جەماوەر توانییان داگیرکەران ملکەچی ئاواتە نەتەوایەتییەکان بکـەن و بەدنیای بسەلمێنێ کـە ئـەو سـەردەمە نـەماوە کـە کـورد بـە تـاوانی کوردبـوون تاوانبار بکرێ.

### ١٩- بۆچوونی مارف خەزنەدار لەسەر ئەدەبی فۆلکلۆر و ئەدەبی بەرزی خوێندەواران:

هەر چەند ئێمە قەرزاری ئەدەبی فۆلکلۆرین، بەڵام دەبێ هەوڵ بدەین هەرچی زیاتر ئەدەبی نووسـراو گەشـە پـێ بـدەین و پلـەی زانیـاری نەتەوەکـەمان بەرینـە سەر. گۆڕانی هەلومەرج دەبێ لە ئەدەبیات و شیعر و چیرۆکیشدا خۆی نیشان بدا. مامۆسـتا خەزنـەدار، لـە لاپـەڕە (٣٣٨ )ی ڕۆژگـاری مـن. لـە بـەرگی سـێیەمدا دەنووسـێ: ((لەوەتـەی چـووبوومە ئـەو وڵاتـە پرسـێکی گـەورە لـە نـاو مێشـکمدا دروست بوو، ئەویش ئەوە بوو: تا کەی ئـەدەبی بـەرزی خوێنـدەواران سەرشـۆڕ و ملکەچی ئەدەبی میللی نەنووسراو (فۆلکلۆر) بێ لەم وڵاتـەدا؟ ئێمـە لەسـەر ئـەوە یـەك دەنـگ بـووین کـە دوو ئـەدەب هەیـە، نووسـراو نەنووسـراو. هەرچـەندە پێوەندییێکی بـەهێز لـە نێوانیانـدا هەیـە، بـەڵام هێنـدێ ئـەو پێوەندییـە دەبـێ لـە یەکتری جیا بکرێنەوە. ئێمە هەموومان لەسـەر ئـەو بـاوەڕە بـووین لەبـەر ئـەوەی کـوردی ئـەو ناوچـەیە لـە پـێش شۆڕشـی ئۆکتۆبـەر نەخوێنـدەوار بـوون، کـە خوێندەواری پەیدا بوو، ئەدەبەکـەیان شـەقڵی ئـەدەبی نەخوێنـدەواری وەرگـرت، واتە ئەدەبی میللیی نەنووسراو. لەبەر ئەوە بـوو بـە ژمـارە نووسـەر و شـاعیر زۆر بوون. چیرۆك شێوەی حیکایەتی هـەبوو. شـیعر شـێوەی بـەیت و بـالۆرەی میللـی وەرگرتبـوو. کەچـی شـاعیر و نووسـەری وەك ((قاچـاغی مـراد)) و ((شـێکۆیی حەسەن)) و ((عەرەبی شـەمۆ)) و ((عـەلی عەبـدولڕەحمان)) کـەم بـوون. ئەمانـە بـەلای منـەوە ئـەدەبی کوردییـان لـە چوارچـێوەی ئـەدەبی نەنووسـراو هێنایـە

دەرەوەی، بەتایبەتی کاری پەخشانی واتە چیرۆك و ڕۆمان. هەر لەبەرئەوەش بوو ئەم بەرهەمانە ڕووی ئەوەیان هەبوو وەربگێڕدرێنە سەر زمانی ڕووسی و وەکو ئەدەبێکی نووسراوی بەرز خۆیان پێشان بدەن".

جیاوازی بیروڕای نێوان بارزانی و قازی محەمەد، هەرچەند تاکو ئێستا بەشێوەی زانستییانە لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوە، بەڵام کەسایەتی و نووسەرانی لاوەکی و ناوخۆ بەکورتی ئاماژە بەو جیاوازییانە دەکەن بەبێ ئەوەی هۆکارەکان دیاری بکەن. بەباوەڕی من ئەوە مەسەلەیەکی مێژوویی و نەتەوایەتییە و پێویستە بەوردی هەڵوێستەی لەسەر بکرێ و وەك ئەرکێکی نەتەوایەتیی داهاتوو ڕوون بکرێتەوە. هیچ دوور نییە بارزانی و قازی محەمەد، بیر و بۆچوونی جیاوازیان بووبێ، ئەوە شتێکی سروشتییە. بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو جیاوازی بیروڕایە ڕوون بێتەوە. هیوادارم کەسانی شارەزا و خەمخۆری نەتەوەی کورد هەنگاو هەڵگرن و ئەو بۆشاییە لە مێژوو پڕبکەنەوە و بێلایەنانە ڕووداوەکە وەك خۆی بگێڕنەوە. مێژوو ئەوەیە کە ڕووی داوە و چەواشەکاری و دەست تێوەردانی دەبێتە هۆی سەرلێشێوان و دووپاتبوونەوەی هەڵەکان. دوکتۆر خەزنەدار، یەکێکە لەو نووسەرانەی بەکورتی و ناڕاستەو خۆ لەدەرەوەی وڵات باسی ئەو ئێرانییانە دەکات لە باکۆ نیشتەجێ بوون. لەلاپەڕە (١٣)ی ڕۆژگاری من، بەرگی چوارەمدا دەنووسێ:" قازی محەمەد کە ئەوانیش لە باکۆ پەنابەری سیاسی بوون، بەربەرەکانێیان دەکردن و باگیرۆڤیان هان دەدا زیاتر ئازاری بارزانییەکان بدا".

بایەخی خوێندن و دەوری ڕۆشنبیریی لە هیچ کەس شاراوە نییە، یەکێك لە هۆکارەکانی دواکەوتوویی نەتەوەی کورد، نەخوێندەواری بووە. ئەو بۆشاییە تاڕادەیەك لە سەدەی بیست و یەکدا پڕ بووەتەوە کورد خەریکە دەکەوێتە ناو مێژوو، بۆ، لەبەر ئەوەی ڕووناکبیری کورد سەردەمی خەباتی چەکداری تێپەڕاندووە و دەیهەوێ بەچەکی قەڵەم ڕووناکبیری دەرەکی تێگەیەنێ کە کورد لەباری ڕۆشنبیرییەوە لەو گەلانەی کە سەربەست بوون کەمتر نییە.. بەڵێ خوێندن و ڕۆشنبیری زامنی ڕزگاری هەموو نەتەوەیەکە. مامۆستا خەزنەدار، یەکێکە لەو ڕۆشنبیرانەی کە باوەڕی بەخەباتی ڕۆشنبیری هەبووە و بەرهەمەکانی باشترین بەڵگەن و مێژوو تۆماری کردوون.

### ٢٠- هەستی مارف خەزنەدار بۆ کۆچی دوایی ((گۆران))ی شاعیر:

لەدەستدانی خۆشەویست، مرۆڤ زۆر ناڕەحەت دەکا، خۆشەویستی وا هەیە بەقەدەر دەریاچەیێك خەم و پەژارە لەدوای خۆیان بەجێ دێڵن، لەبەرئەوەی بەدەگمەن جێگایان پڕ دەبێتەوە. نەمان و مردن بۆ هەموو بوونەوەرێك دیاری کراوە، ڕۆژێك لە ڕۆژان هاتۆتە سەر ئەو گردە زەوییە و ڕۆژێکیش دەبێ بڕوا. بەڵێ مردن ناخۆشە، جەرگ بڕە و بۆشاییەکەی زۆر درەنگ لەبیر دەچێتەوە، بەتایبەت بۆ هێزێك هەڵکەوتەیی وەك مێژوونووس و لێکۆڵەر و شاعیر و ئەدیب. خەزنەدار، بەکۆچی دوایی شاعیری ناودار، (گۆران)ی مەزن، شاعیر و داهێنەر و خاوەن شێواز، دڵ و دەروونی ئاگر دەگرێ و مێشکی دەتەزێ بیرەوەرییەکانی ڕابردووی بۆ زیندوو دەبێتەوە. بەنووسینی چەند دێڕێك خۆشەویستی و ئەمەکناسیی خۆی سەبارەت بەگۆرانی شاعیر دەردەبڕێ. لەلاپەڕە (٨٦)ی ڕۆژگاری من. بەرگی چوارەمدا دەنووسێ: "پەیامی مردنی گۆران لە نیشتیماندا هەواڵێکی جگەربڕ بوو بۆ من و وڵات. ماتەم دایگرتم، دیمەنی بیرەوەرییەکانم یەك لە دوای یەك بەخەیاڵمدا تێدەپەڕین. ئەو شاعیرە ناسکە لە ژیانیدا ئازاری چەشت، لە هێزی تاریکی و دواکەوتوویی، لە خەڵکی نەفام ، لە پیاوی کەمبین".

مامۆستا خەزنەدار دەڵێ مەرگی زۆر گران بوو لەلام، لەکاتێکدا لەگەڵ بیرەوەرییەکانی گۆراندابووم، دەبوو بۆ سبەی خۆم بۆ باسێکی زانستی بە بەشداریی نزیکەی سەد و پەنجا کەس لە مامۆستایان و قوتابیانی ڕۆژهەڵاتناسی شاری سانت پترسبۆرگ ئامادە بکەم. لەلاپەڕە (٨٥) ی ڕۆژگاری من. بەرگی چوارەمدا دەنووسێ: "ئەو شەوە تەنیا لەگەڵ بیرەوەرییەکانی گۆراندابووم. بۆ سبەینێ دەبوو باسێکی زانستی لە کۆنگرەی دووەمی عەرەبناسی لە هەموو وڵات لە سانت پترسبۆرگ بەناوی "سەرچاوەی عەرەبی لەسەر کورد" پێشکەش بکەم". خەزنەدار لەو وتارەدا باسی کۆچی دوایی گۆران ڕادەگەیەنێ و کەسایەتی هەڵکەوتەیی مامۆستا گۆرانیان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

### ٢١- مارف خەزنەدار و پێوەری خۆشەویستی:

خۆشەویستی دەبێتە هۆی هیوا بەژیان و هەموو مرۆڤێك لە ژیاندا شتێکی خۆش دەوێ و هەوڵی بۆ دەدا. ژیان بەبێ هەبوونی حەز و ئاوات و ئەوین هیچ

مانایـەکی نییـە. بـەڵام خۆشەویسـتترین خۆشەویسـتی، نیشـتیمانە. خـاوەنی ئـەو خۆشەویسـتەش لـەلای هـەموو نیشـتیمانپەروەرێك خۆشەویسـتە و خۆشەویسـی تایبـەتی هەیـە لـە دڵـی دڵسـۆزانی کۆمـەڵگادا. مامۆسـتا خەزنـەدار یەکێکـە لـەو کەسانەی کە نیشتیمانی خۆی لە هەموو شتێك لا خۆشەویستتر بووە. بە شـادی و بەختەوەریی نەتەوەکەی شاد بووە. بۆ لەقاودانی زوڵم و زۆرداری چەوسێنەرانیش تا ئەو جێگایەی لەدەستی هـاتبێ هـەوڵی داوە و هـاواری ڕەوا و بەحـەقی کـوردی مـاف خـوراوی گەیاندووەتـە ڕێکخـراوە خێرخوازەکـان و کۆمـەڵگا و وڵاتـانی ئاشتیخواز و ئەرکی ڕووناکبیرانەی خۆی ڕاپەڕاندووە.

گۆڕینی حکومەتـەکانی دیکتـاتۆری و ملـهوڕی ئـارەزووی سـەرەکی هـەموو نەتەوەیەکی زوڵم لێکراوە و بن دەسـتە بـۆ وەدیهـاتنی ئـەو ئاواتـە بەدووروودرێـژی خەباتیان کردووە و قوربانییـان داوە بـەڵام ، زۆرجـار ئاڵوگۆڕەکـان لەبـەر ئـەوەی بنـەڕەتی نـین، تـەنیا دەسـەڵاتەکان جێگاکانیـان دەگـۆڕی و بەرژەوەندییـەکانی گشتی لەبەرچاو ناگیرێن. دەتوانین کۆدەتاکانی عێراق بەنموونە بێنینەوە و بێـژین لەبـەر بـێ بنـەمابوونی پـڕۆژەی پلانـەکان بـە تایبـەت بـۆ کـورد. هـەر ڕاپـەڕین و شۆڕشێك بەرژەوەندیی چینی فەقیر و هەژار نـەپارێزێ، سـەرەنجام سـەرمایەدار و بەرژەوەنـدیخواز دەسـتی بەسـەر دادەگـرن. شۆڕشـی ڕاسـتەقینە ئـەو شۆڕشـەیە ئاڵوگۆڕ بەسەر ژیانی خەڵکدا بێنێ و نەتەوەکان بەبێ جیاوازی لێی بەهرەمەند بـن و بەتـەنیا تاقمێـك و چـینێك خـۆی لـێ نەکەنـە خـاوەن و بـە ئـارەزووی خۆیـان مەیدانداری تێدا بکەن. مامۆستا خەزنەدار، بەپێی باوەڕبوون بە فـرە نەتـەوەیی و ئاینی لە عێراق چاوەڕوانی ئەوەی دەکـرد کـە بەشـوێن گـۆڕینی دەسـەڵاتدا دەبـێ مـافی مرۆڤایـەتی ڕێـزی لـێ بگـیرێ و سەربەسـتی و پێکـەوەژیان وەك مـافێکی سەرەتایی بـۆ هـەموو کـەس و لایـەنێکی پـارێزراو جیـاوازی نێـوان ڕەش و سـپی نـەمێنێ. بۆیـە زۆر دڵخـۆش نـەبووە بـە کودەتاکـانی عێـراق و لـە لاپـەڕە (٨٩)ی ڕۆژگـاری مـن. بـەرگی چـوارەمدا دەنووسـێ: "دڵخـۆش بـووم بـەوەی دوژمنێکـی گەوجی کورد لەناوچوو، دڵتەنگ بـووم بـەوەی دوژمنێکـی تـری کـورد دێتـە جێـی ئەو".

مامۆستا خەزنەدار، بۆ بەرژەوەندیی نەتەوەکەی هێندێك جار نەیارانی وەك دۆست چاو لێ کردووە و دەڵێ من عەبدولکەریم قاسمم خۆش نەدەویست، چونکە خراپەی بۆ کورد هەبوو. لە لاپەڕە(٩٠)ی ڕۆژگاری مـن. بەرگی چـوارەمدا دەنووسێ: (پاش زەمانی عەبدولکەریم قاسم هەڵوێستی دامودەزگای تازە دوای کۆمۆنیزم بوو، لەبەر ئەوە لەو وڵاتەدا دەست دەکرا بەجەنگی ڕاگەیاندن دژی ڕژێمی تازەی عێراق بەناوی ئەوەی کۆمۆنیست و کورد دەچەوسێنێتەوە).

ئێمە چەند خوێندەوارێکی کورد هەڵوێستی ئەو وڵاتەمان بەهەل زانی و لەم بابەتەوە برووسکەیەکمان بۆ خرۆشۆڤ ڕەوانە کرد، لە بروسکەکەدا داوای مافی کوردمان کرد لەڕژێمی تازەی عێراق. ئێمە ئەو کردەوەی خۆمانمان لەبیرچووە، چاوەنۆڕی ئەوەش نەبووین وەڵاممان بدەنەوە یا لە ڕۆژنامە بۆمانی بڵاو بکەنەوە، کەچی لە پاش چوار پێنج مانگ، لەهاویندا برووسکەیەکیان لە ڕۆژنامەی "پراڤدا" بڵاوکردەوە. لەو کاتەی ناخۆشی لە نێوان دەسەڵاتی ئەم وڵاتە و ڕژێمی تازەی عێراق تیژ بووبوو". ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە کورد دیپلۆماسییانە هەوڵ بدا بۆچارەسەری مەسەلەی کورد و دۆست و لایەنگر بۆخۆی بدۆزێتەوە و بۆچوون و هەڵوێستی خێرخوازانەی سیاسەتوانان لەسەر پرسی کورد، لەلایەن هەرکەس و وڵاتێکەوە بێ بیقۆزێتەوە و بەئیجابی وەری بگرێ. دۆستایەتی و دوژمنایەتی هیچ کامیان ئەبەدی نین و مرۆڤ دەبێ بەپێی بەرژەوەندیی سەردەم و کات سوود لە هەل و کات وەربگرێ.

پێشکەوتنی هەر نەتەوەیەك پێوەندیی ڕاستەوخۆی بەزانستەوە هەیە، ئەو وڵاتانەی پلەی زانستییان بەرزە کۆمەڵگایەکی بەختەوەریان هەیە. ئینسانی ڕووناکبیر و مشوورخۆر بۆ خۆشبەختیی ئینسان بە شوێن زانستدا دەگەڕێ، بۆ ئەوەی کەلتووری نەتەوەکەی گەشە پێبدا. بەشوێن زانستداگەڕان بەتایبەت ئەگەر لە پێناوی خزمەتی نەتەوەییدا بێ، کارێکی پیرۆز و بەنرخە. هەموو کەس لە بەرامبەر کۆمەڵگادا ئەرکێکی لەسەر شانە و دەبێ بەپێی توانا بەڕێوەی بەرێ. بەڵام ڕووناکبیر و خوێندەوار ئەرکەکانیان قورستر و زۆرترە، بەتایبەت زیندووکردنەوەی فەرهەنگ و پاراستنی زمانی زگماك دەکەوێتە سەرشانی ڕووناکبیر. ئەو کەسانەی کە زانست لەبەر خزمەت بە نیشتیمان هەڵدەبژێرن و

ئاستەنگەکان و گێرەوکێشەی بەزینی سنوور ساردیان ناکاتەوە و لەبەر خاتری خزمەتکردن بە وڵات پەرەوازەی وڵاتانی پێشکەوتوو دەبن بۆ ئەوەی لە ئەزموونی ئەو وڵاتانە کەڵك وەرگرن و بەدەستی پڕ بگەڕێنەوە نیشتیمان و بەکاری بێنن.

مامۆستا خەزنەدار، یەکێك بووە لەو ڕۆشنبیرانەی کە بەئامانجی خزمەتکردنی زمانی ئەدەبی کوردی هەڵبژاردووە و بەکۆڵێك ئەزموونی تازەوە گەڕاوەتەوە وڵات دوای تەواوکردنی خوێندنەکەی داوای لێ دەکەن بمێنێتەوە، بەڵام لەبەر لێپرسراویی ئەخلاقی ئەو داوایە ڕەت دەکاتەوە و لە لاپەڕە (١٠١)ی ڕۆژگای من، بەرگی چوارەمدا دەنووسێ: "هاتووم بۆ فێربوون، کە دەبێ لە نیشتیماندا خەرج بکرێ".

ژن لە ڕابردوودا کە پیاوسالاری حاکم بووە، ئیجازەی پێ نەدراوە جگە لە کاروباری ناو ماڵ وەك منداڵ بەخێوکردن، چێشت لێنان، جل شۆردن، خزمەتی مێوان کردن ... بێتە ناو کۆمەڵگا. دەوری ژن لەژیانی کۆمەڵگادا دەورێکی گرنگ و بەبایەخە. بەهیچ پیاوێك ئەنجام نادرێ. پاراستنی زمانی زگماك یەکێکە لەو کارە بنەڕەتییانەی کە تەنیا بە ژن دەکرێ. پێناسەی لەسەر یەك نەتەوە، یەك زمانە، ڕابگرێت پارێزەری زمانە و زمان لە فەوتان دەپارێزێ و یەکێك لە بنەماکانی نەتەوەبوون کە زمانە لەسەر شانی ژنە و شانازییێکی گەورەیە لە ژیانی ژندا، یەکێکی دیکە لە شانازییەکانی ژن پێگەیاندنی مناڵە، ئەو هەموو مرۆڤە پلە بەرزانەی کە بەشەرییەت شانازییان پێوە دەکا ئامێزی گەرمی دایك پێی گەیاندوون، لە لایەکی تریشەوە ژن لەپێگەیاندنی ئەدیب و شاعیر هاندەرێکی سەرەکی و خۆشەویستیی ژن نەبێ ئەو هەمووە ئەدەبیاتە جوانە نایەتە بەرهەم و ئەو وشە جوانانە بەمنی گەورە ناکرێت، کەوابوو دەتوانین ببێژین بۆ ئەدەب و شیعر و شاعیریش باشترین هەوێنە.

مامۆستا خەزنەدار، وەك زۆرێك لە شاعیر و ئەدیبیان. جوانیی ژنی کردووە بە هەوێن و بەرهەمی ئەدەبیی خۆی پێ ڕازاندۆتەوە. لەلاپەڕە (١٠٥)ی ڕۆژگاری من. بەرگی چوارەمدا باسی مەلەوانێکی کیژ دەکا و دەنووسی: "مەلەوان گەیشتە قەراغ زەریا، کە ئاو هاتە کەمەری قیت بۆوە و بەدوو باز گەیشتە سەر لمەکە. چی جوانێك بە پەیکەرێکی باڵا بەرز، سنگ قیتی نەرم و نۆڵ، پژ خورمایی چاو کاڵ،

دڵۆپی ئاو بەسنگ و مەمکی دەهاتە خوارەوە، دەم بە پێکەنین گوتی: ئەوە لەبەر من هاتووی گوتم: نا، بۆ بینینی دولفین هاتبووم، کە تۆم لەناو ئاودا دی، ئایا بۆم دەکرێ نەمێنمەوە و چاوم بە تۆ نەکەوێ؟".

قەڵاچۆکردنی ئەرمەنی قسەوباس و بۆچوونی جۆربەجۆری بەدوادا هاتووە و زۆریشی لەسەر نووسراوە. مێژوونووسان چلۆنێتی ڕووداوەکەیان تۆمار کردووە، بەڵام هێندێك دەمارگرژی وەك ژیلتیاکۆڤ مامۆستای تورکناسی لە کۆلێجی ڕۆژهەڵاتناسی لە زانستگای سانت پترسبۆرگ بەکەیفی خۆیان و بەبێ بەڵگەی متمانە پێکردوو تاوانەکە دەخەنە سەر ئەستۆی کورد. مامۆستا خەزنەدار، جوابی ئەو بۆچوونە هەڵانە دەداتەوە و بەم جۆرە بۆ ڕووداوەکە دەچێت لە لاپەڕە (١١٥-١١٤) ی ڕۆژگاری من. بەرگی چوارەمدا دەنووسێ: "کورد خزمەتی سوڵتانی عوسمانی نەکردووە لەم مەسەلەیەدا. لەپاشانا ئەگەر ڕووس برا گەورەی ئەرمەن بێ، کورد برا بچووکی نییە چونکە هیچ نەبێ بەژمارە دووسێ ئەوەندەی ئەرمەنە." ئێمە تاوانبار نین، پێویست ناکا سۆسیالیزم و مارکس و لینین و ئۆکتۆبەر بێنە ئەو مەسەلەیە چونکە پێش ئەمانەیە. ئەوەی ئەرمەنی بەقەڵاچۆکردن دا ڕووسی برا گەورە بوو، تۆ مێژوونووسی و باش دەزانی زۆرانبازی لە نێوان دوو ئمپراتۆریەتی سەروو و (ڕووس) و خواروو (عوسمانلی) نێوی ئاینی وەرگرتبوو، گاور و موسڵمان. ڕووس بۆ چاکەی خۆیان ئەرمەنیان هاندا لە دژی عوسمانلی، بۆ ئەوەی بستێکی تر بەرەو خوار بنەوە. کوردیش ئەمڕۆ نییە موسڵمانن، تۆ دەتەوێ ئەم هەموو کوردە ببێ بەگاور و بەرهەڵستی عوسمانلی بکا و پێشوازی ڕووس بکا. ئینجا وڵاتەکەش بداتە دەست ئەرمەن. لەبەرئەوەیە شاعیری گەورەی کورد (حاجی)ی ڕۆشنبیر و سیاسی و ژیر و دانا و ستراتیج بوو کە وتوویەتی:

**خاکی جزیر و بۆتان یەعنی وڵاتی کوردان**

**سەد حەیف و سەد مخابن دەیکەن بە ئەرمەنستان**

ئێمە تاوانبار نین، تاوانبار قەیسەری ڕووس و سوڵتانی عوسمانلین، چونکە نەتەوەی بچووکیان دەچەوساندەوە، لەمەوپاشیش نامانەوێ ئەم بەیت و باڵۆرانە ببیستین".

**٢٢- پلەی خوێندەواریی خەزنەدار:**

مامۆستا خەزنەدار، لە وڵاتێکی پێشکەوتووی وەك ڕووسیا، لە زانکۆی سانت پترسبۆرگ بووەتە قوتابی و سەرکەوتوویی خوێندنی دوکتۆرا یا بە وتەی خۆی خوێندنی بەرز تەواو دەکا، لە مارف خەزنەدارەوە دەبێ بە دوکتۆر مارف خەزنەدار. ئیتر لە قوتابیەتی تەواو دەبێ و دەبێ بەمامۆستای زانکۆ. چاردە کەس لە زانایانی ئەنجومەنی کۆلیجی ڕۆژهەڵاتی زانستگەی سانت پترسبۆرگ لە کۆبوونەوەی نامەی بەرگری –تێزی– دوکتۆرای خەزنەداردا بەشدارییان کردووە کە بەناوترین زانا و پسپۆڕی ڕۆژهەڵاتناسی بوون. ئەم زانایانە هەریەکەی پسپۆڕی زانستێك بوون و لەلاپەڕە(٢٢٨)ی ڕۆژگاری من، بەرگی چوارەمدا دەنووسێ:"لقی وەکو ڤاسیلی ڤاسیلییڤچ سترۆڤێ (١٨٨٩–١٩٦٧) پسپۆڕی مێژووی ڕۆژهەڵاتی کۆن، نیناڤیکتۆرڤنا پێڤولێڤکایا (١٨٩٤–١٩٧٠) پسپۆڕی مێژوو و زمانزانی ڕۆژهەڵاتی کۆن، دیمیتری ئەلیکسییڤچ ئۆلەیروگێ (لە ١٩٠٣ لە دایك بووە) پسپۆڕی لێکۆڵینەوەی ئەفریقا، گریگۆری ڤاسیلییفچ پێڤیکۆڤ (لە ١٩٠٤ لە دایك بووە) پسپۆڕی لێکۆڵینەوەی وڵات و نەتەوەکانی چین ڤێرا ئەلیکساندرۆ ڤناکرا چکۆڤسکایا (١٩٨٤–١٩٧٤) پسپۆڕی عەرەبناسی، بۆکۆلۆبۆڤ پسپۆڕی ئێرانناسی، کۆنۆتۆڤ پسپۆڕی تورکناس، بۆڵدیڤ پسپۆڕی ئێرانناسی، ئیسحاق ناتانۆڤیچ ڤیننکۆڤ (لە ١٨٩٧ لەدایك بووە) پسپۆڕی ئێرانناسی، ڤیکتۆرئیڤانۆڤیج بیلیابێڤ (لە ١٩٠٣ لە دایك بووە) پسپۆڕی عەرەبناسی، بۆریس بۆریسێڤیچ پیۆترووڤسکی (لە١٩٠٨ لەدایك بووە) پسپۆڕی ئەرکیۆلۆجی ڕوژهەڵاتی کۆن، بێڤگینیا میخایلۆڤنا پینوس ( لە ١٩١٣ لە دایك بووە ) پسپۆڕی ژاپۆنناسی، بەشداریکردنی ئەو هەموو زانا بەناوبانگانە ئەوەمان پێ دەڵێن کە نامەکەی خەزنەدار، زۆر بایەخی پێدراوە. بۆ ئیسپاتی ئەم بۆچوونە بیروڕای سکرتێری ئەنجومەنی زانایان وەك بەڵگە دێنینەوە. خەزنەدار، لەلاپەڕە(١١٩) ی ڕۆژگاری من. بەرگی چوارەمدا دەنووسێ:"سکرتێری ئەنجومەنی زانایان ئەوەی خستە ڕوو کە کۆمەڵێك ڕاپۆرتی زانستی لە زانایانی ڕۆژهەڵاتناسی و دەستگا زانستییەکان هاتووە، هەموویان لەسەر ئەو باوەڕەن کە نامەکە لە پلەیێکی بەرزی زانستیدایە، لەبەر ئەوە لەپاش بەرگریکردن پێویستە چاپ بکرێ. خاوەن ڕاپۆرتەکان ئەمانەن:

قـەناتی کـوردۆ، بـراگنیس، خـالفین، بەشـی ئـەدەب لـە ئامۆژگـای ڕۆژهەڵاتناسـی ئـەکادیمیای زانسـتی مۆسـکۆ ئامۆژگـای ڕۆژهەڵاتناسـی ئـەکادیمییای زانسـتی ئازەربێجان لە باکۆ". ئەنجومەنەکە کە چاردە کەس بوون بەتێکڕای دەنـگ پلـەی بـەرزی نامەکـە دەستنیشـان دەکـەن و داوا دەکـەن ئامۆژگـای ڕۆژهەڵاتناسـی ئەکادیمیەی زانستی ئەو نامەیە چـاپ بکـا". مامۆسـتا خەزنـەدار، هەرچـەند دوای تەواوکردنی خوێنـدنی زانکـۆ لـە ڕووسـیا دەبـێ بـە مووچـەخۆری دەوڵـەت، بـەڵام لەبەرئەوەی خۆی بەمڵکی کورد دەزانێ دەبێ ئەزموونەکانی لە نیشـتیمانی خۆیـدا بەکاربێنێ، دەگەڕێتەوە وڵات. ئەدەبی کوردی لەسایەی هەوڵ و تێکۆشـانی زانـا و هەڵکەوتـەی وەك، ڕەفیـق حیلمـی، بـرایم ئەحمـەد، زەبیحـی، هـەژار، هـێمن، گـۆران...... پـارێزراوە و گەشـەکردنێکی بەرچـاوی بـە خۆیـەوە دیـوە. دوکتـۆر خەزنەداریش یەکێك بووە لەو ڕووناکبیرانەی بە هەستێکی نەتەوایەتی و کوردانەوە بـۆ گەشـەکردنی ئـەدەب و کـەلتووری گەلەکـەی ئـەو مەیدانـەی هەڵبـژاردووە و سەرکەوتووانە ئەرکی ڕۆشنبیریی خۆی بە ڕێوە بردووە. تێزی دوکتۆراکەی بەهێند وەردەگیرێ و ئەنجومەنی زانایانی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسـی سـانت پترسـبۆرگ بـۆ چـاپکردن وەری دەگـرن. خەزنــەدار لەلاپــەڕە (١٦٣)ی ڕۆژگــاری مــن، بــەرگی چوارەمدا دەنووسـێ: "چـونکە یەکـەمین کتێبـە بـە زمـانێکی ئـەوروپایی لەبابـەت ئەدەبی کوردییەوە".

## ٢٣- مارف خەزنەدار لە ڕۆژنامەی کوردستاندا:

خاڵەمینی شاعیر دەڵێ: ئەوانەی لەسەر ئەو خاکە کورکن – ئێـران و سـوورییە و عێـراق و تـورکن، کوردسـتان لـە نێـوان چـوار وڵاتـی ئێـران، سـوورییە، عێـراق، تورکییەدا بەناحەق و بـەپێی بەرژەوەنـدیی زلهێزەکـانی جیهـان، دابـەش کـراوە و مافی نەتەوەییبوونی لێ زەوت کراوە. کورد وەك هـەموو گـەلانی دیکـەی سـەر ئـەو گردە زەوییە مافی سروشتی خۆیـەتی بـۆ لـە نـاوبردنی ئـەو سـنوورە دەسـتکردانە هەوڵ بـدەن و دەوڵـەتی سـەربەخۆیان هـەبێ. خەزنـەدار، لەوکاتـەوە کـە دەسـتی قەڵەمی گرتووە، ئەو هەستە لە مێشـکیدا گـوراوە، هـەم بـەکردەوە و هـەمیش بـە نووسین و بیروڕای گشتی لێ ئاگادار کردووەتەوە. ڕۆژنامـەوانی بـەلای مامۆسـتاوە

زۆر گرنگ بوو و هەمیشە هەوڵی دەدا لە وتارەکانیدا نەیارانی کورد و کوردستان دەستنیشان بکا. لە ڕۆژنامەی "کوردستان"ی کوردانی ئێران، سەربە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوو، کە لە دەرەوەی وڵات دەردەچوو، چەند وتارێکی بە بایەخ و دەوڵەمەند بڵاو دەکاتەوە. لەبەر گرنگیی وتارەکان دەقی وتارەکە دەخەمە ڕوو کە لە لاپەڕە (١٧٠) ی ڕۆژگاری من بەرگی چوارەمدا نووسراوە: وتاری یەکەم بە ناوی (شار و کوردستانی عێراق) بوو (لە ژمارە١٣ی ئاغستۆس١٩٦٦) بڵاو کرایەوە لەوێ ئەوەم دەرخستبوو کە شای ئێران نەك دۆستی کورد نییە، بەڵکو دوژمنی هەرە گەورەی کوردی کردووە بە داردەست بۆ چاکەی خۆی. پێویستە جڵەوی ئەسپی کورد بە دەست خۆیەوە بێ، ئەگینا گران و قورس دەکەوێتەوە. وابوو پاش هەشت ساڵ و نیو کارەساتە جەرگبڕەکە ڕوویدا، ئەوە هەرەس و پشت شکانی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ بوو. ئەگەرچی خەڵکی ڕەمەکی و ساکار"ئاشبەتاڵ"یان پێ دەگوت، بەڵام ئاشی کورد قەت بەتاڵ نابێ، لە دوای هەموو کەوتنێك هەستانەوەیەك هەیە."

وتاری دووەم، لە ڕۆژنامەی کوردستاندا بەناوی "گەلی کورد و بزووتنەوەی نەتەوایەتی عەرەب" بوو لە (ژمارە ١٦ی ئەیلولی ١٩٦٦) بڵاو کرایەوە. نووسینێکی بیرو ڕا لە وتارەکەدا ئەوە بوو، عەرەبی عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب و کوردی عێراقیش بەشێکە لە نەتەوەی کورد، ئەگەر عەرەب مافی ئەوەی هەبێ یەکێتی عەرەب دروست بکا، واتە هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکان ببن بە دەوڵەتێك، لەو ڕۆژگارەدا ئەمە دروشمی هەرە دیاری سیاسییان بوو، پێویستە هەموو پارچەکانی کوردستانیش مافی ئەوەیان هەبێ یەك بگرن و ببن بەدەوڵەتێك. ئەم قسانە لەو سەردەمەدا قورس بوون، هەموو گوێیەك نەیدەتوانی وەریانبگرێت.

مامۆستا خەزنەدار، چوارچێوەی حیزبایەتی بۆ بیری نەتەوایەتی پێ تەسك بوو، پێی وابوو پێویست نییە هەرکەسێکی کە کوردایەتی دەکا دەبێ لەگەڵ ڕێکخراوێکی حیزبیدا خەبات بکا. زۆرن ئەو کەسایەتییە سیاسی و ڕووناکبیر و ڕۆژنامەوانانەی کە سەربەخۆن و لە دەرەوەی ڕێکخراوی سیاسیدا کاری سیاسی دەکەن، بەڵام زۆربەی ژیانیان لە پێناو گەشەکردنی ژیانی کۆمەڵگای کوردەواریدا بەخت کردووە و دەربەدەری و ئاوارەییان لەسەر دیوە. بەو مانایە نییە کە

حیزبایەتی کردن زەرەر لە کۆمەڵگا دەدات مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤ لە هەر پلە و پایەکدا بێ دەتوانێ خزمەتی نەتەوەکەی بکا و ئەرکی خۆی بەچاکی بەڕێوە بەرێ. ڕێکخراوە سیاسییەکان دەوری ئیجابیی خۆیان هەیە، شتێك نییە حاشای لێ بکرێ. بەڵام، هەموو شتێك لە چوارچێوەی بەرژەوەندی حیزبەکەیاندا لێك دەدەنەوە. بەداخەوە زۆر جاری وا هەیە لە نێو حیزبەکاندا بەرژەوەندی کۆمەڵگا پشت گوێ دەخرێ، بەتایبەت ئەو کاتەی دەبنە بەڕێوەبەری حکومەت. بڕوانە لە لاپەڕە (١٧١)ی ڕۆژگاری من، بەرگی چوارەمدا دەنووسێ: "وتارێکم بەناوی "پێویستی سەرشانی خوێندکارانی کورد" نووسییەوە، لە ژمارە (١٩ی مارتی ١٩٦٧)ی ڕۆژنامەی کوردستان بڵاو کرایەوە، لە وتارەکەدا ئەوەم دەربڕیبوو کۆمەڵەی خوێندکاران لقی کورد، نابێ هیچ پارتی و ڕێکخراو و تاقمێکی سیاسی بیکەن بە هی خۆیان، چونکە کورد لە هەموو پارتێك گەورەترە، نابێ ناکۆکی نێوان ڕێکخراوانی جیاوازی کورد بێتە ناو کۆمەڵەی خوێندکارانەوە".

مامۆستا خەزنەدار، گەشت و گوزار و سەفەر و سەردانەکانیشی باری سیاسییان پێوە دیاربووە، چونکە چووبێتە هەر شارێك، بەر لە هەموو شتێك وەدوای ڕێوشوێنی کورد کەوتووە و هیچ کەلێن و قوژبنێك نەماوە سەری پێدا نەکا و سەرە داوەکان نەباتەوە سەر یەك. بۆ وێنە کاتێك دەچێتە ئازەربایجان و چاوی بەکوردەکانی ئەو وڵاتە دەکەوێ، لەگەڵیان کۆ دەبێتەوە، باسی ئەدەب و مێژووی کورد، هەروەها ئەوەی پێوەندی بەکوردەوە بێ کۆبوونەوەکانی پێ دەوڵەمەند دەکا و ڕووداوەکان دەخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە و جەماوەری لێ ئاگادار دەکا و هەلومەرجی کوردەکانی ناوچەکە لەباری مێژووییەوە دەگێڕێتەوە. لە لاپەڕە (٢٣٨)ی ڕۆژگاری من بەرگی چوارەمدا دەنووسێ:"ئەگەر کوردی ئازەربایجان لەسەر یەك ئایین و ئاینزا، موسڵمان و شیعە نەبوونایە لەگەڵ ئازەربایجانییان لەوانە بوو پارێزگاری زمانەکەی خۆیان بکردایە وەکو کوردی ئەرمەنستان و گورجستان و تورکمانستان."

کوردی ئازەربایجان لە ناوچەیێکی شاخاوی، ئاو و هەوا سازگار و بەپیت دەژین، بەدەگمەن بێگانەیان تێدا دەبینرێ. سنووری جوگرافی ئەم ناوچە کوردەوارییە بەم جۆرەیە: لە ڕۆژهەڵاتدا ناوچەی قەرەباغ، لە باکوور و ڕۆژئاوا

کۆماری ئەرمەنستان، لە باشووردا وڵاتی ئێران. ناوچەکە لە ڕووی جوگرافی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە . دەکرێ بەچوار بەش: کەلبەجاڕ و لاچین و زەنگەلان. نێوەند یان شارۆچکەن بەناوی ناوچەکانەوە بەسەریەکەوە لە پەنجا گوندی گەورەو بچووك زیاتر دەگرنە بەر. ئێستا ڤلادیمێر لینین لەژیاندا بوو، لە ساڵی (١٩٢٣) بەشێوەیێکی ڕەسمی ئەم ناوچە کوردییانەی کرد بە هەرێمێکی سەربەخۆی نەتەوەیی و ناونرا "قەزای کوردستان". پایتەختی شارۆچکەی لاچین بوو.

نووسین لەسەر دەورو زەمانێکدا بێ، گرنگی و بایەخی خۆی هەیە و وەك مێژوو حیسابی لەسەر دەکرێ، هەروەها بۆ بەرەی داهاتووش دەبێتە بەڵگەی زیندووبوونی ئەو زمانەی پێی دەنووسرێ. نووسین بەزمانی بێگانەش لە واقیعدا هەر خزمەتە بەزمانی کورد و دەسەلات و دەوڵەمەندیی ئەو زمانە دەردەخا. دوکتۆر خەزنەدار، کتێبی "کورتە مێژووی ئەدەبی کوردی تازە" بە زمانی ڕووسی بلاو دەکاتەوە و لە لاپەڕە (٢٥١)ی ڕۆژگاری من، بەرگی چوارەمدا دەنووسێ: کتێبی"کورتە مێژووی ئەدەبی کوردی تازە" بە زمانی ڕووسی لەناو کۆمەڵی ڕۆژهەلاتناسان دەنگی دایەوە. ڕۆژنامە و کۆوارەکانی ڕووسی و کوردی و ئەرمەنی و گورجی و ئازەربایجانی لەسەریان نووسی. ئاژانسی (تاس) و (ئەرمینیا پرێس) بە ڕووسی و ئەرمەنی هەواڵی دەرچوونیان بلاو کردەوە. ئامۆژگای خۆمان لە سان پترسبۆرگ بۆ ساڵی (١٩٤٧) پاداشتی بۆ سێ کتێب تەرخان بوو. پاداشتی یەکەم کتێبەکەی من وەری گرت".

١٣٩٢/٤/٢٤

# تعليمات النشر
# في مجلة الأكاديمية الكردية

١- مجلــة الأكاديميــة الكرديــة، مجلة فصليــة تعني نشــر البحوث العلميــة عن الكرد وكوردســتان. يجب أن تكون البحوث المرســلة الى المجلة مستوفاة لشروط البحث العلمــي وتخضــع للتقييم العلمي من قبل المتخصصين. مــن الضروري أن يتضمن البحث دراســة مشــكلة علميــة محددة ويتضمن أفــكارا وتحليلات جديــدة ولايكون منشورا أو مقبولا للنشر في أية مجلة أخرى.

٢- لغة النشــر الأساســية في المجلة هي اللغة الكردية، ولامانع من نشــر بحوث علمية تخص الكرد وكوردستان باللغتين العربية أو الأنجليزية.

٣- يكتــب عنوان البحث وإســم الباحث ومركز عمله، ومرتبتــه العلمية و وظيفته على الصفحة الأولى من البحث.

٤- من الضروري أن يلحق البحث بملخص باللغتين الأخريين، على ألا تزيد كلماته عن ١٥٠ كلمة ويوضح فيها الكاتب أهمية البحث والنتائج الأساسية التي توصل أليها.

٥- يعد البحث مقبولا للنشر ويزود الباحث بقرار هيئة التحرير بقبوله بعد تقييمه إيجابيا من قبل الخبراء والمحكمين المتخصصين.

ما ينشــر في المجلة يعبر عن وجهة نظر الباحــث، وليس بالضرورة تعبيرا عن وجهة نظر المجلة.

٦- تحتفظ هيئة التحرير بحقها في أن تحذف أو تعيد صياغة بعض الألفاظ والتعابير، بما يتلائم مع أســلوبها في النشر، مع مراعاة الحفاظ على الفكرة الأصلية دون المساس بها.

٧- يعتمد المنهج العلمي المعمول به في إختيار عنوان البحث ودراسته وأسلوب ترتيب المصادر والهوامش وإقتباس النصوص، وتعتذر هيئة التحرير عن نشــر أية دراسة تهمل هذه الجوانب .

٨- حيــن يكون البحث تحقيقــا لمخطوطة تتبع القواعد والمناهج العلمية المعمول بها في هذا المجال، وترفق البحث بست صفحات من المخطوطة.

٩- يرسـل البحث بثلاث نسـخ ورقية على (A٤) وعلى قرص مدمج (CD)، على أن لا يزيد عدد الصفحات الكلية للبحث عن (٢٥) صفحة بضمنها الأشـكال والجداول وقائمة المصادر. يفضل أن يكتب البحث بالحروف (١٥) Ali-A-Sahifa .

١٠- فـي حالة كون الموضـوع مترجماً، من الضروري ان يكون ذا صلة بأحد جوانب الثقافـة الكرديـة (الأدب، اللغة، التأريـخ... الخ). ومن الضرورة بمـكان أن يكون مترجماً من اللغة الأصلية مع إرفاق النص الأصلي للموضوع المترجم.

١١- تخصـص مجلـة الأكاديميـة الكرديـة عدداً مـن صفحاتها لعـرض وتقييم الكتب الصـادرة باللغة الكردية او اللغات الأخرى عن الكـرد والثقافة الكردية مع مراعاة المنهج العلمي المتبع في هذا المجال.

# بحث في حرب الأسماء

## " الكوردي نموذجاً "

**إبراهيم محمود**
مركز الأبحاث العلمية والدراسات الكوردية
جامعة دهوك

**مقدمة:**

قبل أكثر من أربعة عقود زمنية، كتب الشاعر العربي الفلسطيني الراحل محمود درويش، وكان شاعر المقاومة الفلسطينية، كتب قصيدة ذاع صيتها، وصارت من أثرياته الشعرية المقاوِمة، وهي (سجّلْ أنا عربي)، وعندما كان في فلسطين المحتلة، أقتطف منها هذه المقاطع:

سجّلْ
أنا عربي
ورقم بطاقتي خمسون ألفْ
وأطفالي ثمانيةٌ
وتاسعهم سيأتي بعد صيفْ
فهل تغضبْ
سجل
أنا عربي
وأعمل مع رفاقِ الكدح في محجرْ
وأطفالي ثمانيةٌ
أسلُّ لهم رغيف الخبزِ
والأثواب والدفترْ
من الصخرِ
سجل

